# گەلاوێژی کوردستان

## کەلیلە و دیمنە بە کوردی

وەرگێرانی: حاجی مەلا کەریمی زەنگەنە

پێشەکی: د. محمد نوری عارف

ناوی کتێب: گەلاوێژی کوردستان یان "کەلیلە و دیمنە بە کوردی"
وەرگێڕانی: حاجی مەلا کەریم حاجی سەعید زەنگەنە
سالی وەرگێڕان: ١٩٣٤ سلێمانی
پێشەکی: د. محەممەد نووری عارف
بلاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٧٠
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
بەرگ: شکار عەفان نەقشبەندی
نووسینی سەر بەرگ: خۆشنووس محەمەد زادە
وێنەکان: لە کێشانی "سوزانە فرێتز"ە و لە "کلیلة ودمنة" چاپی ١٩٨١ "دار الشروق - بیروت" وەرگیراوە.
پیت لێدان: ئەمیر داوود
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمان مەحمود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠١
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٣٠١)ی سالی ٢٠٠١ی دراوەتێ

# پێشەکی

د. محمد نوری عارف

ڕۆژێکی هاوینی ساڵی ١٩٧٦ بە هۆی هاوڕێی دێرینم خوالێخۆشبوو هونەرمەند شەماڵ سائب بۆ یەکەم جار مامۆستا مەلا کەریم ناسی، ئەو کاتە هەردووکمان مامۆستا بووین لە کۆلیجی ئادابی زانکۆی سلێمانی، کاک شەماڵ وتی: با سەرێ لە مامۆستا مەلا کەریم بدەین، قسەکانی خۆشە و ماوەیەک لەگەڵیدا دادەنیشین، ڕۆیشتین بۆ ماڵەکەی، وا ڕێک کەوت لەوێ بوو، بەخێرهاتنی کردین و سێ قوڵی دانیشتین، مەلا کەریم پیاوێکی ئارام و لەسەرخۆ بوو، قسەکانی بەتام و خۆش بوون، ئەو سەردەمە، ئەوانەی کە هاوتەمەنی ئەو بوون و خوێندەوار بوون، لە حوجرەی مزگەوتەکاندا خوێندبوویان، لە پاڵ زمانی عەرەبیدا بێجگە لە زمانەکەی خۆیان فارسیشیان دەزانی، کە زانی من مامۆستای زمان و ئەدەبی فارسیم، هاتە سەر باسی ئەدەبی فارسی، دیار بوو کە هۆگری ئەو ئەدەبە بوو، دوای وتووێژ و گفتوگۆ لەو بارەیەوە، باسی بەرهەمە بەناوبانگەکانی ئەدەبی فارسی کرد، وەکو: گوڵستان و بوستان و دیوانی حافز و...هتد. ئینجا قسە هاتە سەر باسی کەلیلە و دیمنە کە ناوبانگێکی جیهانی هەیە، لە پێش ئیسلام و دوای ئیسلامیش وەرگێردراوەتە سەر زمانە جیاجیاکانی دونیا، بێگومان لە ئەدەبی فارسیشدا جێگایەکی تایبەتی هەیە و هەمووی چیرۆکی خۆش و بەکەڵک و پڕ لە ئامۆژگارییە. مەلا کەریم وتی: کەلیلە و دیمنەم لە فارسییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و ناونیشانی(گەلاوێژی کوردستان)م بۆ داناوە، وەکو ئاگام لێیە، کراوە بە زۆر زمان و لام حەیف بوو کە خوێندەوارانی کورد لێی بێ بەش بن، دوای ئەوە وتی: ساڵەهای ساڵە بە تەمای ئەوەم کە بۆم چاپ بکەن، بەڵام هەر وا ماوەتەوە، ئینجا دەستنووسەکەی پیشان داین، هەندێکم لێ خوێندەوە، بینیم بە کوردییەکی خۆش و شیرین و ڕەوان ساڵی ١٩٣٤ نووسیویتیەوە، لە ڕاستیدا پەخشانی کوردی و لەو سەردەمەدا و بەو شێوەیە نووسرابێتەوە بێگومان نرخ و بەهایەکی تایبەتی هەیە و دەگمەن و نایابە، کەم ڕۆشنبیری کورد لەو سەردەمەدا بیریان لەوە کردۆتەوە کتێبێکی وا بکرێ بە کوردی. چەند ساڵێکی بەسەردا تێپەڕی و مەلا کەریم کۆچی کرد و ئاواتەکەی نەهاتە دی و کتێبەکەی هەر وا مایەوە و نەخرایە ژێر چاپ دوای ئەوە ساڵ هات و ساڵ چوو نزیکەی چارەکە سەدەیەک تێ پەڕی بەسەر ئەو دیدارەی کە کردمان لەگەڵ خوالێخۆشبوو مەلا کەریمدا، ڕۆژێ لە ناکاو نەزیرە خانی کچی خوالێخۆشبووم لە

هەولێر بینی، بەخێرهاتنم کرد و دەمزانی کە ماوەی چەند ساڵێکە لە هۆڵەندە دەژی و ئێستا بۆ سەردان هاتۆتەوە، دوای هەندێ گفتوگۆ وتی: کتێبێکم لەسەر شەماڵ نووسیوە و (گەلاوێژی کوردستان)ی باوکیشم هێناوە بە نیازی ئەوەی هەوڵ بدەم، بەڵکو چاپیان بکەم، دەستنووسەکە بە ڕێنووسی کۆنی کوردی نوسرابوو، بەلام کاتی خۆی مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم خستوویەتییە سەر ڕێنووسی نوێی کوردی و ئەوانەیشی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو*، وتم ئەمە کارێکی زۆر باشە و چاپکردنی کتێبەکە ئاسانتر و خێراتر دەکات، بە ئەزیەرەخانم وت: من ئامادەم داوا لە سەرنووسەری دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس کاک بەدران ئەحمەد بکەم بۆ چاپ کردنیان، دڵنیام کە خواستەکەمان بەجێ دەهێنێ. دوای ئەوەی کە ئەمەم بە کاک بەدران وت، دەستنووسەکانی وەرگرت و بەڵێنی دا کە دوای هەڵسەنگاندن چاپیان بکات. زۆری پێ نەچوو، ڕۆژێ چاوم پێی کەوت، وتی: (گەلاوێژی کوردستان)ی مەلا کەریم خوێندەوە و سەرنجی ڕاکێشام و بینیم کە کارێکی زۆر باشە و بە کوردییەکی شیرینی ئەو سەردەمە نووسراوە و لەبەر کۆنی پەخشانەکەی نرخێکی تایبەتی هەیە و بڕیاری لە چاپدانیم دا و ئێستا بەشێکی زۆری لێ چاپکراوە و بەم زووانە تەواو دەبێ و داوات لێ دەکەم پێشەکییەکی بۆ بنووسی، منیش بەڵێنی ئەوەم پێ دا. دوای ئەوەی کە تەواو بوو، دەستنووس و لاپەڕە چاپکراوەکانی پێدام، وا لێرەدا کورتەیەک دەنووسم لە بارەی ئەم وەرگێڕانە کوردییە و مێژووی ڕابوردووی ئەم کتێبە گرنگە و جێگای تایبەتی لە ئەدەبیاتی جیهاندا.

لە کۆتایی دەستنووسی (گەلاوێژی کوردستان)دا نووسراوە: گەلاوێژی کوردستان لە ١٠ی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٤ دەست کراوە بە نووسینەوەی و لە ٢٠ی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٤ تەواو بووە. لەو سەردەمەوە تا ئەمڕۆ گۆڕانێکی یەکجار زۆر بەسەر پەخشانی کوردیدا هاتووە، کە ئەم گۆڕانە و بەو خێراییە و لەو ماوەیەدا، لە زمانەکانی تردا دەگمەنە و لە زمانەکانی دراوسێشماندا بەو شێوەیە بەدی ناکرێت و گەلێ جیاوازە لەگەڵ پەخشانی کوردیی ئەمڕۆماندا، لە ڕووی وشە و زاراوە و لێکدانی وشە و دەربڕین و داڕشتنی ڕستەکاندا، هەر لەبەر ئەو جیاوازییە زۆرە، بە کۆن دادەنرێت، ئەو گۆڕانە خێرایەش کە لە زمانەکەماندا، تا ئەمڕۆ ڕووی داوە، هۆی تایبەتی خۆی هەیە، نووسەر و

* نووسینەوەکەی مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم لە چوار دەفتەردا بووە. وا دیارە یەکێک لە دەفتەرەکان (دەفتەری سێیەم) لەناوچووە بۆیە دەزگای ئاراس داوای لە کاک ئەحمەد تاڵانە کرد کە دەفتەری سێیەمان بۆ بنووسێتەوە، ئەویش کارەکەی بۆ ئەنجام داین و سوپاسی دەکەین.

ئەدیب و ڕۆشنبیرەکانمان هەمیشە هەوڵیان داوە بە کوردی پەتی بنووسن و لە جیاتی وشە بێگانەکان وشەی خۆماڵی و ڕەسەنی کوردی بەکاربهێنن، چونکە ئاشکرایە کە زمان بڕبڕەی پشتی هەموو میللەتێکە و مەرجێکی گرنگە بۆ بوونی ئەو نەتەوەیە و هێشتنەوە و پاراستن و گەشە پێدانی. ئەوەی کە شایانی باسە ئەوەیە کە ئەو شێوەیەی مەلا کەریم گەلاوێژی کوردستانی پێ نووسیوەتەوە، کوردیی ڕۆشنبیرانی قۆناغی ئەو سەردەمە بووە، بەبێ زۆرکردن لەخۆ، نووسەرەکەی بە شێوەیەکی سادە و ئاسان و ڕەوانی ئەو سەردەمە کتێبەکەی لە فارسییەوە، وەرگێڕاوە بۆ سەر کوردی. ئەوە شێوەیەکی تایبەتمەندە بەو قۆناغە، لە ڕووی لێکۆڵینەوە و دیراسەی زمانی کوردی بایەخێکی تایبەتی و بە نرخی هەیە.

پەخشانی ئەگەر بە زمانی میللەتەکانی دەوروپشتمان، وەکو: عەرەبی و فارسی و تورکی، لەو سەردەمەدا نووسرابێتەوە، بە نوێ دانانرێت و جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ شێوەی نووسینی ئەمڕۆیاندا، چونکە لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ خاوەن دەسەڵاتن، زمانی عەرەبی هەر لەسەرەتای ئیسلامەوە تا ئەمڕۆ نەتەوە موسڵمانە جیاجیاکان بەرهەمی هەمە جۆرەیان پێ نووسیوە و خزمەتیان کردووە، لەبەرئەوەی کە زمانی ئاین و زانست و دەسەڵات بووە. فارسەکانیش خاوەنی دەسەڵاتێکی پتر لە(٢٥٠٠) دوو هەزارو پێنج سەد ساڵەن، لە سەرەتاوە تا دەگاتە پەیدابوونی ئیسلام زمانی ڕەسمییان هەبووە، دوای ئیسلامیش تا ئەمڕۆ هەر هەیانەو پێی دەوترێ فارسی دەری یان فارسی نوێ. هەروەها تورکەکانیش خاوەنی دەسەڵاتێکی زیاتر لە(٥٠٠) پێنج سەد ساڵەن، زمانی ڕەسمی خۆیان هەیە، کوردیش لە دوای ئیسلام سەدەها ساڵ میرنشین و دەسەڵاتی سەربەخۆ و نیمچە سەربەخۆی هەبووە، بە دیالێکتە جیاجیاکانی زمانەکەی، بەرهەمێکی زۆری بەجێ هێشتووە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی هەر شیعر بووە، لە زەمانی باباە تایەر و دوا بەدوای ئەو، سەدەها شاعیری بە توانامان هەبووە، بەڵام تەمەنی پەخشانی کۆنی کوردی، لە نزیکەی دوو سەدە تێپەڕ ناکات، لەو ماوەیەدا ئەوانەی کە پەخشانی کوردییان نووسیوە لە پەنجەی دەستێ تێپەڕ ناکات، لەوانەیە بەرهەمەکانیان وەکو کتێبێ لە نزیکەی دوو سەد پەڕەیەک دا جێگای ببێتەوە، لە مێژووی ئەدەبەکەماندا پەخشان شان بەشانی شیعر نەڕۆیشتووە، چونکە دەسەڵات و میرنشینە کوردییەکانمان زمانی کوردییان وەکو زمانی ڕەسمی بەکار نەهێناوە، لە باتی زمانەکەی خۆمان بە زۆری زمانی فارسی و عەرەبییان بەکار هێناوە، زمانی میللەتەکانی دراوسێمان وەکو باسمان کرد زمانی ڕەسمی، هەر یەکێ

لەو زمانانە لە سنوورێکی تایبەتی و لە قەڵەمڕەوی خۆیاندا بەکارهێنراون و دەهێنرێن، زانایان و نووسەرانیان دەسەڵاتدارەکانی خۆیان هانیان داون و پشتیان گرتوون، بەڵام ئەو زەمینە لەبارە بۆ زمانی کوردی نەڕەخسابوو، زمانەکەمان زمانی ڕەسمی نەبوو، ئەو کەسەی کە بە کوردی بینووسیبایە تەنها هەستی نەتەوایەتی بوو کە پاڵی پێوە نابوو، با بێینەوە سەر باسەکەی خۆمان کە (گەلاوێژی کوردستان)ە و لە ساڵی ١٩٣٤دا مەلا کەریم لە فارسییەوە بە پەخشان وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، وەرگێڕ دەسەڵاتێ پشتی نەگرتووە، کەسێ هانی نەداوە، یەکێ پشتیوانی نەبووە، کە ئەو کتێبە بکات بە کوردی و بۆی چاپ بکات، تەنها هەستی نەتەوایەتی بزواندوویەتی، زانیویەتی کە، کەلەبەر و بۆشاییەک هەیە و ویستوویەتی بەپێی توانای خۆی بەشێکی لێ پڕ بکاتەوە، وەکو خۆی لە پێشەکییەکەیدا دەڵێ: «ڕجایە، برا خۆشەویستەکانم وەکو تەماشام کرد، ئامۆژگارییەک کە بە کوردی بێت نەنووسرابووەوە، یا عەرەبی، یا فارسی، هەر کەسە جۆرە کتێبێکی بۆ زوبانەکەی نووسیبوومەوە، وە (گەلاوێژی کوردستان) کە بیست و چوار زوبان تەرجومە کرابوو، منیش بە کوردی کە زوبانی ئەجدادمانە، نووسیمەوە، یارمەتی لە خواوە.»

ناونیشانی کتێبەکە (گەلاوێژی کوردستان)ە، کە لە فارسییەکەیدا (انوار سهیلی)یە ئەم هاتووە ناونیشانەکەی خستۆتە قالبێکی نەتەوایەتییەوە و ناوی ناوە گەلاوێژی کوردستان، (سهیل: سوهەیل) وشەیەکی عەرەبییە و ناوی ئەستێرەیەکە لە کۆتایی گەرمای هاویندا دەردەکەوێت، میوە لەم کاتەدا پێ دەگات، لەبەرئەوەی کە لە (یەمەن)دا بە تەواوی دەبینرێت، پێی دەڵێن (سوهەیلی یەمانی)، ئەم وشەیە لە فارسیشدا بەکاردێت، لە زمانی کوردیدا پێی دەوترێ (سیوەیل)، لە پەندێکی پێشینانی کوردیدا ئەم وشە بەکاردەهێنرێت، لەکاتێکدا ئەگەر کەسێ بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ یەکێ نەبینێ و لە پڕێکدا چاوی پێ بکەوێ، پێی دەڵێ: «بووی بە ئەستێرەی سیوەیل»، ناوێکی تری هەیە لە کوردیدا کە زۆر ناسراوە و پێی دەڵێن «گەلاوێژ» ئەستێرەیەکی گەشە و لە کۆتایی هاویندا کاتی کە دەردەکەوێت لە شەودا، لەناو خەڵکدا باوەو دەڵێن: «گەلاوێژ دەرکەوت و گەرما نەما»، وەرگێڕ پارچە هۆنراوەیەکی شاعیری بەناوبانگی کورد (حەمدی) کردووە بە سەرەتاکەی لەژێر ناونیشانی سورة (فاتحة الکتاب) بە کوردی. هەروەها لەلاپەڕە(٦)ی گەلاوێژی کوردستاندا بەم جۆرە دەڵێ:

«لە زەمانی ئەبو المظفر بەهرام شاە کوڕی سوڵتان مەحموودی غازی غەزنەوی، حەکیمی

بێ ئەمثال و زوبان فەصیح ابو المعالی نصرالله کوڕی محمد کوڕی حمید تەرجەمەی کرد بە فارسی، ناونرا «ئەنواری سهیلی»یەوە مەلا کەریم کوڕی حاجی سەعید کوڕی مەلا کەریم ناوی نرا گەلاوێژی کوردستان».

لە ڕاستیدا من نازانم مەلا کەریم لە ساڵی ١٩٣٤دا چ چاپێکی کەلیلە و دیمنەی لەژێر دەستدا بووە و لە چ ساڵێکدا چاپ کراوە، لەوە دەچێت کە ئەمەی لە پێشەکی ئەو چاپەدا وەرگرتبێ کە لەژێر دەستیدا بووە، بەڵام ئەمە بۆچوونێکی ڕاست نییە و هەڵەیە و ڕاستییەکەی بەم جۆرەیە: ابو المعالی نصرالله بن محمد لە دەوروبەری ساڵی (٥٣٦ کۆچی) کەلیلە و دیمنەی وەرگێڕاوەتە سەر فارسی[١] دوای ئەوە لە کۆتایی سەدەی نۆهەمی کۆچی (حسین الواعظ الکاشفی) کەلیلە و دیمنەی (ابو المعالی نصرالله بن محمد) هێنا و هەندێکی لێ لابرد و هەندێکی خستەسەر و بەشێوەیەکی تر بە فارسی نووسییەوە و ناوی نا (انوار سهیلی) ئەنواری سوهەیلی[٢]. هەروەها (براون) دەڵێ: حسین کاشفی ناسراو بە (واعظ) دانەری کتێبی (ئەنواری سوهەیلی)یە، کە ناسراوە بە (مەولانا کمال الدین حسین واعظ کاشفی) لە ساڵی (٩١٠ کۆچی)دا مردووە[٣].

لەبەرئەوەی کە (ئەنواری سوهەیلی) پەیوەندی بەکارەکەمانەوە هەیە و مەلا کەریم لە گەلاوێژی کوردستاندا ناوی بابەکانی ئەنووسیوە و لەوانەیە لە چاپەکەی ئەودا بەو جۆرە بوو بێت و نایشزانین کە بنچینەی وەرگێڕانەکەی چ چاپێ بووە، لێرەدا کورتەیەک لەبارەی ئەنواری سوهەیلییەوە دەنووسین و ناونیشانی بابەکانی دەخەینە ڕوو:

لەکۆتایی سەدەی نۆهەمی کۆچیدا و لە سەردەمی سوڵتان حسین میرزا بایقرای نەوەی تەیموردا (حسین واعظی کاشفی) دەستی کرد بە نووسینەوەی کەلیلە و دیمنەکەی (ابو المعالی) بەجۆرێکی تر و بەرگێکی تریشی کرد بە بەردا، هەندێکی لێ لابرد و هەندێ چیرۆکی تری خستەسەر و، هەروەها گۆڕانکایشی کرد لە ناونیشانی بابەکانیدا و شیعری فارسی خستە شوێن شیعرە عەرەبییەکان و هەوڵی گۆڕین و ئاسان کردنی ڕستە و دەربڕینەکانیدا و پێشکەشی (نظام الدولە امیر شیخ احمد السهیلی) کرد، کە یەکێ بووە لە ئەمیرەکانی سوڵتان حسین و ناوی نا (انوار سهیلی: ئەنواری سوهەیلی) و براون (ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگی ئینگلیزی) بە باشترین وەرگێڕانەکانی کەلیلە و دیمنەی دادەنێت، بەڵام ئوستاد (عبدالعظیم قریب) لە بارەی شێوەی نووسینەکەیەوە دەیخاتە پلەیەکی زۆر خوارووی وەرگێڕانەکەی (ابو المعالی)یەوە و دەڵێ: هۆیەکەیشی ئەوەبووە کە

ئەو کاتە سەردەمی دواکەوتنی ئەدەبی فارسی بووە و لە پلەی هێناوەتە خوارەوە و دیسان دەڵێ: خـوازە و لێکچـوونی بێ هێـزی بەکـارهێناوە و لە شـێوەی نووسـینەکـەیدا زۆر لە خۆکـردنی پێـوە دیارە، ئەم (ئەنواری سوهەیلی)یە وەرگێـردراوەتە سـەر زمـانی تورکی جەغـەتایی و عـوسمـانی و دیسان کراوە بە زمانی هیندی و دەکەنی. ژمارەی بابەکانی ئەنواری سوهەیلی چواردە بابە بەم جۆرەی خوارەوە کە بە فارسییە و لەژێریدا بە کوردی نووسراوە، کە ئەمانەن:

باب اول: درا اجتناب نمودن قول ساعی و نمام.

بابی یەکەم: لەبارەی دوورکەوتنەوە لەوانەی کە قسەی خەڵک دەگێڕنەوە.

باب دوم: در سزا یافتن بدکاران و شامت عاقبت کارشان.

بابی دووەم: لەبارەی سزادانی بەدکاران لە ئەنجامی کارەکانیان.

باب سوم: در موافقت دوستان و فوائد معاضده، ایشان.

بابی سێیەم: لەبارەی ڕێککەوتن لەگەڵ دۆستان و یارمەتیدانیان.

باب چهارم: در بیان ملاحظه کردن احوال دشنمان.

بابی چوارەم: لە بارەی ئاگاداربوون لە کاروباری دوژمـان.

باب پنجم: در حضرت غافل شدن و از دست دادن.

بابی پێنجەم: لەبارەی زیانی بێ ئاگایی و لەدەست دان.

باب ششم: در آفت تعجیل و شتاب زدگی درکارها.

بابی شەشەم: لەبارەی زیانی پەلە و خێرایی کردن لە کارەکاندا.

باب هفتم: در حزم و تدبیر و بحیله خلاص یافتن.

بابی حەوتەم: لەبارەی وریایی و بیرکردنەوە و بەفێڵ خۆ ڕزگارکردن.

باب هشتم: دراحترازکردن: از ارباب حقد و حسد و اعتماد ناکردن بر تملق ایشان.

بابی هەشتەم: لەبارەی خۆ دوورخستنەوە لە کینە تۆزان و حەسوودان و پشت نەبەستن بە زمان لووسییان.

باب نهم: در فضیلت عفو که ملوک را بهترین صفاتست.

بابی نۆهەم: لەبارەی باشیی لێبوردن کە بۆ پاشایان چاکترین سیفەتە.

باب دهم: در بیان جزاء اعمال بر طریق مکافات.

بابی دەهەم لەبارەی جەزای کردەوەکان بە هۆی پادلشتەوە.

باب یازدهم: در حضرت افزودن طلبیدن و ازکارخود بازماندن.

بابی یانزەهەم: لە بارەی زیانی زۆر داواکردن و لە کاری خۆ دواکەوتن.
باب دوازدهم: در فضیلت علم و وقار.
بابی دوانزەهەم: لەبارەی پلەی بڵندی زانست و گەورەیی.
باب سیزدهم: دربیان اجتناب نمودن ملوک از اقوال اهل غدر و خیانت.
باب سیانزەهەم: لەبارەی دوورە پەرێز بوون لە پاشایان و لە قسەی ستەمکاران و بەدکاران.
باب چهاردهم: در عدم التفات بانقلاب زمان و بنای کار بر قضاو قدر نهادن.
بابی چواردەهەم: لەبارەی گوێ نەدان بە دەور و زەمانەی بێ بار و کاردانە دەستی چارەنووس[٤].

وەرگێڕدراوەکانی کەلیلە و دیمنە بۆ سەر زمانی فارسی:

١- ڕوودەکی (عبدالله جعفر بن محمد) شاعیری گەورەی سەدەی چواردەمی کۆچی، لە ساڵی (٩٤٠ زایینی)دا مردووە[٥]. بۆ یەکەمین جار کەلیلە و دیمنە کە بە کۆمەڵەی بیدپای هیندی بەناوبانگ بوو، (عبدالله بن مقفع) لە پارسی میانەوە وەریگێڕابووە سەر عەرەبی و ڕوودەکی بە شیعر وەریگێڕایە سەر فارسی[٦].

٢- کەلیلە و دیمنەی بەهرامشاهی: ئەم کتێبە بەناوبانگترین و ڕازاوەترین کەلیلە و دیمنەی فارسییە، کە لە کەلیلە و دیمنەکەی (عبدالله بن المقفع)ەوە کراوە بە فارسی بەدەستی (ابو المعالی نصرالله بن محمد بن عبدالحمید منشی) ئەنجام دراوە، بەپێی هەندێ سەرچاوە خەڵکی شیراز یان دەڵێن خەڵکی (غەزنێن) بوو. بەهرامشاهی غەزنەوی (٥١١- ٥٢٢ کۆچی) ڕێزی لێگرتووە و لە بارەگای ئەودا کاری کردووە. (ابو المعانی) لە دەزگای غەزنەوییەکاندا مایەوە، لە ئەنجامدا بوو بە وەزیری خوسرە و مەلیک (٥٥٩ - ٥٨٣ کۆچی). عوفی لە جوامع الحکایات دا و هەروەها لباب الالباب لەبارەی پلەو پایەی ئەوەوە گەلێ شتیان نووسیوە[٧].

٣- انوار سهیلی «کلیلەو دیمنە»: حسین کاشفی ناسراو بە مەولانا کمال الدین حسین واعظ کاشفی دایناوە، کە لە ساڵی (٩١٠ کۆچی) دا مردووە. ئەمە لاسایی کردنەوەی کەلیلە و دیمنەکەی ابو المعالییەو بەشێوەیەکی تر بە فارسی دایناوە[٨].

٤- عیار دانش: ئەم کەلیلە و دیمنەیە (ابو الفضل بن مبارک ناسراو بە علامی) لە هیندستان بە پەخشانێکی جوان و ڕەوان نووسیوێتی، ناوبراو یەکێ بووە لە زانا و

وەزیرەکانی (اکبر همایون)ی پاشای هیند، ابو الفضل لە ساڵی (١٠١١ کۆچی)دا کوژرا[٩].

دەبێ ئەوەیش بزانین کە کەلیلە و دیمنە، ماوەیەکی زۆر دوای (گەلاوێژی کوردستان)ی مەلاکەریم، دووجاری تر کراوە بە کوردی. یەکەم (عومەر تۆفیق) لە ساڵی ١٩٧٠دا تەواوی کردووە و بۆ دووەم جار لە ساڵی ١٩٧٥دا چاپ کراوەتەوە لە چاپخانەی کامەرانی لە سلێمانی و بەرامبەر بە وشەی(باب)ی عەرەبی (دەرگا)ی داناوە، کە هەمووی دەکاتە نۆزدە دەرگا و، لە عەرەبییەوە کردوویەتی بە کوردی و(٢٠٥) لاپەڕەیە، بەلام ناڵێت لە چی چاپێکی عەرەبییەوە وەری گێڕاوە.

دووەمیان کەلیلە و دیمنەیەکی ترە و (دلاوەر) لە عەرەبییەوە وەری گێڕاوە بۆ سەر کوردی، ساڵی ٢٠٠١ یەکەم چاپی دەرچووە لە کوردستان - سلێمانی، وەرگێڕ پێشەکییەکی بۆ نووسیوە بە ڕێکەوتی ٢٠٠١/٥/٢٢ و دەڵێ: چەند کۆیلەیەکی زۆر گرنگمان لێ هەڵبژارد و وەرمان گێڕایە سەر زمانی کوردی شیرین. کتێبەکە هەڵبژاردەیەکە لە عەرەبییەوە و (١٩٩) لاپەڕەیە، ناوی چاپە عەرەبییەکەی نەهێنراوە.

لێرەدا کورتەیەک لەبارەی کەلیلە و دیمنەوە دەخەینە ڕوو، هەر لە سەرچاوەکەیەوە کە (پەنجە تەنتەرە)یە، ئینجا دێینە سەر باسی (ابن المقفع) و کەلیلە و دیمنەکەی ئەو کە هەر لە کۆنەوە بنچینەیەکی زۆرگرنگ بووە بۆ هەموو وەرگێڕدراوە ناودارەکانی جیهان. بەناوبانگترین کۆمەڵە چیرۆکێ کە لە سەردەمی ساسانییەکاندا لە سەنسکریتەوە کرابێ بەزمانی پەهلەڤی، کتێبی کەلیلە و دیمنەیە و سەرچاوە بنەڕەتییەکەی (پەنجە تەنتەرە)یە و پێک هاتووە لە پێنج باب و ئەمڕۆ لەژێر دەستدا نییە.

لە زەمانی ئەنو شیروانیدا (بورزوویەی پزیشک) ئەم کتێبەی وەرگێڕایە سەر زمانی پەهلەڤی و کۆمەڵە داستانێکی تری لەسەرچاوەی هیندییەوە وەکو (مها بهاراتە) وەرگرت و خستییە سەری، بەلام ئەم سەرچاوەیە پەهلەڤییە ئێستا نەماوە و ابن المقفع لە سەردەمی ئیسلامدا ئەو کەلیلە و دیمنەی کرد بە پەخشانی عەرەبی و دوای ئەوە چەند شاعیرێ بە شیعر وەریان گێڕایە سەر زمانی عەرەبی، یەکێ لەوانە (ابان لاحقی)یە، کە لەم وەرگێڕانە تەنها چەند بەیتێک ماوە. لە وەرگێڕدراوەکانی کەلیلە و دیمنە نووسینەوەیاندا گەلێ بابەت و شتی تری خراوەتە سەر. یان هەندێ جار لێی کەم کراوەتەوە، لە کەلیلە و دیمنەکەی ابوالمعالی نصرالله منشی دا باسی ئەوە کراوە کە (١٠) دە بابی لە هیندییەوە

وەرگیراوە و ئێرانییەکان پێنج بابیان خستۆتە سەر، بە قسەی (ابن الندیم) کەلیلە و دیمنە (١٧-١٨) باب بووە و هەر هەمان نووسەر دەڵێ: کەلیلە و دیمنەیەکی بینیوە دوو بابی لەوانی تر زیاتر بووە. کەلیلە و دیمنە چ لە سەردەمی ساسانییەکان، واتە پێش ئیسلام و چ لەسەردەمی ئیسلامدا بەشێوەیەکی تایبەتی بایەخی پێ دراوە[١٠].

ئینجا دێینە سەر باسی وەرگێڕدراوە کۆنەکانی کەلیلە و و دیمنە بۆ سەر زمانەکانی جیهان هەر لەسەرەتاوە کە بەم جۆرە:

سەرچاوە هەرە کۆن و بنەڕەتییەکەی بە زمانی (هیندی) بووە، بورزوویەی پزیشک لە زەمانی ئەنوشیروان، لە پێش ئیسلامدا وەری گێڕاوەتە سەر زمانی (پەهلەڤی) و، وەرگێڕانێکی تریش بە زمانی (تبتی)، لە پەهلەڤییەکەوە (ابن المقفع) لە ساڵی (٧٥٠ زایینی)دا کردوویەتی بە عەرەبی و لە ساڵی (٥٧٠ ز)دا هەر لە پەهلەڤییەوە کراوە بە زمانی سریانی کۆن.

دوای ئەوە هەر سەرچاوە عەرەبییەکەی (ابن المقفع) بووە بە سەرچاوەیەکی بنەڕەتی و لەمەوە وەریان گێڕاوە بۆ سەر زمانەکانی جیهان بەم جۆرە: لە ساڵی (١٢٥١ز)دا کراوە بە ئیسپانی کۆن و لە(سەدەی ١٣ی ز) کراوە بە لاتینی کۆن و لە (سەدەی ١٣ی ز) یعقوب بن العازار کردوویەتی بە عیبری و هەر لەم عیبریەوە لە ساڵی (١٢٧٠ز) کراوە بەلاتینیی ناوەڕاست و جارێکی تر لە عەرەبییەکەی (ابن المقفع)ەوە لە ساڵی (١٢٧٠ز) کراوە بە لاتینی ناوەڕاست و جارێکی یوحەنا کردوویەتی بە عیبری و لە عیبرییەکەی یوحەناوە لە ساڵی (١٥٥٢ز) کراوە بە زمانی ئیتاڵی و لە ئیتاڵییەوە لە ساڵی (١٥٧٠ز) کراوە بە ئینگلیزی و دیسان لە عیبرییەکەی یوحەناوە لە ساڵی (١٤٩٣ز)دا کراوە بە ئیسپانی نوێ و هەر لەمەوە لە ساڵی (١٥٤٨ز)دا کراوە بە ئیتاڵی و دیسان لە عیبرییەکەی یوحەناوە لە ساڵی (١٤٨٠ز)دا کراوە بە ئەڵمانی و لە ئەڵمانییەوە کراوە بە دوو زمان واتە زمانی دانیمارکی لە ساڵی (١٦١٨ز)دا و زمانی هۆڵەندی لە ساڵی (١٦٢٣ز)دا. دیسان نصرالله بن عبدالحمید لە(سەدەی ٦ی کۆچی)یەوە لە عەرەبییەکەی (ابن المقفع)ەوە کردوویەتی بە فارسی و هەر لەم فارسییەوە (کاشفی) لەسەدەی (٩ی کۆچی) لەژێر ناونیشانی (انوار سهیلی)دا کردوویەتی بە فارسی و هەروەها لە (انوار سهیلی) فارسییەوە: یەکەم کراوە بە تورکی لەژێر ناونیشانی (همایون نامە) کە لەسەدەی (١٠ کۆچی)دا، وەرگێڕدراوە بۆ (سوڵتان سولەیمان). دووەم بە دەستکارییەوە لە هیندا

هەر بەزمانی فارسی نووسراوەتەوە لەژێر ناونیشانی (عیار دانش) کە (ابو الفضل هیندی) لە ساڵی (۹۹٦ کۆچی)دا نووسیویّتی، بەڵام لە (همایون نامە) تورکییەکەوە لە ساڵی (۱۷۲٤ز) کراوە بە فەرەنسی، دیسان هەر لە (ابن المقفع)ە عەرەبییەکەوە لە ساڵی (۱۰۸۰ز)دا کراوە بە زمانی یۆنانی و هەر لەم یۆنانییەوە دوو وەرگێڕان هەیە: یەکەم (سلافۆنی کۆن)، دووەم ئیتاڵی لە ساڵی (۱۵۸۳ز)دا، دیسان هەر لە (ابن المقفع)ەوە لە سەدەی (۱۱ی ز)دا کراوە بە سریانی نوێ و هەر لەم سریانییەوە لە ساڵی (۱۸۸۰ز)دا کراوە بە ئینگلیزی[11].

کەلیلە و دیمنەکەی (ابن المقفع) هەر لەسەردەمی خۆیەوە و دوای خۆیشی، بایەخێکی زۆری پێ دراوە و بە درێژایی مێژووەکەی وەرگێڕدراوەتە سەر زمانە دەسەڵاتدارەکان و لە ئەدەبی جیهانیشدا شوێنی تایبەتی خۆی هەیە و کاریشی تێ کردوون. لەبەرئەوە بە پێویستی دەزانم کە لەبارەی نەژاد و بنەماڵە و ژیان و بەرهەمەکانییەوە کورتەیەک پێشکەش بکەم:

مێژوونووس و لێکۆڵەرەکان باوەڕیان وایە کە (ابن المقفع) لە نەژادی فارسی بووە، بنەماڵەکەی لە گوندی (جوور)دا ژیاوە، کە ئەمڕۆ ناسراوە بە فیروزئاباد و دەکەوێتە نزیک شیراز، و هەندێکیش دەڵێن لە (خوز) ژیاوە، کە (خوزستان)ە و عەرەب پێی دەڵێ (ئەهواز) و یەکێکە لەپارێزگاکانی خوارووی ئێران لە نزیک (بەسرە) و جهشیاری لە کتێبی (الوزراء والکتاب-ص۱۰۹) و ابن الندیم لە کتێبی (الفهرست - ص۱۷۸)دا، دەڵێن خەڵکی (جوور)ی سەر بە (شیراز)ە، ئوستاد ملک الشعراء بهار لە کتێبی (سبک شناسی-ج۱، ص۱۵۳)دا، دەڵێ (جوور) کراوە بە عەرەبی (گوور)ە[12].

لێکۆڵەرە ئێرانییەکان باوەڕیان وایە کە ابن المقفع خەڵکی دەوروبەری (شیراز)ی سەر بە ناوچەی فارسە. زۆربەی مێژوونووسەکان دەڵێن ناوی (روزبە) بووە، واتە خۆش بەخت، کامەران، بەختیار. بەڵام ناوی باوکی (داذویە) بووە. بۆ ئەم واتایە (زبیدی) دەڵێ: ابو محمد عبدالله بن القفع زمان پاراو بووە و، ناوی (روزبە) یان (دازجشنس) بووە پێش ئەوەی کە ببێ بە ئیسلام، و دوا وتە لەبارەی ناوەکەیەوە (ابن المقفع) خۆی لە کتێبەکەیدا الیتیمة (تاج العروس ج۵، ص٤۷۹ طبعة القاهرة) ناوی بردووە. ابن الندیم دەڵێ: ناوی عبدالله بن القفع بە فارسی (روزبە) بووە، پێش ئەوەی ببێ بە ئیسلام، آبا عمرو، کاتێ کە بوو بە ئیسلام پێیان دەوت ابو محمد المقفع ابن مبارك (الفهرست، ص ۱۷۸

طبعة القاهرة). ناوی ابن المقفع وەکو ناسراوە، هەر لە دایک بوونییەوە تا ئەمڕۆ لە باوکییەوە بۆی ماوەتەوە، ابن خەللەکان دەڵێ: لەلایەن حجاج کوڕی یوسف الثقفی کە والی عیراق بوو (٧٥-٩٥ کۆچی) باج و خەراجی لە ناوچەی فارس کۆ دەکردەوە، کاتێ کە لەو پارە و دەستکەوتانەی بەکاردەهێنا بۆ ڕابواردن وخۆشگوزەرانی، حجاج لەمە زۆر تووڕە بوو و فەرمانی دا بە لێدان و شکەنجەیەکی سەختی، تا وای لێ هات کە دەستی کۆڵەوار بوو، هەر لەوەوە ناونرا (المقفع)، دوای ئەوە کوڕەکەیشی بەوە ناونرا و ئینجا ناوبانگی بەوە پەیداکرد. هەروەها بە جۆرێکی تر، دەڵێن باوکی (ابن المقفع)، باج و خەراجی لە ناوچەی فارس کۆ دەکردەوە و (خالد عبدالله القسری) کە والی عیراق بوو لەسەر ئەم کارە دایەزراند بوو، کاتێ کە (یوسف بن عمر الثقفي) بوو بە والی عێراق و ڕقی لێی هەستا فەرمانی دا بە لێدانی بە جۆرێ تا دەستی کۆڵ بوو. (وفیات الأعیان، ج١، ص٢٧٠)[١٣].

مێژوونووسەکان لە بارەی لە دایکبوونی (ابن المقفع)ەوە بۆچوونی جیاجیایان هەیە، زۆریان لەو باوەڕەدان کە لە ساڵی ١٠٦ کۆچی = ٧٢٤ زایینی لەدایک بووە. ابن خەللەکانیش لەم باوەڕەدایە و لە کتێبی (وفیات الأعیان، ج١، ص١٨٨)دا دەڵێ: کاتێ کە ابن المقفع کوژرا تەمەنی(٣٥) ساڵ بوو، هەروەها لە شوێنێکی تری ئەو کتێبەدا دەڵێ: کوشتنی لە دەوروبەری ساڵی(١٤٢کۆچی)دا بووە و ئەمە بە نزیکترین بیر و بۆچوون دادەنرێت لەبارەی ساڵی مردنییەوە[١٤].

ابن المقفع لە دایک و باوکێکی فارسی کە لە ناز و خۆشیدا دەژیان لە (جوور)دا هاتۆتە دنیاوە، باوکی بەڕێوەبەرێکی گەورە و خاوەن سامان بووە، لە بەر ئەوەی لە منداڵیدا، ژیانی بە خۆشی و کامەرانی بردۆتە سەر و ئەمەیش زەمینەیەکی وای بۆ ئامادە کرد، کە بتوانی بە ئارامی لەناو زانست و زانیاریدا پەروەردە بکرێ، وردە وردە فێری زمانی پەهلەڤی بوو و شارەزایی پەیداکرد لە شارستانێتی ئێرانی کۆندا، بەتایبەتی دەورەی ساسانییەکان کە بە گەشەترین سەردەمی مێژووی ئێران دادەنرێت. لەو کاتەی کە (بەسرە) مەڵبەندی زانایان و نووسەران بوو (ابن المقفع) لەوێدا فێری سەرەتاکانی زمان پاراوی و ڕەوانبێژی بوو، نزیکی و تێکەڵاوی پەیدا کرد لەگەڵ زانایان و شاعیراندا، فێری عەرەبییەکی زۆر باشی پەتی بوو، (ابن الندیم) دەڵێ: (ابو الجاموس) یەکێ بوو لە زانا عەرەبە گەورەکانی ئەوێ، ابن المقفع پاراوی و ڕەوانبێژی لەوەوە فێر بوو- الفهرست لابن

ندیم، ص٤٥ - ئەمە کارێکی گەورەی کردە سەر ابن المقفع و هەردوو رۆشنبیری بەناوبانگی فارسی و عەرەبی تێدا کۆبووەوە و گەیشتە قووڵایی و ناخی هەردوو ئەدەبی عەرەبی و فارسی. ابن المقفع نموونەی بلیمەتی بوو، محمد سلام دەڵێت: لە عەجەمدا لە ابن المقفع زیرەکتری تێدا نەبوو، هەروەها لە ئەدەبی عەرەبیدا بەرهەمی نوێی هێنایە کایەوە و باشترین بەرهەمی لە پەهلەڤییەوە وەرگێڕایە سەر عەرەبی... (ضحی الاسلام، لاحمد امین، جا، ص٢٠٧)[١٥].

زاناو نووسەرەکانی بەسرە (ابن المقفع)یان ناسی و ناوبانگی گەیشتە وەزیر و میرەکان، لە بارەگای ئەواندا کاری دەکرد، بوو بە نزیکترین هاوڕێی (عبدالحمید الکاتب) و ژیانێکی باشی بۆ سازکرد لە زمانی مەروانی دوا خەلیفەی بەنی ئومەییە[١٦].

دوای کەوتنی خەلافەتی بەنی ئومەییە و دامەزراندنی خەلافەت بەنی عەبباس ناوبانگی ابن المقفع لەبەسرەدا گەیشتە هەموو کۆڕ و ئەنجومەنێ، والی بەسرە ئەمیر عەبباسی مامی خەلیفە سلێمانی کوڕی عەلی نزیکی کردەوە لە خۆی و کردی بە مامۆستای منداڵەکانی و دوای ئەوە، لای مامەکانی خەلیفە ناسراو لەوانیش نزیک بووەوە، لە بارەگای ئەواندا کاری نووسینی گرتە ئەستۆی خۆی، بەڵام لە پلەو پایەی بەرز خۆی دوور دەخستەوە دوای ئەوەی وازی لە ئاینی مانەوی هێنا و بوو بە ئیسلام و ناونرا عبدالله[١٧].

بەدبەختی ابن المقفع لەوەدا بوو کە سولەیمان لەمیرنشینی بەسرە لابرا و سوفیانی کوڕی مەعاویەی کوڕی یەزید هاتە شوێنی و زۆر ڕقی لە ابن المقفع بوو، ئەمەیش هۆی زۆری هەبوو، دەڵێن ابن المقفع گاڵتەی بە سوفیانی کوڕی مەعاوییە دەکرد، پرسیاری لێ دەکرد، کاتێ وەڵامی دەدایەوە، پێی دەوت: ڕاست ناکەیت و پێی دەوت: «یا بن المغتلمة والله ما اکتفت أمک برجال أهل العراق، حتی تعدهم الی الشام - وفیات الاعیان، ج١، ص٢٦٨» واتە: ئەی کوڕی وا وا لێکراو... دایکت بە هەموو پیاوەکانی عیراق تێری نەخوارد، تا خۆی گەیاندە خەڵکی شام» دیسان ابن خلکان لە(وفیات الاعیان)دا دەڵێت: سوفیانی کوڕی مەعاوییە لووتێکی گەورەی هەبوو، هەر کاتێ کە ابن المقفع بڕۆیشتبایە بۆ لای، بەم جۆرە سەلامی لێ دەکرد: (السلام علیکما)، مەبەستی لەمەدا گاڵتە پێ کردن بوو، واتە: خۆی پیاوێ بوو، لووتیشی لە گەورەییدا پیاوێکی تر بوو. (وفیات الأعیان لابن خلکان، جا، ص١٨٨، طبعة بولاق). هەر لەبەر ئەوەبوو کە سوفیان نەیتوانی زاڵ ببێ بەسەر ئەو کین و توورەییەی کە هەیبوو بەرامبەر بە ابن المقفع و،

ویستی که تۆڵەی لێ بسێنێ و ئاگری ڕق و قینی خۆی دابمرکێنێتەوە و، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٣٩ کۆچی)دا، ئەبو جەعفەری مەنسور، کاتێ کە سولەیمانی مامی لە ویلایەتی بەسرە لابرد و سوفیانی کوڕی مەعاویەی خستە شوێنی، سوفیان ئەمەی بە هەل زانی تا تۆڵە لە ابن المقفع بکاتەوە، ڕۆژێ ابن المقفعی هێنایە سەر تەنوور و فەرمانی دا تا ئەندامەکانی لەشی ببڕن و لەبەرچاوی خۆی فڕێیان بدەنە ناو تەنوورەکەوە، تا دوا پارچەی لەشی[١٨].

هەروەها دەگێڕنەوە، دەڵێن لە کاتێکدا کە تەمەنی (٣٦) سی و شەش ساڵ تێپەڕی نەکردبوو، ئەبو سوفیان لە حەمامدا خنکاندی، یان دەڵێن خستییە ناو بیر و بەردبارانی کرد، هەروەها دەڵێن ئەندامەکانی لەشی پارچە پارچە کرد[١٩].

دیسان دەڵێن لە ساڵی (١٤٢ کۆچی)دا، بەدەستی سوفیانی کوڕی مەعاوییە لەبەسرە بە تاوانی زەندەقە کوژرا[٢٠].

مێژوونووسەکان لە کوشتنیدا بیر و بۆچوونی جیاجیایان هەیە، هەیە دەڵێ: ساڵی (١٤٥ کۆچی) کوژراوە، یەکێکی تر دەڵێ: (١٤٣ کۆچی)، کوژراوە، یان لە بەسرە ساڵی (١٤٢کۆچی) کوژراوە، (هدیة العارفین، جا، ص٤٣٨) و ابن الجوزی لە کتێبی «مرآة الزمان»دا، دەڵێ: ساڵی ١٤٥ کۆچی کوژرا، هەروەها (عمر بن شبة) خاوەنی کتێبی (أخبار البصرة) دەڵێ: لەساڵی ١٤٣ کۆچیدا کوژرا، (وفیات الأعیان لابن خلکان، ج١، ص ١٨٩)[٢١].

**بەرهەمەکانی (ابن المقفع):**

ابن المقفع کتێبی زانستی لە پەهلەڤییەوە وەرگێڕاوە بۆ سەر عەرەبی، وەکو: کتێبی ایساغوجی و قاطیغور یاس و باری مینیاس و انالوطیقای ئەرستۆ. هەندێ لێکۆڵەران باوەڕیان وایە کە ئەم وەرگێڕدراوانە هینی محەممەدی کوڕی عبدالله بن المقفعە، لەو وەرگێڕدراوانە نوسخەیەک لە کتێبخانەی زانستگای سن ژۆزف - بیروت و نوسخەیەکی تری لە کتێبخانەی مەشهەد هەیە، نزیکترە لە ڕاستییەوە ئەگەر بەهینی (عبدالله بن المقفع) دابنرێ. هەروەها وەرگێڕانی کتێبی ئەدەبی و مێژوویی و داستانە میللییە ئێرانییەکان و پەند و قسەی نەستەق و گەلێ بەرهەمی تری کراون بە زمانی عەرەبی، کە بەشی زۆریان، گەورەترین نووسەری ئیسلام (روزبە) کوڕی دادویە (ابن المقفع) وەریگێڕاون[٢٢].

ابن المقفع بوو بە هۆی گۆڕانێکی مەزن لە پەخشانی عەرەبیدا، کە بە باشی شارەزای ئەدەبیاتی پەهلەڤی و عەرەبی بوو، دەستی کرد بە وەرگێڕانی کتێبە بەناوبانگەکان لە پەهلەڤییەوە بۆ عەرەبی وەکو کتێبی: گاهنامە، ئایین نامە، کەلیلە و دیمنە، خداینامە(سیر الملوك، سيرة ملوك الفرس)، کتێبی مەزدەک، کتێبی تاج، هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە کتێب و نامەکانی تر، ئەم هەموو بەرهەمانەی زۆر بەسەرکەوتوویی و زرنگییەوە کرد بە زمانی عەرەبی، بەم هۆیەوە بە خێرایی بایەخی پێ دراو جێگای خۆی گرت[٢٣].

سێ کتێبی بەناوبانگی ابن المقفع لەژێر ناونیشانی: الأدب الكبير، ناسراو بە الدرة اليتمية، والأدب الصغير، ورسالة الصحابة، لەسەر هەموو کتێبەکانەوە جێگای تایبەتی خۆیان هەیە، ابن المقفع ئەم سێ کتێبەی ڕاستەوخۆ لە پەهلەڤییەوە وەرنەگێڕاوە، بەڵکو خۆی دایناون و بۆ کتێبی یەکەمیان گەلێ کەڵکی وەرگرتووە لە سەرچاوە پەهلەڤییەکان. الأدب الصغير والأدب الكبير لەنێوان نووسەرانی عەرەبیدا بەناوبانگ بوون و کەڵکیان لێ وەرگرتوون. (ابن قتيبة) لە کتێبی (عيون الاخبار)دا گەلێ سوودی لێ وەرگرتوون و جارەهایش ناویانی بردووە و هەروەها کەڵکی لە کەلیلە و دیمنەکەیشی وەرگرتووە[٢٤].

### پەراوێزەکان

١- تاريخ ادبيات ايران- تأليف دكتر ذبيح الله صفا -جلد دوم- ص٨٨٨.
٢- القصة في الأدب العربي -الدكتور امين عبدالمجيد بدوي- دار المعارف- ص٣٢٤.
٣- از سعدي تا جامي -تأريخ ادبي ايران- تأليف ادوارد براون انكليسي، ترجمة و حواشي علي أصفر حكمت، ص٦٣٩،٦٤٠.
٤- القصة في الأدب الفارسي، الدكتور امين عبدالمجيد بدوي، دار المعارف، ص٣٢٤، ٣٢٦.
٥- گنج سخن، از رودكي تابهار - تأليف دكتر ذبيح اللة صفا، تهران ص٧١.
٦- تأريخ ادبيات ايران، يان ريپكا، ترجمة كيخسرو كشاورزي، چاپ اول، ١٣٧، ص٣٣٨.
٧- تأريخ ادبيات ايران، تأليف دكتر ذبيح الله صفا، جلد دوم، ص٩٤٨، ص٩٤٩.
٨- از سعدي تا جامي، تأريخ ادبيات ايران، تأليف ادوارد برون انكليسي، ترجمة و حواشي، علي اصفر حكمت، ص٦٣٩، ص٦٤٠. بڕوانە هەر ئەم سەرچاوەیە لاپەڕە ٧٣٦.
٩- از سعدى تا جامى، تاريخ ادبيات ايران، تأليف ادوارد براون... ص٦٨١،٦٨٢.
١٠- تاريخ ادبيات ايرلن پيش از اسلام، دكتور احمد تفضلى، تهران، ١٣٧٧، ص٣٠٣، ص٣٠٤.
١١- كليله و دمنه، ابن المقفع، دقق فيها وعلق عليها الشيخ الياس خليل زخريا - دار الاندلس، بيروت، ص٣١.
وەهەروەها بڕوانە: تأريخ الأدب العربي، حنا الفاخوري، بيروت-لبنان. طبعة ثامنة، ص٤٥١.
١٢- عبدالله بن المقفع، تأليف محمد غفراني الخراساني، مطبعة العالم العربي، ١٩٦٥، ص٦١

١٣- سەرچاوەی پێشوو ل٦٢.٦٣
١٤- سەرچاوەی پێشوو ل٦٣
١٥- سەرچاوەی پێشوو ل٦٥، ٦٦
١٦- سەرچاوەی پێشوو ل٦٧
١٧- سەرچاوەی پێشوو ل٦٩-٧١
١٨- سەرچاوەی پێشوو ل٩٧-٩٨
١٩- كليلة ودمنة- عبدالله بن المقفع، دقق فيها وعلق عليها الشيخ الياس خليل زخريا دار الاندلس- بيروت، ص١٨.
٢٠- تأريخ ادبيات ايران- دكتر صفا، جلد اول، ص١٨٦
٢١- عبدالله بن المقفع، محمد غفراني، ١٩٦٥، ص١٠٢.
٢٢- تأريخ ادبيات ايران، تأليف دكتر ذبيح الله صفا، جلد اول، چاپ دوازدهم، ١٣٧١-تهران، ص١٠٤، ص١٢١.
٢٣- تأريخ ادبيات در ايران، دكتر صفا، جلد اول، ص١٨٥
٢٤- تأريخ ادبيات در ايران، دكتر صفا، جلد اول، ص١٨٥، ص١٨٧.

# پێناسەی وەرگێڕ

حاجی مەلا کەریم حاجی سەعید زەنگەنە ساڵی ١٨٩٧ لە شاری سلێمانی لە گەڕەکی سەرشەقام هاتووەتە دنیا. تەمەنی سێ ساڵ بووە باوکی کۆچی دوایی کردووە. دایکی ئامینە خان رەسوڵ ئاغایان کە لە دەوڵەمەندەکانی زەنگەنە بووە، بە خێوی کردووە و ناردوویەتیە قوتابخانەی روشدیەی تورکی کە تەنیا قوتابخانە بووە و هەتا پۆلی چوارەمی سەرەتایی خوێندووە. بەڵام خوێندنی بە هۆی بڕیارێکی حکومەتی عوسمانی تەواو نەکردووە کە قوتابی دەبوایە بە پۆشەنیی رەسمی بێتە قوتابخانە «بریتیی بووە لە چاکەت و پانتۆڵ و شەپقەی قەپاغدار»، ئەم بڕیارەی جێبەجێ نەکردووە و وازی لە خوێندن هێناوە. دایکی دەیخاتە قوتابخانەی دینی کە پێی دەوترا حوجرە، پاشان دەچێتە قوتابخانەی مامۆستا «ناجیە خان» کە ئافرەتێکی موسڵمان و زیرەک بووە، لەوێ دەستی کردووە بە فێربوونی زمانی فارسی و تورکی و عەرەبی. لەبەرئەوەی نووسەر لە قوتابخانەی روشدیە فێری نووسین و خوێندن و زمانی تورکی دەبێت و زۆر زیرەک دەبێت، لە ماوەی ٦ مانگدا قورئان تەواو دەکات و نازناوی مەلا کەریمی بە سەرا دەدرێ، هەروەها لە مامۆستا ناجیە خان بەباشی فێری زمانی فارسی دەبێت، ئینجا دەس دەکات بە خوێندنەوەی کتێبی فارسی و عەرەبی و، بە هۆی قورئانی پیرۆزەوە فێری عەرەبییەکی باش دەبێت.

لە تەمەنی ١٨ سالیدا دایکی کۆچی دوایی دەکات. لەو کاتەدا دەچێتە یەکێک لە مزگەوتەکانی سەرشەقام و دەبێت بە فەقێ بۆ ئەوەی نەبێت بە عەسکەری تورک. بەڵام ئەمە سەری نەگرت و کرا بە عەسکەر و رەوانەی شاری موسڵ کرا، چەند مانگێک عەسکەری دەکات و پاشان را دەکات و دێتەوە سلێمانی. دووای ئەوە ئینگلیز دێنە سلێمانی و مێجەرسون دەبێ بە حاکمی سیاسی. ئەو کاتە مەلا کەریم، مرید دەبێ لە مزگەوتی حاجی کاک ئەحمەدی شێخ و هاتوچۆی گۆڕی کاک ئەحمەد دەکات. پاشان خۆی دەناسێنێ بە مێجەرسون. مێجەرسون کە دەزانێت زۆر زیرەکە، رۆژێک پێی دەڵێ حکومەتی عێراق کارەبا دەهێنێ بۆ سلێمانی و دەتوانی لەگەڵ ئەواندا کاری کارەبا بکەیت.

بە هۆی جوولانی سوپا بۆ موسڵ بۆ دامرکاندنەوەی راپەڕینی شێخ ئەحمەدی بارزان، چەند جارێک چووەتە موسڵ. بیر و هەستی کوردایەتی لە مێشک و دڵیدا دەچەسپێ.

ساڵی ١٩٣٤، شەوانە دوای نوێژ کردن دەستی دەکرد بە وەرگێڕانی کتێبی (کلیلة و دمنة). چەند مانگێک لەبەر چرا تەرجەمەی دەکردن و بەگوێرەی حیکایەتەکان وێنەی بۆ دەکێشان. دوای راکێشانی کارەبا بۆ چەند ماڵێک وەک ماڵی مێجەرسون و شابەندەر و شێخ مەحموود و شێخ قادر و حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا و عیزەت بەگ عوسمان پاشا، کارەبای بۆ ماڵی خۆی راکێشا لە گەڕەکی دەرگەزێن نزیک ماڵی عیزەت بەگ. لە سایەی بوونی کارەباوە، بە ماوەی دوو ساڵ لە تەرجەمەی کەلیلە و دیمنە بووەوە کە تا ئێستا دانەکەی بە دەستنووسی خۆی و وێنەکێشانی ئەو پارێزراوە.

بە نەخۆشی دڵ لە مێژووی ١٩٨٠/٨/٢١ کۆچی دوایی کرد و لە گردی شێخ ئەوڵا کە ناسراوە بە شێخی کاسە و کەوچک نێژرا.

# سورة فاتحة الكتاب

## به كوردى

(يا رســـول الله) زەليـل و دڵ حـــەزينم، ڕەحـــمـــەتێ
مـوســتـەمـەند و بێ قـەرار و بێ قـەرينم، ڕەحـمـەتێ
ڕاحـەتێ قـەلب و وجـوود و عـيـززەتێ نەفـسم نەمـا
وەقـتێ مـەرگـە، حـافـيـظێ ئيـمـان و دينم، ڕەحـمـەتێ
دادخـواهێ مـەحـشـەر و پشت و پەناهێ مـوئمـينان
هەم نشــينێ ذاتێ دونيـــا و ئافـــەرينم، ڕەحـــمـــەتێ
با بە (بسم الله الرحـــمن الرحـــيم) دەست پێ بكەم
چونكە تينووى ڕەحــمــەتم، دڵ ئاگــرينم، ڕەحــمــەتێ
كـــائينات (الحـــمـــــد لله) پڕ لە نوورى ڕوويێ تۆ
ئەى حـــەبيب و يارى (رب العــالمين)م، ڕەحـــمـــەتێ
ئەى وجـوودت مـەنبـەعێ ئەلطافێ (الرحـمن الرحـيم)
(مالك)ى ئيعجاز و شەمسێ (يوم الدين)م، ڕەحمەتێ
قـــائيـــمێ (اياك نعـــبـــد) بووم بە تەهليـــغـــاتێ تۆ
وا (واياك) ئەڵێم، بۆ (نســـتـــعين)م، ڕەحـــمـــەتێ
(اهدنا) بۆ ڕێى (صـــراط المســـتـــقـــيم)م تۆ خـــودا
بۆ ئيـــرانەى ڕێى (صـــراط الذين)م، ڕەحـــمـــەتێ
با لە (انعـــمت عليـــهم) من نەبم بێ بەش خـــودا
خـۆ ســـەگێ كـــوويێ (امـــير المرسلين)م، ڕەحـمـــەتێ
غـــەيرى تۆ كێ من لە (المغـــضـــوب عليـــهم) لا ئەدا
هەروەك (ولا الضـــالين. آمين) هيچ نەبينم، ڕەحـــمـــەتێ
تۆو خـودا غـافڵ لە (حـەمـدى) قـەت مـەبە ڕۆژى جەزا
ڕووســيــاهم، ئەى (شـفـيـع المذنبين)م، ڕەحــمــەتێ

ڕجايە، برا خۆشەويستەكانم، وەكوو تەماشام كرد ئامۆژگارييەك كە بە كوردى بێت نە نووسرابووەوە. يا عەرەبى يا فارسى هەر كەســە جۆرە كـتـێـبـێكى بۆ ئەو زوبانەكانى نووسـيـبوەوە، وە (گەلاوێژى كوردستان) كە بە بيـست و چوار زوبان تەرجمـە كـرابوو، منيش بە كـوردى كە زوبانى ئەجدادمانە، نووسيـمەوە. يارمەتێ لە خوداوە. خەڵقى شارى سلێمانى، لە گەڕەكى دەرگەزێن.

مەلا كريم

## بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي هدانا للايمان والاسلام. والصلاة والسلام على سيدنا ومولانا ومقتدانا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.

له پاش حەمد و ثەنا، عەرەزی ئێمە ئەوەیە خزمەتێ بۆ نەوجوانی کورد جێ بێلێن. نەسیحەتێ بە زوبانی فارسی بەیان کرابوو. ئێمەیش بە کوردی بەیانی بکەین. لە عەسری پێشوودا حەکیمی بە مەعریفەت (بیدپای) ناوی پیاوێکە لە مەملەکەتی هیندوستان، لە زەمانی (دابیشلیم) کتێبێکی بە زوبانی حەیواناتەوە دانا ناوی (کەلیلە و دیمنە)یە، بە چوارده نەصیحەت دروستی کرد و هەر نەصیحەتێ مەعریفەتێک نیشان ئەدا بۆ ئەوانەی تەماشای بکەن لە ئەنواعی سیاسەت و دۆستایەتی شارەزا ئەبن. ئەم کتێبە سێ فائیدەی هەیە. بۆ عەقڵ بلێیمت ڕێگە نیشان ئەدا. بۆ حکایەت ئارەزوو بکەیت لە ئەنواعی ئەدەبیات و موصەووەرات بەیان کراوە. بۆ قیمەت هەر کەلیمەیێ بە یەک ئاڵتوون موشابیهە. وە پادشاهانی پێشوو موعامەلەی حوکمدارییان لەسەر قانوونی ئەم کتێبە کردووە. ئەوەڵ بە زوبانی هیندی نووسرابوو. لە زەمانی نەوشیروان تەرجەمە کرا بە فارسی.

ڕۆژێ لە مەجلیسی نەوشیروان وتیان: لە خەزێنەی دابیشلیم پادشای هیند کیتابێ (بەرهەمەن) تەرتیبی کردووە. کلیلی دەرگای عەدالەتە. ئەساسی بناغەی میللەتە. بۆ سیاسەتی پادشاهان ڕەحمەتە. بە زوبانی تەیر و حەیواناتەوە بەیان کراوە. وەقتێ نەوشیروان ناوی ئەو کتێبەی بیست، بۆ پەیدا کردنی ئەمری کرد بە ئومەرا و وزەرا. عوموم قەراریان دا یەکێکی بە فیکر ڕەوانەی هیندوستان بکرێ بە سیاسەت ئەو کیتابە تەرجەمە بکات. لەو عەسرەدا حەکیمێ خەڵقی فارس بوو، لە عەقڵ و زیرەکیدا بێ ئەمثال بوو. میقدارێ دینار تەسلیم بە حەکیم کرا. لەسەر ئەمری نەوشیروان حەرەکەتی کرد، بۆ هیندوستان. بە موددەیێک هەر جۆری بوو ئەو کیتابەی پەیدا کرد، بە زوبانی فارسی تەرجەمەی کرد، هێنایە خزمەتی نەوشیروان.

حوکوومەتی عەدالەتی نەوشیروان بە واسیطەی ئەو کیتابەوە بوو. لە پاش نەوشیروان چەند پادشاهانی عەجەم لەسەر قانوونی ئەم کتێبە حوکمدارییان ئەکرد. تا زەمانی خەلیفەی دووەم لە عەبباسییان ئەبوو جەعفەری مەنصوور کوڕی موحەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی عەبباس خودایان لێ ڕازی بێت، خەبەری ئەو کیتابەیان بیست. بە

هەموو مەعلەکەتدا بە سەعیتێکی زۆر دەستیان کەوت. تەرجەمەیان کرد بە عەرەبی، دەفعەیێکی کە لە زەمانی ابو المظفر بەهرام شاە کوڕی سوڵتان مەحموودی غازیی غەزنەوی، حەکیمی بێ ئەمثال و زوبان فەصیح ابو المعالی نصرالله کوڕی موحەممەد کوڕی حەمید تەرجەمەی کرد بە فارسی، ناو نرا (ئەنواری سهیلی)، وە (مەلا کریم کوڕی حاجی سەعید کوڕی مەلا کریم) ناوی نا (گەلاوێژی کوردستان). بە ڕاستی ئەم کتێبە بێ ئەمساڵە. وە بۆیە بە زوبانی دڕندە و باڵندەوە بەیان کراوە. ئینسان لە بێ ئەدەبانەوە تەربییەت وەرنەگرێت. ئەم کتێبە وەک خەزینەی پادشاهان لە هەموو جۆر فائیدە دەست ئەخات. (أولاً) ئەگەر ئارەزووی ئەدەب ئەکەیت لە هەموو جۆر ئەدەبیات بۆ دونیا و ئاخیرەت بە عەمەل بێت بەیان کراوە. وە دووەم ئەگەر ئارەزووی حیکایەت ئەکەیت لە ئەنواع حیکایەتی غەریب بەیان کراوە. وە ئەگەر ئارەزووی تەماشای شکڵ ئەکەیت بۆ تەماشا کردنی تازە پێگەیشتووەکانمان موسەووەر* کراوە. بە زوبانی کوردی، زوبانی

* وەرگێر زۆر وێنەی بۆ ئەم کتێبە کێشاوە. وێنەکان ڕەنگاوڕەنگیشن بەلام لەبەرئەوەی زۆر سادەن بە پێویستمان نەزانی بلاویان بکەینەوە. وێنەی ترمان دانا کە بەهۆی بەڕێز د. مارف خەزنەدارەوە دەستمان کەوتن. ئارلس.

ئەجدادمانە نووسراوەتەوە. ڕجا ئەکەم لە برا خۆشەویستەکانم ئەگەر سەهو وە یان غەڵەتێک هەبی قەڵەمی عەفو بەسەریا بکێشن. وە هەر چەند وەقتم موساعەدەی نە ئەکرد، بە شەو ئەم کیتابەم نووسییەوە. هیدایەت لە خودا تەمەننا ئەکەم. ئەم کیتابە بە چوارده نەسیحەت نووسراوەتەوە، وە هەر نەسیحەتەی بەیانی موعامەلەیەک ئەکات. وە منیش یەک نەسیحەت لە کیتابەکە زیاد دامنا، بوو بە پازده نەسیحەت. (ان شاء الله) هەر یەک لە جێگەی خۆی بەیان ئەکرێت. ئەمما لەپێش نەسیحەتەکان لازمە بەیان کردنی پەیدا بوونی کیتابەکە مەعلووم بکرێت.

حیکایەت

ئەگێڕنەوە لە مەملەکەتی چین پادشایەک بوو ساحیب عەدالەت، دەرحەق بە ئەهالی زۆر چاک بوو. ئەوشیروانی زەمانە بوو. حاتەم تەبیعەت بوو. ناوی (هومایوون فال) بوو. وەزیری پادشاه ناوی (خجستەڕای) بوو. وەزیرەکە عەقڵ و زیرەکیی بێ ئەمسال بوو.

پادشاه بە بێ وەزیر دەستی بۆ ئومووراتی درێژ نەئەکرد. ڕۆژێ پادشاه ئارەزووی ڕاوی کرد، ڕووی کردە وەزیر وتی: فکری ڕاوم هەیە. ئەسبابی ڕاو ڕێک بخە. وەزیر لەسەر ئەمری شاه میقداری لەشکری ئامادە کرد. بۆ سوبحەینێ پادشاه و وزیر لەگەڵ لەشکر و ئەسباب ڕوویان کردە سەحرا. وەقتێ دەست کرا بە ڕاو کردن باز بە ئاسمانا و تووله و تاڵجی بە ئەرزدا ئەو سەحرایەیان لە نێچیر پاک کردەوە. وەزیر بە ئەمری پادشاه ئەمری کرد بە ڕاو بە تاڵ کردن. وەقتێ گەڕانەوە بۆ مەملەکەت گەرمیی خۆر تاوی گرتبوو. ئەو سەحرایە وەک کوورەی ئاسنگەران جۆشی سەندبوو. ئەسپ لە ڕۆیشتن، تەیر لە فڕین ئەکەوتن. پادشاه وتی: ئەی وەزیر! لەم گەرمایەدا ڕۆیشتنمان مەسڵەحەت نییە. وەزیر وتی: ئەی پادشاه! ئەمر ئەمری جەنابتە. ئارەزوو ئەفەرموویت ئەو کێوە لە پێشمانەوە دیارە ساحێب درەختە، ئەچین لە ژێر سێبەری درەختەکان میقداری ئیسراحەت ئەکەین. وەقتێ شیددەتی گەرما خەلاس بوو ئێمەیش حەرەکەت ئەکەین بۆ مەملەکەت. لەسەر قسەی وەزیر ڕوویان کردە کێوەکە. وەقتێ نزیک بە کێوەکە بوون تەماشایان کرد لە هەموو نەوع تەیر بەسەر دارەوە بە خوێندن خەریکن. درەختی سنەوبەر و عوود سەریان بۆ ئاسمان بڵند بۆتەوە. ئاوی وەک مرواری ئەهاتە خوارەوە. وەقتێ داخل بەسەری کێوەکە بوون لەژێر سێبەری دارێکا جێگەی پادشایان داخست. موقابیل بە جێگەی پادشاه دارێک شکابوو و پەڕپووت بووبوو. ناوی دارەکە بۆش بووبوو، هەنگ هێلانەیان تیا دروست کردبوو. پادشاه چاوی بە هەنگەکان کەوت، سوئالی لە وەزیر کرد: ئەم جانەوەرە باڵ سووکانە ناویان چییە و، ئەم هاتو چۆ و ڕۆیشتنەیان لەبەر چییە؟ وەزیر وتی: ئەی شەهریار! ئەم جانەوەرانە زۆر بە مەنفەعەتن وە کەمێک بە ئازارن. لە تەرەف خوداوە ئیلهام دراون "وأوحی ربک الی النحل ان اتخذی من الجبال بیوتا". مەقسەدی ئەم ئایەتە بۆ ئەم جانەوەرانەیە. ناویان هەنگە. پادشایەکیان هەیە ناوی (یەعسووب)ە. ئەختێ لەوان لە بەدەنا گەورەترە. عوموومی ئەو هەنگانە لەژێر حوکمی یەعسووبدان. پادشاکەیان ئەمری کردووە لە پیسی ئەنیشن. وە لە گوڵی بۆنخۆش زەخیرە ئەبەن. وەتەختی مێو بۆ پادشاه دروست کراوە. عوموومیان لەژێر حوکمی پادشاکەدان. بە ئەمری پادشاه، وەزیر و دەرگاوان و ڕەئیس و چاوش و هەریەکە بە وەزیفەی خۆیان خەریکن. وەستا و موهەندیس شانە دروست ئەکەن کون کون هیچیان لە یەک فەرق ئەکرێن. وەقتێ خانووەکە تەواو کرا، بە ئەمری یەعسووب دێنە دەرەوە، ئەچن لە گوڵی بۆنخۆش ئەنیشن، خواردنی شیرین ئەخۆن. بە موددەتێکی کەم لە زکیانا بە شەربەتێکی شیرین و ساف ئەبێت وە داخلی کونی شانەی ئەکەن. ئەبێت بە هەنگوین.

خودا فەرموویەتی: «فیه شفاء للناس». ئەمما وەقتێ لە دەرەوە ئەڕۆنەوە جێگەی خۆیان لە دەرگا دەرگاوان تەفتیشیان ئەکا. ئەگەر لەسەر ئەمری پادشاە مابوون، ئیزن ئەدرێن بۆ ژوورەوە. وە ئەگەر وەفا و شەرتیان شکاندبوو، دەرگاوانەکان دوو لەتی ئەکەن و فڕێی ئەدەنە دەرەوە. وە ئەگەر دەرگاوانەکان خەبەریان نەبوو بۆنی پیس بە لووتی پادشا دا چوو پادشاە بە نەفسی خۆی ئەو هەنگە ئەدۆزێتەوە، داخلی جێگەی سیاسەتی ئەکات وە لەگەڵ دەرگاوانەکان ئەمر ئەکات بە کوشتنیان. وە ئەگەر واقیع بوو هەنگێکی غەریب رووی کرد بۆ لای ئەوان، مەنعی ئەکەن بچێتە ژوورەوە. وە ئەگەر ئەگەڕایەوە هەنگەکە ئەکوژن. ئەگێڕنەوە جەمشید شاە تەخت و سەڵتەنەت و وەزیر و دەرگاوان و ئەساسی لەسەر تەرتیبی هەنگ دانا و بە مەرتەبەی تەواو گەیشت، ناوی چاکەی بەجێ هێشت.

(هومایوون فال) ئەو قسانەی لە وەزیر بیست، رووی کرد بۆ لای دارەکە. وەقتێ تەماشای هاتوچۆی کردن هەر یەکە میقدارێ گوڵ بەقاچیانەوە دیارە و زەرەر بە یەک نادەن. پادشاە تەحەییور ما. هومایوون فال وتی: ئەی وەزیر! عەجەبا ئەم جانەوەرانە زەرەر بە یەک نادەن، عوموم وەک یەک بە هاتو چۆ کردن خەریکن، ئەمما خولقیان لەگەڵ بەنی ئادەم زۆری فەرقە، بەنی ئادەم دائیما خەریکی ئازاری یەکترن؟! وەزیر وتی: ئەی پادشا ئەم جانەوەرانە لەسەر یەک تەبیعەت خەلق بوون، وە بەنی ئادەم لەسەر تەبیعەتی موختەلیفە خەلق کراون وەک رۆح و نەفس و جەسەد، خێر و شەڕ. بەسەر یەکا ڕژاون. قیسمێکیان بۆ بەهەشت وە قسمێکیان بۆ جەهەننەم خەلق بوون. ئەوەی بۆ بەهەشت خەلق کراون خەریکی نوێژ و رێگەی شەریعەتە. ئەوەی بۆ جەهەننەم خەلق (کراوە) بە ئارەزووی نەفس و شەیتان موعامەلە ئەکات. پادشاە وتی: ئەی وەزیر! وەک تۆ بەیانی ئەکەیت سەلامەتی ئینسان لە تەنهاییدایە وە ئیسراحەت لە عەزل بوونایە. وەکوو بیستوومە رەفاقەتی بەنی ئادەم ئاخری پەشیمانیی لە دوا دێت. ئەوانە عیبادەتی خودا ئارەزوو بکەن لە چۆڵێ وە یا لە غارێ بە عیبادەت کردن خەریکن. وەزیر وتی: ئەوەی تۆ ئەفەرموویت حەقیقەت رێگەی راستییە. ئەمما رەفاقەت باعیثی فەرەحی دڵە. حوکەما فەرموویانە: لەناو مەجلیسا دانیشتن لە تەنهایی چاکترە چونکە تەنهایی نزیکی سەفاهەتە. خودای تەعالا بەنی ئادەمی خەلق کردووە عوموم بە واسیتەی یەکەوە مەعیشەت پەیدا ئەکەن، مەسەلا وەک ئاسنگەر و دارتاش و پادشاە رەعییەت. ئەمانە بە یەک موحتاجن. پادشاە وتی: ئەی وەزیر ئەوەی تۆ بەیانت کرد راستە، ئەمما لەوە خۆف ئەکەم لەمەو دوا بە واسیتەی قووەت وەیا ماڵ و دەوڵەت زوڵم پەیدا ببێت. ئەهالی بکەونە ژێر حەبس و رەزالەتەوە،

عوقوویەتیان بە گەردنی من بێت. وەزیر وتی: ئەی پادشاه! بۆ دەفعی خەیالاتی جەنابت، عیلمێک هەیە باعیثی ڕێگەی عەدالەتە، وە ئاسایشی میللەتە. پادشاه وتی: ئەو عیلمە ناوی چییە؟ وەزیر وتی: چاوم پێ کەوتووە لە ئینجیلدا لە بابی حەوتەم (فارەقلیتا) ئەڵێت: لە تەئریخی میلادیی سەنەی ٥٨١ پێغەمبەرێ دێتە سەر دنیا ناوی موبارەکی ئەحمەدە، بڕەهمەنان یەعنی عالمان ئەڵێن ناموسی ئەکبەرە. ئەو پێغەمبەرە ساحیب شەریعەتە، ساحێب میعراجە، سیراجە، وەهاجە، کلیلی دەرگای جەننەتە، ئەووەلی ئەنبیایە، لە ئاخری دنیایە. یەعنی دوای ئەو پێغەمبەر نایەتە سەر دنیا. بە واسیتەی جیبرەئیلی ئەمین قورئانی بۆ دێتە خوارەوە. لەسەر ئەمری فەرموودەی ئەو پێغەمبەرە هەرچی بکرێ گوناهی نییە. وە لەپاش وەفاتی خولەفا لە جێی ئەو حوکم ئەفەرموون. وە پادشاهان لە ڕێگەی شەرعەوە هەرچی بکەن گوناه نییە، وە قائیمی سەڵتەنەتی پادشاهان بە واسیطەی شەرعەوە مومکین نەبێت، وە باقی بوونی شەرع بە واسیتەی پادشای عەدلەوە ئەوەستێ. هومایوون فال وتی: ئەو حاکمە عەدلە لەسەر شەریعەتی موحەممەد موعامەلە بکات، سیفەتی مەئمووڕانی چۆنە؟ وەزیر وتی: ئەو حاکمە لازمە لە قانوونی سیاسەت بزانێت وە لە ڕێگەی شەریعەت دەرنەچێت. بە حوکمی "وشاورهم في الأمر" بە تەدبیری وزەرا و عولەما و حوکەما حوکم بفەرموێت. وە ئەگەر لە ڕێگەی شەریعەت لای دا بە موددەتێکی کەم مەملەکەتی لە دەست ئەچێت، تووشی عەزابی دونیا و قیامەت ئەبێت «وجزاء سيئة سيئة مثلها». وە لازمە پادشاهان لەگەڵ تایفەیەکدا بە تەدبیر خەریک بێ، وە لە تایفەیەک خۆی بپارێزێت، چونکە مەئمووران لەسەر دوو نەوعن، نەوعێکیان زۆر بە ئیخلاس بۆ بەرز بوونەوەی پادشاه و مەنفەعەتی حوکوومەت، بۆ ئیسراحەتی میللەت سەعی ئەکەن. وە قیسمێکیان غەیرەز مەنفەعەتی خۆیان نەبێت ئارەزووی کە ناکەن. دائیما چاوەڕوانی ڕیشوەتن. ئەگەر کەسێ خزمەتیان بکەین مومکینە بەقاتیلی ببرێت بۆ حوزووری حاکم دەستی عەفوی بۆ درێژ ئەکەن. لازمە بۆ زاتی موبارەکی پادشاه ئەو دوو تایفە بناسێت، وە ڕاست قسە و ئەهلی فیتنە فەرق بکات تا بە واسیتەی فیتنەی زوبانەوە بیناغەی مەملەکەتی تێک نەچێت. وە شەرایتی پادشاهان ئەوەیە بە فەرموودەی عولەما و حوکەما و وزەرا ئومووڕات ئەدا بفەرموێت، وە هەر پادشایەک لەسەر قانوونی شەریعەت موعامەلەی ئەدا فەرموو مەملەکەتی ئاوەدان ئەبێت، وە میللەتی تورەقی ئەکات، وە ناوی عەدالەتی گوم نابێت، هەر وەک دابیشلیمی هیندی قانوونی سیاسەتی لەسەر قسەی بڕەهمەنی حەکیم دانا مەملەکەت و میللەتی تورەقیی

کرد، وە هەتا حالی حازر ناوی بە عەدالەت مەشهوورە. ئەی پادشاە! هەر چەند فکر ئەکەم لە ناوی چاک چاکتر نادۆزمەوە.

وەقتێ هومایوون فال ناوی دابیشلیم و برەهمەنی بیست وەک غونچەی گوڵ گەشایەوە. بە رووی خۆشەوە رووی کردە خجستە رای، وتی: ئەی وەزیر موددەتێکە لە دووی ئەم قیسسە ئەگەڕێم. (الحمد لله) بە زوبانی موبارەکی جەنابت ئەووەڵی قیسسە ئاشکرا بوو. ئومێد دەکەم ئەووەڵ تا ئاخری قیسسەی دابیشلیم و برەهمەنی حەکیم بەیان بفەرموویت. ئەمر کرا بە لەشکر، روویان کردەوە بۆ مەملەکەت. وەقتێ داخل بە مەملەکەت بوون، پادشاە لەسەر تەختی سەڵتەنەت قەراری گرت. ئەمری کرد بە وەزیر، زوبانی عاقڵ کلیلی دەرگای گەنجە. هەرچی قسەی برەهمەنی حەکیم لەگەڵ دابیشلیم کراوە، بەیان بفەرموو.

## حیکایەتی دابیشلیم وە برەهمەنی حەکیم

وەزیری دڵ رووناک بە زوبانی فەسیح عەرزی پادشای کرد وتی: ئەگێڕنەوە لە مەملەکەتی هیندستان پادشایەک بوو ناوی دابیشلیم بوو، بە زوبانی هیندی یەعنی شەهەنشاە. ئەو پادشایە دە هەزار زنجیرە فیلی حەربیی دابەستبوو لە لەشکر و سوپاە و ئەساسی حەرب لە حیساب دەرچوو بوو، وە لەگەڵ فەقیر و میللەت زۆر بەشەفەقەت بوو وە عەدالەتی شۆرەتی پەیدا کردبوو. مەملەکەتی لە نیهایەتی ئاوەدانییا بوو. بە نەفسی خۆی لەگەڵ موحاکەمە خەریک بوو. ساڵی دوو رۆژ موحاکەمە دائەنرا. ئەو دوو رۆژە یا دوو کەس وە یا سێ کەس موحاکەمەیان ئەبوو. رۆژێ لەسەر تەختی پادشایی قەراری گرتبوو، عولەما و حوکەماو ئەشرافی مەملەکەت عومووم لە مەجلیسی حازر بوون. ئەمر کرا بە حازر بوونی رەققاسان و بەستە بێژان. بەزم ئاراستە کرا. عوود و کەمانچە، دەف و نەی لێدرا. رەققاسان بە رەقس کردن، گۆرانی بێژ بە نەغمەی داوودی پیر و جوانی ئەهێنایە رەقسەوە. لە پاش رەقس ئەمر کرا بە حازر بوونی تەعام. دەستیان کرد بە نان خواردن. لە پاش نان خواردن دەست شۆررا . هەر کەسە لە جێگەی خۆی قەراری گرت. عولەما، وەحوکەما، وە ئەشراف هەر یەکە بە جۆرێ قسەیان هێنایە ناوەوە. میقدارێ سوئال و جواب لە یەک کرا. ئینتیهای قسە ئەوە بوو رەئیی زۆریان ئەوەبوو وتیان سەخاوەت لە هەموو شتێک جوانترە. ئەوەڵ ئەمرێ خودا ئەمری کردووە سەخاوەتە (السخاء شجرة في الجنة) یەعنی سەخاوەت دارێکە لە بەهەشتدا. وەقتێ دابیشلیم گوێی لەو قسەیە بوو رەگی مەرحەمەتی کەوتە حەرەکە. ئەمری کرد دەرکی خەزێنە بکەنەوە وە

غەریب و لیقەوماو بانگ بکەن. فەقیر و فوقەرا و ئەهلی کەسابەت لە خەیری پادشاه بووژانەوە. موددەتێ بەو جۆرە دەوامی کرد. شەوێ بە ئیسراحەت نووستبوو، لە خەویا تەماشای کرد پیاوێکی نوورانی هاتە بەردەمی، ڕەسمی گەورەیی بەجێ هێنا، وتی: ئەی پادشا موددەتێکە دەرگای مەرحەمەتت کردووەتەوە، بە واسیتەی هەناسەی فوقەراوە خودا ئەتبەخشێ. بۆ سوبحەینێ لازمە سوار بیت بۆ تەرەفی ڕاستی مەملەکەت حەرەکەت ئەکەیت بە مەقسەد ئەگەیت، وە خەزینەیەک بە ناوی موبارەکتەوە دانراوە لە ئەنواعی جەواهیرات، هەر نەوع ئارەزوو بفەرموویت تیا مەوجوودە. دابیشلیم لە خۆشیی ئەو قسەیە خەبەری بۆوە، هەڵسا، بە عیبادەت کردنی خودا خەریک بوو تا ڕۆژ. وەقتێ هەتاو هەڵهات ئەمری کرد ئولاغ زین بکەن. ئولاغی خوسووسی زین کرا، وە میقدارێ عولەما و حوکەما لە خزمەتیا سوار بوون ڕوویان کرد بۆ ڕۆژهەڵاتی مەملەکەت، بە ڕۆیشتن و بە تەماشا کردن خەریک بوون. لە ئەسنای تەماشا کردن لە کێوەکە غارێ دەرکەوت. نزیک بەغار بوون. پادشاه چاوی بە دەروێشێ کەوت لە دەرکی غارەکە دانیشتبوو. وەقتێ دەروێش چاوی بە پادشاه کەوت چوو بە ئیستیقبالی پادشاوە. ڕەسمی ئەدەبی بە جێ هێنا. پادشاه مەیلی ڕەفاقەتی کرد. دەروێش بە عەقڵ زانیی پادشاه ئارەزووی دابەزین ئەکات. وتی: ئەی تاجی سەری میللەت! سولەیمان بەو هەموو گەورەییەوە مەرحەمەتی لەگەڵ مێروولە کرد. ئومێد ئەکەم بە قودوومی موبارەکت دڵی بەندە ڕووناک بکەیتەوە، وە هەر چەند لە دەستی بەندە لە دوعا زیاتر هیچ نایەت ئومێد ئەکەم سەرم بەرز بکەیتەوە، وە خەزێنەیێ لەباوکمەوە جێ ماوە لەم غارەدا دەفن کراوە ئەمر بفەرموویت بە نەقڵ کردنی. قابیلی خەزێنەیی جەنابتە.

وەقتێ پادشاه ئەو قسەی لە دەروێش بیست خەوەکەی بۆ دەروێش بەیان کرد. دەروێش وتی: موبارەکە مادەم لە غەیبەوە تەبلیغ کراویت حەڵاڵی جەنابتە. پادشاه ئەمری کرد بە هەڵکەنینی. میقدارێ هەڵکەنراو دەرکەوت. سندووق بە سندووق نایانە بەر دەمی پادشاه: سندووقێ دوڕ و سندووقێ یاقوت و سندووقێ ئەڵماس و سندووقێ قوفڵی ڕۆمیی لێ درابوو. هەرچەندە بۆ کلیل گەڕان ئەو سندووقە بکەنەوە کلیل نەبوو. پادشا کەوتە مەراقەوە، وتی مومکینە ئەو سندووقە ئەشیای عەنتیکەی تیا بێت. ئەمری کرد بە پیپی ئاسنگەری شکاندیان. لە ناو سندووقەکە سندووقێکی بچووک دانرابوو، لە ناو سندووقەکە قوتوویەک دانرابوو. پادشا بە دەستی موبارەکی قوتووەکەی کردەوە پارچە ئاوریشمێ بە خەتی سوریانی نووسرابوو لە قوتووەکە دا دانرابوو، عولەما و وزەرا و

حوکـما تەماشایان کرد، بۆیان مەعلووم نەبوو چی نووسراوە. پادشا کەوتە بەحری مەراقەوە، فەرمووی لازمە یەکێ بدۆزنەوە لەم خەتە شارەزا بێت. عەرزیان کرد ئەی پادشاه لە مەملەکەت حەکیمێ هەیە خەتی سوریانی ئەزانێت، مومکینە ئەو حەکیمە بیخوێنێتەوە. پادشا ئەمری کرد بە گەڕاندنەوەی لەشکر بۆ مەملەکەت. وەقتێ داخل بە مەملەکەت بوون حەکیمیان لای پادشا حازر کرد. پادشا فەرمووی: زەحمەت دانی تۆ بۆ ئەم خەتەیە، بیخوێنەرەوە. حەکیم تەماشای حورووفاتی ئاوریشمی کرد، وتی: ئەی پادشا ئەمە وەسیەت نامەی هۆشەنگ شایە وە خەزێنەی بۆ جەنابت داناوە. وەسیەتەکەی ئەمەیە: ئەی داپیشلیم! من لە غەیبەوە تەبلیغ کراوم. ئەم خەزێنە بۆ تۆم داناوە، وە خەزێنەکە ئەقڵی خەزێنەی خۆت ئەکەیت، وە حوکمداریی سەڵتەنەت لەسەر ئەم چوارده وەسیەتە دائەنێیت. وە بە ماڵی دنیا مەغروور نەبیت، هەر ڕۆژە لای یەکێکە. ئەم وەسیەتە نامە زۆر لازمە بۆ پادشاهان. بەم وەسیەتە موعامەلە بکەن حوکوومەتیان بەردەوام ئەبێت وە بناغەی مەملەکەتیان ناڕووخێت وە میللەتیان تەرەقی ئەکات. بینایەک بیناغەی مەحکەم بوو ڕووخاندنی زەحمەتە. بەیانی وەسیەتەکان ئەمەیە:

ئەوەڵ نەسیحەت: مەئموور لە پادشاه نزیک بوو خزمەتی لازمە. وە بە قسەی فیتنە مەئموور عەزڵ نەکەیت. عەزڵ کردنیان باعیسی وێرانیی مەملەکەتە.

دووەم نەسیحەت: مونافەعەتی دوو ڕوو و فیتنە لازمە وە کوشتنیان حەڵاڵە چونکە خودا فەرموویەتی: «والفتنة أشد من القتل».

سێهەم نەسیحەت: زوبان شیرینی لەگەڵ ئومەرا لازمە. بە دڵنەوایی و بە تەدبیری وزەرا هەموو کارێک بە ئاسانی دروست ئەبێت.

چوارەم نەسیحەت: بە زوبان لووسیی دوشمن باوەڕ نەکردنە، وە غافڵ بوون لە دوشمن باعیسی هیلاکەتە وە وێرانیی مەملەکەت و میللەتە. ئەمر بە کوشتنیان لازمە.

پێنجەم نەسیحەت: ئیسراف کردن حەرامە. خەزێنە وەیا گەنج دەستت کەوت بێهوودە سەرف کرێت پەشیمانیی لە دوو دێت. «کلو واشربوا ولا تسرفوا».

شەشەم نەسیحەت: بێ تەدبیر کردن دەست بۆ ئیش نەبەیت وە عەجەلە لە ئیش نەکەیت. لە ئاخری پەشیمان بوونەوە بێ فائیدەیە. «العجلة من الشيطان».

حەوتەم نەسیحەت: ئەگەر دوشمن ئەتراڵیان گرتیت لەگەڵ یەکێکیان سوڵح کردن لازمە. بە تەدبیر و ئیقتدار ئەبێت لە دەستی دوشمن نەجات بوون.

هەشتەم نەسیحەت: رەفاقەت لەگەڵ حەسوود و دانیشتن لەگەڵیان زەرەرە. ئینسانی حەسوود دارێک بنێژێت بەری تاڵ دێنێت.

نۆهەم نەسیحەت: تەبعی پادشا لازمە سەلیم بێ. عەفو کردنی زۆر بێت. لە ئەوەڵی دنیا تا قیامەت لە بچووک گوناە بووە، لە گەورە عەفو کردن.

دەهەم نەسیحەت: ئارەزووی پادشا لەسەر زوڵم نەبێ. هەناسەی مەزڵوومان زوو ئەگاتە حوزووری خودا. ڕێگەی عەدالەت گوم نابێت. «ان احسنتم احسنتم لانفسکم».

یازدەهەم نەسیحەت: موعامەلەیەک بۆ موڵک و میللەت نەفعدار نەبێت کردنی دروست نییە. بناغەی موعامەلە بە تەدبیر کرا تێکچوونی نییە.

دوازدەهەم نەسیحەت: وەقتێ دڵت گری غەزەبی داگیرسا، بە ئاوی حیلم بیکوژێنەوە. وەحیلم ڕەوشتی پێغەمبەرانە. «والکاظمین الغیظ والعافین عن الناس».

سیازدەهەم نەسیحەت: ئەهلی خائین و جاهیل و غەددار لایقی ئومموورات نین، دوور بوون لەو تائیفانە لازمە. ئەمین و ساحێب عەقڵ مەئموور بوو، تورەقیی پادشایە.

چواردەهەم نەسیحەت: ڕازی بوون بە قەزاو قەدەر. سەبر کردن لە ژێر بەلا، شوکر کردن لەسەر نیعمەت. ئینسانی عاقڵ پێ بەستراوی دەرد و بەلایە. پیاوی جاهیل خەریکی سەیر و سەفایە.

ئەم چواردە وەسیەتە بەیانم کرد هەر یەکە بە درێژی داستانێکی هەیە. وە ئەگەر پادشاە ئارەزوو ئەکات تا ئاخری ئەم نەسیحەتانە بە تەواوی بزانێت حەرەکەت بکات بۆ کێوی سەرەندیب جێگەپێی حەزرەتی ئادەم علیه السلام، لەو کێوە مەقسەدی دەست ئەکەوێت. خودا یارمەتی ئەدات لەسەر ڕێگەی هیدایەت. پادشاە ئەو قسانەی لە حکیم بیست ئەمری کرد بە خەلات کردنی حەکیم، لەپاشا وەسیەت نامەی هەڵگرت، فەرمووی: ئەم خەزێنەیەی نیشانی من درا خەزێنەی ڕەحمەت بوو، سیڕی خودا بوو لە من ئاشکرا کرا. (الحمد لله)، ئەوەی بە عوموومی پادشاهان لازمە لە لای من زۆرە. ئەمری کرد بە صەرف کردنی خەزێنە بە خێری هۆشەنگ شاە. ئەو ڕۆژە بە کەیف کردن خەریک بوو لە خۆشیی ئەو وەسیەت نامەیە. بۆ شەوێ خەوی ئیسراحەتی نەکرد. لەبەر خەیاڵ کردن چوونی بۆ سەرەندیب بە چ نەوع بێ، لە جێگەی خۆی کێ بێ بە عەداڵەت حوکم کات قابیلی وەکالەت بێ؟! بۆ سوبحەینێ لەسەر تەختی پادشاهی قەراری گرت، ڕووی کردە وەزیران، وتی: ئیمشەو خەوی ئیسراحەتم نەکردووە لەبەر چوونم بۆ سەراندیب. ئێوە فکرتان چییە،

بەیانی بکەن. موددەتێکە لەسەر تەدبیری ئێوە حوکمم کردووە، وە هەر یەکە تەدبیرێکی لایقە بەیانی بفەرموون. ئیش بێ تەدبیر دروست نییە. وەزیرەکان عەرزیان کرد: بۆ ئەم سەفەرە فکر لازمە. ئێمە هەردوکمان ڕێگەیەکی لایق ئەدۆزینەوە، بۆ سوبحەینێ عەرزی جەنابتی ئەکەین. پادشا فەرمووی موبارەکە. بۆ سوبحەینێ هەردوو وەزیر چوونە دائیرە، هەر یەکە لەسەر جێگەی خۆی دانیشت. وەزیری گەورە چووە بەردەمی پادشا عەرزی کرد: ئەی پادشای عالەم! بە فکری من سەفەر کردن موناسب نابینرێ. ئەگەر چی ئەم سەفەرە مەنفەعەت دەست ئەخا، ئەمما نارەحەتیی زۆرە، وە مەعلوومی جەنابتە «السفر قطعة من السقر». سەفەر کردن بە دەست خۆتە وە هاتنەوەی مەعلووم نییە. ئێستا بە ئیسراحەت لە جێگەی خۆت حوکمداری ئەکەیت، موناسب نییە ئیسراحەت بە مەشەققەت تەبدیل بکرێت. مەسڵەحەت ئەوەیە بە واسیتەی سەفەرەوە ئەوەت بە سەر نەیەت بەسەر دوو کۆترەکە هات. پادشا فەرمووی چۆنە؟

**حیکایەتی بازندە و نەوازندە**

وەزیر وتی: ئەگێڕنەوە دوو کۆتر لە دارستانێ هێلانەیان دروست کردبوو. ئەو دارستانە ڕێگەی خەڵقی لێ دوور بوو، تووشی زەحمەتی زەمانە نەبوون. یەکێکیان (بازندە)و یەکێکیان (نەوازندە) ناو بوون. بازندە خەیاڵی سەفەری کرد، بە نەوازندەی وت: ئەی ڕۆحی شیرینم! فکرم هەیە بە وەعدەی دوو سێ ڕۆژ سەفەرێ بکەم. خودا فەرموویەتی: «قل سيروا في الأرض». تەماشای عەجایب و غەرایبی دونیا بکەم. حوکەما فەرموویانە: «السفر وسيلة الظفر». ئاشکرا مەعلوومە خەنجەر تا لە کالان دەرنەچێت برین ناکات. قەڵەم تا سەری دوو لەت نەبێت خەتی (جەوهەری) نانووسێ. ئاسمان دایم لە سەفەرایە. بە مەرتەبەی بڵندی گەیشتووە. ئەرز لە جێگەی خۆی ثابتە بووە بە جێگەی مار و مێروو. سەفەر نیشانەی دەوڵەتە. خەزینەی بێ ئەمساڵە. دار ئەگەر ئیقتیداری سەفەر کردنی بوایە تووشی بڕین نە ئەهات. نەوازندە وتی: ئەی ڕەفیق تۆ مەشەققەتی سەفەرت نەدیوە عەزیەتی سەفەرت نەکێشاوە. نەتبیستووە (الغربة كربة) و (الفرقة حرقة). سەفەر دارێکە بەری تاڵ ئەدات. سەفەر هەورێکە بارانی زەلیلی ئەبارێنێت. ڕەفیقی چاک بە خەیاڵی سەفەر ئەکەیت.

بازندە وتی: ئەگەرچی سەفەر بۆنی ناخۆشی لێ دێت، ئەمما سەیر کردنی مەملەکەتان و تەجرەبەی ڕەفیقان و خوێراتی زەمان مەعلووم ئەکات. سەفەر گوڵێکە لەناو دڕکی تیژ

دێته دەرەوە. عەتری گوڵ بە ئاسانی دەست ناکەوێت.

نەوازندە وتی: ئەی ڕەفیق مەعلومە سەفەر وەک باغی ئیرەم وایە ئەمما بە تەنهایی سەفەر دروست نییە. ئەگەر دوو ڕەفیق بە ئارەزووی یەک سەفەر بکەن بێ ئەمسالە. وە هەتا ئێستا هەردوکمان بە خۆشیی یەک ژیاوین، چۆن مەراقی ڕەفاقەت و غەمی غەریبی بۆت مومکین ئەبێ. ڕجا ئەکەم لەسەر خەیاڵی سەفەر لاچۆ، باعیسی دووریی تەرەفەین ئیختیار مەکە.

بازندە وتی: ئەی ڕەفیق قسەی مەراق و خەفەتی ڕەفاقەت مەکە. ئەگەر قەدەر لە ڕەفاقەتی تۆی خستم ڕەفیقان زۆرە، ئیتر دەفتەری مەشەققەت هەڵگرە. دڵم بۆ سەفەر گری گرتووە، لازمە سەفەرێ بکەم. سەفەر بەردی مەحەکە. ئاڵتوون بە مەحەک ئەبێ ناناسرێت.

نەوازندە وتی: ئەی ڕەفیق ئێستا تەنافی مەحەبیەت ئەپچڕێنیت، لەگەڵ ڕەفیقی تازە چۆن بۆت ئەبەسترێت. حوکەما وتوویانە: تەرکی ڕەفیقی موافیق کردن باعیسی تکچوونی ئیسراحەتە. ئەوەی شەرت و وەفای ڕەفاقەت بوو بە نەسیحەت عەرزم کردی. ئیختیار بە دەستی خۆتە.

قسەی هەردووکیان لێرە دا تەواو بوو. دوعا خوازییان لەیەک کرد. بازندە لە شەققەی باڵی دا، ڕۆیشت. نەوازندە لە هێلانەکە بە تەنها مایەوە.

وەقتێ بازندە ڕووی کردە سەحرا میقدارێ ڕێگە ڕۆیشت، لە دوور شاخێکی بەدی کرد، ڕووی کردە شاخەکە. لە دامێنی شاخەکە باغێ دیار بوو، ڕووی کردە ناو باغەکە، گوڵی تازە پشکووتبوو، میوەی بە دارەوە شۆڕ بووبوو. ئەو شەوە لە ناو ئەو باغە دا بە کەیف ڕایبوارد. بۆ سوبحەینێ هەڵفڕی، ڕووی کردە سەحرا. میقداری نیو سەعات ڕێگە ڕۆیشت، هەور و تریشقە بەری ئاسمانی گرت. لە بریسکەی بەرەق و لە دەنگی ڕەعد شێر خۆی ئەخستە کونەوە. لە ناکاو تەرزە و باران دای بە یەکدا. دنیا وەک تۆفانی نووح کەوتە سەر ئاو. گەڵا بە دارەوە نەما، عوموموم تەرزە وەراندی. بازندە لەو وەقتە دا جێگە نەبوو خۆی تیا بشارێتەوە. لەبن گەڵای دار هەر ئەوع بوو خۆی شاردەوە. ئەو شەوە بە نیوە مردوویی هەتا ڕۆژ لە سەرما ئەلەرزا. فکری قسەی ڕەفیقی ئەکردەوە. زۆر پەشیمانیی حاسڵ کرد. وەقتێ ڕۆژ هەڵهات پەڕو باڵی وشک بۆوە . بە فکری گەڕانەوە هەڵفڕی. لە ئەسنای فڕینا واشەیەکی تیژباڵ بۆی هاتە خوارەوە. بازندە لە ترسی ڕۆحی

خۆی دا بە ئەردا، نەزری کرد ئەگەر لە دەست ئەو بەلایە نەجاتی بوو تا موددەی حەیاتی ناوی سەفەر نەبات. لە ناکاو بازێ پەیدا بوو تەماشای کرد واشەیەک خەریکە کۆترێک بگرێت. بە فکری لێ سەندنی کۆترەکە لە چنگ واشەکە بسێنێت هاتە خوارەوە. واشە قووەتی بازی نەبوو، هەردووکیان بە گژ یەکا چوون. کۆتر فرسەتی زانی خۆی کرد بەبن درکێکا، لە چنگ هەردوو بەلا نەجاتی بوو. وەقتێ شەوی بە سەراهات چووە بن بەردێک. ئەو شەوە بە برسییەتی ڕۆژی کردەوە. بۆ وەقتێ هەتاو کەوتن لە بن بەردەکە هاتە دەرەوە بە ئەتراقی خۆیدا تەماشای کرد نە باز و نە واشە دیار نەبوون. هەڵفڕی بچێتەوە بۆ لای ڕەفیقەکەی. لە ڕێگە تەماشای کرد کۆترێ نیشتۆتەوە، دانێکی زۆری لە بەردەم ڕژ کراوە. بازندە لە تاو برسێتی هار بووبوو، نیشتەوە، هێشتا دەمی نەگەیشتە دان بە داوەوە بوو. بە زوبانی عیتاب ڕووی کردە کۆترەکە وتی: ئەی ڕەفیق! من و تۆ هەر دوو یەک جینسین، بۆچ نەتوت ئەمە داوی شەیتانە؟ شەرتی وەفای میوانداری ئەمەیە لای تۆ؟ کۆترەکە وتی: ئەی غەریب لە قەزاو قەدەر خۆ لادان مومکین نییە. بازندە وتی: ئەی ڕەفیق نەتوانیت لەم بەلایە نەجاتم بدەیت؟ هەتا مردن تەوقی عەبدایەتی لە مل کەم؟ جوابی دایەوە: ئەی فەقیر ئەگەر حیلەم بزانییایە خۆم لە حەپس نەجات ئەدا، بەو نەوعە تۆ ئەڵێیت باعیسی داوی تەیران نەنەبووم. عەجایب بۆ تۆ کە ماویت. حاڵی تۆ وەک حاڵی بەچکە حوشترەکە وایە، لە ڕێگا هیلاک بووبوو، بانگی دایکی ئەکرد: نەختێ ورد برۆ. دایکی جوابی دایەوە: نابینیت هەوسارەکەم بە دەست غەیرەوەیە. ئەگەر بە دەستی من نەبوو پشتی خۆم لە ژێر بار نەجات ئەدا، تۆیش لە ڕێگە ئیسراحەتت ئەکرد. ئینتیها بازندە ڕێگەی نەجاتی لێ مەعلووم کرا. لە ترسی ڕۆح فرەفرە و پەلە پەلی دەست پێ کرد. ڕۆژی تەواو نەهوبوو. مووی داوەکە پچڕا، لە بەلا نەجاتی بوو، لە ترسی ڕۆح برسێتیی لەفکر چووبووەوە. ڕووی کردە سەحرا، میقدارێ ڕێگە ڕۆیشت، تووشی ئاوەدانییەک بوو. سەوزایی لە قەراغ ئاوەدانییەکە چێنرابوو. دیوارێ بۆ موحافەزەی زەرعەکە دروست کرابوو. بازندە لەسەر دیوارەکە نیشتەوە. کوڕێکی تازە پێگەیشتوو چاوی بە کۆترەکە کەوت. بە خەیاڵی مەزەی کەباب تیری بۆ کۆتر هاویشت، دای لە باڵی کۆتر. کۆتر سەرەو لێژ کەوتە خوارەوە، بیرێ لەبن دیوارەکە کرابوو کەوتە بیرەکەوە. وەقتێ کوڕەکە چووە بن دیوارەکە تەماشای کرد کۆترەکە کەوتۆتە بیرەکەوە. مومکین نەبوو بۆی بچێتە ناو بیرەکەوە. جێی هێشت. بازندە ئەو شەوە بە برسێتی لەناو بیرا مایەوە. بە زەلیلی و مەحزوونی بۆ فیراقی ئەوازندە ئەگریا. وەقتێ ڕۆژ بووەوە هەر ئەوع بوو هاتە سەر بیرەکە.

فرسەتی زانی بە ئاسمانا بلند بۆوە، ئەوستا تا داخلی بە حودوودی هێلانەکەی بوو. وەقتێ ئەوازندە لە دوور چاوی بە بازندە کەوت، چوو بە پیریەوە، میقداری سەعاتێ دەمیان لە ناو دەمی یەک نا. ئەوازندە وتی: ئەی رەفیق! بۆ چی وا زەعیف بوویت؟ بازندە وتی: دەردێکم کێشاوە بە واسیتەی سەفەرەوە شەوێک بە ئیسراحەت بۆت نەگێرمەوە. (الحمد لله) ئەم دەفعەیە بە دیدارت گەیشتمەوە. هەتا بە رۆح زیندوو بم ناوی سەفەر نەبەم. بۆ ئیحتیاجی نەبێت لە هێلانە ئەچمە دەرەوە.

وەزیر وتی: ئەی پادشاە ئەم مسالەم بۆیە بەیان کرد تا خەیالی سەفەر نەکەیت. پادشا وتی: ئەی وەزیری ناسیح.. مەشەققەتی سەفەر زۆرە، ئەمما مەنفەعەتی سەفەر لەحیساب نایەت. مانگ و رۆژ دایم لە سەفەر وەستانیان نییە. ناو بەو رووناکی و جوانییە، مووددەتێ لە جێگەی خۆی مایەوە رەنگی ئەگۆرێت و بۆگەن ئەبێت. ئەگەر بەچکە بازەکە لەگەڵ بێچووی قەلەباچکە بمایە، بە شەرەفی تەربییەتی پادشاە نەئەگەیشت. وەزیر وتی: چۆن بووە؟

### حیکایەتی قەلەباچکە و باز

دابیشلیم فەرمووی: بیستوومە جووتێ باز لەسەر شاخێ هێلانەیان دروست کردبوو. سیمرغ قووەتی فرینی ئەو جێگەیان نەبووبوو. وەقتێ بەچکەیان هەڵهێنا هەردووکیان بۆ پەیدا کردنی خواردنی بەچکەکە فرین. درەنگیان پێ چوو، ئەهاتنەوە بێچووەکە سەری لە هێلانە هێنایە دەرەوە، بۆ سەر و خوار تەماشای ئەکرد. لە ناکاو کەوتە خوارەوە. قەلەباچکەیەک بۆ خواردن ئەگەرا، تەماشای کرد پارچە گۆشتێ لەسەر شاخەکەوە هاتە خوارەوە، وای زانی مشکە لە دەنووکی قەل بەرەڵا بووە. قەلەباچکە چوو بە ئاسمانا، بەچکە بازەکەی گرتەوە، بە دڵێکی خۆش بردی لە بەردەم بێچووەکانی دانا. وەقتێ کە ورد بووەوە تەماشای کرد دەنووک و نینۆکی پێی هەیە. بۆی مەعلووم کرا لە جینسی باڵدارەو شکارییە. رەحمی پێ کرد. فکری کرد: خودا منی کردووە بە باعیثی رۆحی ئەم تەیرە. وا چاکە لەگەڵ بێچووەکانی خۆم فەرقی نەکەم، بە ئەولادی خۆمی قوبووڵ بکەم. نیهایەت وەک بێچووەکانی پەروەردەی کرد. بۆ خواردن لەگەڵ بێچووەکانی فەرقی نەبوو. وەقتێ نزیک باڵە فرە بوون، بەچکەی بازەکە فکری کرد: ئەگەر من برای ئەمانەم، بۆ چ سوورەتمان وەک یەک نییە؟ وە ئەگەر من لەم تایفە نیم، پەروەردەم بۆچ ئەکەن؟ نە خۆم لە ئەسلی ئەمان ئەزانم و، نە خۆم بە بێگانە حیساب ئەکەم. بەو خەیاڵەوە زۆر عاجز بوو.

ڕۆژێ قەلەباچکە بە بەچکەی بازەکەی وت: باعیسی دڵتەنگیت چییە، بەیانی بکە هەتا دەرمانی بۆ پەیدا بکەم. بەچکە باز وتی: زۆر عاجزم. بەیان کردنی مومکین نییە. مەسڵەحەت ئەوەیە ئیزنم بدەیت دوو سێ ڕۆژ بە ئەتڕافی ئەم کێوە دا بگەڕێم، مومکینە دڵم فەرەحی تێ کەوێت. قەلەباچکە بە عەقڵی بۆی مەعلووم بوو لەسەر چ فکرێکە. ڕووی کردە بازەکە وتی: ئەی ڕۆحی شیرینم ئەم قسەی کردت جارێکی کە مەیکە. حوکەما وتوویانە: سەفەر بۆنی جەهەنەم ئەدات. ئامان خۆت تووشی عەزاب نەکەیت. دوو تایفە ئیختیاری سەفەر ئەکەن. ئەوەڵ بۆ مەعیشەت پەیدا کردن. دووەم لە ترسی خەتا فیرار کردن. (الحمد لله) تۆ لەو دوو تایفە نیت. نە ترس و نە برسییەتی ئەزانی. سەفەر کردنت باعیث بە چییە. باز وتی: ئەوەی بەیانت کرد ڕاستە، ئەمما هەر چەند خەیاڵ ئەکەم ئێرە بە جێگەی خۆم نازانم. ئیرادەی سەفەرم هەیە. قەلەباچکە وتی: ئەوەی من بەیانی ئەکەم، نەسیحەتی خێرە. ئەمما قسەی تۆ دەلالەت لە حیرس و تەمەع ئەکات. ئینسانی تەمەعکار موفلیس و سەرگەردانە. ئەترسم ئەوەت بەسەر بێت بەسەر پشیلەی پیرێژنەکە هات. باز وتی: چۆنە ئەو مەسئەلە؟

### حیکایەتی پشیلەی پیرێژن

قەلەباچکە وتی: ئەگێڕنەوە پیرێژنێ بوو لە خانوێکی تاریک بە فەقیری ئیدارەی ئەکرد. لەبەر تەنهایی ئولفەتی لەگەڵ پشیلەیەک گرتبوو. ئەو پشیلەیە لە عومری خۆی نە بۆنی تەعام و نە لەزەتی گۆشتی دیبوو. ئیدارەی ئەوە بوو حەفتەی جارێ وەیا دوو جار مشکێکی ئەگرت. هەموو خۆشیی پشیلەکە لەوە زیاتر نەبوو. تەسادوف ڕۆژێ بۆ تەماشا کردن سەرکەوتە سەربان. لە دوور پشیلەیەک دەرکەوت. ئەو پشیلەیە، بە تەکەببور، سەعاتێ هەنگاوێکی ئەنا. نزیک بە پشیلەی پیرێژن بوو. وەقتێ پشیلەی پیرێژن ئەو پشیلەی بەو ئەوعە چاو پێکەوت، بە زوبانی خۆیان بانگی کرد: ئەی ڕەفیق! تەشریفت لە کوێوە دێت؟ ئەم شەوقەت لە کوێ پەیدا کردووە؟ جوابی دایەوە: خواردنی من لەسەر سینی پادشایە. هەموو ڕۆژ ئەوەندە پلاو و تاسکەبابی و گۆشتی سوورەوە کراوە ئەخۆم وە هەتا یەک حەفتە ئیشتیهام خواردن نابات. پشیلەی پیرەژن وتی: پلاو و تاسکەبابی و گۆشتی سوورەوە کراو چۆنە، لەزەتی چییە؟ من لە عومری خۆم لە مشکی خانووی پیرێژن زیاتر هیچم نەدیوە.

پشیلەکە جوابی دایەوە: حەیفە تۆ خۆت بە جینسی من حیساب کەیت. تۆ لە جینسی

جالجالۆکە و قرژاڵ نەکەیت. نابینیت وەک مردوو لە قەبر هاتوویتە دەرەوە؟ ئەگەر بۆنی پاقلاوە و کولیچە بێت بە لووتتا مومکینە لە غەیبەوە بانگ بکرێت (یحیی العظام وهي رمیم) زیندوو بیتەوە. پشیلەی پیرێژن بە گریان وتی: ئەی ڕەفیق، حەقی جینسییەت و دراوسێتیم بەسەرتەوە هەیە. کەسێ موعاوەنەتی زەعیفێ بکات خودا موعاوەنەتی ئەکات. هیممەت بفەرموویت بەڵکی بە واسیتەی جەنابتەوە ببووژێمەوە. پشیلەکە ڕەحمی پێ کرد، وتی: شەرتە ئەم دەفعەیە بێ تۆ داخڵ بە سەر سینی نەبم. وەقتێ نان خواردن خەبەرت ئەدەمێ بە یەکەوە ئەچین بۆ ماڵی پادشاه. پشیلەی پیرێژن بەو وەعدەیە دڵ خۆش بوو. لە سەر بان چووە خوارەوە لای پیرێژن ئەوەڵ تا ئاخر قسەی بۆ پیرێژن گێڕایەوە. پیرێژن لە ڕووی نەسیحەتەوە وتی: ئەی فەقیر بە قسەی ئەهلی دنیا مەغروور مەبە. پێت لە دائیرەی قەناعەت نەکەیتە دەرەوە. چاوی ئەهلی تەمەع بە خاکی قەبر نەبێت پڕ نابێ. چاوی تەمەعکار بە سووژنی مردن نەبێ نادوورێتەوە. ئەو نەسیحەتانەی پیرێژن تەئسیری لە پشیلە نەکرد. بە خەیاڵی گۆشت خواردن ڕووی کردەوە بۆ لای پشیلەکە. وەقتێ هەردوو پشیلەکە ڕوویان کرد بۆ ماڵی پادشاه، مەشهوورە (الحريص محروم) ئەو بێ بەختە ئاوی مەحروومی بە ئاگری خەیاڵیا کرابوو. سەبەب ئەوە بوو چێشتکەری پادشا لە دەست پشیلە شکاتیان کردبوو، ئەمر درابوو تیرانداز لە هەموو لایەکەوە بۆ کوشتنی پشیلە حازر بووبوون. پشیلەی پیرێژن لەو مەسئەلە بێ خەبەر بوو، لەگەڵ بۆنی تەماعی کرد وەک سەگی برسی چووە پێشەوە. هێشتا دەمی بە گۆشت نەگەیشت شریخە لە کەوان هات. تیرێ دای لەسەر سنگی، لەترسی ڕۆح فیراری کرد، وتی: گەر ئەجاتم ببێ لە دەست ئەم تیرە، من و مشکی خانووی داپیرە. بە گریان ڕۆیشتەوە بۆ خزمەت پیرێژن..

قەلەباچکە وتی: هێنانەوەی ئەم میسالەم بۆ ئەوەیە بەم بەشە شوکر بیت. ناشوکری لەسەر نیعمەت کوفرە. باز وتی: ئەوەی بەیانت کرد عومومی نەسیحەتە و ڕێگەی مەرحەمەتە، ئەمما خواردن و خواردنەوە بۆ حەیوان هاتووە، وە هەر کەس ئارەزووی مەرتەبەی بڵندی بکات لە سارد و گەرمیی زەمان خۆف ناکات وە بە جێگەی بەر حوکم ڕازی نابێ وە ڕێگەی بەرز بە ڕەحەتی مومکین نابێ. قەلەباچکە وتی: ئەم خەیاڵە لەسەری تۆ دایە مومکین نابێ وە هەر کەس ئارەزووی حوکمداریی بوو بەبێ لەشکر بۆی مومکین نابێ. باز وتی: تیژیی دەنووک و نینۆکم هەیە، موحتاج بە لەشکر نیم. مەگەر حیکایەتی پیاوە ڕەشیدەکەت نەبیستووە بە قووەتی شمشێر لەسەر تەختی سەڵتەنەت دانیشت؟ قەلەباچکە وتی: چۆن بووە؟

باز وتی: ئەگێڕنەوە پیاوێکی فەقیر حاڵ هەتا نانی پەیدا نەکرد لیباسی نەبوو. هەتا لیباسی پەیدا نەکرد نزیک بە مردن ئەبوو. لە دەرەجەی موحتاجیدا ئیدارەی نەکرد. چەند ساڵ عومری تاڵی ڕابوارد. ئینتیها خودا ڕەحمی پێ کرد ئەولادێکی نێرینەی پێ عەتا فەرموو نیشانەی ڕوستەمی لەناوچەوانیا شوعلەی ئەدا. بە واسیتەی قودوومی کوڕەکەوە دەرگای ڕەحمەتی بۆ کرایەوە، ڕۆژ بە ڕۆژ دەوڵەتیان لە زیادی بوو. کوڕەکە عومری گەیشتە هەشت ساڵ، نرایە مەکتەب. موعەللیم ئەیوت: بڵێ ئەلف، کوڕەکە ئەیوت: تیر. موعەللیم ئەیوت: بڵێ تێ، کوڕەکە ئەیوت: شمشێر. نیهایەت سەری زوبان و بنی زوبانی تیر و شیر بوو. وەقتێ بلووغ بوو، باوکی وتی: ئەی کوڕم فکرم هەیە هەتا ماوم ژنت بۆ بێنم چونکی نەفس و شەیتان ڕێگەی خراپە نیشان ئەدا. لەپێش ئەوەی عیشق غەڵەبە بێنێت ژن هێنان باعیسی خێرە. بە واسیتەی ماڵ و ژنەوە ئینسان لە گوناە دوور ئەبێت. کوڕەکە وتی: ژنێ خۆم ئارەزووی بکەم مەشەققەت نانێمە بەر جەنابت. باوکی وتی: ئەو ژنەی ئارەزووی تۆی لەسەرە، نیشانم بدە لێم مەعلووم بێ کێیە. کوڕەکە چووە ژوورەوە شمشێری هێنایە دەرەوە. وتی: بابە ئەم شمشێرە لە گۆنەی دەسگیران جوانترە. لە دانی مار تیژ ترە. بە قووەتی ئەم شمشێرە کچی پادشاە داگیر ئەکەم وەقتێ بەخت موساعەدە بکات. مارەیی کچی پادشاە شمشێرە. نیهایەت بەو فکرەوە ڕۆژێ ڕووی کرد بۆ باغی پادشاە. کچی پادشای بە زۆر ڕاکێشاو بە مەقصەدی خۆی گەیشت.

باز وتی: ئەم میسالەم بۆیە هێنایەوە لێت مەعلووم بێ دەست لەم خەیاڵە هەڵناگرم تا بە مەقصەدی خۆم ئەگەم. قەلەباچکە بۆی مەعلووم کرا ئیش چییە. ناعیلاج ئیزنی دا. دوعا خوازییان لە یەک کرد. باز میقدارێ فڕی. تا هیلاک بوو، لەسەر شاخێ نیشتەوە. تەماشای کرد کەوێک بە لەنجەولار و قاسپە قاسپ نزیک بە باز بۆوە. باز پەلاماری دا گرتی، لەگۆشتی سنگی تێر بوو (ولحم طیر مما یشتهون). تەسکینی بە دڵی دا، وتی: (الحمد لله) خودا ڕەحمی پێ کردم لە جێگەی نا ئەسڵ نەجاتم بوو. ئەمە ئەووەڵ سەفەرە. ئومێد دەکەم هەتا بێت ڕوو لە خێر بێ. چەند ڕۆژێ بە گرتنی کەو و سوێسکە ڕایبوارد. ڕۆژێ تەماشای کرد باز لە دامێنی شاخەکەوە میقدارێ سوار بەڕاو خەریک بوون. لە ئاسمان باز بۆ گرتنی تەیرو، تووڵە و تانجی لە شاخەکە بڵاو بووبوونەوە. پادشای ئەو ویلایەتە بوو زۆر ئارەزووی ڕاوی ئەکرد. بازێ بە دەست پادشاوە بوو، قەسدی تەیرێکی

کرد، بازەکەی لای قەلەباچکە پێشدەستیی بازی پادشای کرد، تەیرەکەی لە چنگ دەرهێنا. وەقتێ پادشاه تەماشای قووەتی ئەو بازەی کرد، ئارەزووی گرتنی کرد. ئەمری بە ئومەرا دا لە هەموو لایەکەوە داویان بۆ باز نایەوە. عاقیبەت بازەکەیان گرت، هێنایان بۆ خزمەت پادشاه، بە دەستی خۆی پەروەردەی ئەکرد. لای پادشاه بە پەسەندی مەشهوور بوو. بە واسیتەی سەفەرەوە لە ڕەفاقەتی قەلەباچکە ئەجاتی بوو، بە ڕەفاقەتی پادشاه گەیشت. ئەم میسالەم بۆیە هێنایەوە مەنفەعەتی سەفەر لە حیساب نایەت. خودا فەرموویەتی: «فامشوا في مناكبها».

دابیشلیم ڕووی کردە وەزیری بچووک، وتی: بۆ مەسئەلەی سەفەر قسەی تۆ چییە؟ وەزیری بچووک ڕەسمی تەعظیمی بە جێهێنا، وتی: ئەی پادشاه عەزیەتی سەفەر وە ڕەزالەتی غوربەت لایقی نەفسی پادشاه نییە. لەبەر ئەوە پادشاه سێبەری سەری میللەتە و پاسەوانی ڕەعیەتە. ئەگەر پادشا نەبێت میللەت بە قەتل و قیتالی یەک خەریک ئەبن. بە موددەتێکی کەم مەملەکەت بە چۆڵی ئەمێنێت. سەفەر بۆ نەفسی پادشاه زۆر خەتەرە. پادشا وتی: ئەی وەزیر ترس بۆ ژن هاتووە، سام و ترسانن ئیشی شێرانە. مەعلوومە هەتا پادشاهان خۆیان ئەنێنە دەرکستانەوە ڕەعیەت گۆڵی ئیسراحەت ناکەنەوە و فەقیران سەرناکەنە سەر سەرینی ئیسراحەت. ئێوە بزانن فەرقی پادشاه و ڕەعیەت دوو شەرتە. هەرچی پادشایە تەخت و سەڵتەنەت و ئەمری پێ عەتا کراوە، هەرچی میللەتە ئیسراحەت و موطیع و بەرحوکمی پێ دراوە. پادشاه و میللەت هەردوکیان تالیبی ئیسراحەت بن نە حوکمی پادشاه و نە ڕەحەتیی میللەت باقی ئەمێنێت. ئەگەر پادشاه ئارەزووی ئیسراحەت و خواردنی کرد میللەت زوو مەحو ئەبێتەوە. قەولی حوکەمایە: سەعی کردن بۆ پادشاهان باعیث بە تورەقیی میللەتە. ئینسان فکری ئیشی کرد هەتا بۆی ئەچێت دەستی ناکەوێت. مەسڵەحەت ئەوەیە بە پێی خۆم بۆ ڕێگەی خێر حەرەکەت بکەم، وەک پڵنگەکە ئارەزووی جێگەی خۆی کرد بە سەعیێکی زۆر دەستی کەوت. وەزیرەکان وتیان چۆن بووە؟

**حیکایەت**

دابیشلیم فەرمووی: ئەگێڕنەوە لە ئەترافی بەسرە جەزیرەیەک بوو دڵگیر و هەوا خۆش، بە هەموو ئەترافیا ئاو ئەڕۆیشت، دارستانی بۆ ئاسمان بڵند بووبوو. لەخۆشیی جەزیرەکە ناو نرابوو (فەرەح ئەفزا). ئەو جەزیرەیە پڵنگێ هێلانەی تیا دروست کردبوو، شێری توند

تەبیعەت موقابەلەی لەگەڵ ئەو پڵنگە بۆ نەئەکرا. درندە قودرەتی داخڵ بوونی ئەو جەزیرەیان نەبوو. ئەو پڵنگە بێچوێکی بوو، ئارەزووی ئەکرد لە جێگەی خۆی داینێت، مەرگ موهڵەتی نەدا (اذا جاء أجلهم لا یستأخرون ساعة ولا یستقدمون). پڵنگەکە مرد. ئەمما چەند ساڵ بوو درندە ئارەزووی ئەو بێشەیان ئەکرد. وەقتێ بۆیان مەعلووم بوو پڵنگ مردووە بە یەک دەفعە هوجوومیان کردە جەزیرەکەوە. بێچوە پڵنگەکە موقابەلەی پێ نەئەکرا، فیراری کرد. ئەو درندانە شێریان بە پادشای خۆیان قوبووڵ کرد. بە ئیسراحەت لە ناو جەزیرەکە دا رایان ئەبوارد. ئەمما وەقتێ بێچوە پڵنگەکە رووی کردە سەحرا تەرکی وەتەنی کرد، رێگەی کەوتە جەزیرەیەک، لەگەڵ درندەی ئەوجەزیرەیە رەفاقەتی گرت. دەردی خۆی بۆ درندەکان گێرایەوە، تەڵەبی ئیمدادی کرد، ئەوانیش وتیان ئیمە قووەتی شەرکردنمان نییە، ئێستا جەزیرەی فەرەح ئەفزا بە دەست درندەوەیە، پادشاهێکیان هەیە زۆر بە قووەت، تەیر قودرەتی فڕینی نییە بەسەر فەرەح ئەفزادا بفڕێ. ئێمە چۆن ئەتوانین موقابەلەی شێر بکەین، وە بەرگەی حەملەی شێر ناگرین، وە ئەگەر تۆ فکری وەتەن ئەکەیت مەسڵەحەت ئەوەیە بچیت بە دڵێکی ساف خزمەتی شێر ئیختیار بکەیت. پڵنگ لەبەر ئەوە (حب الوطن من الایمان) چۆوە بۆ جێگەی خۆی. وەقتێ نزیک بەجەزیرە بۆوە لەگەڵ یەکێ لە خزمەتکاران بە خزمەت شێر گەیشت. شەرتی ئەدەبی بەجێ هێنا. بە دڵێکی ساف خزمەتی شێری ئەکرد. حورمەتی لای شێر رۆژ بە رۆژ لە زیادی بوو، مەرتەبە بە مەرتەبە گەورە بوو هەتا بوو بە وەزیر. ئینتیها رۆژێ واقیعاتێ لە ئەترافی جەزیرەکە رووی دا. لەو وەقتە دا دنیا زۆر گەرم بوو. لە گەرمیی رۆژ دنیا سوور بووبووەوە. تەیر قودرەتی فڕینی نەبوو. لەبەر گەرمی شێر کەوتە مەراقەوە. لەو وەقتە دا پڵنگ داخڵ بە خزمەتی شێر بوو، لەگەڵ تەماشای کرد شێر عاجزە، رووی کردە شێر عەرزی کرد: جەنابت بەر قەرار بێت، واسیتەی دڵتەنگیت چییە؟ شێر قسەی بۆ پڵنگ کرد. پڵنگ لە مەسئەلە حاڵی بوو، وتی: ئەگەر ئەمری عالیی لەسەر بێ بەندە ئەم خزمەتە بەجێ دێنم. شێر روخسەتی دا، لەگەڵ میقداری درندە پڵنگ رۆیشت. وەقتێ ئیشەکەی بەجێ هێنا، ئانەن لەگەڵ درندەکان گەڕایەوە. یەکێ لە درندەکان رووی کردە پڵنگ، وتی: وەقت گەرمە، سەعاتێ سەبر بگریت هەتا فێنک ئەکات، ئەو وەقتە حەرەکەت کردن مەسڵەحەتە. ئەلحەمدو لیللا ئیشەکە بەجێ هێنراو بەمەرامی جەنابت دروست بوو، عەجەلە کردن بۆ چییە؟ بچین لە ژێر سێبەری ئەو دارانە ئیسراحەت بکەین و ئەختێ ئاوی سارد ئەخۆینەوە بۆ فێنکی عەسر حەرەکەت بکەین زۆر موناسبە. پڵنگ جوابی دایەوە: رۆح فیدایی من لە

پادشا مەعلومە. شەرتی وەفا نییە من ئیسراحەت بکەم و پادشاە بە مەراقەوە بتلێتەوە. ئیسراحەتی ئێمە باعیسی مەراق زیاد کردنی پادشایە. هەتا زوو بەخزمەت پادشا بگەین چاکە. وەقتێ حەرەکەتیان کرد و داخل بە خزمەت پادشاە بوون، قسەی پڵنگ یەکە یەکە عەرزی شێر کرا. شێر ئافەرینی لە پڵنگ کرد. وتی: ڕەحەتی دەست یەکێ ئەکەوێت نارەحەتیی وەلی نیعمەتی بەلاوە گران بێت. ئێستا مەعلوومە پڵنگ ساحێب وەفایە، لایقی پادشاییی فەرەح ئەفزایە. لەسەر ئەمری شێر پڵنگ کرایەوە بە پادشای فەرەح ئەفزاو، بێشەکە تەسلیم بە پڵنگ کرایەوەو لە جێگەی شێر بە حوکمرانی دانیشت.

دابیشلیم وتی: هێنانە دیی ئەم میسالەم بۆ ئەوە بوو ئێوە بۆتان مەعلووم بێت دەست کەوتنی مەتڵەب بەبێ زەحمەت مومکین نابێ. مەعلوومە ڕۆژ لە مەشریق هەڵدێت و لە مەغریب ئاوا ئەبێت. ئەگەر یەک سەعات ئیسراحەت بکات غولغولە ئەکەوێتە ناو مەخلووقەوە. وە کەس لە سەفەر نائومێد نەبووە خوسووس ئەم سەفەرە بۆ من واسیتەی ڕێگەی عەدالەتە و بۆ دەستکەوتنی عیلمێکە باعیسی ئیسراحەتە بۆ میللەت (ان ذلك من عـزم الأمـور). وزەرا بۆیان مـەعلووم کـرا مـومـانەعـەتی پادشـا مـومکین نابێت. موبارەکبادییان کرد، وە لەسەر ئەمری وزەرا ئەسبابی سەفەر دروست کرا.

پادشا کـەوتـە بەحری فکرەوە بۆ خـوسـووسی یەکـێکی ئەمین لـە جـێگەی پادشـاە بە حوکمداری دانێ. بە ئەمری پادشاە مەجلیس گیرا. بە ئیتتیفاقی ئومەرا، وزەرا و میللەت یەکێکیان لە جێگەی پادشاە تەعیین کرد. پادشاە ڕووی کردە وەکیلەکە فەرمووی: من ئیرادەی سەرەندیب ئەکەم، بۆ تۆ لازمە خەوی ئیسراحەت لە خۆت حەرام بکەیت. ڕێگەی عەدالەت بگریتە پێش. حەقی مەزڵوومان لە زاڵم بسێنی بە ئەمری شەریعەت حوکم بکەیت و، لە قانوونی عەدالەت ئەچیتە دەرەوەو، ئارەزووی ڕەحەتیی میللەت بکەیت و، دەستی تەعەددا درێژ نەکەیت. بۆت مەعلووم بێ هەناسەیەک دونیا ژێر و ژوور ئەکات. وە بەتەخت و سەڵتەنەت مەغروور نەبیت. ئەم ڕۆحە لای بەنی ئادەم ئەمانەتە، بە وەعدەی چەند ڕۆژێ لە بەدەن دەرئەچێت. وە ڕجا ئەکەم ئەم وەسیەتانە فەرامۆش نەکەیت. لەپاشا هاتە دەرەوە، بە پێش دەمی لەشکرا هاتوو چووی دەست پێ کرد و میقداری ئەسیحەتی ئەوانی کرد. دوعا خوازیی لە میللەت کرد، لەگەڵ میقداری لەشکر لە مەملەکەت چوونە دەرەوە، ڕوویان کرد بۆ ڕێگەی سەرەندیب. بەحر و بەڕیان بڕی، وە لە گەرمی و هیلاکیی ڕێگە گەیشتن. ئینتیها داخل بە حوودوودی سەرەندیب بوون. وەقتێ نزیک بە شاری سەرەندیب بوونەوە، ڕووی پادشا وەک گوڵی هەنارسوور

هەڵگەڕاو حەمدو سەنای خودای بەجێ هێنا. وەقتێ داخڵ بە شاری سەرەندیب بوون، دوو سێ ڕۆژ بۆ ئیسراحەت لە شارەکەدا بە گەڕان خەریک بوون، باری فەزڵەو ئەو میقدارە لەشکرە لە شارەکەدا دانرا، وە پادشاه و هەردوو وەزیر و کاتب ڕوویان کرد بۆ سەر شاخەکە. وەقتێ داخڵ بە سەر شاخ بوون بە تەماشا کردن خەریک بوون. غارێکی تاریک دەرکەوت، پادشا بۆی مەعلووم بوو جێگەی حەکیمی ساحێب تەدبیرە، ناوی (بیدبای برەهمەن)ە. بە هیندی (پیل پای) ناو ئەبرا. ئەو حەکیمە لە عەقڵ و قسەکردندا بێ ئەمسال بوو دەستی لە دنیا هەڵگرتبوو، شەو و ڕۆژ بە عیبادەت مەشغووڵ بوو. دابیشلیم میقدارێ لە بەر غارەکە دا وێستا. حەکیمی دڵ ڕووناک هاتە بەردەم غارەکە، بانگی کرد: «أدخلوها بسلام امنین». پادشاه بە سوورەتی شاهانە چووە ژوورەوە، ڕەسمی تەعزیمی بەجێ هێنا، سەلامی لەحەکیم کرد. حەکیم جوابی دایەوە. وەقتێ پادشا تەماشای حەکیمی بەهێمنی کرد، لە سوورەتی تەحەییور ما. بە سوورەت بەنی ئادەم بوو، بە سیفەت وەک مەلائیکە بوو. حەکیم بە عەقڵ بۆی مەعلووم بوو پادشاه بۆ سوئال چووە. فەرمووی: دانیشە، بەیان بفەرموو واسیتەی زەحمەت کێشانت چییە؟ دابیشلیم بینینی خەوەکە و دۆزینەوەی خەزێنەکەی و وەسیەت نامەی هۆشەنگ شای، ئەووەڵ تا ئاخر، بۆ حەکیم بەیان کرد. حەکیم بەزەردەخەنەوە وتی: ئافەرین بۆ غیرەت و عەدالەتت. موەففەقییەتت بۆ ڕەحەتیی میللەت ئەوەندە ڕێگەی زەحمەتت کێشاوە. ئینشائڵلا ناوی چاکەت گوم نابێ. لە وەقتی سوئال و جواب پادشاه وەسیەتەکانی هۆشەنگ شای بۆ حەکیم یەکە یەکە گێڕایەوە. حەکیم عوموومی حیفز کرد، وە ئێمەش سوئال و جوابی دابیشلیم و برەهمەنی حەکیم بەناوی (گەلاوێژی کوردستان)ەوە، بە چواردە نەسیحەت بەیان ئەکەین و، نەسیحەتێ لە ئاخری چواردە نەسیحەتەکان بە ناوی (تەوەددود)ی جاریە لە زەمانی خەلیفە هاروونوڕڕەشید، عومووی مەسئەلەی شەرعییە و ئەدەبییە، بەیانی ئەکەین. هیدایەت لە خودا تەمەننا ئەکەم.

### نەسیحەتی ئەووەڵ

باوەڕ نەکردن بە قسەی حەسوود و دوو زوویان

دابیشلیم فەرمووی: مەعنای وەسیەتی ئەووەڵ نەڵێت مەئموور لە پادشا نزیک بوو حورمەتی لازمە وە بەقسەی فیتنە مەئموور عەزڵ نەکەیت، وە عەزڵ کردنیان باعیس بە وێرانیی مەملەکەتە، وە پەرێشانیی میللەتە. ڕێگەی چۆنە؟ وەخوسووس کەسێ بە ڕوتبە

گەیشت، وە حەسوودان ئارەزوو بکەن ئەو مەئمووره عەزڵ بکرێت، چۆن دڵی پادشا لەو مەئمووره وەرئەگێرن. وە تەدبیری، پادشاه فەرق بە قسەی درۆ بکات، وە بە زوبانی لووسی حەسوود باوەر نەکات؟ داوای دەرمانی لە حەکیمی ساحێب تەدبیر ئەکەم.

حەکیم جوابی دایەوە، وتی: ئەساسی پادشاهی لەسەر ئەم نەسیحەتە ئەمێنێت. لازمە پادشاه ئەهلی فیتنە لە مەجلیس دەرکات، وە لە مەملەکەت دووری خاتەوە، وەمەنعی غەیبەت کردنی ئومەرا بکات. ئەگەر پادشاه بە قسەی فیتنە مەئمووری عەزڵ کرد، باعیسی تێکچوونی سەڵتەنەتە. وەلازمە بۆ پادشاهان ئاگری قەهری بەقسەی فیتنە هەڵنەگیرسێنن (والفتنة أشد من القتل). وە ئەگەر ڕێگەی فیتنە کرایەوە بۆ حوزووری پادشا، وەک مەسەلەی شێر و گاکە ئەبێت. دابیشلیم فەرمووی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

برەهمەن فەرمووی ئەگێرنەوە بازرگانێ بوو دائیما بە سەفەر کردن خەریک بوو. مەملەکەتانی زۆر دیبوو. سارد و گەرمیی زەمانی تەجرەبە کردبوو. ڕۆژێ نەخۆش کەوت. دەردەکەی هەتا نزیک بە مردن بوو. ئەو بازرگانە سێ ئەولادی نێرینەی بوو. دەستی کرد بە وەسیەت بۆ ئەولادەکانی، وتی: بۆتان مەعلووم بێ یەک دوو ڕۆژ عومرم ماوە. من ئەمرم و، خۆتان و غیرەتتان. ئەی ئەولادم، من تەماشا ئەکەم کەستان تالب بە کەسابەت نین و بە ماڵی دنیا مەغروورن. ئەگەرچی بە بێ مەشەققەت ماڵتان دەست کەوتووە، بە ئیسراف سەرف کردنی حەرامە (كلوا واشربوا ولا تسرفوا). بۆتان مەعلووم بێ ماڵی دنیا سەرمایەیە بۆ دنیا و قیامەت. دەوڵەت سێ خاسیەتی بۆ دنیا هەیە.

ئەووەڵ خۆش ڕابواردن و ئارەزوو شکاندن و موحتاج نەبوون، بە ماڵ مومکین ئەبێت. دووەم مەدح و حورمەت و سڕ پۆشین، بە واسیتەی دەوڵەتەوە دەست ئەکەوێت. سێهەم شۆرەت بەسەر ساحێب ئەسڵدا پەیدا ئەکات و قسەی مەقبووڵ ئەبێ و، چەند کەسانێ بە واسیتەی دەوڵەتی دنیاوە نائیلی ڕەحمەتی خودا بوون. پیاوی عاقڵ بەبێ فائیدە ماڵ سەرف ناکەن. (نعم المال الصالح للرجل الصالح). زۆر کەس هەیە بە واسیتەی ماڵی زۆرەوە بە پادشاهان نزیک بوون. ئەی ئەولادم ئێوە بزانن حەوزێک پڕ بێ لە ئاو و ئاوی نەیەتە سەر، کەم کەم ئاوی لێ بەرن بە موددەتێ وشک ئەبێ. بەحرێ ئاوی نەیەتە سەر تۆزێ وشکایی سەر دێنێتە دەر. ئەی ئەولادم، وەک من بە تیجارەت و سەفەر خەریک بووم ئێوەش وەک من سەعی بکەن. نەڵێن باوکمان پیر بووە، عەقڵی نەماوە. بۆ

پاشەرۆژتان جەرگم سووتاوە. کورە گەورەیان وتی: ئەی بابە، ئەوەی تۆ ئەفەرموویت بێ تەوەککولییە. بەنی ئادەم هەتا ژینی لە دنیا مابێ رزقی لە تەرەف خوداوە بۆ دێت و، رزقێ خودا بۆ ئێمەی رەوانە کردبێ بۆ کەس ناخورێت، وە رزقێ بە نسیب ئێمە نەبوبێت دەستمان ناکەوێت. مادام وایە کەسابەت بکەین و کەسابەت نەکەین وەک یەکە. مەگەر حیکایەتی دوو شازادەکەت نەبیستووە؟ شاهیدی حاڵمانە. یەکێکیان بە بێ مەشەققەت پادشایی و خەزێنەی دەست کەوت، وە یەکێکیان بە واسیتەی پادشاهیەوە بە کوشت چوو.

باوکیان پرسی: چۆن بووە؟ بەیانی بکە.

**حیکایەت**

کورە گەورەیان وتی: لەمەملەکەتی حەڵەب پادشایەک بوو رەعیەت پەروەر، لە عەداڵەت و بە رەحمیدا بێ ئەمسال بوو. ئەو پادشایە دوو کوڕی بوو. کوڕەکان دائیما بە ئیشی خراپە و لەهو و لەعەب خەریک بوون. لەدائیرەی ئینساف چووبوونە دەرەوە. پادشا عاقڵ و دنیا دیدە بوو. خەزێنە و ماڵی لە حیساب دەرچووبوو. لە ترسی مەغروور و بێ عەقڵیی کوڕەکانی بە فکریا هات خەزێنەکەی تەسلیم بە دەست ئەمینداری بکات. لە ئەترافی حەڵەب عابیدێک بوو دایم بە تاعەت کردنی خودا خەریک بوو. پادشاه لەگەڵ ئەو عابیدە زۆر ئاشنا بوون. عابید چووە لای پادشاه بۆ چاو پێکەوتن. پادشا بە مەخفی خەزێنە و ماڵەکەی تەسلیم بەعابید کرد، بۆ پاشە رۆژی کوڕەکان موحافەزەی بکات. لە نیوەی شەو دا خەزێنەکەیان بە مەخفی نەقڵ کردە جێگەی عابید. وەسیەتی بۆ عابید کرد: هەر وەقتێ مناڵەکان موحتاج بوون، وردە وردە تەسلیمیان بکات. بۆ سبحەینێ پادشاه ئەمری کرد خەندەقیان هەڵکەند، رووی کردە کوڕەکان: خەزێنەکەم لەناو ئەو خەندەقە دا شاردووەتەوە، وە ئێوەش ئاگەهداریی ئەحواڵی خۆتان بکەن، وە هەر وەقت موحتاج بوون خەزێنەکە هەڵدەنەوە وردە وردە لێی سەرف بکەن. چەند رۆژێ نەخۆشیی پادشاه تووڵی کێشا. بە ئیرادەی خودا پادشاه و عابیدەکە هەردوکیان بە رۆژێ ئەمری خودایان کرد (انا لله وانا الیه راجعون). وەقتێ لە کفن و تەعزیەی پادشاه بوونەوە، ئەمما بێ خەبەر بوون خەزێنەکە لە ماڵی عابید دفن کراوە، وایان بۆ مەعلووم بووبوو لە خەندەقەکە دا دفن کراوە. کورە گەورەیان لە جێگەی پادشا دانا. عوموومی میللەت موتیعی ئەمری بوون. کورە بچووک بە بێ وەزیفە مایەوە و حورمەتی لای برا گەورە نەبوو. کوڕەکە خەیاڵی کرد وتی: مادەم لە پادشایی و خەزێنە مەحرووم بووم، وا چاکە لە گۆشەیەک بە عیبادەت

خەریک بم. دنیا بێ وەفایە، وەفای تا سەر بۆ کەس نەبوە. مەسڵەحەت ئەوەیە بچم بۆ خزمەت عابیدەکەی ڕەفیقی باوکم، لە خزمەت ئەودا بە عیبادەت مەشغووڵ بم، بۆ ئاخیرەت چاکە. بەو فکرە لە شار چووە دەرەوە. ڕووی کرد بۆ جێگەی عابید. وەقتێ داخڵ بە جێگەی عابید بوو، بۆی مەعلووم کرا عابید مردووە. کوڕەکە لە جێگەی عابید دانیشت، بە عیبادەت کردن خەریک بوو. لە ژێر خانووی عابیدەکەدا جۆگە ئاوێک بوو. ئاوەکە بۆ زەراعەت ئەڕۆیشت. ئاوی جۆگەکە وشک بوو. ڕۆژێ کوڕەکە بە پاک کردنەوەی جۆگەکە خەریک بوو. لەبەر موحتاجیی ئاو فکری کرد ئەگەر ئاوی ئەم جۆگە وشک بێت باقی بوونم لێرە بێ فائیدەیە. وا چاکە جۆگەکە هەڵکەنم هەتا ئەیگەیەنمە ئاو. دەستی کرد بە جۆگە هەڵکەنین هەتا نزیک بە خەزێنەکە بوو. وەقتێ گەیشتە سەر خەزێنە، شوکری خودای کرد. بە قەدەر ئیحتیاجی خۆی سەرفی ئەکرد. ئەمما کوڕە گەورەکەیان بە تەکەببور و ئیسراف بە خەرج کردن خەریک بوو، وە غەمی ڕەعیەت و لەشکری ئەبوو وە برای بچووکی بە فکرا نەئەهات. لە پاش موددەتێک دوشمنی بۆ پەیدا بوو. دوشمنەکە بە لەشکری زۆر و سیلاحەوە هوجوومیان کردە سەر کوڕە پادشاە. کوڕە پادشاە لەشکر و سوپای ڕێکخست وە بە ئومێدی دەرهێنانی خەزنەکە داخڵ بە قەسر بوو. هەر چەند ئەرزی هەڵکەند، بۆ خەزنەکە گەڕا هیچی دەست نەکەوت. کەوتە بەحری مەراقەوە. نا ئومێدیی حاسڵ کرد. لەتاو هوجوومی دوشمن هەر ئەوع بوو لەشکر و سوپای هەڵگرت لە مەملەکەت چووە دەرەوە، بەرامبەر بە دوشمن سەفی ڕاکێشا. وەقتێ دەست کرا بە تیر هاویشتن، لە ناکاو تیرێ لە تەرەف دوشمنەوە هات دای لەسەر دڵی کوڕە پادشاە، دەست بەجێ ئەمری خودای کرد. تەسادوف لە تەرەف لەشکری کوڕە پادشاوە تیرێ ڕۆیشت دای لە سەر دڵی پادشای دوشمن، (ئەویش ئەمری خودای کرد). هەردوو لەشکر بەبێ پادشاە مانەوە. هاوار کەوتە هەردوو لەشکرەوە، نزیک بوو ئاگری فیتنە لە هەردوو تەرەف داگیرسێت. بە تەدبیری وزەرا سوڵحیان کرد و قەراریان دا لە ئەولادی پادشاە یەکێک بکەن بە پادشاە. ئەمر درا مەجلیس تەشکیل بکرێت. بە قەراری مەجلیس قەراریان دا کوڕە بچووکی پادشاە موددەتێکە تەرکی وەتەنی کردووە لە خانووی عابیدێک بە عیبادەت مەشغووڵە. میقدارێ ئەشراف و میقدارێ وزەرا چوونە ماڵی عابیدەکە کوڕەکەیان هێنا لە جێگەی باوکی کردیان بە پادشاە، وە خەزێنەکەیان ئەقڵ کردە خەزنەی پادشاوە. بە واسیتەی تەوەککولەوە خەزێنەی باوکی و جێگەی باوکی دەست کەوتەوە. ئەم مەسئەلەیەم بۆیە هێنایەوە ڕزقێک بە نسیب بووبێت لازم بە سەعی ناکات. پشت بە تەوەککول بەستن

له کەسابەت چاترە.

کوڕەکە ئەم قسەی تەواو کرد. باوکی فەرمووی: ئەوی بەیانت کرد عوموومی ڕاستە. خودا لە قورئانی کەریمدا فەرموویەتی: (لیس للانسان الا ما سعی). نان پەیدا کردن بە سەعی و بە عەزیەت نەبێت، بە دانیشتن و بە تەمەڵی نان پەیدا نابێت. مەگەر قسەی پیاوەکەت نەبیستووە بە چاوپێکەوتنی باز و قەلەڕەشکە تەرکی کەسابەتی کرد؟ کوڕە پرسی: چۆنە، بەیانی بفەرموو.

حکایەت

باوکی وتی: ئەگێڕنەوە دەروێشێ بە دارستانێکدا ڕۆیشت، تەماشای کرد بازێ میقدارێ گۆشتی بە چنگەوە گرتووە بە ئەترافی دارێکدا ئەگەڕێت. دەروێش دیققەتی کرد قەلەڕەشێک بێ پەروباڵ لەهێلانە دا کەوتووە. بازەکە چووە سەر هێلانەکە، ئەختە ئەختە گۆشتەکە ئەپچڕێت، ئەیخاتە دەم قەلەڕەشکەکەوە. دەروێش وتی: سوبحانەڵلا! قەلەڕەشێک بێ پەروباڵ لەم هێلانەیە دا کەوتووە، بێ خواردن نییە. ڕازیقی ڕزق خودایە، چاوی قودرەتی لە هەموو عالەمەوە هەیە. منیش وا چاکە لە گۆشەیەک بە ڕەحەتی دانیشم، ئەوەندە زەحمەتی خۆم نەدەم. فەرموودەی خودایە: «ان الله هو الرزاق ذو القوة المتین». ڕۆیشت لە گۆشەیەک دانیشت، میقداری سێ شەو بە بێ خواردن ئیدارەی کرد، سکی بە پشتیەوە نووسا، قووەتی هەڵسانی نەما، عیبادەتی ئەو سێ ڕۆژەی فەوتا. خودای تەعالا ئیلهامی فەرمووە سەر پێغەمبەری ئەو عەسرە، لەحاڵاتی دەروێشەکەی خەبەردار کرد. فەرمووی بە واسیتەی کەسابەتەوە ڕزق بۆ عەبد ئەنێرم. تەهلیفی دەروێش بکە وەک باز بێت مەنفەعەت بە قەل بگەیەنێت، وەک قەل نەبێت مەنفەعەت لە باز وەرگرێت، لە (الکاسب حبیب الله) بێ بەهرە نەبێت. حوکەما فەرموویانە: ڕزق تەقسیمە، ئەمما ئەسبابی بۆ ڕەوانە کراوە. لە پادشاە هەتا فەقیر بە کەسابەت موحتاجن. بەبێ کەسابەت نان بۆ کەس پەیدا نەبوو نابێت. کوڕی ناوەڕاستیان دەستی کرد بە قسەکردن، وتی: بابە، ئێمە قووەتی تەوەککولی کوللیمان نییە، لازمە کەسابەت بکەین. هەر وەقت دەستمان کرد بە کەسابەت موحتاج ئەبین بە ماڵ و ژن، تەدبیری ئەو وەقتە چییە، بفەرموو. باوکی جوابی دایەوە: ئەی ئەولادم، ماڵ دەست کەوتن ئاسانە، ئاگەهداریی زەحمەتە. ئەگەر کەسێ بوو بە ساحێب ماڵ، لازمە دوو وەزیفە بناسێت: ئەووەڵەن موحافەزەی ماڵەکەی بکات لە دەست دز و جەردە. پیاوی ساحێب ماڵ دوژمنی

زۆرە، وە پارە لای هەموو کەس شیرینە. دووەم لازمە لە سەرمایەکەی سەرف نەکات، وە مەنفەعەتی کەسابەتی هەر چەند بوو بە ئیدارە سەرفی کات. وە ئەگەر بە مەنفەعەتی مالەکە ئیدارەی نەکرد و سەرمایەی خوارد، بە موددەتێکی کەم زەلیل و داماو ئەبێت، هەروەک وتوویانە بەحر ئەگەر ناوی نەهاتە سەر، تۆزی وشکایی سەر دێنێتە دەر. مەگەر حیکایەتی مشکەکەت نەبیستووە بە قەهر و غەمەوە خۆی کوشت؟

کورەکە سوئالی کرد چۆن بووە؟

**حیکایەت**

باوکی وتی: بیستوومە فەلاحێک بوو میقداری گەنمی کردبوە ژوورێکەوە دەرگای عەمارەکەی بە قوڕ بەست ڕۆژێ لازماتی. تەسادوف مشکێ لە ژێر عەمارەکە هاتە دەرەوە. گەنم وردە وردە بە کونەکەدا ئەچوە خوارەوە (وفي السماء رزقكم). تەئسیری لە مشک کرد. مشک زۆر بەو نیعمەتە کەیف خۆش بوو. بە موددەتێکی کەم خەیالی قاروونی و سەلتەنەتی فیرعەونیی کەوتە سەر. میقداری مشکی گەڕەکی جەمع کرد، بەیانی خەزێنەی بۆ کردن. عومومی مشکەکان بوون بە عەبد و بە پادشای خۆیان قەبوول کرد. خزمی دوور و ڕەفیقی کۆن کۆبوونەوە، سوێنیان بە سەری ئەو ئەخوارد. بە خزمەت کردن مەشغوول بوون و بە ڕەسمی خۆیان هەر یەکە لەسەر وەزیفەیەک دانران. دەستیان کرد بە مەدح کردن. وتیان: قوربان، هەتا سەری جەنابت سەلامەت بێ گەنم لە بارین کەم ناکات. هەموو ڕۆژێک هەر چەند گەنم ئەهاتە خوارەوە ئەیانخوارد و غەمی پاشە ڕۆژیان نەبوو. تەسادوف لەو عەسرەدا گرانی پەیدا بوو، فەلاح ئارەزووی فرۆشتنی گەنمەکەی کرد. وەقتێ دەرگای عەماری کردەوە تێفکری گەنمەکە زۆری کەم کردووە. زۆری مەراق خوارد. وای بە مەسلەحەت زانی گەنمەکە نەقل کات. وەقتێ فەلاح نەقلی گەنمەکەی کرد مشکەکان خەبەردار نەبوون. ئەمما مشکێکی زیرەک فەرقی بە تەپە تەپی قاچی فەلاح کرد، لە کونەکە سەرکەوتە سەرێ. بۆی مەعلووم بوو گەنمەکە نەقل کرا. چووە خوارەوە مشکەکانی خەبەردار کرد. مشکەکان هەر یەکە لە کونێکەوە، وەلی نیعمەتی خۆیان جێهێشت. ڕەفیقی خواردن و خزمی درۆ بوون. هەر یەک بۆ لایەک تەفر و توونا بوون. مشکە هەر چەند بەو لاو بەو لای خۆیا تەماشای کرد کەسیانی نەدی. بانگی کرد: سەبەبی چییە لە من تۆراون؟ ڕەنگە سەرخۆش بووم عەزیەتم داون. نیهایەت بە کونەکەدا سەرکەوت، تەماشای کرد ئەسەری گەنم نەماوە. عەمارەکە چۆل کراوە، وتی:

ساحیب عەمار بووم، هەر خۆم پاشا بووم
لەناو رەفیقان رۆستەمی زاڵ بووم
وەفا نەماوە، باعیسی چییە
رەفیقی ئێستا نانی- نانی‌یە

ئەوەندە گریا سەری دا بە ئەرزدا، مێشکی کەوتە خوارەوە مرد. ئەم میسالەم بۆیە هێنایەوە بۆتان مەعلووم بێت حورمەت بە واسیتەی بوونەوەیە. کوڕی بچووکیان هەستا دەستی باوکی ماچ کرد، وتی: بابە، ئینسان دەستی کرد بە کەسابەت و مەنفەعەتی بوو، خەرج کردن چۆن لائیقە؟ باوکی وتی: ئەی ئەولادم دوو ڕێگەی هەیە. ئەووەڵ ئیسراف حەرامە، بەو نەوعە سەرفی نەکات تەعنەی خەڵق بهێنێتە سەر خۆی. ئیسراف کردن وەسوەسەی شەیتانە (ان المبذرین کانوا اخوان الشیاطین). لازمە ڕێگەی شەریعەت بگرێتە پێش.

بەقسەی حوکەما و ئەمری عولەما
بەخیل و ئیسراف بە یەک دانرا

دووەم شەرتە لغاوی شەیتان لە دەم نەکەیت، خۆت موفلیسی دنیا و قیامەت نەکەیت. (بشر مال البخیل بحادث أو وارث). هەر سێ کوڕەکە ئەو نەسیحەتەیان لە باوکیان بیست. هەر یەکە بە کەسابەتێک مەشغووڵ بوون. کوڕە گەورەکەیان دەستی کرد بە تیجارەت، بە سەفەر کردن خەریک بوو. دوو گای بە قووەتی بوو، شێری توند تەبیعەت لە بۆرەی ئەو گایانە فکری پادشایی نەئەما. فیلی ساحێب قووەت موقابەلەی ئەو گایانەی نەئەکرد. لە دەرەجەی گەورەیی و قووەتدا بوون. جەسەدیان وەک فیل، حەملەیان وەک شێر. بە یەک ڕۆژ ئەچوون بەغداد تا هەولێر. ئەو دوو گایە یەکێکیان (شەترەبە)و یەکێکیان (مەندەبە) ناو بوون ساحێبی ئەو گایانە بە نەفسی خۆی خزمەتی ئەکردن. زۆر خۆشەویست بوون. نیهایەت ڕۆژێ سەفەرێکی هاتە پێش. هەردوو گاکەی بار کرد. ڕۆیشت بۆ سەفەر. قۆناغی ئەو ڕۆژەیان دوور بوو. لە ڕێگە تووشی جۆگە و ئاوێک بوون، قوڕ و زۆنگاوێکیان هاتە پێش. گاکان هیلاک بووبوون. شەترەبە لەناو قوڕا چەقی. میقداری خەریک بوون، هێنایانە دەرەوە، ئەمما قووەتی هەڵسانی نەبوو. تیجارەکە مەجبوور بوو یەکێکی بۆ کرد بە نۆبەچی ئاگەداریی بکات، هەتا دوو سێ ڕۆژ ئەبووژێتەوە، لە پاشا داخڵ بە کاروانی بکاتەوە. تیجارەکە لەگەڵ کاروان ڕۆیشتن.

شەترەبە و نۆیەچییەکە مانەوە. کابرای نۆیەچی سەبری کرد تا دوو ڕۆژ. لە تەنهایی بێ تاقەت بوو، شەترەبەی بە جێهێشت و ڕۆیشت. وەقتێ داخل بە کاروان بوو خەبەری مردنی شەترەبەی بە تیجار دا. مەندەبە لە مەراقی شەترەبە نەخۆش کەوت و مرد، ئەمما شەترەبە لە پاڵەوە دەستی کرد بە گیا خواردن، میقداری قووەتی پەیدا کرد هەڵسایە سەر خۆی. بەدەم لەوەڕەوە ڕۆیشت، داخڵ بە ناو سەوزاییەک بوو. لەناو ئەو سەوزاییە دا چەند ڕۆژێ مایەوە. تێر گیا بوو، قووەتی ئەووەڵی پەیدا کردەوە. لەبەر مەغرووری و خۆ تاقیکردنەوە خەیاڵی بۆڕاندنی کرد، بە قووەتێکی تەواو بۆڕاندی. ئەمما ئەو بێشەیە شێرێکی توند تەبیعەت لە ئەووەڵی جوانییەوە تا ئەو وەقتە لەسەر تەختی پادشایی حوکمدار بوو، لە ئەنواعی دڕندە لە ژێر دەستیا بوو، وە لە عومری خۆی کەسی لە خۆی زیاتر نە ئەزانی، وە قووەتی فیل و بەبر بەلایەوە وجوودی نەبوو. ئەمما ئەگای دیبوو و نە دەنگی گای بیستبوو. وەقتێ بۆڕەی گا هات سەرسام بوو، ڕۆح هاتە لێوی، قووەتی حەرەکەتی نەما. لەبەر ئەوەی دڕندەکان فەرق نەکەن لە جێگەی خۆی هەڵنەسا. ئەمما لە ژێر حوکمی ئەو شێرەدا دوو چەقەڵ هەبوو، یەکێکیان (کەلیلە)و یەکێکیان (دیمنە) ناو بوون، لە دەرەجەی زیرەکی و قسە زانیدا بوون، لە فکر و قانوونی مەشهووری دنیا بوون، ئەمما

دیمنە لە فکرو تەمەعدا لە کەلیلە زیاتر بوو. بەعەقڵ زانیی شێر لە ترسی گا قووەتی هەڵسانی نییە، ڕووی کردە کەلیلە وتی: تەماشای پادشاهت کردووە قووەتی هەڵسانی نەماوە؟

بەناو چەوانیـــــا وا دەرکـــــەوتووە

لە دەنگی گـــــاهۆڕ ناوکی کــــەوتووە

کەلیلە جوابی دایەوە: تۆ حەقی ئەم سوئالەت نییە. قسە کردن لە پادشاهان بێ ئەدەبییە، ئێمە نان خۆری پادشاهین، لە ژێر سێبەری پادشاهدا ئیسراحەت ئەکەین. بۆ ئێمە قسە کردن دەرحەق بە سیرڕی پادشاه زۆر بێ ئەدەبییە. ئەو قسەی تۆ کردت لایقی ئێمە نییە، وە نزیک بووغمان بە پادشاه مومکین نییە. وەزیفەی پادشاهان لە کوێ، بن تووڕک و چەم و ئاو لە کوێ، وەهەرکەس لە ئیشێک نەزانێ، دەستی بۆ درێژ بکات، ئەوەی بەسەر دێ بەسەر مەیموونەکە هات.

دیمنە پرسی: چۆن بووە بەیانی بفەرموو.

**حیکایەت**

کەلیلە وتی: ئەگێڕنەوە مەیموونێ تەماشای کرد دارتاشێ لەسەر دارێ دانیشتووە، بە مشار دارەکە ئەبڕێتەوە. دوو پوازی لە دارەکە داوە بۆ ئاسانی هاتوچۆی مشارەکە. هەر وەقت مشارەکەی تەنگ ئەبوو پوازی ئەووەڵی دەرئەهێنا لە نزیک مشارەکە داینەکوتا. تەسادوف دارتاش بۆ حاجەتی ئاو هەستا ڕۆیشت. دارەکە بە جێ ما. مەیموونەکە کە جێگەی دارتاشی بە خاڵی دی، چووە سەر دارەکە دەستی برد بۆ مشار، کلکی لە قلیشی دارەکەوە چووە خوارەوە. سنگی ئەووەڵی دەرکێشا، دار هاتەوە یەک، مەیموون بوو بە تەڵەوە. کابرای دارتاش هاتەوە. مەیموونە فەقیرەکە دەستی کرد بە گریان. دارتاش دەستی کرد بە لێدان و سزا دانی وتی: مەیموون و دارتاشیمان گوتووە؟ ئەوەندەی لێ دا هەتا کوشتی. مەیموونەکە مرد. ئەم مەسئەلەیەم بۆیە هێنایەوە هەر کەس ئیشێ بکات لە دەرەجەی خۆی زیاتر بێ پەشیمانیی لە دوو دێت، ئیسراحەتی بۆ مومکین نابێ. دیمنە وتی: هەر کەس ئارەزووی نزیکیی پادشاهی بوو بۆ نان خواردن نییە، بەڵکی لە هەر جێگەیەک بێت سکی پڕ ئەبێتەوە، ئەمما نزیک بوون بە پادشاه باعیسی حورمەتە. کەسێ نزیک بە پادشا بوو ئەووەڵەن ڕوتبە و مەعاشی دائیمییە وە مومکینی ئەبێت دۆست و ڕەفیقی لە بەلا نەجات بدات، دوشمنی دوچاری بەلا بکات. بۆت مەعلووم بێت هەر کەس

بە واسیتەی تەمەعەوە هاتوچۆی پادشاهی کرد، لە ژێر دائیرەی حەیواناتایە. سەگی برسی بە ئیسقانێک دڵخۆش ئەبێت. پشیلەی سپڵە بە لوقمەیەک ئەفسی کوێر ئەبێت. بیستوومە شێر ئەگەر کەروێشکێ بگرێت و حەیوانە کێوییەک بەدی بکا کەروێشکەکە ئەجات ئەدات، ڕوو لە حەیوانەکە ئەکات. تەڵەبی جێگەی بڵند بکە هەتا مومکینت ئەبێت و مانەوەمان باش نییە. لێت مەعلووم بووە ئاو لە نوور پەیدا بووە، مووددەتێک لە جێگەی خۆی مایەوە بۆگەن ئەبێت، خواردنەوەی بۆ کەس مومکین نییە. کەلیلە وتی: ڕوتبە و مەئموورییەت بۆ کەسێکە یا تەحسیلی مەکتەبی کردبێت وەیا بە ئیرس بۆی بەجێ مابێت. ئێمە لەم دوو تایفە مەحروومین، جێگەمان بن تووترکە، لایقی ڕوتبە و مەئموورییەت نابین، چونکە (نان بۆ نانەوا، گۆشت بۆ قەساب) دانراوە. تەرکی ئەم خەیالاتانە بکە، تۆ لەکوێ، ڕوتبەی وەزارەت لەکوێ؟ ئەم قسانەت بۆنی ناخۆشی لێ دێت.

دیمنە وتی: دەستمایەی گەورەیی بە ئەسڵ و ئەسەب نییە، ئەمما بە زیرەکی و قانوونە. هەر کەس عەقڵی تەواو بوو وردە وردە ڕوتبەی زیاد ئەکات، وەکەسێ عەقڵی نەبوو ئەگەرچی ڕوتبەی وەزیری بێت ئاخری جێگەی زەجر و زیندانە. حوکەما وتوویانە: باری گران بە زەحمەت هەڵئەگیرێت، بە ئاسان دائەنرێت. مەسەلا بەردێکی گران بە زەحمەت بخەیتە سەر شانت، بە ئاسان بەری ئەدەیتەوە. مەسئەلەی مەئموورییەت زۆر بە زەحمەت دەست ئەکەوێت و بەغەفڵەت عەزڵ ئەبێت. هەروەک حوکەما فەرموویانە: پیاوی گەورە تەحەممولی وەک فەقیر نییە، قوبوولی هەموو موعامەلەیەک ناکات، چونکە کەسێ گەورە بوو ئولفەت بە لیباسی نایاب و خواردنی پاکەوە ئەگرێت. تەرک کردن زۆر زەحمەتە، ئەمما ئینسانی دەروێش هەر نەوع بێت موداڕای مومکین ئەبێت بە شەرتێک تەمەڵ نەبێ. مەگەر مەسئەلەی دوو ڕەفیقەکەت نەبیستووە یەکێکیان بە واسیتەی زەحمەتەوە بە ڕوتبەی پادشاهی گەیشت و، یەکێکیان بە واسیتەی تەمەڵییەوە لەبن شاخەکە دا مابۆوە؟

کەلیلە وتی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

دیمنە وتی: ئەگێڕنەوە دوو ڕەفیق بوون یەکێکیان (سالم) و یەکێکیان (غانم) ناو بوون، بە ڕێگە دا ئەڕۆیشتن. ڕێگەیان کەوتە بن شاخێک. تەماشایان کرد حەوزێ دروست کراوە، ئەتراقی حەوزەکە بە گوڵ و ڕێحانە و لاولاو چێنراوە. ئاوی حەوزەکە وەک مرواری

ئەچێتە خوارەوە. هەردوکیان بە ئیسراحەت لەسەر ئەو حەوزە دانیشتن. وەقتێ ئیسراحەتیان کرد لە ئەترافی حەوزەکە وردبوونەوە بەردێکی سپی بە خەتی سەوز نووسراوە: ئەی موسافیر بەخێر بێن! بە واسیتەی جەنابتانەوە ئەم جێگەیە ڕووناک بۆوە. ئێمە بۆ حورمەتی میوان هەرچی چاکە حازرمان کردووە، ئەمما ئەووەڵەن شەرت ئەمەیە ئەووەڵ دەفعە داخڵ بەناو ئەم ئاوە بێن، لە شەپۆل و لە غەرق نەترسن. وەقتێ لە ئاو پەڕینەوە شێرێ لە بەرد دروست کراوە بە شان هەڵگیرێت بە یەک وچان تا سەر شاخەکە ڕاکەیت، لە بانگ کردنی جانەوەران نەترسیت. وەقتێ درندە هەڵمەت بدەن خۆف نەکەیت. درک دامێنت بگرێ نەکەویت و ڕانەوەستیت. وەقتێ داخل بەسەر شاخەکە بوویت، بە مەقسەد ئەگەیت، وەهەتا ئینسان خۆی ئەخاتە ناو بەڵاوە تووشی مەنفەعەتی دنیایی نابێت، وە پیاوێ سەفەری ڕێگە نەبڕێت لە مەنزڵدا ئیسراحەت ناکات. ئەگەر ڕووی ئەرز پڕ بێت لە ئالتوون، مسقاڵێکی بە پیاوی تەمەڵ ناگات. غانم وتی: ئەی ڕەفیق موافەقەتم بکە بەیەکەوە داخڵی ئەم تەلەسمە ببین، یاخود بە مەقسەدمان ئەگەین، وەیا ناومان لە دنیا گوم ئەکەین. سالم وتی: ئەی ڕەفیق ئەم قسەیە لە قسە ناچێت. خەتێ نووسراوە نەتیجەی مەعلووم نییە. ئینسان بەبێ تەجرەبە خۆی بخاتە داوی بەڵاوە، باعیسی جەهالەتە. ئینسانی عاقڵ زەهری بە یەقین دەرمانی بە فکر نەخواردووە. پیاوی عاقڵ ڕەحەتیی حازری بە مەشەقەتی قەرزی نەداوە. پیاوی بە تەمەع دایم موفلیسە. ڕجا دەکەم بە ڕەحەتی دانیشە.

غانم وتی: ئەی ڕەفیق، دانیشتن واسیتەی تەمەڵی و ماڵ وێرانییە. هەڵسووڕاندن باعیسی تەرەققی و تەجەللییە. ئینسان هەتا عەرەقی هیلاکەت لەناو چەوان پەیدا نەکات. نانی ئیسراحەتی دەست ناکەوێت. مەعلومە هەموو بەشەرێ ئارەزووی ئیسراحەت ئەکات، ئەمما نانی دەست ناکەوێت. نانی ڕەحەتی دەست کەس نەکەوتووە، ئیستە دەست ئێمە بکەوێت. کلیلی خەزێنەی زەمانە بەبێ زەحمەت بە دەست کەس نەکەوتووە. مومکینە ئێمە خەریکی ئەم قسە دەبێ ڕەنجمان زایع ناڕوات.

سالم وتی: ئەم قسەی تۆ بۆنێ کرووزی لێ دێت، ئینسانی عاقڵ بێ تەجرەبە خۆی ناخاتە بەحری بێ بنەوە. لازمە ئینسان دەست بۆ ئیشێ درێژ بکات عەقڵی خۆی بخاتە ناو تای ترازوویەک و بەڵا بخاتە ناو ئەو تای. هەر لایەکیان گران بوو موعامەلەی پێ بکات. ئیستا ئێمە بۆمان مەعلووم نەبوە ئەم نووسینە ڕاستە وە یا درۆیە، بەڵکی بە قەشمەری ئەم خەتە نووسرابێ. بەڵکی سەرچاوەی ئەم کارێزە گۆگرد بێ ئینسان بسووتێنێ

و، بەڵكی پەرینەوەوی ئەو شێرەی كەلە بەرد دروست كراوە هەڵگرتنی بۆمان مومكین نەبێ. وەفەرزمن هەڵگیرا قووەت نابێ بەیەک وچان بگەینە سەر شاخەکە، وە بەڵكی هەر نەوع بوو ئەمانە جێ بەجی بوو هیچیان دەست نەكەوێت. قەتعیەن من دەست بۆ ئەم ئیشە درێژ ناكەم. خۆم ناخەمە ئیشی بێ سەرو پێوە. وە ئیختیاری خۆت بە دەست خۆتە. ئەچیت من حەقم نییە.

غانم وتی: ئەی ڕەفیق، من دەست لەم ئیشە هەڵناگرم. شەرتێكە كردوومە. بە وەسوەسەی (شیاطین الانس والجن) خۆم تەعتیل ناكەم. بۆم مەعلووم بووە ڕەفاقەتی منت پێ ناكرێ، ئیقتیدارت نییە پێ بنێیتە ئەم دركستانەوە. ئەمما ڕجا دەكەم بۆ تەماشا كردن لەم جێگەیە ڕاوەستە بە دوعا كردن مەشغووڵ بە و ئاگەهداری ڕەفیق شەرتی مەردانەیە.

سالم وتی: بۆم مەعلووم بوو دەست لەم مەقسەدە هەڵناگریت، وە بەقسەی من قانیع نابیت، وە من قووەتی ئەم تەماشا كردنەم نییە، چونكە باعیس بە دڵ تەنگییە. وە هەردوكیان هەر ئەشیایەكیان بوو كردیان بە دوو كەرتەوە، دوعا خوازییان لە یەک كرد. سالم ڕۆیشت، وەغانم چووە سەر كارێزەكە. وتی:

لەناو ئەم بەحـــرە خـــۆم ئەخنكێنم

گـــەوهەری مـــرادم لەبن دەردێنم

وەقتێ داخڵ بەسەر كارێز بوو تەماشای كرد عەجەب كارێزێ بوو.

لەدوور وەک كـــارێز تەلیـــسم كـــرابوو

لەفـــورات زۆرتر بەحـــری ســـیاە بوو

غانم بۆی مەعلووم كرا تەلیسمە، ئەمما مەردانە لە ئاو پەڕییەوە، بە گورجی دەستی برد شێرەكەی هەڵگرت نایە سەرشانی، بە ڕاكردن هەتا سەر شاخەكە نەوەستا. وەقتێ داخڵ بە سەر شاخەكە بوو تەماشای كرد لە پشت شاخەكەوە مەملەكەتێ دیارە باغ و گوڵزاری دڵ ئیحیا ئەكاتەوە. بە تەماشا كردنی شاخەكە خەریک بوو. لە ناكاو دەنگێ لەشێرە بەردەكەوە هات، ئەو سەحرایە هاتە لەرزە. دەنگی شێرەكە گەیشتە شارەكە. ئەهلی شارەكە عومووم هاتنە دەرەوە، ڕوویان كرد بۆلای غانم. وەقتێ داخل بوون بە شاخەكە هاتنە بەردەمی غانم، ڕەسمی ئەدەبییان بەجی هێنا، غانمیان سواری ئولاغ كرد، چوونەوە مەملەكەت. سەرو ئەندامی غانم بە گولاو و كافوور ئەزافەت كراو لیباسی پادشاهییان لەبەر كرد، لەسەر تەختی سەڵتەنەت قەراری گوت. غانم سوئالی ئەو تەلیسمەی كرد،

جوابیان دایەوە: ئەی پادشاه، حوکمای بەفکر سەرچاوەی ئەو کارێزەیان تەلیسم بەند کردووە. هەر وەقت کەسێ نزیک ئەو سەرچاوە بوو، نیشانەی ئەوەیە ئەبێتە پادشای ئەم مەملەکەتە، وە پادشای ئەم مەملەکەتە ئەمری خودا ئەکا، ئەوی لە جێگە دائەنرێت. بە واسیتەی بانگ کردنی شێرەکەوە بۆمان مەعلووم ئەبێت پادشاه بۆ مەملەکەت هاتووە. بەم نەوعە موددەتێکە حالاتی پادشای ئەم مەملەکەتە وەهایە. ئێستا پادشاهیی مەملەکەت عانیدی جەنابتە. ئێمە عوموومو بۆ خزمەت حازرین. ئەو وەقتە غانم بۆی مەعلووم کرا بە واسیتەی مەشەققەتەوە بەرۆتبەی پادشاهی گەیشت. ئەم مەسئەلەم بۆیە هێنایەوە تا بزانیت دەست کەوتنی ناز و نیعمەت بەبێ مەشەققەتی زەمانە دەست ناکەوێت. من تا لە شێر نزیک نەبم ئیسراحەت ناکەم.

کەلیلە وتی: رێگەی ئەم ئیسراحەتە چۆن پەیدا ئەکەیت؟

دیمنە وتی: حالی حازر فرسەتە، چونکی شێر خۆفناک ئەبینم، خۆم ئاشکرا بکەم. مومکینە بە ئۆشداروویی نەسیحەت فەرەحێ بخەمە دڵی شێرەوە، بە واسیتەی قسەکردنەوە نزیک بە پادشاه ببم و ڕوتبەیەک بۆ خۆم تەعیین بکەم.

کەلیلە وتی: نزیک بوونت بە شێر چۆن مومکین ئەبێت؟ وە ئەگەر مومکین بوو ڕەسم و ئادابی پادشاهان نازانیت.

دیمنە وتی: ئینسان عاقڵ و زیرەک بوو بۆ ڕەسم و ئەدەب موحتاج نابێت. هەر کەس بە ڕەشیدیی خۆی پشت ئەستوور بوو موحتاج بە نەسیحەت ناکات، دەست بۆ هەر مەقسەدێ درێژکات بەسەهلی دێتە دەست. وە ئەگەر تەرەقی ڕووی کردە ئینسان ڕێگە نیشان ئەدات. هەروەک بیستوومە پیاوێکی کاسب ئەستێرەی تالعی جووڵایەوە، بوو بە پادشاه، ناوی سەڵتەنەتی لە دنیا دا بڵاوبۆوە. ڕۆژێ پادشاهێک کاغەزی بۆ نووسی: ئەی دارتاش، تۆ سنعەتی شەقەکێشان باش ئەزانیت. قانوون و تەدابیری حوکوومەتیت لە کێ وەرگرتووە؟ جوابی بۆ نووسییەوە: ئەو کەسەی پادشاهیی بە من عەتا کرد، قانوون و ئومووراتی تەعلیم کردم. خودای تەعالا دەرگای ڕەحمەتی لە کەسێ کردەوە هەموو ئەسبابێکی بۆ ئەنێرێت.

کەلیلە وتی: ناوی هەر کەس بە گەورە ببرێت لەگەڵ مەئمووریەت یەک نییە. مەئمووریەت بۆ دوو تایفە دانراوە. ئەووەڵیان ئەوەیە بە ئیرس بۆی جێ مابێت. دووەمیان ئەوەیە تەحسیلی مەکتەبی کردبێت. لەم دوو تایفە دووریت. ئومێدی وەزارەت

چۆن ئەکەیت؟ مومکینە نزیک بە شێر بوویت ئەجەل دامانت بگرێت.

دیمنە وتی: هەر کەس ئارەزووی ڕوتبە بکات لازمە لە ڕێگەی قانوون شارەزابێت، زیهن و فکری وردی بێت. منیش بە ئەزیەتێکی زۆر ڕێگەی ئەو قانوونانەم دۆزیوەتەوە. بۆم مەعلووم کراوە هەر کەس ئارەزووی نزیک بوونی پادشای کرد لە سەری واجبە پێنج ڕێگە بگرێت. ئەووەڵەن ئاگری قەهری بە ئاوی حیلم بکوژێنێتەوە. دووەم لە وەسوەسەی شەیتان و ئارەزووی نەفس خۆی لادات. سێهەم بوغزو فیتنە هەڵگیرساندن بەعادەت نەگرێت. چوارەم دڵی لەسەر بناغەی ڕاستی دانێت. پێنجەم لە موحاکەمەدا بە نەرمی لەسەرخۆ سوئال و جواب وەرگرێت. هەر کەس ئەم ڕێگەیە بزانێت، ئارەزووی نزیک بوون بە پادشا بکات بە مەقسەد ئەگات.

کەلیلە وتی: وەقتێ نزیک بوویت بە پادشاه لەسەر چ فکرێ جێگەی ڕەحەتی پەیدا ئەکەیت؟

دیمنە وتی: بە ڕاستی خزمەتی ئەکەم، وەفکری خۆم ئەخەمە سەر تەبیعەتی، وە ئەمر کردنی ئیجرا ئەکەم، وە هەر ئیشێ مەنفەعەتی بۆ پادشا بوو و باعیسی تەرەققیی میللەت بوو، بەسەعی جێ بەجێی ئەکەم، وە هەر وەقت موقەددەرێ ڕووی دا بزانم زەرەری بۆ پادشاه ئەبێت بە قسەی شیرین و بە نەرمی پادشاه خەبەردار ئەکەم. هەر وەقت ئەم نەوعە موعامەلە لە تەرەف منەوە زاهیر بوو حورمەت لای پادشا پەیدا ئەکەم وە قسەم لای پادشا مەعقوول ئەبێت. بەبێ تەدبیری من دەست بۆ هیچ ئومووراتێ درێژ ناکات.

کەلیلە وتی: وا مەعلووم ئەکات قەرارت داوە و ئیمزات کردووە بە خزمەت پادشاه بکەیت. ئەمما هوشیاری ئەحواڵی خۆت بە. حوکەما فەرموویانە: بۆ سێ ئیش چوونە پێشەوە دروست نییە. ئەووەڵەن خزمەتی پادشاه. دووەم خواردنەوەی زەهر. سێهەم قسە ئاشکرا کردن لە ژن. هەرچی داخڵ بێت بەو سێ ئیشە لە قیسمی بێ عەقڵان حیساب ئەگرێت. حوکەما پادشاهیان بە شاخ تەشبیە کردووە، ئەگەرچی شاخ مەعدەنی دوڕڕ و جەوهەرە، ئەمما جێگەی پڵنگ و ئەژدەهایە. ڕەفاقەتی پادشاه وەک بەحر وایە، یا تیا غەرق ئەبێت، وەیا بە زەحمەت ئەجاتی ئەبێت. ناو بەحر پڕە لە گەوهەر و یاقوت، ئەمما سەلامەتی لە کەنارایە.

دیمنە وتی: هەر چیت فەرموو عومومی ڕێگەی ڕاستییە، وە ئەزانم پادشاه ئاگرە. هەر کەس نزیکی بوو لە سووتانێ نزیکە. ئەمما بازرگان ترسی زەرەری تیجارەت بکات،

مەنفەعەتی یەک بە دە ناخوات. سێ ئیش هەیەدەست ناکەوێت مەگەر بە عەقڵ: خزمەتی سوڵتان، سەفەری بەحر، موقابەلەی دوشمن. من خۆم بەبێ عەقڵ حیساب ناکەم، بۆچ لە نزیک بوونی پادشاه بترسم.

کەلیلە وتی:

بەعـــەقڵ و فـــەهم تەواوی
بۆچ دەســـتـــەئەژنۆ دامـــاوی

ئەگـەرچی زۆرم لەگـەڵ وتی و تۆ کـەمت بیست. خـەیاڵی وەزارەتت کـەوتۆتە سـەر، موبارەکە فەرموو، نۆشت بێ. هەردوکیان لەقسە بوونەوە. دوعا خوازییان لەیەک کرد. دیمنە ڕۆیشت، داخڵ بە خزمەتی شێر بوو. سەلامی لەشێر کرد. شێر سوئالی کرد ئەمە خەڵقی کوێیە؟ عەرزیان کرد: قوربان، ئەمە کوڕی فلان خزمەتکارە کە موددەتێ دەرگاوان بوو. شێر وتی: ناسیمەوە. لە پاشا بانگی کردە پێشەوە. دیمنە چووە پێش دەمی شێر، ڕەسمی ئەدەبی بەجێ هێنا. شێر وتی: تا ئێستا لە کوێ بوویت؟ دیمنە وتی: بە ڕوخسەتی باوکم هاتوومە خزمەت جەنابت. ئەگەر موهیممێ ڕووی دا، بە ئەمری کەعبەی حاجات و قیبلەی مرادات بەندە بە فکر دروستی بکەم، بۆ ڕووناکیی دڵی پادشاه خۆم تەقوم بکەم. مومکینە موهیممێ بە وزەراو ئەشراف سەهل ناکرێت، بە خزمەتکارێکی بچووک جێ بەجێ بکرێت. مەعلوومە ئەوی بە قەڵەمتراشێ دروست ئەبێت بە سەد شمشێر دروست نابێت. وە ئەگەر بە دستە گوڵ نابم، بە عەمەل سووتاندنی ژێر دیزە دێم. وەقتێ شێر ئەو قسانەی لە دیمنە بیست، لە فەساحەتی زمانی تەحەییور ما. ڕووی کردە مەئموران، فەرمووی: ئەم کوڕە دەرگاوانە زۆر زیرەک و عاقڵە، ئینسانی بچووک ئەگەرچی هەیئەتی بچووکە، ئەمما عەقڵی زۆرە. مەسەلا دەنکە کیبریتێ بەو بچووکییە داگیرسێت بخرێتە کۆمەڵە پووشێ عومومی ئەسووتێ. ئینسانی عاقڵ و زیرەک بە هەیئەت دیارە.

وەقتێ دیمنە ئەو قسانەی لەشێر بیست، بۆی مەعلووم کرا زوبان لووسێتیی تەئسیری لە شێر کردووە، وەک گوڵ گەشایەوە. زوبانی بە وەعز کردەوە. وتی: لەسەر عومومی ئومەرا و وزەرا لازمە هەر ئیشێکی موهیم ڕوویدات و دڵی پادشاه نارەحەت بکات، ئەو ئومەرا و وزەرایە ئیسراحەت نەکەن هەتا ئیشەکە دروست نەکەن، وە هەر کەس بە عەقڵی خۆی تەدبیرێ بدۆزێتەوە و عەرزی پادشاهی بکات، وە بۆ زاتی پادشاه مەعلووم ئەبێت ساحێب عەقڵ و تەدبیر چ تایفەیەک ڕوو لە خێرە، لە پادشاه مەعلووم ئەبێت ئەو کەسانە لایقی

ڕوتبەی گەورە و مەعاشی زیاد نەبن. مەسەلا هەتا گەنم لە ژێر خاک دەر نەکات، بۆ موحافەزە کردنی سەعی ناکرێت. وەقتێ سەوز بوو ناو نەدرێت، لە خواردنی حەیوان موحافەزەی نەکرێت وە مەنفعەتی زۆری لێ نەبینرێت. لازمە ئێمەیش هەر کەسەمان بە قەدەر عەقڵمان تەدبیر و ڕەئی عەرزی پادشاهی بکەین، چونکە ئێمە وەک دڕک و خاکین، پادشاە وەک ڕۆژ و هەورە. بە واسیتەی پادشاوە گوڵ و لاولاو ناو دەخواتەوە.

شێر وتی: تەدبیر کردنی عاقڵان و مەنفعەتی بوونیان چۆن مەعلووم نەبێ؟

دێنە وتی: لازمە بۆ زاتی پادشا تەماشای حەسەب و نەسەب نەکات. مەسەلا چەند مەئمووری بێ هونەر بێت، وە لە جێگەی باوکیان مەئموور بن بۆ پادشاە مەنفعەتی نییە. ئەمما بۆ ئومووراتی پادشاە ئینسانی قانوون ناس و بە فکر لازمە، وەکەسێ تەحسیلی مەکتەبی نەکردبێت لایقی ئومووراتی پادشاهی نییە. میقداری مەدح و سەنای شێری کرد.

وەقتێ شێر ئەو قسە شیرینانەی لە دێنە بیست زۆر لای مەعقوول بوو. لە نزیک خۆی جێگەی بۆ تەعیین کرد، بوو بە وەزیر. بیناغەی ئیشی شێر لەسەر تەدبیری دێنە دانەنرا. دێنە وردە وردە بە عەقڵ و زیرەکی لای شێر موعتەبەر بوو، بوو بە مەحرەمی سیرڕی پادشاە. دائیما لە قسە و قانوونی حوکوومەتی خەریک بوون. ئینتیها ڕۆژێ خەڵوەتیان کردبوو دوو بە دوو، دێنە فرسەتی زانی سوئالی لە شێر کرد: واسیتە چییە موددەتێکە ئارەزووی ڕاوت نەماوە؟ تەماشا ئەکەم لە جێگەی خۆت هەڵناسیت. مومکینە دڵی جەنابت پەردەی عیجزی پەیدا کردووە. ئەگەر لە بەندە مەعلووم بێت دەفعی ئەو عیجزە ئەتوانم بکەم. شێر فکری وابوو خەیاڵی دڵی لە دێنە ئاشکرا نەکات. لە ناکاو شەترەبە بۆڕانی. لە بۆڕەی شەترەبە خەیاڵی پادشاهی لە سەری شێر چووە دەرەوە، بەو دیو و بە دیوی خۆیا نەکەوت، نا عیلاج قسەی ڕاستی بۆ دێنە بەیان کرد. شێر وتی: عاجزی و هەڵنەساندنم واسیتەی ئەو دەنگە عەجاییبەیە. نازانم. چ دەنگێکە؟ مومکینە دەنگی موقابیلی قووەتی بێت. ئەگەر مەسەلە وابێ، بوونی من لەم بێشە دا چاک نییە. دێنە وتی: شاهم، غەیرەز ئەو دەنگە هیچ خۆفی کەت نییە؟ شێر وتی: نییە. دێنە وتی: ئەو دەنگە زۆر بێ ئەهمیەتە. وجوودی ئەوەندە نییە موڵکێ بە نیریس بۆ جەنابت بە جێماوە، لە خەوفی ئەو دەنگە تەرکی کەیت بڕۆیت. لازمە زاتی پادشاە وەک شاخ سابت بێت. بە واسیتەی بایەکی توندەوە ئەم دیو و ئەو دیو نەکات. شەرت ئەوە نییە هەرچی دەنگ و

بەدەنی گەورە بوو بە قووەت بێ. تەماشا ناکەیت بە شەری بەو نەوعە بە داری ئیسقانی ورد نەبێت؟ نەتبیستووە قولنگ بەو گەورەییە بە چنگ بازێکەوە نەسیر نەبێت، قووەتی فرینی نابێ؟ هەر کەس لە دەنگی گەورە خۆف بکات بەو دەردە ئەچێت تووشی ڕێوییەکە بووبوو.

شێر سوئالی کرد: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

دیمنە وتی: ئەگێڕنەوە ڕێوییەک ڕێگەی کەوتە قۆناغێک، بۆ خواردن ئەگەڕا. گەیشتە بن دارێ. تەپڵێ لەسەر دارەکە قایم کرابوو، هەر وەقت با لە دارەکە ئەکەوت ئەیدا لە تەپڵەکە دەنگێکی گەورەی لێ ئەهات. ڕێوی تەماشای کرد لە بن دارەکە مریشکێ بە چینە کردن خەریکە. ڕێوی فکری کرد پەلاماری مریشک بدات. دەنگ لە تەپڵەکەوە هات. ڕێوی تەماشای کرد شتێکی گەورە لەسەر دارەکەیە. وای زانی بە قەدەر دەنگی و زلیی گۆشتی هەیە، بە تەمەعی خواردن بە دارەکە دا سەرکەوت. پەلاماری تەپڵی دا دڕانی، وەقتێ بۆی مەعلووم کرا لە پارچە پێستێ و کەڵە هێژنگێ زیاتر نەبوو دای بەسەر خۆیا دەستی کرد بە گریان. زۆر پەشیمانیی حاسڵ کرد، وتی: حەیف بە واسیتەی ئەو دەنگە گەورەوە مریشکێکی حەڵاڵم لە دەست دەرچوو، بەو دەردەوە ئەوەندە گریا هەتا مرد. ئەم میسالەم بۆیە هێنایەوە لە جەنابت مەعلووم بێت ئینسانی ئەستوور زۆر بێ هێزە، وە ئەگەر ئەمری جەنابت سادر ئەبێت ئەچم حەقیقەتی حالاتی گا تەفتیش ئەکەم. شێر قسەی دیمنەی پێ خۆش بوو، ئیزنی دا، ڕۆیشت بۆ لای شەترەبە. وەقتێ دیمنە حەرەکەتی کرد شێر پەشیمان بۆوە لە ناردنی دیمنە. فکری کرد وتی: ئیشێکی زۆر خراپم کرد و نامەردیم بەسەر خۆم هێنا. حوکەما فەرموویانە: لایقی پادشاهان نییە سڕی خۆی لای دە تایفە ئاشکرا بکات. ئەووەڵ لای کەسی بێ جورم و بێ گوناه حەپس کرا بێ و دارکارییان کردبێت. دووەم لای کەسێ لە تەرەف پادشاوە ماڵی تالان کرابێ. سێهەم لای کەسێ لە مەئمووریەت عەزڵ کرابێت. چوارەم لای کەسێ بە فیتنە و فەساد مەشغووڵ بێت. پێنجەم لای کەسێ جەزا درابێ و ڕەفیقی عەفو کرابێ. شەشەم لای کەسێ لەسەر گوناه لە ڕەفیقی زیاد ئەزیەت درابێ. حەوتەم لای کەسێ خزمەتی زۆر بێ و کەم حورمەت بێ. هەشتەم لای کەسێ تەعقیبی دوشمن بکات لە تەرەف پادشاوە مەنع کرابێ. نۆهەم لای کەسێ ئارەزووی زەرەری پادشاه بکات. دەهەم لای کەسێ لە تەرەف پادشاوە بە مەئموور

قوبووڵ نەکراین. سڕ ئاشکرا کردن لەگەڵ ئەم دە تایفە بۆ پادشاهان زۆر خەتەرە. لەسەر پادشاه لازمە هەتا دین و دیانەتی کەسێ تەجرەبە نەکات سڕی خۆی بۆ بەیان نەکات. حەیف بێ تەدبیر و بێ تەجرەبە قسەی سڕی خۆم لە بێگانە ئاشکرا کرد. بەبێ ئیمتیحان ناردنی دیمنە بۆ لای شەترەبە لە عەقڵی عاقڵان دوور بوو، چونکە دیمنە زۆر زیرەکە. ئەگەر ڕۆژێ لە دەرگای من ئازارێکی پەیدا کرد، فیتنە هەڵئەگیرسێنێ، دوشمنی من لە قیسسە خەبەردار ئەکات. لە مەعنای (ان بعض الظن اثم) دەرچووم. لە پاش ئەمە هەر دەردێ تووش بم، موستەحەققم، خۆم بەسەر خۆم هێناوە. ئیشی خۆ کردوو دەرمانی نییە. بەو خەیاڵانەوە بەو دیو و بەو دیوی خۆیا ئەکەوت، ئینتیزاری هاتنەوەی دیمنە بوو. لە دوور دیمنە دەرکەوت، شێر تەسکینی دڵی هات، لە جێگەی خۆی قەراری گرت. وەقتێ دیمنە داخڵ بوو بە خزمەتی شێر، ڕەسمی خزمەتی بەجێ هێنا، زوبانی بە مەدح و سەنا کردەوە. وتی: ئەی پادشاه لە بە لای زەمان دوور بیت، خودا بەر قەرارت کات. ئەو دەنگە بە گوێی جەنابتا هاتووە، دەنگی گایەکە بە گیا خواردن خەریکە، غەیرەز خواردن و نووستن نەبێت، فکری کەی نییە، وە غیرەتی لە ملی و سکی زۆر دوورە. شێر وتی: قووەتی چۆنە؟ دیمنە وتی: قووەتی بۆم مەعلووم نەکراوە، چونکی بە زاهیر سام و هەیبەتی نییە. شێر وتی: قووەت بە سام و هەیبەت مەعلووم ناکرێ. حوکەما فەرموویانە: ڕەشەبای بە قووەت زەرەر بە گیا ناگەیەنێت، سپی چنار لە ڕەگ و ڕیشە دێنێتە دەرەوە. پەهلەوانان هەتا موقابەلەی یەک نەکەن قووەتیان لەیەک مەعلووم ناکرێت. قووەت و ڕەشیدیی بەنی ئادەم ڕۆژی حەرب مەعلووم ئەبێت. دیمنە وتی: ئەی پادشاه، من بە عەقڵ بۆم مەعلووم بووە زۆر کەم غیرەتە و قووەتی موقابیل بە گەورەیی نییە، وە ئەگەر ڕوخسەتی جەنابت هەیە ئەچم ئەیهێنم بە خزمەت کردن خاکی بەرێیت بە زوبان بلێسێتەوە، تەوقی خزمەتکاری لە گەردن ئەقش بکات. شێر لە قسەی دیمنە دڵخۆش بوو. ئیشارەتی کرد بە هێنانی. دیمنە ڕۆیشت بۆ لای شەترەبە. ئەووەڵ دەفعە سوئالی لە شەترەبە کرد: لە کوێوە هاتوویت، چۆن گەیشتوویتە ئەم بێشەیە و بێ خۆف ئەسوورێیتەوە؟ شەترەبە ئەووەڵ تا ئاخر قیسسەی خۆی بۆ دیمنە بەیان کرد. وەقتێ دیمنە لەحاڵاتی خەبەردار بوو ڕووی کردە شەترەبە، وتی: بۆت مەعلووم بێ ساحێبی ئەم بێشە شێرە، پادشاهی عوموومی حەیواناتە، وە من فروستادەم بۆ لای تۆ. ئەگەر گوناهێ لە تۆ سادر بووە عەفوت ئەکات، لازمە بەبێ ڕاوەستان بچین بۆ خزمەت شێر، وە ئەگەر لەگەڵ من نەهاتیت چیت بەسەر هات گوناهی خۆت بە گەردنی خۆت. لازمە بە گورجی جوابی بۆ بەرمەوە. شەترەبە ناوی

شێری لە زوبان دیمنە بیست ترس وخۆفی پەیدا کرد، وتی: بە ڕاستی تەنمینم بکەیت، لە سیاسەتی شێر مەحفووزم بکەیت، لە خزمەت جەنابتا دێم، بە خزمەت شێر موشەڕڕەف بیم. دیمنە بە زوبانی لووس و سوێندی زۆر هەر نەوع بوو دڵی شەترەبەی تەنمین کرد قوسوور و خەیانەت لەگەڵ شەترەبە نەکات. هەردوکیان بە جووتە چوون بۆ خزمەت شێر. دیمنە پێش شەترەبە کەوت. خەبەری هاتنی شەترەبەی عەرزی شێر کرد. وەقتێ شەترەبە داخڵ بە خزمەتی شێر بوو ڕەسمی خزمەتی بەجێهێنا. شێر بە توندی لە شەترەبەی پرسی: چۆن داخڵ بەم حودوودە بوویت؟ بە چ وەسیلەیەک گەیشتوویتە ئەم بێشەیە؟ شەترەبە حالاتی ئەووەڵ تا ئاخر بۆ شێر بەیان کرد. وەقتێ شێر حالاتی شەترەبەی بۆ مەعلووم کرا، ڕووی تێ کرد، وتی: بە شەرتێ لەم بێشە نەچیتە دەرەوە بۆ کەس مومکین نابێ دەستی تەعەددات بۆ درێژ کات. خوانی نیعمەتی من بۆ عومومی حەیوانات کراوەتەوە. سەد هەزاری وەک تۆ لێی بخوات کەم نابێتەوە، هەر باقییە، وەمنیش قوسوورم دەرحەق ڕەعیەت نەکردووە، وە عەدالەتی من مەشهوورە لە دنیا دا، وەتەنمین بە هەتا مردن ئەتوانیت بژیت بە ئیسراحەت. وەقتێ شەترەبە ئەو قسانەی لە شێر بیست، وەک غونچەی

گوێ گەشایەوە، وە شەرتی کرد لە ڕووی سیدقەوە لە خزمەت کردن قوسوور نەکات. شێر ڕوتبەی بە شەترەبە دا . ڕۆژ بە ڕۆژ ڕوتبەی لە زیادی بوو. مەحەبیەتی شەترەبە لە دڵی شێر دا قەراری گرت، وای لێ هات بوو بە وەزیر. ئینتیها، بێ تەدبیری شەترەبە دەست بۆ هیچ ئوموراتێ نە ئەبرا. تەدبیر کردنی شێر و شەترەبە دوو بە دوو لە خەڵوەتا ئەکرا. دیمنە خزمەتی لای شێر نەما. دیمنە بۆی مەعلووم بوو ڕوتبەی شەترەبە تەرەققی کرد، نەفسی پیسی کەوتە حەرەکە، بە دڵ قەهری لە شەترەبە گرت، چونکە ئاگری دڵی حەسوود گڕ بگرێ، ئەووەڵ جگەرەی ئەسووتێنێ. بەو قەهرەوە نە شەو و نە ڕۆژ ئارامی نەبوو. بۆ شەکوەی حاڵی خۆی چووە لای کەلیلە. ڕووی کردە کەلیلە، وتی: تەماشای ویجدانی شێر ئەکەیت؟ بە جان و دڵ خزمەتم کرد، وە ترس و خۆفی لە گا پەیدا کردبوو، بە عەقڵ و زوبانی شیرین سەهلم کرد. شەترەبەم کرد بە خزمەتکار، وردە وردە ڕوتبەی درایە هەتا بوو بە وەزیر، لە جێگەی من دانرا. ئێستا پادشاە بەبێ ئەمری شەترەبە دەست بۆ هیچ ئوموراتێ درێژ ناکات، وەحورمەتم لای پادشاە نەما. تەدبیر چییە؟ کەلیلە جوابی دایەوە، ئەو شیعرەی وت:

ئیـــقـــرارت ئەکـــرد من کـــەم فـــەهم نیم
تووڵی نەکـــێـــشـــا، بە چاوی خـــۆم دیم

تەدبیری خۆتە، دەرمانی بۆ کەس پەیدا نابێت. ئەو برینە بە دەستی خۆت کردووتە، بۆ هیچ حەکیمێ چار ناکرێت. لە تۆ ئەوە قەوما لە عابیدەکە قەوەا. دیمنە پرسی: چۆنە، بەیانی بفەرموو.

حیکایەت

کەلیلە وتی: ئەگێڕنەوە پادشاهێ خەرقەیەکی چاکی بەخشی بە عابیدێ. کابرایەکی دز لەو موعامەلەیە خەبەردار بوو، تەماعی کردە خەرقەکە، بەحیلە چووە لای عابید، بوو بە دەروێش. مووددەتێ خزمەتی عابیدی کرد هەتا وای لێ هات عابید ئەمین بوونی لە دەروێش پەیدا کرد. شەوێک لە ناوەقت خەرقەی هەڵگرت ڕۆیشت. وەقتێ عابیدەکە خەبەری بووەوە تەماشای کرد نە خەرقەکە و نە دەروێشەکە دیارە. بەفکر مەعلوومی کرد خەرقەکە دەروێش دزیویەتی، هەڵسا ڕووی کردە ڕێگە بۆ دۆزینەوەی خەرقەکە. تەماشای کرد جووتێ گا کێوی شەڕیانە. ئەوەندە شاخیان لە یەک داوە خوێن لە لەشیان ئەڕوات. تەسادوف ڕێوییەک هات دەستی کرد بە خوێن خواردن. لەبەر تەمەع خەبەردار نەبوو.

گاکان له یەک وەستانەوە. ڕێوی کەوتە مابەینی هەردوکیان. شاخی گاکان گیرایە پەراسووی ڕێوی، کوشتیان. ڕێویی زۆرزان لە واسیتەی تەمەعەوە خۆی بە کوشت دا. عابید ئەوەی تەماشا کرد و ڕۆیشت. شەو مابوو، نزیکی شارەکە بووەوە. دەروازەی شارەکە داخرابوو. عابید تەماشای ئەکرد جێگەیەک بدۆزێتەوە تا ڕۆژ ئیدارە بکات. ژنێ لە سەربانەوە چاوی بە عابید کەوت بۆی مەعلووم کرا غەریبە، چوو دەرگای لێ کردەوە، بردیە ماڵەوە. عابید چووە ژوورەوە، بە تەسبیحات مەشغووڵ بوو. ئەمما ژنەکە گەوواد بوو، چەند ئافرەتێکی لابوو، خراپەیان ئەکرد. پارەکەیان گەووادە وەری ئەگرت. یەکێ لەو ژنانە زۆر جوان بوو، دۆستی هەبوو لە ئێوارەوە دۆستەکەی لای ئەو ئەنووست هەتا ڕۆژ. گەووادەکەیان فکری فەوتاندنی دۆستی ژنەکەی کردبوو، لەبەر ئەوە نۆبەتی بە کەس نە ئەدا. ئەو شەوی عابید چووە ئەوێ گەووادەکە قەسدی کوشتنی دۆستی ژنە جوانەکەی کرد. گەووادەکە عەرەقی زۆری بۆ تێکردن. هەردوکیان تەواو سەرخۆش بوون، خەویان لێ کەوت. گەووادەکە میقدارێ زەهری هێنا، کردیە لوولەیەکەوە، سەرێکی نایە کونە لووتی دۆستی ژنەکەوەو دەمی گرت بە سەری لوولەکەوە. لەو وەقتەدا کابرا پژمی. ژەهرەکە چووە قوڕگی ژنە گەووادەکەوە، لە جێگەی خۆی ڕۆحی دەرچوو. عابید فکری کرد وتی: چاڵ بۆ هەر کەس هەڵکەنێت، خۆی تێی ئەکەوێت. ئەو شەوە بە هەزار ساڵ لە عابید ڕۆیشت. وەقتی هەتاوکەوتن ڕۆیشتە دەرەوە، بەناو شارەکە دا ئەگەڕا. کەوشدروویەک خۆی بە مریدی عابید ئەزانی، چاوی بە عابید کەوت. بۆ تەبەڕڕوک بردیە ماڵەوە. ئەمری کرد بە مناڵەکانی حورمەتی عابید زۆر بگرن و خۆی بانگ کرابوە سەر زیافەت. ژنی کەوشدروو دۆستی هەبوو، زۆر ئارەزووی وەسڵی ئەکرد. ئەو ڕۆژە بۆی مەعلووم بوو کەوشدروو لەسەر زیافەتە. جوابی لە دۆستەکەی گێڕایەوە وەقتی مەغریب بچێتە لای. تەسادوف دۆستی ژنەکە گەیشتە بەر دەرگا، کەوشدروو هاتەوە، فەرقی کرد بۆ خزمەت ژنەکەی ئەچێت. کەوشدروو چووە ماڵەوە، دەستی کرد بە لێدانی ژنەکەی هەتا هیلاک بوو. لە پاشا بەستیەوە بە کۆڵەکەوە. عابید فکری کرد ڕجا لە کەوشدروو کات ژنەکە لە عەزاب نەجات بدات. هەتا لەفکر بووەوە کەوشدروو خەوی لێ کەوت. تەماشای کرد ژنی دەلاک پەیدا بوو. ڕووی کردە ژنی کەوشدروو، وتی: خوشکێ، بۆچ فلان کەست بە تەما کرد و ئەهاتیت؟ دۆستایەتی ئەوەیە تۆ بەجێت هێنا؟ ئەوا دۆستەکەت لە ماڵی ئێمە دانیشتووە ئینتیزاری دیدەنی تۆ ئەکات. سوێندی بە دەما هاتووە ئیمشەو ئەچێتە لای هاتووچوو کردنی بە ئەبەدی نەمێنێت. قوربانت بم تەدبیر چییە. ژنی کەوشدروو بە

هێواشی بانگی کردە پێشەوە، وتی: ئیمرۆ کەرپیاوەکە شێت بووە. لە خۆیەوە هاتەوە، دەستی کرد بە لێدانم، وە ئەمە حاڵمە کە ئەیبینیت بەستوومیەوە بەم کۆڵەکەوە، وە ئەگەر شەرتی خوشکایەتی بەجێ دێنیت و وەفای دۆستەکەم ئەزانیت، من بکەرەوە، تۆ لە جێگەی خۆم ئەبەستمەوە، هەر ئێستا ئەچم دڵی دۆستەکەم ئاشت ئەکەمەوە، دێمەوە تۆ ئەچیتەوە بۆ ماڵی خۆت، تا قیامەت خۆم و دۆستەکەم مەمنوون ئەبین. ژنی دەلاک ڕازی بوو، ژنی کەوشدرووی کردەوەو خۆی لە جێگەی ئەو بەسترایەوە. ژنی کەوشدروو ڕۆیشت بۆ لای دۆستی. تەسادوف کەوشدروو خەبەری بووەوە، هەستا داری هەڵگرت، دەستی کرد بەلێدانی ژنەکە. ژنە هاواری لێ هەستا. کەوشدروو دەستی برد گازنی هەڵگرت، لووتی ژنەکەی بڕی، وتی: دێڵە سەگ سوێندم ئەخوارد هاوار بکەیت لووتت ئەبڕم. ئەوە جەزات بێ. سبحەینێ لووتت بەرە بە دیاری بۆ دۆستەکەت. ژنەکە لە ترسا بێ دەنگ بوو. خۆی بە خۆی ئەوت حاڵێکی سەیرە. بەزم یەکێکی کە ئەیکات، مەشەققەت من کێشام. وەقتێ ژنی کەوشدروو هاتەوە تەماشای کرد ژنی دەلاک لووتی بڕاوە، عوزر خواهیی بۆ هێنایەوە لە کۆڵەکەی کردەوە و خۆی بە کۆڵەکەوە بەستەوە. ژنی دەلاک لووتی بە دەستیەوە گرت، ڕۆیشت بۆ ماڵەوە. موتەحەییر مابوو، دەمێ پێ ئەکەنی. دەمێ ئەگریا. عابید ئەو حاڵاتانەی چاو پێکەوت، لە ئیشی خودا موتەحەییر مابوو. میقداری نیو سەعاتێ تووڵی کێشا. ژنی کەوشدروو دەستی کرد بە دوعا. وتی: خودایە، لەسەرڕی مار و مێروو ئاگەهداری. فەرقی تاریکی و ڕووناکی بۆ چاوی قودرەتت نییە. مەعلوومە ئەم پیاوە بوهتانم پێ ئەکات، بێ گوناە لووتی بڕیوم، خودایە تۆ سەتتار و غەفوور و ڕەحیمی. لووت باعیسی زینەتی ئینسانە. بە کەرەم و بە ڕەحمی خۆت لووتم لە جێگەی خۆی چاک کەیتەوە. لەو وەقتەدا مێردەکەی خەبەر بووەوە، گوێی لە دوعاکانی ژنەکە بوو، ڕووی تێ کرد، وتی: ئەی سۆزانیی ناڕەسەن، نۆبەی ئەم مەکر و حیلەیە. دوعای گونەهکاری ڕووڕەشی وەک تۆ چۆن گیرا ئەبێ، وە موحتاجیی ئەهلی فەساد چۆن ڕەوا ئەبێت؟ حوکەما فەرموویانە:

تەڵەبی دوعـا وەختێ لە خـوا کـە
دڵ و زوبانت هەردوکـیـان پاکـە

سبحەینێ دۆستەکەت لووتت چاک ئەکاتەوە. لە پڕ ژنەکە بانگی کرد: ئەی زاڵم هەڵسە تەماشای قودرەتی خواکە، چونکە ئەلحەمد و لیللا لە گوناە دوور بووم لووتم بە جێگەی خۆیەوە نووسایەوە و لە تەعنەی بێگانە ئەجاتم بوو. کەوشدرووی دڵ ساف وەقتێ چرای

داگیرساند تەماشای کرد لووتی لە جێگەی خۆی ماوە، دەست بەجێ بە بێ گوناهیی ژنەکە ئیعترافی کرد، دەست و پێی ژنەکەی ماچ کرد، تەڵەبی گەردن ئازاییی لێ کرد، سوێندی بۆ خوارد هەتا بە ڕۆح زیندوو بێ خەیاڵی خراپە دەرحەق ژنەکەی نەکات، بە قسەی فیتنە باوەڕ نەکات، لە ژێر ئەمری ژنەکەی دەرنەچێت، بۆ هەر شتێک موحتاج بوو بە ژنەکەی بڵێت داوا لە خودا کات چونکە پەردە بۆ دوعای ژنەکەی نییە، زوو گیرا ئەبێت، ئەمما ژنی دەلاک چووە ماڵەوە، فکری ئێشی لووتی ئەما، لە تەدبیری مەکر و حیلە دا بوو ڕێگەیەک بدۆزێتەوە لە دەست مێردەکەی و تەعنەی دراوسێ خۆی نەجات دات. تەسادوف یەکێ لە دەرگای دا، وتی: فلان کەس ناساغە، وەرە دەستێ حەجاماتی بکرە. دەلاک بانگی ژنەکەی کرد: ئەو جانتایە ئەسبابەکانی تیایە بمدەرێ، ژنەکە فرسەتی زانی، هەڵسا گوێزانی دایە، وەستا گوێزانەکەی لە دەست گرت. وتی: گوێزان بە تەنها چی لێ بکەم، فڕێی دا، وتی: جانتام لازمە. ژنەکە هاواری دەست پێ کرد: ئای لووتم! ئای لووتم! ژنەکە خۆی بە ئەرزدا تل ئەدا. لە هاوار هاوار دراوسێکانی کۆبوونەوە. تەماشایان کرد کراسی ژنەکە خوێناوییە و لووتی براوە. ڕوویان کردە دەلاک: وەستا لەسەر چی لووتی ئەو زەعیفەت بڕیوە، گوناهی چییە؟ وەستا نە زوبانی ئیقرار وە نە زوبانی ئینکاری بوو، وەک کەڕو لاڵ وەستا. فکری ئەکرد یارەبی ئەمە خەوە یا ئاشکرایە. ئەو مەسئەلە کەوتە دەم خزم و ئەقرەبای ژنەکە. وەقتێ ڕۆژ بۆوە، عابید ڕێشتە دەرەوە چوو بۆ دیدەنی قازی، ئاشنایەتیی کۆنیان بوو. ئەمما ئەقرەبای ژنەکە وەستای دەلاکیان هەڵگرت چوون بۆ مەحکەمەی شەرع، وتیان: قازی ئەفەندی تەڵەبی حوقووقمان ئەکەین، ئەم دەلاکە بە بێ گوناە لووتی ئەو ژنەی بڕیوە، قازی سوئالی لە دەلاک کرد: لەسەرچی لووتی ئەو ژنەت بڕیوە، عەیبدارت کردووە؟ دەلاک زوبانی جوابی نەبوو. قازی بە ئەمری شەرع ئەمری کرد لووتی دەلاک لە جیاتیی لووتی ژنەکە ببڕن. عابید هەڵسا وتی: قازی ئەفەندی سەبر کە. لە مەعنای قسەی من بفکرێ. دز خەرقەی منی ئەبردووە، گا کێوییەکان ڕێوییەکیان ئەکوشتووە، زەهر ژنە گەووادی ئەکوشت، ژنی دەلاک کەوشدروو لووتی ئەبڕیوە ئەمانە عومووم خۆمان بەسەر خۆمان هێناوە. قازی لە دەلاک خۆش بوو، ئەمری کرد بە عابید: لازمە حەقیقەتی ئەم قسانە بەیان بفەرموویت. عابید لە ئەووەڵ تا ئاخر ئەوی دیبووی بۆ قازیی بەیان کرد، وتی: ئەگەر من ئارەزووی دەروێش گرتنم ئەئەبوو، دز بە خەرقەکەم شاد نەئەبوو. ئەگەر ڕێوی تەمەعی خوێن خواردنی نەئەکرد، سکی بە شاخی گا کێوییەکان نە ئەدڕا. ئەگەر ژنە گەووادەکە قەسدی کوشتنی جوانەکەی نەئەکرد، زەهرەکە نە ئەگەڕایەوە

قورگی بیکوژێ. ئەگەر ژنی دەلاک واسیتەی بەیەک گەیاندنی دوو گوناهکار نەئەبوو، لووتی بە دەست کەوشدروو نە ئەبڕا. قازی ئەفەندی بۆت مەعلووم بێ ڕێگەی چاکە چاکەیە، ڕێگەی خراپە خراپییە. تۆیش ئاگەهدار بە.

کەلیلە وتی: ئەم میسالەم بۆیە هێنایەوە تا لێت مەعلووم بێت تەدبیری خۆتە، بۆ کەس چار ناکرێت. قسە و نەسیحەتی من تەئسیر لە تۆ ناکات. لە ئەووەڵەوە پێم وتیت: ئەی ڕەفیق، نزیک بوون بە پادشاهان فیتنە و بەڵایە. بۆ جینسی ئێمە دروست نییە نزیک بە شێر بکەوین، چونکە جێگەی ئێمە ناو تووڕکەڵانە و ئیجاد بوونی شێر بە پادشاه خەلق کراوە. زۆرم لەگەڵ وتی بێ فائیدە بوو. ئێستا تەدبیری تۆ لای من نەماوە.

دیمنە وتی: فەرموودەکانت عومووم ڕوو لە ڕاستییە. مەعلوومە ئەم ئیشە خۆم کردوومە. ئەمما ئومێد دەکەم ئەم گرێیەی سەر دڵم بە واسیتەی نوفووسی موبارەکتەوە بکرێتەوە و ڕێگەیەک بە عەقڵ و زیرەکیی خۆت بدۆزیتەوە لە مەراق نەجات بیم.

کەلیلە وتی: ئەووەڵ دەفعە تۆ فکری وەزارەتت کرد، من دووربینیی ئەم ئیشەم کردبوو. وە ئێستایش ئەگەر بە قسەی من ئەکەیت لەسەر ئەم خەیاڵاتە لاچۆ، کونجی قەناعەت بگرە. وە ئەگەر هەوای وەزیری داویە لە سەرت تەدبیری لای من نییە، خۆت حاکمی نەفسی خۆتی. وام بۆ مەعلووم بووە فکری تۆ بۆنی خوێنی لێ دێت، قسە کردنم لەگەڵ تۆ بێ فائیدەیە.

دیمنە وتی: ئەتوانم بە حیلە کارێ بکەم شەترەبە لەم نزیکانە دوور بخەمەوە، لە وەزیریی عەزڵ بکەم، ئەمما ئەترسم پێم بڵێن نا ئینسانی کرد، وە ئەگەر واز بێنم لای بچووک بێ حورمەت بیم. وە مەقسەدی من فیتنە و بەخالەت نییە، مەقسەدم جێگەی خۆمە، چونکە حوکەما فەرموویانە: بۆ پێنج ڕێگە سەعی کردن شەرتی عەقڵە. ئەووەڵ تەڵەب کردنی ڕوتبەیەک حورمەت پەیدا بکات. دووەم خۆ پاراستن لە زەرەرێ بە تەجرەبە مەعلووم کراوێ. سێهەم موحافەزەی ئیشێ مەنفەعەتدار بێت. چوارەم خۆ دەرهێنان لە ڕێگەی هیلاکەت. پێنجەم جەلب کردنی ئەشیایەک دەفعی دوشمنی پێ بکرێت. وە لە جەنابت مەعلووم بێ ئارەزووی من لە جێگەی خۆم زیاتر نییە. لەلام زۆر زەحمەتە شەترەبەیەک دوێنێ دوشمن بە شێر بوو ئەمڕۆ لە جێگەی من وەزیرە. ئێستا ئەوە بە مەسڵەحەت ئەزانم فێڵێ بدۆزمەوە لە شەترەبە ئەم بێشەیە جێ بێڵێت و ڕێگەی فیرار بگرێتە پێش. منیش لە جێگەی خۆم بە دڵێکی خۆش دانیشم و ئیسراحەتێکی تەواو بکەم، وە لە جووتە

چۆلەکەکە کەمتر نیم کە ئینتقیامی خۆیان لەواشە سەند.

کەلیلە وتی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

دیمنە وتی: ئەگێڕنەوە جوتێ چۆلەکە لەسەر لقەدارێ هێلانەیان دروست کردبوو، واشەیەک لەسەر ئەو شاخە هێلانەی کردبوو. ئەو واشەیە وەقتێ لە شاخ ئەهاتە خوارەوە هەروەک برووسکە تیژ ئەڕۆیشت. زۆر دائیما خەریکی ڕاوکردنی چۆلەکە بوو. وەقتێ پەلاماری کۆمەڵە چۆلەکەی ئەدا لە هەزار یەکێکی لە ژێر چنگ دەرنەئەچوو. جووتە چۆلەکە فەقیرەکان هەر وەقت بێچوویان هەڵئەهێنا، نزیک بە فڕین ئەبوون، واشەکە ئەچوو عومومی ئەبردن دەرخواردی بێچووەکانی خۆی ئەدا. چۆلەکەکان لە واسیتەی (حب الوطن من الایمان) تەرکی ئەو هێلانەیان بۆ نەئەکرا. چەند ساڵێ بەو ڕەزالەتە دەوامیان کرد. ئینتیها ساڵێ بێچوویان هەڵهێنابوو، نزیک بەوە بووبوون بفڕن، باوکەو دایکەیان زۆر بە عەجەلە تەعلیمی فڕینی بە بێچووەکان ئەکرد. وەقتێ بێچووەکان زرووکە-زرووکیان ئەکرد، دایکە و باوکەکانیان ئەگریان. یەکێ لە بێچووەکان زۆر زیرەک بوو، بە عەقڵ بۆی مەعلووم بوو دایکە و باوکەیان ترسێکی هەیە. سەبەبی گریانی لە دایک و باوکی پرسی. جوابیان دایەوە: ئەی ئەولادم لە ئێمە مەپرسە، لە فرمێسکی چاومان و لە کونی جگەرمان بپرسە. بۆت مەعلووم بێ چەند ساڵە ئێمە جگەرمان کون کون بووە لە دەست واشەی زاڵم. بە تەواوی حالاتی واشەی بەیان کرد. بێچووەکە وتی: لازمە ئێمە سابیر بین بە قەزاو قەدەری خودا. خودا دەرد ئەداو دەرمانی بۆ ئەنێرێت. لەسەر ئێمە لازمە تەدبیر و ئێوەش سەعی بکەن، بەڵکی دڵی ئێوەو سەری ئێمە لە هیلاکەت دەرچێت. بۆ دۆزینەوەی ئەم بەڵایە ڕوو بکەن بۆ سەحرا، لە یەکێ دەرمانی ئەم هیلاکەتە بپرسن. جووتە چۆلەکە بەو قسەیە دڵیان خۆش بوو. یەکێکیان باقی مایەوە بۆ خزمەت کردنی بێچووەکان و یەکێکیان فڕی ڕووی کردە سەحرا، میقدارێ ڕۆیشت، لەسەر دارێ نیشتەوە، فکری کرد سوئال لە کێ کات، دەرمانی چۆن بدۆزێتەوە؟ قەراری کرد تووشی هەر ڕۆح لەبەرێ هات دەردی خۆی بۆ بەیان کات. تەسادوف تووشی قاقنەز هات. ئەو قاقنەزە تازە لە مەعدەنی ئاگر هاتبوە دەرەوە. وەقتێ چۆلەکە چاوی پێ کەوت عەجیب تەیرێکە، شکلی غەریبە، چووە بەردەمی، بەزەلیلی ڕەسمی ئەدەبی بەجێهێنا. قاقنەز تەماشای حالاتی چۆلەکەی کرد، سوئالی کرد: بۆچ عاجزیت؟ ئەگەر واسیتەی برسیەتییە، دوو سێ ڕۆژ لێرە بە، بە

ئیسراحەت بیووژێرەوە. وەئەگەر دەردێکی کەت هەیە، بەیانی بکە، بە قەدەر ماڵ سەعی بکەم. چۆلەکە بە گریان حالاتی زوڵمی واشەی بۆ قاقنەز گێڕایەوە. وەقتێ قاقنەز ئەو قسانەی بیست، دڵی گڕی سەند، وتی: دڵ خۆش بە ئینتیقامت ئەسێنم. ئیمشەو ئاگر ئەنێم بە هێلانەی واشەوە، خۆی و بێچووەکانی ئەسووتێنم. چۆلەکەکە دڵ خۆش بوو. قاقنەز وتی: هێلانەی خۆتم نیشان بدە. بەبێ خۆف لای چۆلەکەکانت ئیسراحەت بکە. شەوێ من دێم بۆ لای تۆ، وەرە هێلانەی واشەکەم نیشان بدە، ئاگریان تێ بەر ئەدەم. چۆلەکە بە دڵێکی خۆش ڕووی کردەوە هێلانەکەی. وەقتێ شەوی بەسەراهات، قاقنەز میقدارێ ئاوجنسی خۆی کۆکردەوە، میقدارێ نەفت و گۆگردیان هەڵگرت، ڕوویان کرد بۆ لای چۆلەکە، بە ئیشارەتی چۆلەکە هێلانەی واشەیان دۆزییەوە. واشە لەگەڵ بێچووەکانی ئیسراحەت نووستبوون. قاقنەز نەفت و کیبریتیان ڕژانە هێلانەی واشە، لەپڕ گڕی سەند. واشە و بێچووەکانی عومووم سووتان. چۆلەکەکان لە هیلاکەت نەجاتیان بوو.

دیمنە وتی: ئەم مەسەلەیەم بۆیە هێنایەوە ئینسانی بچووک هەر چەند قووەتی نییە، ئەمما فکری بە قووەتی هەیە.

کەلیلە وتی: مەعلوومە حالی حازر شەترەبە وەزیرە، ڕوتبەی لە عوموومی ئومەرا زیاترە، ساحێب قووەتە. شێر بێ تەدبیری شەترەبە دەست بۆ هیچ ئیشێ درێژ ناکات. حورمەتی زۆر لای شێر پەیدا کردووە، دەرچوونی مەحبەتی شەترەبە لە دڵی شێر زۆر زەحمەتە، چونکی پادشاهان ڕوتبەیان بە هەر کەس عەتا کردو ڕووی مەحەبەتیان بە هەرکەس دا، بە خیانەتێکی گەورە نەبێ مەئموور عەزڵ ناکا.

دیمنە وتی: لەوە زیاتر تەدبیری پاشا عومووم لای من بوو، وە ئێستا من مەحرووم بووم، شەترەبە لە جێگەی من وەزیرە. مومکینە بەم نزیکانە شێر بە واسیتەی شەترەبەوە تووشی زەرەر ببێ. حوکەما فەرموویانە: واسیتەی موڵک وێرانیی پادشاهان شەش دەرەجەیە. ئەووەڵ دووورکردنی عولەما لەخۆی. دووەم لەشکری بێ سیلاح بنێرێتە سەر دوشمن. سێهەم قەهراوی و بەقسەی ژنان موعامەلە بکات. چوارەم ئەمر بکات بەوێرانیی مەملەکەت. پێنجەم توند تەبیعەت و ساحێب زەجرو لێدان بێ. شەشەم خولقی جەهلی بێ، مەسەلا لە جێگەی سولح ئەمر کات بەشەڕ. لە جێگەی شەڕ ئەمرکات بە سولح. سولح وە یا شەڕ هەر یەکە لە جێگەی خۆی بەکار دێت. لە جێگەی گوڵ، گوڵ بڕوێنە، لە جێگەی دڕک، دڕک.

کەلیلە وتی: وا ئەزانم بۆ کوشتنی شەترەبە پشتینت بەستووە ئارەزوو ئەکەیت شەترەبە بە هیلاکەت بەریت. بۆت مەعلووم بێ هەر کەس ئارەزووی ئازاری کەسێکی بێت، ئاخری پەشیمانیی لە دوو دێت، وە هەر کەس تەماشای خراپە بکات و عیبرەتی لێ وەربگرێت ئەوەی بەسەر دێت بەسەر پادشا زاڵمەکە هات:

ئاخری کەوتە سەر ڕێگەی چاکە.

دیمنە پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

کەلیلە وتی: ئەگێرنەوە لە مەو پێش پادشایێک بوو زاڵم، دەستی تەعەددای بەسەر ئەهلی مەملەکەتدا درێژ کردبوو، ڕەعیەت هاتبوونە ڕەزالەتەوە، دەستی دوعایان بۆ ئاسمان بڵند کردبوو. ڕۆژێ پادشا چوو بۆ ڕاو. وەقتێ لە ڕاو هاتەوە ئەمری کرد بە جارچی بەناو مەملەکەتدا جاڕ بدات لەسەر ئەمری پادشاه هەر کەس ماڵی کەسێ بدزێ وەیا بیخوات، لە جیاتی یەک فلس یەک دانی دەرئەکێشرێت، وەهەرکەس قەتڵ بکات ئەکوژرێتەوە، وەهەرکەس عەرەق بخوات قەتران ئەکرێتە قوڕگیەوە، وە هەر کەس دزیی کرد دەستی ئەبڕن. زوڵم کردن نەما. شارەکە ئەمین بوو. وای ڕەعیەت خستە ئیسراحەتەوە دەرگایان بە شەو دانەئەخرا، حەیواناتیان بێ پاسەوان ئەچوە سەحراو ئەهاتەوە ماڵی ساحێبی.. ڕۆژێ یەکێ لە مەحرەمەکانی خاصە سوئالی لە پادشاه کرد: وەرگەڕاندنی زوڵمەت بە عەدالەت واسیتەی چی بوو؟ پادشاه جوابی دایەوە وتی: ڕۆژێ چووم بۆ ڕاو، تەماشام کرد سەگێ پەلاماری ڕێوییەکی دا، قاچی شکاند. ڕێوی لە ترسا خۆی کرد بە کونێکدا. ئەوەندەی بەین نەبوو کابرایێ بەردی لە دەست بۆوە دای لە قاچی سەگەکە، قاچی شکا. ئەوەندەی بەین نەبوو ئولاغێ لەقەی دا لە قاچی کابرا، قاچی کابرا شکا. میقدارێ ڕێگە ڕۆیشتێ، قاچی ئولاغەکە چوو بە کونەمشکدا، قاچی شکا. وەقتێ ئەمانەم دی فکرم هاتەوە سەرخۆم، بۆم مەعلووم بوو ئاخری خراپە خراپەیە. لەو واسیتەوە تەرکی زوڵمم کرد.

کەلیلە وتی: ئەم میسالەم بۆیە هێنایەوە لە ئیشی خراپە بترسیت.

حەدیسی سەحیحە: (من حفر بئرا لاخیه وقع فیه). بیر بۆ هەر کەسێ هەڵکەنی بە نسیب خۆت ئەبێت.

دیمنە وتی: من فکری زوڵمم نییە. مەزڵووم ئیددیعای حوقوقی لە زاڵم کرد گوناهی

نیه. مەزڵووم فکری ئازاری زاڵم بکاتەوە بە ئازاری بگەیەنێت، زۆر پێ خۆشحاڵ ئەبێ.

کەلیلە وتی: وام بۆ مەعلووم کراوە بە ڕەحەتی شەترەبە بۆ تۆ دوور ناکەوێتەوە چونکی شەترەبە قووەت و ڕەفیقی لەتۆ زیاترە و لەتۆ گەورەترە. بچووک موقابەلەی لەگەڵ گەورە پێ ناکرێ.

دیمنە وتی: بیناغەی ئیش بە قووەت و گەورەیی نییە. تەدبیر و عەقڵ لە قووەت و گەورەیی زیاترە. ئەوەی بە تەدبیر دروست ئەبێ، بە قووەت چار ناکرێت. مەگەر نەتبیستووە قەلی بە تەدبیر و حیلە مارێکی لەناو برد؟

کەلیلە وتی: چۆن بووە، بەیانی بفەرموو.

**حیکایەت**

دیمنە وتی: بیستوومە قەلێ لە کونە بەردێ لەسەر شاخێک هێلانەی دروست کردبوو، نزیک بە هێلانەکەی کونە مارێ بوو. ئەو مارە بێ ڕەزا بوو، بە هەناسەی گیای سەوزی وشک ئەکرد. ئاوی دەمی زەهری هیلاکەت بوو. هەر وەقت قەل بێچووی هەڵئەهێنا، مارەکە ئەچوو ئەیخوارد. جگەری قەلەکە کون کون بووبوو. قەل شکاتی ئەو زوڵمەی بردە لای چەقەڵ. بەچەقەڵی وت: ئەی ڕەفیق پەرێشان بووم بە دەست زوڵم کردنی ماری بەد ئەتوارەوە. فکرم هەیە حەقی خۆم لە مار بسێنم. چەقەڵ وتی: بە چ فکرێ حەقت لە مار ئەسێنی؟ قووەتت بەسەر مارا مومکین نییە. قەل وتی: فکرم ئەوەیە وەقتێ مار خەوی لێ کەوت، ئەچم بە چنگ چاوی دەردێنم. وەقتێ کوێر بوو نیقتیداری نابێ بێتە سەر هێلانەکەم بێچووەکانم بخوات. چەقەڵ وتی: ئەو فکرەی تۆ لەعەقڵی عاقڵان دوورە. عەقڵداران بەو ئەوعە خۆیان تووشی هیلاکەت ئەکردووە. ئەبیت بە ماسیگرەکە. بۆ مردنی قرژانێک خۆی بە مردن دا.

قەل پرسی: چۆن بووە، بەیانی بفەرموو.

**حیکایەت**

چەقەڵ وتی: ماسیگرێ بوو. لەسەر گۆمە ئاوێ قەراری گرتبوو. ناو گۆمەکە پڕ بوو لە ماسی. ڕۆژ بە ڕۆژ بە قەدەر کیفایەت ماسی ئەگرت، ئەیخوارد. چەند ساڵێ بەو ئەوعە ئیدارەی ئەکرد. وەقتێ پیر بوو قووەتی نەما، لە گرتنی ماسی سست بووبوو. بەخۆی وت. بەپیری گەیشتم. لەسەر ئەم ئاوە زەخیرەم نییە. وەقت نەماوە. وا چاکە بە حیلە میقدارێ

زەخیرە دابنێم بۆ پاشە ڕۆژ. بە عاجزی، بە شەلە شەل چووە قەراغ ئاوەکە. قرژانگێک چووە پێشدەمی ماسیگرە سوئالی کرد: بۆچ وا عاجزیت؟ ماسیگرە جوابی دایەوە: مردنم لەم حالە خۆشترە و لە تۆ مەعلومە ژیانی من بە واسیتەی ماسیی ئەم گۆمەوەیە. چەند سالە من کەم خواردن نەبووم، وە ماسییەکانیش کەم نەبوونەوە. ئیمڕۆ تەماشام کرد دوو پیاوی تۆڕەوان بە قەراغ ئێرەدا ڕۆیشتن، وتیان ئەم گۆمە ماسیی زۆرە. یەکێکیان وتی: فلان جۆگە ماسیی زۆرە، لازمە ئیمڕۆ بچین ماسیی ئەو جۆگەیە بگرین. بۆ سبحەینێ دێینەوە. ماسیی ئێرە عومووم ئەگرین. لەو وەقتەوە ئەو قسەیەم بیستووە، ڕۆح هاتووەتە سەر دەنووکم. قرژانگ ئەو قسەی لە ماسیگرە بیست. گەڕایەوە خەبەری بە ماسییەکان دا. ماسییەکان کەوتنە مەراقەوە تەدبیریان کرد لەگەڵ قرژانگ بچنە خزمەت ماسیگرە چارەیان بۆ بدۆزێتەوە. عوموومی ماسییەکان لەگەڵ قرژانگ چوون بۆ لای ماسیگرە، وتیان: لە زوبان جەنابتەوە قسەیەک بە ئێمە گەیشتووە، دەرمانی چییە؟ تەدبیرێکمان بۆ بدۆزەرەوە. حوکەما فەرموویانە: دوشمنی عاقڵ لە دۆستی نەزان چاکترە. وەمەعلوومی جەنابتانە ژیانی تۆ بە واسیتەی ئێمەوە مومکین ئەبێ. نابێ قوبووڵ بکەیت نە جەنابت و نە ئێمە تووشی هیلاکەت ببین. مەسلەحەت چییە بەیانی بفەرموو.

ماسیگرە وتی: لەو وەقتەوە ئەو قسانەم بیستووە، هێزی ئەژنۆم نەماوە. لەوە زیاتر بە چاک نازانم ئێوە نەقڵ بکەم، لەم نزیکانە گۆمێ شارەزام، ئاوێکی ڕووناک، زیخی، وەک پیرۆزە دیارە، لە ڕێگەی بەنی ئادەمەوە دوورە، قووڵیی گۆمەکە بە ئەوعێکە هیچ غەوواسێ ناتوانێ بچێتە ناوی، وە ئەگەر قوبووڵ ئەکەن عوموومتان ئەقڵی ئەو گۆمە ئەکەم. ماسییەکان عوموومی قوبووڵیان کرد، وتیان وەقت درەنگە. ماسیگرە وتی: لازمە هەر ڕۆژێ میقدارێکتان نەقڵ بکەم. ماسییەکان ڕازی بوون. ماسیگرە ڕۆژێ میقدارێ ماسیی بە دەنووک ئەبرد لە دەوری گۆمەکە ئەیخوارد. چەند ڕۆژێ بەو فێڵە ماسیی ئەخوارد. ئەمما ماسییەکان ئەوی باقی مابوون دەخیل و ئامانی ماسیگرە ئەبوون زوو ئەقڵیان بکات. قرژانگ فکری گۆمی تازەی کەوتە سەر. ڕووی کردە ماسیگرە: لازمە ئەقڵم بکەیت، بۆ ڕەفیقەکانم بێ تاقەت بووم. ماسیگرە فکری کرد دوشمنی لەمە زیاتر نییە، وا لازمە ئەمیش بە جێگەی ئەوان بگەیەنم. خواردنی ئەم ماسییانە سەهلە. قرژانگی هەڵگرت، ڕووی کرد بۆ جێگە ئێسقانی ماسییەکان. وەقتێ قرژانگ چاوی بە ئێسقانی ماسییەکان کەوت بۆی مەعلووم بوو قسەی ماسیگرە فێڵ بوو، درۆیە. قرژانگ فکری کردەوە وتی: عاقڵ بۆی مەعلووم کرا دوشمن قەسدی ئەکات، سەعی بۆ نەجاتی

نەکات زۆر بێ غیرەتییە. وە ئێستا من بۆ نەجاتی خۆم سەعی بکەم حاڵ لە دوو نەوع خالی نابێ. ئەووەڵا ئەگەر نەجاتم بوو بە مەردی ناو ئەبرێم. وە ئەگەر نەجاتم نەبوو ناو گوم ئەکەم هەروەک وتوویانە: دوشمن ڕوو بە ڕوو هات، بۆ دەفعی زەرەر پەلە کردن لازمە تا ڕۆح دێتە دەر. قرژانگ هەردوو قاچی برد بۆ گەردەنی ماسیگرە، توند گرتی. ماسیگرە قووەتی نەمابوو لەبەر پیری، بێ هۆش بوو، کەوتە خوارەوە، مرد، ڕۆحی دەرچوو. قرژانگ لەگەردنی بووەوە، ڕووی کردەوە جێگەی ئەووەڵی. خەبەری حیلەی ماسیگرەی بۆ باقیی ماسییەکان بەیان کرد. تەعزییەی مردنی ماسییەکان لەفکر چووەوە لە خۆشیی مردنی ماسیگرە.

چەقەڵ بەقەلی وت: ئەم میسالەم بۆیە هێنایەوە تا بزانیت زۆر کەس بوون بە مەکر و حیلەی خۆیان لەناو چوون (ولا یحیق المكر السيىء الا بأهله). بۆت مەعلووم بێ من ڕێگەیەک بە تۆ نیشان ئەدەم باعیسی نەجات بێ ئەگەر موقتەدیری.

قەل وتی: هەر ئەمرێ لە تەرەف جەنابتەوە بکرێ باعیسی مەمنوونییە. چەقەڵ وتی: ڕوو بکەرە ئاوەدانییەک، لیباسێ هەڵخرابێ، بەدەنووک هەڵیگرە. وردە وردە بفڕە، لە چاو ساحێب لیباسەکە گوم نەبیت هەتا ئەگەیتە سەر مارەکە، لیباسەکە بدە بەسەر مارەکەدا. وەقتێ ساحیب لیباس چاوی بەمار بکەوێ ئەیکوژێت، تۆ لە دەست زوڵمی مار نەجاتت ئەبێ. قەل بەو تەدبیرە ڕووی کردە ئاوەدانییەک، تەماشای کرد ژنێ بە غوسڵ کردن خەریکە. قەل دەنووکی مالی بە سرکەییی ژنەکە دا، بردی. ژنەکە خۆی پۆشتە کردەوە، شوێن قەل کەوت هەتا نزیک بە کونەمار بووەوە. قەل سرکەییی خستە خوارەوە بەسەر مارەکەدا. وەقتێ ژنەکە نزیک بە سرکەیی بووەوە، چاوی بە مار کەوت، بەردی بۆ مار هاویشت، کوشتی. چوو سەری پان کردەوەو سرکەییەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت.

دیمنە وتی: هێنانەوەی ئەم میسالە بۆ ئەوە بوو تا بۆت مەعلووم بێ ئەوەی بە تەدبیر دروست ئەبێ، بەقووەت مومکین نابێ.

کەلیلە وتی: شەترەبە قووەت و فکری لە تۆ زیاترە، هەرچەند تۆ مەکر و حیلە کۆبکەیتەوە، شەترەبە بەیەک دەقیقە بڵاوی ئەکاتەوە. مومکینە تۆ لە کەمینی شەترەبە نەجاتت نەبێ، شەترەبە ئیشی تۆ تەواو ئەکات. قسەی کەروێشکەکەت نەبیستووە، فکری گرتنی ڕێوییەکەی کرد، خۆی تووشی بەلا کرد.

دیمنە وتی: چۆن بووە؟

کەلیلە وتی: ئەگێڕنەوە گورگێکی برسی لە سەحرا بۆ خواردن ئەگەڕا، تووشی کەروێشکێ هات لەبن سێبەری دەوەنێکدا نووستبوو. گورگ ڕووی کردە کەروێشک. کەروێشک خەبەری بووەوە. فکری ڕاکردنی بوو، گورگ بانگی کرد، وتی: خۆت هیلاک مەکە، بێ فائیدەیە لە دەستم دەرناچیت. کەروێشک لە ترسا لە جێگەی خۆی وشک بوو. بە گریانەوە وتی: ئەزانم ئەمیری حەیوانات برسیەتی بێ تاقەتی کردووە ئەمما بە زەعیفیکی بۆن ناخۆشی وەک من تێر ناخوات، وە ئەگەر بە مەسڵەحەتی ئەزانیت لەم نزیکانە کونە ڕێوییەک شارەزام. لەبەر قەڵەوی قووەتی ڕۆیشتنی نەماوە. وام بۆ مەعلووم کراوە گۆشتی لە ئاوی حەیات خۆشترەو لە شەکر شیرینترە. وە ئەگەر بە زەحمەتی نەزانیت، من بە فێڵ دەرخواردی جەنابتی ئەدەم. کیفایەتی خواردنی تۆ ئەکات. وە ئەگەر ئەدۆزرایەوە بەندە ئەسیرم لە ژێر دەستی جەنابتا هەر نەوع ئارەزوو ئەکەیت حەددی زیادیم نییە. گورگ بە قسەی کەروێشک ڕازی بوو. ڕوویان کرد بۆ کونی ڕێوی، ئەمما ئەو ڕێوییە زۆر زیرەک و عاقڵ بوو، دەرسی شەیتانی دا ئەدا. دنیای زۆر دیبوو، چەند هەزار تەڵەی بەبای کلکی تەقاندبوو، لە زیرەکیدا بێ ئەمسال بوو. کەروێشک لەگەڵ ئەو ڕێوییەدا لە قەدیمەوە مونازەعەیان بووبوو. بە فرسەتی زانی حەقی خۆی بکاتەوە. گورگی هێنایە دەرگای کونە ڕێوی. خۆی چووە ژوورەوە، سەلامی لە ڕێوی کرد بە ڕەسمی خۆیان. ڕێوی ئیحتیرامی زۆری گرت. سوئالی لە کەروێشک کرد: مومکینە بە ئیشێ تەشریفت هاتبێ؟ کەروێشک وتی: موددەتێکە بە خزمەتت نەگەیشتووم و لە قوسووریم ببوورە، وە ئێستا فروستادەم لە تەرەف عەزیزی میسرەوە داخل بەم ناحیە بووە، شۆرەتی سالحیی جەنابتی بیستووە، ئیرادەی چاوپێکەوتنی جەنابتی هەیە، وە ئەگەر تەشریفت ئاردا[illegible] چاوپێکەوتنی پادشاە ئەفەرموویت، موبارەکە. وە ئەگەر وەقت موساعەدە [illegible]کات، دەفعەیەکی کە بە خزمەت نەگەین. حالی حازر پادشا لە دەرەوە وەستاوە، وە [illegible] جەنابتە. ڕێوی لە قسەکردنی کەروێشک بۆی مەعلووم کرا ئیش لە کوێیە. ف[illegible] کرد وا لازمە زەهری خۆیان دەرخواردی خۆیان بدەم. لە پاشا ڕێوی هەستا، وتی: دائیما بۆ خزمەتی میوان سفرەم کردووەتەوە، وە خواردن لای من ئینتیهای نایەت. لازمە تەعامێ حازر بکەم لایقی خواردنی عەزیزی میسر بێت، چونکی عەزیز منی سەربەرز کردووە. لازمە خانووەکە پاک بکەمەوە وە فەرشی لایقانە ڕابخەم. کەروێشک وای بۆ مەعلووم کرا زوبان لووسی تەنسیری لەڕێوی کردووە. کەروێشک وتی: قوربان، زەحمەت لازم ناکات.

عـەزیز پیـاوێکی بێ هەوایە. ئارەزووی تەعـام و جـێگە ناکـا ئیللا ئەوە نەبێ و بۆ تەبەڕروک هاتۆتە خزمەتت. ڕێوی وتی: «ازا انزل الضیف، نزل برزقه». شەرتی میوانداری لازمە. من حازرم. کەروێشک چووە دەرەوە، مژدەی بە گورگدا ڕێوی خەڵەتا. (لکل جدید لذة)، تەعریفی گۆشتی ڕێویی بۆ گورگ کرد. گورگ بۆ خواردنی گۆشتەکەی دانی تیژ کرد، ئەمما ڕێوی لەوەپێش چاڵێکی قووڵی لە کونەکەدا هەڵکەندبوو، بۆ ڕۆژێکی تەنگانە سەری چاڵەکەی بە پووش داپۆشیبوو، لە جێگەیەکی کەوە کونێکی بۆ دەرچوونی خۆی کردبوو، ڕێوی ڕێگەی ئەووەڵی گوم کرد، ڕێگەی خستە سەر چاڵەکە. لە کونەکەوە بانگی کرد: فەرموون، میوانی خۆشەویست! کەروێشک بەشەوقێکی تەواو، گورگ بە ئارەزووی گۆشت خواردن، چوونە کونە ڕێوییەوە، وەقتێ بە خۆیان زانی هەردووکیان کەوتنە چاڵەکەوە.

گورگ بۆی مەعلووم بوو فێڵی کەروێشکە، پەلاماری کەروێشکی دا، هەڵیدڕی، خواردی. ڕێوی بەسەلامەتی لە کونەکە چووە دەرەوە.

کەلیلە وتی: ئەم میسالەم بۆیە هێنایەوە بۆت مەعلووم بێت ئینسانی عاقڵ تووشی داوی بەلا نابێت، وە کەسێ عەقڵی بوو بە قسەی فێڵ باوەڕ ناکات.

دیمنە وتی: چاک ئەفەرموویت، ئەمما بۆم مەعلووم بووە شەترەبە مەغروورە وە لە فکری من بێ خەبەرە. نازانێ من دوشمنیم دەرحەق پەیدا کردووە. حیلە لە دۆستایەتیدا دروست نەبێ، مەگەر حیکایەتی بێچوە شێرەکەو کەروێشکەکەت نەبیستووە چۆن کەروێشک بە عەقڵ وردیی خۆی شێری لەناو برد؟

کەلیلە پرسی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

دیمنە وتی: ئەگێڕنەوە لە ئەترافی بەغدا سەوزاییەک بوو بۆنی بەهەشتی لێ ئەهات. گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ عەکسی چاوی ئەبرد. لە هەموو نەوع حەیوانات و دڕوندەو باڵندە جێگەیان تیا دروست کردبوو. لە نزیک ئەو باغە شێرێکی توند تەبیعەت پەیدا بوو بوو. هەموو ڕۆژ میقداری حەیواناتی ئەو باغەی ئەگرت ئەیخوارد. حاڵی حەیوانەکان زۆر تەهلوکە بوو، ئیسراحەتیان نەمابوو. نیهایەت ڕۆژێ عومومی حەیوانەکان کۆبوونەوە چوونە خزمەت شێر، ئیزهاری خزمەتکارییان کرد، شێریان بە پادشای خۆیان قەبووڵ کرد. قەراریان دا لەژێر ئەمری شێر ئەچنە دەرەوە. وتیان: ئەی پادشاە، ئێمە لە ژێر حیمایەی

جەنابتا ئەژین و تەدبیرێکمان بەدەستەوەیە، ئەگەر موافەقەت ئەفەرموویت. شێر وتی: بەیانی تەدبیرەکەتان بکەن. وتیان: فکرمان هەیە قورعە بکێشین، ناوی هەرکەس دەرچوو ئەو ڕۆژە بۆ خواردنی جەنابت حازر بکرێت. ئەمری جەنابت چییە؟

شێر موافەقەتی کرد. وتیان: لازمە لە جەنابت شەرت و پەیمان وەربگرین، وە ئێمە ئەمینی لە حاڵی خۆمان پەیدا بکەین. شێر بە ڕەسمی خۆیان شەرت و قەراریان بەست. چەند موددەتێ لەسەر ئەو قەرارە دەوامیان کرد. ناوی هەر حەیوانێ لە قورعە دەرئەچوو، پوختیان ئەکرد، لەبەردەمی شێر دائەنرا ئەیخوارد.

ڕۆژێ قورعە بەناوی کەروێشکێک دەرچوو، بۆ خواردنی شێر حازرکرا. کەروێشک ڕووی کردە ڕەفیقەکانی، وتی: ئەتوانن سەعاتێ تەئخیرم بکەن هەتا لەدەست زوڵمی ئەم بێ ڕەحمە نەجاتتان بدەم؟ وتیان: موبارەکە. کەروێشک تەئخیر بوو تا میعادی خواردنی شێر بەسەرچوو. شێر کوورەی قەهری داگیرسا. دانی بە دانا ئەنا، کەروێشک هێواش هێواش چوو بۆ خزمەتی شێر. تەماشای کرد شێر برسییەتی بێ تاقەتی کردووە، مووی بەدەنی ڕاست بووەتەوە، کلک بە ئەرزدا ئەماڵێ، نزیک بەوە بووە شەرت بشکێنێ. کەروێشک بە ملێکی کەچەوە سەلامی لە شێر کرد. شێر بە توندی جوابی دایەوە، پرسی: ئەحواڵی حەیوانات چۆنە؟ کەروێشک وتی: لەسەر ڕەوشتی قەدیم ماون. ئیمڕۆ بۆ ناشتای جەنابت کەروێشکیان حازر کردبوو، من هێنام بۆ خزمەتت. لە ڕێگە تووشی یەک شێر هاتم، بە زۆر کەروێشکەکەی لێ سەندم. هەرچەند پاڕامەوەو تەبلیغم کرد: ئەمە بۆ خواردنی پادشای حەیوانات حازر کراوە وجوودی ئەزانیم، وتی: لایقی خواردنی منە. کەس ئیقتیداری نییە لە من زیاتر لایقی پادشایی بێت، ئەی پادشا! ئەوەندە لاف و خۆهەڵکێشانی کرد، من بێ تاقەت بووم، فیرارم کردو داخل بە خزمەتی جەنابت بووم.

شێری برسی دەماری قەهری کەوتە حەرەکە، ڕقی هەڵسا، وتی: عەجەبا کەسێ هەیە موقابەلەی قووەت و پەنجەی من بکات! ئەی کەروێشک، ئەتوانی جێگەی ئەو شێرە بە من نیشان بدەیت، ئینتیقامی تۆو حەققی خۆم بکەمەوە؟ کەروێشک وتی: قوربان، چۆن ناتوانم، چونکە ئەوەندە قسەی بێ ئەدەبانەی دەرحەق جەنابت کردووە، مومکینم بوایە کاسەی سەریم ئەکرد بە ئاوخۆری ڕێبواری سەحرایی. ئەوەی وت و پێش شێر کەوت. شێری دڵ ساف بەفریبی کەروێشک مەغروور بوو. کەروێشک شێری بردە سەر بیرێ. ئاوی بیرەکە لە نیهایەتی ڕوونییا بوو بێ شوبهە عەکسی ئینسان دیار بوو. کەروێشک

وتی: ئەی پادشا، دوشمنی غەددار لەناو ئەم بیرەدایە. بە تەنها ناتوانم بچمە سەر بیرەکە. لازمە پادشا من بگرێتە باوەش، هەتا ئەو غەدداره نیشان بدەم. شێر کەروێشکی گرتە باوەش، چووە سەر بیرەکە، چاوی بە سوورەتی خۆی کەوت، وایزانی شێرەکەی دوشمنی کەروێشکی بەدەمەوە گرتووە. چاوی تاریک بوو. کەروێشکی دانا، خۆی خستە ناو بیرەکەوە، نقوم بوو، خنکا. کەروێشک بەسەلامەتی گەڕایەوە لای ڕەفیقەکانی. خەبەری مردنی شێری بە حەیوانەکان دا، وتی:

لوقـــــــمـــــەیەک لە پاش زاڵمی بێ دین

خـــۆشـــتـــرە لە عـــومـــری ســـەد ســـاڵە ژین

عـومـوومی حـەیوانەکان ئافـەرینیـان لە کەروێشک کرد. حـەمدو سـەنای خـوایان بەجێ هێنا.

دیمنە وتی: هێنانەوەی ئەم مـیـسـاڵەم بۆ ئەوەبوو بزێت مـەعلووم بێ ئەوەی بە عـەقڵ دروست ئەبێ، بە قووەت مومکین نابێ.

کەلیلە وتی: هیلاک بوونی شەترەبە بەبێ زەحمەت مومکین نابێ، وە ئەگەر زەحمەت بەشێـر بکات زۆر بێ ئەدەبیـیـە چونکی عـاقـڵان بەرەحـەتیی خـۆیان زەحـمـەتی وەلی نیعـمەتیان نەداوە، ڕجا ئەکەم لەسەر ئەم فکرە لاچۆ، وە ئەگەر بەقسەم ناکەیت ڕەفاقەتمان لەیەک حەرامە.

دیمنە ڕووی لە کەلیکە وەرگێڕا لە ڕەفاقەت جیابوونەوە. دیمنە لە وەقتێ فرسەتدا نزیک بەشێر بوو. بە ملێکی کەچەوە دەستەو نەزەری شێر وەستا.

شێر وتی: موددەتێکە دیار نیت، قودوومت خێر بێ.

دیمنە وتی: ئومێد ئەکەم ئاخری خێر بێ. شێر وتی: حەوادیسات چییە؟

دیمنە وتی: ئەی شاهم، خەبەرێکم بیستووە. ئەگەر ئەمری جەنابت هەیە بەیان بکرێت. شێر وتی: مەسـئەلە چییە، بیگێڕەوە. دیمنە وتی: لازمە بە خەڵوەتی یەکە یەکە عەرزی جەنابتی بکەم. شێر وتی: ئێستـا فرسەتە، لەمـە خەڵوەتی زیاتر نابم. تەئخیر بەقـسە مەدە. تەئخیر بوون ئافاتی لێ پەیدا ئەبێ. مەعلوومە گۆشت دوو ڕۆژ مایەوە بۆن پەیدا ئەکا. هەتا گرێ نەهاتووەتە ڕێگە، قسە بەیانی بکە، بەڵکی زوو عـیلاج بکرێت. دیمنە وتی: مەعلوومی جەنابتە قسەی حەق لەبەر تەبیعەت زۆر ناخۆشە. دەرمانی دەرد لای نەخۆش زۆر تاڵە. لازمە ئەو کەسەی گوێ لە قسە ئەگرێت تێگەیشتنی بێ. یەکە یەکە

قسه وەرگرێ، بیخاته ناو دڵیەوەو قوفڵی لێ بدات. شێر وتی: خۆت ئەیزانی من لە عومومی پادشاهان بە فکر ترم، وە عەقڵم بە هەموو نەوعە قسەیەک نەشکێ، وە خوسووس کەسێ لە مەکتەب دەرچووەو لە قانوون شارەزایە بە مەئموور دامناوە. وەتۆیش لازمە هەر حەوادیساتێکت بیستووە بۆم بەیان بکەیت. دیمنە وتی: بەندە لەڕووی جەنابتا خوبراتم پەیدا کردووەو موورەخەس کراوم بۆ هەر نەوع خوبراتێ تەقدیمی جەنابتی بکەم. وە مەعلوومی زاتی پادشایە بەندە نمەک بە حەرام نەبووم. بۆ بەرز بوونەوەی پادشا زۆر سەعی نەکەم و دڵی پادشا بەردی مەحەکە، وە عومومی ئومەراو ڕەعیەت لە جەنابت مەعلووم بووە. شێر وتی: بۆم مەعلووم بووە خیانەت لەتۆ نابینرێت، وە زیرەکی و عەقڵی لە عومومی ئومەرا ئاشکرابووە، وە قسەی تۆ موشابەهەی غەرەز ناکا. دیمنە وتی: عومری پادشاه بەرقەرارێ لازمە تەفتیشی ئەحواڵی ئومەرا بکات، وە ئومەرایش لازمە ڕۆحی خۆی فیدای سەری پادشا بکات. حوکەما فەرموویانە: سێ نەوع هەیە لازمە ئاشکرا کردنی. ئەووەڵ خیانەت لە پادشاه. دووەم بەیان کردنی ئازار لای حەکیم. سێیەم ئاشکرا کردنی فەقیری لای دۆست. هەرکەس ئەمانە ئاشکرا نەکات خەیانەتی لە نەفسی خۆی کردووە. شێر وتی: حەلالزایەتیر، تۆ لەمەوپێش لە من مەعلووم بووە، لازم بەدرێژە ناکات، حەوادیس چییە بیگێڕەوە هەتا زووە بەتەدبیر جێ بەجێ بکرێ.

دیمنە بۆی مەعلووم بوو هەسانی دا لەبەری پێی شێرو قسەی ڕەواجی پەیداکرد، وتی ئەی پادشاه، شەترەبە لەگەڵ ئومەرا قسەی کردووە بە یەک، وتوویەتی: قووەت و حەمییەتی شێرم بۆ مەعلووم کراوە. ئەگەر قوبووڵم نەکا بەشەریک لەم بێشەیە دەری نەکەم، وە ئێمە خۆمان بەسەربەستی ئیدارە ئەکەین. ئەمە قابیلە بەو نەوعەی تەکەببور پەیدا کات فکری پادشاهی بکات. بە عەقڵ وا ئەزانم شەیتان میزی بە لووتیا کردووە، فکری پادشایی لە مێشکیا تێکەڵ بووە، دەرچوونی زۆر زەحمەتە.

شێر وتی: ئەی دیمنە، بەو نەوعە تۆ ئەیگێڕیتەوە لە عەقڵ دوورە. ئەو مەسئەلەیەت لە کوێ بیستووە؟ حەقیقەتی لە کوێ مەعلووم کراوە؟ ئەگەر شەترەبە ئەو فکرەی کردبێ تەدبیر چییە؟ دیمنە وتی: مەعلوومە ڕوتبەی شەترەبە. لازمە بۆ پادشاهان، کەسێ بەڕوتبە لە پادشاه نزیک بوون، زوو دووری خاتەوە. ئەگەر پادشا ئەوە نەکات ئیش لە دەست ئەچێت، وە عەقڵی جەنابت لە بەندە زیاترە، ئەوەی بە چاک ئەزانی ئەوە بکە. تووڵ کێشانی باش نییە. لەوە ئەترسم بە تەعنە بڵێن:

ئەم ڕۆژە چ ڕۆژێکە کــە عــالەم شـڵـەژاوە
هەر کەس کە بە نەوعێ جگەری قیمە کراوە

حـوکەمـا فـەرمـوویانە: فکری ئینسـان نەوع نەوعـە. ئەووەڵ ئینسـان هەیە دووربینی نەکات، لە پێش ئەوەی تووشی بەڵا بێت خۆی نەجات نەدات. دووەم ئینسان هەیە هەتا بە چاو نەبینێت، ناکەوێتـە پەلەپەل. سێـهـەم ئینسان هەیە وەقـتێ تووشی بەڵا هات (صم بکم) هیچی بۆ ناکرێت، وشک ڕائەوەستێ. موافیقی ئەمانە حیکایەتی سێ ماسیـیەکەیە لە گۆمەکەدا بەیەکەوە بوون. شێر پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

دیمنە وتی: بیسـتوومە گۆمـەئاوێ بوو لە ڕێگەی بەنی ئادەمـەوە دوور بوو. سێ مـاسی لەناو ئەو گـۆمـەدا ئەسـووڕانەوە. تەصـادوف سـاڵێ لە بەهارا باران زۆر باری، لافـاوی ئاو هەڵسا، گۆمەئاوەکەی دڕی. دوو تۆڕەوان ڕێگەیان کەوتە سەر ئەو گۆمە، تەدبیریان کرد بۆ سوبحەینێ تۆڕ بێنن، ئەو سێ مـاسیـیە بگرن. مـاسیـیەکـان لەو تەدبیرە خـەبەردار بوون ئەووەڵـیـان عـاقڵ بوو تەجرەبەی زەمـانی زۆر کردبوو، لەدەست چەند بەڵایەک نەجـاتی بوو بوو، شـەوێ فکری ڕۆیشـتنی کـرد. خـۆی بە خـۆی وت: عـەقڵ و زیرەکی وا دەرئەکـەوێت نزیک بەڵابوو بەشـەو نەخـەوێت. هەر ئەو شـەوە لە گـۆمـەکـە ڕۆیشت. بۆ سـبحـەینێ تۆڕەوانەکـان چوونە سـەر گـۆمـەکـە، تۆڕیان خسـتـە گـۆمـەوە، دوو مـاسـیـەکـەیان گـرت. یەکێکیان فکری کرد: بۆچ وەک ڕەفیقەکەم منیش فیرارم نەکرد؟ پەشیمانیی حاسڵ کرد. فکری کرد، وتی: عـیلاجی دەرد دەرمان پەیداکردنە. وا چاکە بە حیلە خۆم نەجات بدەم، هەرچەندە وتویانە لەوەقتی تەنگانە تەدبیر کار ناکات، ئەمما مومکینە دەفعی بەڵا بکات. ماسییەکە خۆی کرد بە مردوو کەوتە سەر ئاو، تۆڕەوانەکان دەریان هێنا خستیانە قەراخ جۆگـەکە. مـاسی بەهـڵـقە بلێ خـۆی خسـتـەوە ناو ئاوەکـە، لەدەست تۆڕەوانەکـان دەرچوو، ڕۆیشت. مـاسـیـەکـەی ئاخریان لەناو تۆڕەکـەدا مایەوە، مـیـقـدارێ بە ئەترافی تۆڕەکـەدا سووڕایەوە، دەرچوونی نەبوو، تۆڕەوانەکان هێنایانە دەرەوە، گرتیان و ڕۆیشتن.

شـێـر لە گـێـڕانەوەی ئەو قـسـانە فکری کـرد شـەترەبە بکوژێت. بە دیمنەی وت لازمـە تەدبیـرێ لە کـوشـتنی شـەترەبە بکەین. دیمنە وتی: هەتا زوو بیـکـوژێت درەنگە، تەئـخیـر بوونی ئافـات پەیدا ئەکـات. پەروەردەکـردنی بەدئەسڵ ڕێگەی خـەتەرە. شـێـر وتی: زۆر مـەسئەلەیەکی غـەریبـە، چونکی هەتا ئێسـتا لە چاکە زیاتر خراپەم دەرحـەق بەشـەترەبە

نەبووە، وە شەترەبەیش خولقی خراپەی لێ دەرنەکەوتووە، شەترەبە غەک بە حەرام نییە. مومکینە فیتنە ئەو قسانەی بۆ دروست کردبێ. دیمنە وتی: عومومی فەرموودەکانت لایقە، مەگەر نەتبیستووە هەر ڕەنجێ لەگەڵ سپڵە بدرێت زایعە، وە ئەگەر ڕێگەی بەرزبوونەوە بە سپڵە بدەیت سەرچاوەی سەڵتەنەت تێک ئەدات. شێر وتی: ڕێگەی ئیدارەکردن لەگەڵ مەئمووران چۆن دروستە؟ دیمنە وتی: لازمە بۆ نەفسی پادشاهان قەهری زۆر لە مەئموور نەگرێ مەحروومیان بکات، بچنە ژێرحیمایەی دوشمنەوە. ئەوەندە ڕووی شەفەقەت نەکەنە مەئموور، ڕوتبەو ماڵیان لە حیساب دەرچێت، فکری پادشاهیان بکەوێتە سەر.

لەبەینی خۆف و ڕجادا بن. ڕوتبە لازمە بەوەعدەو موددە بێت، دائیما ترس و ئومێدیان چاولێ بێت. لازمە بۆ پادشاە کوشتن و حەپسی و عەفوو ڕوتبەو عەزل کردنی لەگەڵ ئومەرا بێت. ئەگەر بەو نەوعە نەبێ ئومەرا زوو عیسیان ئەکەن. هەریەکە بە فکری بەگلگێکەوە ئەبن.

شێر وتی: ئەی دیمنە، وام بۆ مەعلووم بووە شەترەبە لەو نا ئەسڵ و سپڵانە دوورە، زۆر دڵی سافە، چونکی موودەتێکە نزیک بەخۆمە، لە قانوون و سیاسەت شارەزا بووە، ساحێب وەفایە. وە هەتا ئێستا لە نیعمەت زیاتر زەحمەتی لە من نەدیوە، چۆن ئەتوانێ ئەو قسانە لە ڕووی منا بکات؟ دیمنە وتی: میزاجی خوار بە قەتعی ڕاست نابێتەوە. ئەهلی فەساد قەت پاک نابێتەوە، مەگەر جەنابت لە حیکایەتی کیسەڵ و دووپشکەکە بێ خەبەریت:

شێر پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

دیمنە وتی: ئەگێڕنەوە کیسەڵێ لەگەڵ دووپشکێ ڕەفیق بوون، چەند موددەتێ بەیەکەوە ئیدارەیان کرد، سوێندیان بەسەری یەک ئەخوارد. تەسادوف تەرکی وەتەنیان کرد. ڕێگەی سەفەریان گرتە پێش. میقدارێ ڕێگە ڕۆیشتن. چەم و ئاوێکیان هاتەپێش. دووپشک پەڕینەوەی لە ئاوەکە مومکین نەبوو، زۆر عاجز بوو. کیسەڵ وتی: ئەی ڕەفیق عاجزیت واسیتەی چییە؟ دووپشک وتی: عاجزیم واسیتەی دووریی دیداری تۆیە. لە واسیتەی ئەم ئاوەوە لەیەک جوێ ئەبینەوە. تۆ ئۆغر ئەکەی، زەحمەت کارێکە. ژینم لە پاش تۆ نەبوون مانێکە. کیسەڵ وتی: ئەی ڕەفیق غەم مەخۆ، بە ئاسانی ئەتپەڕێنمەوە. پشتی

خۆم بۆ تۆ ئەکەم بە سەفینە. سنگم ئەکەم بە قەڵغانی سەرت. نامەردییە ڕەفاقەتی خۆشەویست تەرک کردن. حوکەما فەرموویانە:

ڕەفـــیق پەیدا کـــە بە تەجـــرەبە بێ
ڕۆحت فـــیـــداکـــە گـــەر هیـــچت نەبێ

چۆن غیرەتی من قوبووڵ ئەکات لە ڕەفاقەتی تۆ جیا بمەوە. کیسەڵ دوویشکی نایە سەر پشتی، چووە ناو ئاوەکەوە. وەقتێ گەیشتە ناوەڕاستی ئاوەکە گوێی لە تەقە تەقی پشتی بوو دوویشک خێرا خێرا چزووی بە پشتی کیسەڵەکەدا ئەدا. کیسەڵ بانگی کرد: ئەی ڕەفیق، ئەو تەقە تەقە چییە لەسەر پشتم دێت؟ فکرت چییە؟ دوویشک جوابی دایەوە: نووکی چزووم بە پشتی تۆ تاقی ئەکەمەوە. کیسەڵ وتی: ئەی بێ ئینساف، خراپەم چییە؟ ڕۆحی خۆم بەواسیتەی تۆوە خستۆتە گێژاوی ناو ئاوەوە. پشتم بۆ تۆ کردووە بە سەفینە. بەواسیـتـەی منەوە لە ناو ئەجـاتت ئەبێ، وە هەردووکـمـان بەیەکـەوە ڕەفـیـقێن، دوشمنایەتیمان ئەبووە، وە حوقووقی قەدیمت لە فکر ئەما. ئەگەر بە چاکەکردنم نازانیت، پێوەدانت واسیتەی چییە؟ بۆت مەعلووم بێ پەشیمان ئەبیتەوە. سەد دەفعە چزوو بدەیت بە پشتی منا ئازار بە من ناگات. شەرتی دۆستیی تۆ ئەمەیە بەجێی دێنی؟.

دوویشک وتی: سنعەتی من ئەوەیە. لازمە، ئایا لە سەرسنگی دوشمن، ئایا لەسەر پشتی دۆست بێ پێوەبدەم. حوکەما فەرموویانە: هەر کەس بە ئیشێ عادەت بگرێت. تا مردن تەرک بوونی مومکین نییە. وە لەسەر من لازمە دار بێ، بەرد بێ، ئاسن بێ، مس بێ، دۆست بێ، دوشمن بێ پێوە بدەم. کیسەڵ فکری کرد: خزمەت کردنی نەفسی پیس ئابڕووچوونەو ڕێگە گوم کردنە. باعیسی مردنە هەروەک فەرموویانە:

ئاڵتـوون لەسـەر ئەرز هیچ عـیـبی نیـیـە
چاکـە لەگـەڵ بەد زۆر بێ عـەقـڵـیـیـە
ڕەفـیـقی بەدی هیچ خـێـری نیـیـە
پیـسـیی وەک مـارە، فـرسـەتی نیـیـە
بە خـزمـەت کـردن شـیـرینی نیـیـە
تاڵیی گـوژاڵک ئەمـسـاڵی نیـیـە

کیسەڵ خۆی نقوم بەئاو کرد، دوویشک لە پشتی بۆوە، خنکا، مرد.

دینە وتی: بەگێڕانەوەی ئەم حیکایەتە لە پادشاە مەعلووم بێ لە نەفسی پیسی شەترەبە

ئەمین بوون دروست نییە. وە بەقسەی بچووکی وەک من لازمە باوەڕ کردن، چونکی ڕۆح فیدایی من لە جەنابت مەعلووم کراوە، وە قسەیەک بۆنی خێری لێوە بێت، ناخۆشە. مەسەلا حەکیم پارێز بۆ نەخۆش دائەنێ، تەبلیغی ئەکات فلان خواردن موزیرڕە، نەخۆش لای زەحمەتە. بەقسەی حەکیم ناکا. نزیک بە مردن ئەبێ. نەسیحەت ئەگەرچی زۆریش بێ، دەرمان ئەگەرچی تاڵیش بێ، ئەو کەسەی پێویستە لازمە لای خۆش بێ. بێ ئەدەبی نییە لە خزمەتتا ئەیڵێم کەمترینی پادشاهان ئەوەیە لە ئاخری ئیش غافڵە و لە ئەحواڵی ڕەعیەت بێ خەبەرە. وەقتێ قەدەرێ لە پادشاه ڕووی دا. مەئموووران ئەڵێن پادشاه موستەحەققە. کەم عاقڵ بووە، قابیلی ئەو بەڵایە بوو. ئیشێ بە قووەتی خۆت مومکین ئەبێ، سەبرکردنت واسیتەی چییە؟ بۆم مەعلووم بووە. دەست بۆ ئەم ئیشە درێژ ئەکەیت پەشیمان ئەبیتەوە. ئەو وەقتە بە سەد تەدبیر مومکین نابێ. شێر وتی: قسەی بەرزو گران ئەکەیت، لەسەری ئەدەب تەجاوزت کرد. نەسیحەت بە توندی تەئسیر ناکات. شەترەبە فەرزەن دوشمن بوو، چیی لە دەست دێ؟ ئاخری خواردنی منە، چونکی شەترەبە قووەت و گۆشتی لە گیا ئیجاد بووە وەقووەت و گۆشتی من لە گۆشتی حەیوانات ئیجاد بووە. دائیما قووەتی گۆشت لە قووەتی گیا زیاترە. شەترەبە وجوودی لای من بە قەد زەڕڕەیەک نییە. مومکینە وەک تۆ ئەڵێیت ئاخری عومری بێ، لەگەڵ پادشایەکی وەک من موقابەلە بکات. مەعلوومە قووەتی من وەک ڕووناکیی ڕۆژ دیارە، نزیکم بکەوێت بە سووتانێ ئەچێت.

دیمنە وتی: ئەی پادشاهی عومومی حەیوانات، دڵم گری سەندووە. وەک من ئەیزانم جەنابت بێ خەبەری. وە بە قووەتی خۆت مەغروور مەبە. ئەڵێیت: شەترەبە خواردنی منە، لەوە ترساوم هوجووم بکاتە سەرت، چونکی لەگەڵ چەند کەس ئیتتیفاقیان کردووە. بە زوبان لووسی چەند کەسێکی تەفرە داوە.

مێروولە وەقتێ کە تەدبیر ئەکەن<br>
پێست لەبەر شێری تیژ دەرئەکەن<br>
مێشوولەی بچووک ئیتتیفاق بکەن<br>
فیلی بە قودرەت بە ئەرزدا ئەدەن

شێر وتی: قسەی تۆ تەئسیری لێ کردم، بۆم مەعلووم بوو عومومی نەسیحەتە، ئەمما بۆ من زۆر عەیبە، ئەمانم بە شەترەبە داوە، بەبێ خیانەت شەترەبە بشکێنم، چونکە شەترەبە

لەناو مەئمووران ناسراوە، لە ڕێگەی قانوونی دەرنەچووە، لەمەجلیسی ئینتیخابا شۆرەتی پەیداکردووە، لە ئەمری حوکوومەتی عاسی نەبوە. ئەگەر بەبێ خیانەت شەترەبە بکوژم، لە ڕەعیەت مەعلووم ئەبێ ئەشەرت نە وەفا لای من نییە. ئەو وەقتە حورمەتی پادشاهیم نامێنێت. ڕەعیەت ڕێگەی فیراری ئەگرنە پێش.

دیمنە وتی: فکری من ئەوەیە وەقتێ شەترەبە بۆی مەعلووم کرا جەنابت دوشمنی، مومکینە فیتنەو زەرەر بخاتە ناو ڕەعیەتەوە. مەسڵەحەت ئەوەیە تا ئەو خۆی کۆ ئەکاتەوە خەریکی حیلە بێ، جەنابت ڕێگەی حەیاتی لێ قەتع بکەیت.

شێر وتی: شەترەبە لەبەرچاوم ناشیرین بوو، ئەبەدی بەدڵما ناچێتەوە. وا لازمە جوابی بۆ بنێرم لە حودوودی منا نەمێنێت، بۆ کوێ ئەچێت بچێت. دیمنە ترسا ئەگەر ئەو قسەیە بگاتە لای شەترەبە، پاکیتی خۆی لای شێر ئیسپات بکا، دیمنە تووشی داوی بەلا بێت. دیمنە وتی: ئەی پادشاە، ئەم فەرموودەت لە عەقڵ دوورە. قسە لەزوبان، تیر لە کەمان دەرچوو، ناچێتەوە جێگەی خۆی. لازمە ئیزهاری لای خزمەتکاران نەکرێت. باقی بێت لە دڵی خۆتا، چونکی ئەوەی بە زوبان ئیقرار ئەکرێت، دڵ ناگەهدارە. هەر وەقت ئەم قسەیە لای شەترەبە ئاشکرا بوو ئیشی خۆی دروست ئەکا. ئینسانی عاقڵ خۆی لە دوشمن ئاشکرا ناکات. مەسڵەحەت ئەوەیە بە پەنهانی دوشمنیی شەترەبە مەعلووم بکەیت. شێر وتی: بەفکرو بە خەیاڵ یەکەیەکە مەئموور لەناو بردن نیشانەی بێ غیرەتییە. بەدەستی خۆم تەشوێ لە قاچی خۆم بدەم نیشانەی بێ عەقڵییە خیلاف ئەمری شەریعەت ڕێگەی بێ دینییە. بە ئەمری شەرع سوبووتی گوناە بە شاهید وەیا بە ئیقرار دروستە.

دیمنە وتی: موحتاج بە شاهیدو بە ئیسپات ناکا. هەروەقت شەترەبە هاتە خزمەتت، بە عەقڵ ورد بیتەوە بۆت مەعلووم ئەکرێ فکری چۆنە. مەعلوومە عەقڵی جەنابت بەردی مەحەکە. ڕەوشتی عومومی مەئمووران لە جەنابت مەعلووم کراوە. وەقتێ شەترەبە هاتە خزمەتت، چاوی گێژو وێژ کرد، بە ڕاست و چەپی خۆیا ڕوانی، مەعلوومە بۆ وەقتی فرسەت ئەگەڕێ. ئەو وەختە دوشمن شەترەبە مەعلووم ئەبێ، لازم بە شاهیدو ئیسپات ناکا. شێر وتی: ئەگەر ئەو موعامەلە لەشترەبە ئاشکرابوو، بۆم مەعلووم ئەبێت فکری خراپەی کردووە. جەزای بەشیددەت ئەدەمەوە. دیمنە بۆی مەعلووم کرا ئاگری فیتنەی خستە دڵی شێرەوە. فکری کرد خۆی بگەیەنێتە شەترەبە، ئاگری فەسادیش لە دڵی ئەو بەردا. ئارەزووی ئەوە بوو بە ڕوخسەتی شێر بچێتە لای شەترەبە ڕووی کردە شێر وتی:

ڕوخسەتی جەنابت هەیە بچم بۆ لای شەترەبە، حالات و خەبەراتی مەعلووم بکەم، بێمەوە مەسئەلە لە جەنابت بگەیەنم. شێر ئیزنی دا.

دیمنە چووە بۆ لای شەترەبە. وەقتێ نزیک بەشترەبە بۆوە، وەک باوک مردوو خۆی عاجز کرد، چوو بەردەمی شەترەبە، سەلامی کرد. شەترەبە جوابی سەلامی بە تەعزیم دایەوە، بەخێر هاتنی دیمنەی کرد. وتی مووددەتێکە بە خزمەت ناگەین. باعیس بەکەم مەرحەمەتییە. من خۆم بەبچووکی جەنابت حیساب کردووە. دیمنە وتی: ئەگەرچی بەزاهیر دوورم، ئەمما دڵم دایما لە حوزوورایە. مووددەتێکە لە کونجی بە تەنها دانیشتووم، تاقەتی دەرەوەم نەماوە. شەترەبە وتی: واسیتەی تەنهاییت لەبەر چییە؟ دیمنە وتی:کەسێ حوکمی خۆی بەدەست خۆی نەبێت، ئەسیری ئەمری پادشا بێت، ڕۆحی لە تەهلوکەدایە. کەسێ نیقتیداری قسەکردن و هەڵسان و دانیشتن نەتوانێ، مەعلوومە تەنهایی سەلامەتترە. حوکەما فەرموویانە: بەدەست ئاسن بکەیت بە هەویر، چاکترە لە دەست بەسنگەوە گرتن لە پێش گەورە.

شەترەبە وتی: قسە لەمە زیاتر بەیان بفەرموو، بەڵکی نەسیحەتت تەنسیرمان لێ بکات. دیمنە وتی: شەش ئەشیا بێ زەرەر نابێ: دەوڵەمەندی بێ زەرەر، تابیعی دنیا بێ خەفەت، دانیشتن لەگەڵ ژنان بێ بەلا، تەمەعکاری بێ غیرەت بێ پەشیمان بوون، ڕەفیقیی نامەرد بێ زەلیلی، خزمەتی پادشاه بێ بەلا. هەرکەس تووشی زەحمەتی دنیا نەیەت، نانی دەست ناکەوێت. تەمەعکار دائیما زەردو زەعیفە. ڕەفیقی ژنان لە بەحری دەردو گوناها گومە. ڕەفیقی نامەرد لە حەپسی زیاتر مەنفەعەتی بۆ ڕەفیق نییە.

خزمەتکاری پادشاه دایم مەحرووم و موحتاجە. حوکەما فەرموویانە: نزیک بەپادشاه وا دانراوە، بەحری هەمە نەوع تاڵ و سوێراوە. شەترەبە وتی: بە قسەی جەنابتا وا مەعلووم ئەکات لەگەڵ شێر عاجزیتان بووە. دیمنە وتی: ئەم قسەکردنەم مەقسەد لە خۆم نییە. ئەمما بۆ ڕەفیقانم زۆر عاجزم و ئیسراحەتم نەماوەو هەرچەند فکری جەنابت دەکەمەوە. دڵم قوڵپ ئەدات. مەعلوومی جەنابتە شەرت و وەفاتان بەیەکەوە چۆن بووەو هەتا ئێستا بۆ بەرزبوونەوەی جەنابت لە دەرەجەی نیهایەت سەعیم کردووەو قوسوورت لە من نەدیوەو منیش شەرتم لەگەڵ جەنابتا کردووە تووشی بەڵات نەکەم. ئێستا مەعلوومی جەنابتە من تەنهاییم ئیختیار کردووە. ئوموورات لە دەست منا نەماوە. ئەگەر قسەیەک بۆ تۆ زەرەرداریێ بەرگوێم بکەوێت لازمە ئیخسارت بکەم. شەترەبە ئەو قسانەی لە دیمنە

بیست، ترس و خۆفی پەیدا کرد، وتی: ڕۆحی شیرینم چیت بیستووە؟ بەیانی بفەرموو.

دینە وتی: لەیەکێکی قسە ڕاستم بیست، وتی: شێر فکری کردووە شەترەبە زۆر قەڵەو بووە، بوونی لەم بێشەدا بە عەمەل چی دێت؟ لازمە زیافەتێ لە گۆشتی شەترەبە بۆ عومومی مەئموران بکەم. وەقتێ ئەو قسەم بیست باوەڕم کرد، چونکی کەم عەقڵ و نەزانیی شێر بۆم مەعلووم کراوە. هاتم شەرتی خۆم بەجێ هێنا، ئیخبارم کردیت و ئیختیاری خۆت بەدەست خۆتە. مومکینت ئەبێ هەتا زووە عیلاجی خۆت بکە. وەقتێ شەترەبە ئەو قسانەی لە دینە بیست، شەرت و وەفای شێر هاتە پێش چاوی، وتی: ئەی دینە هەرچەند فکر ئەکەم مومکین نییە شێر ئەو قسانەی دەرحەق بە من کردبێ، چونکی هەتا ئێستا لە ئومووراتی قانوونی خیلافی ئەمری پادشام نەکردووە، وە زەڕڕەیەک لە تەرەف منەوە ئازا بە دڵی شێر نەگەیشتووە، وە قسەی جەنابت لای من مەعقووڵە. ئەما مومکینە فیتنەو دوو زوبان بە زمانی منەوە قسەیان بۆ شێر کردبێ و دڵی پادشاە دەرحەق بە من ئاگری قەهری داگیرسابێ. بۆم مەعلووم کراوە چەند کەسانێ لەژێر دەستی پادشاە بە فیتنەو فەسادی خەریکن. هەموو وەقت بەواسیتەی ڕەفیقی نائەسڵەوە ئینسان تووشی مسیبەتی گەورە دێت. مەسەلەی شێر وەک مەسەلەی مراوییەکە وایە.

دینە پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

شەترەبە وتی: ئەگێڕنەوە مراوییەک بوو سوورەتی مانگی لەناو ئاوا چاو پێ کەوت، وای زانی ماسییە. چەند دەفعە بەو فکرە خۆی نوقومی ئاوەکە ئەکرد بۆ گرتنی. ئینتیها لەبەر هیلاک بوون پەشیمانیی حاسڵ کرد. لە پاشا ماسی لەناو ئاوەکەدا بدیبایە وای ئەزانی شوعلەی مانگە. لەبەر ئەو خوسووسە تەرکی ماسی گرتنی کرد، بە برسییەتی موددەتێ مایەوە، ڕۆحی خۆی خستە هیلاکەتەوە. هێنانەوەی ئەم میسالەم بۆ ئەوەیە مومکینە بە زوبانی منەوە بوهتانیان لای شێر کردبێ و لە من عاجز بووبێ، فکری دەرحەق من خراپ کردبێ. عەجەبا فەرقی من لەگەڵ مەئموران زۆرەو سەداقەتی من لەشێر مەعلووم بووە. لازم بوو بۆ زاتی موبارەکی بەقسەی فیتنە دڵی لە من خراپ نەکردایە.

دینە وتی: تێکچوونی پادشاە لەبەر ئەو حیساباتە نییە، بەڵکو ئوسووڵی پادشاهان بەو نەوعەیە. بۆ چەند کەسێ زۆر بە عەقڵ دێن، وە چەند کەسێ موبتەلای دەردو فیراق

ئەکەن. شەترەبە وتی: ئەگەر پادشاە بەبێ گوناە دوشمنایەتی لەگەڵ من بکات، ڕێگەی ڕاستی گوم کردووە و بەمەقسەد ناگات. وە ئەگەر بە واسیتەی گوناهێ کەوە من بکوژێ، مومکینە سەبووریی دڵی خۆی بداتەوە. قەتعییەن گوناە لە خۆم شک نابەم، مەگەر جارجارێ بە واسیتەی ئومووراتی پادشاوە قسەی بە قووەتم کردبێ. ئەویش باعیس بە بەرزبوونەوەی شێر بووە. لەوە زیاتر بێ ئەدەبیم لە حوزوور پادشا زاهیر نەبوە. مومکینە شێر وای خەیاڵ کردبێ شەترەبە لووتی بەرز کردووەتەوە. لایقی ئەمە نەبوو بێ تەجروبە دوشمنایەتی لەگەڵ من پەیدا بکردایە. حوکەما جوانیان داناوە: لەگەڵ نەهەنگ بچێتە ژێر بەحر، وە لە لێوی مار زەهر خواردن، سەلامەتترە لە نیزیکیی پادشاە، وەخوسووس بۆ مەعلووم کرابوو نزیک بوون بە پادشاە لە زەرەر زیاتر قانزاج وەرناگرم. ئەمما قسە لە نەسەب و ئەجەل ناکرێ. پێشوونان پادشاهیان بە ئاگر داناوە، ئەگەرچی شوعلەو ڕووناکی لایقە، ئەمما نزیک بوونی ئینسان ئەسووتێنێ. ئەوی لە دوور ئاگر ئەبینێ، لە سووتان بێ خەبەرە. ئەگەر ئەوانەی لە سیاسەتی سوڵتان خەبەردار بێن کە هەزار ساڵ خزمەت، بەیەک سەهو ئەڕوات، یەک دەقیقە نزیک بە پادشا نابن. میسالی ئەم قسە وەک قسەی بازو مریشکەکە وایە.

دیمنە پرسی: چۆن بووە؟

حیکایەت

شەترەبە وتی: ئەگێڕنەوە ڕۆژێ باز لەگەڵ مریشک دەستی کرد بە قسەکردن. وتی: ئەی مریشک تۆ زۆر بێ وەفایت. خزمەت کردنی بێ وەفا حەرامە. ئەووەڵ چاکە لە دنیادا وەفایە. پێغەمبەر فەرموویەتی: (ان حسن العهد من الایمان). دەلیلی ئیمانداری وەفایە:

بەسەگ حەڵاڵە نان و شووربایە

چونکە پاسەوانە، ساحیب وەفایە

مریشک جوابی دایەوە: ئەی ئەزان تۆ چ بێ وەفاییەکت لە من دیوە؟ باز وتی: بێ وەفایی تۆ ئەوەیە بەنی ئادەم دایم خەریکی خزمەتی تۆن، دان و ئاوت ئەدەنێ، لە دڕندە موحافەزەت ئەکەن، کولانەیان بۆ دروست کردوویت، بە واسیتەی بەنی ئادەمەوە ژیانت مومکین نەبێ. هەر وەقت ئارەزووی گۆشت بکەن لە دەستیان فیرار ئەکەیت، بانەویان ئەفڕیت. بێ وەفایی لەوە زیاتر چۆن ئەبێ وەلی نیعمەتی خۆت بەو دەرەجەیە زەحمەت بدەیت؟ من تەیرێکی سەحراییم، دوو سێ ڕۆژ لەگەڵ بەنی ئادەم ئولفەت بگرم، لە

دەستیان دان و ئاو بخۆم، لە جیاتیی خزمەتیان ئەچم تەیریان بۆ ئەگرم. بۆ ئەوەی بانگم بکەن ئەچمەوە سەردەستیان، لەدەست بەنی ئادەم بە عەزمی فیراری ئەڕۆیشتووم ئیللا بۆ ڕاوکردن نەبێ. مریشک وتی: قسەکردنت مەقبووڵە. فڕینی من و هاتنەوەی تۆ باعیس بەوەیە تۆ قەتعییەن چاوت پێ نەکەوتووە بازێ بکەن بە شیشەوە بیکەن بە کەباب، من زۆرم چاو پێ کەوتووە چزو هووڕی مریشک لەناو تاوەدا سوور بکرێتەوە. ئەگەر تۆ ئاوجینسی خۆت وەک ئاوجینسی من چاو پێ بکەوتایە نزیک بە بەنی ئادەم نەئەبوویت. من ئەگەر بانەو یان ئەفڕیم، تۆ کێو بە کێو ئەفڕیت. ئێشی مار مارانگاز ئەیزانێ. من بێ وەفا نیم، تۆ ساحیب وەفایی.

شەتربە وتی: بۆیە ئەم میسالانەم هێنایەوە بۆت مەعلووم بێ، ئەوانەی ئارەزووی نزیکیی پادشاه ئەکەن لە قەهری بێ خەبەرن. هەروەک وتوویانە: سوئالی قەهری پادشاه لە مەئموورە عەزڵ کراوەکان بپرسە. دیمنە وتی: مەسئەلە ئەوە نییە تۆ فکری لێ ئەکەیت. شێر نە بەقسەی فیتنەو نە بەقسەی کەس فکری کوشتنی تۆی نەکردووە. عادەتی شاهان وایە. پیاوی گەورە ساحێب قووەت بە دوشمن ئەزانن. ئارەزووی بوونی پیاوی بە قووەت ناکەن. شەتربە وتی: مومکینە شێر سەرو شاخی من بە بەڵا بزانێ، وە لە پاڵ ئەوەیشدا فیتنەو فەساد دووزمانییان کردبێ. لە قەدیمەوە هەر بووە پیاوی بچووک ئارەزووی باقی بوونی گەورەی نەکردووە.

دیمنە وتی: تەدبیر چییە؟ شەتربە وتی: ئەگەر مەسئەلە لە واسیتەی فیتنەوە بووبێ ئیش سەهلە. وە ئەگەر قەدەری خودا بێ تەدبیر بەکار نایەت، دەرمانی پەیدا نابێ، چونکی تەدبیر لەقەدەر ناگرێ. دیمنە وتی: پیاوی عاقڵ لازمە دووربینی ئیش بکات. هەر کەس لەمەکری زەمانە ئەمین بێ بەمەقسەد ناگا.

شەتربە وتی: تەدبیرو دووربینی وەقتێ بە عەمەل بێت قەزاو قەدەر نەیەتە ڕێ. چاری قەزا نەبە تەدبیرو نەبە دووربینی ئەکرێ، ئێستا من بیکەم. فەرموویانە: (ازا جاء القدر عمي البصر).

کە هات ڕێگەت قەزاو و قەدەر
ئەچاو ئەبینێت، گوێچکەیش ئەکا کەڕ

مەگەر تۆ قسەی باغەوانەکەو بلبلەکەت نەبیستووە:

دیمنە پرسیی: چۆن بووە؟

شەترەبە وتی: ئەگێڕنەوە پیاوێک بوو باغێکی زۆر نایابی بوو، لە هەموو نەوع میوەو گوڵی لایقانەی تیا بوو، وەک (جنەت الفردوس) هەر چوار وەقت بڕانەوەی گوڵی نەبوو. یەک لق گوڵی نایابی تیابوو باغەوانەکە عاشقی ئەو گوڵە بوو بوو، هەموو ڕۆژ بۆ چاو پێکەوتنی ئەو گوڵە داخڵ بە باغ ئەبوو. ڕۆژێ تەماشای کرد بلبلێ بە گریان خۆی داوە بەسەر گوڵەکەدا بەدەنووک پڕی ئەکاتەوە. وەقتێ باغەوانی دی، فڕی و ڕۆیشت. باغەوان بە عاجزی و نائومێدی گەڕایەوە. لە قەهری بولبول ئەو شەوە نەنووست. بۆ سبحەینێ باغەوان داوی هەڵگرت، لەسەر گوڵەکە نایەوە. وەقتێ بولبول داخڵ بەسەر گوڵ بوو، لە خۆشییا بێهۆش بوو، بوو بەداوەوە. باغەوان بلبلی گرت، لە قەفەسدا حەپسی کرد. بلبل بە زوبانی فەسیح بە باغەوانی گوت: ڕۆحی شیرینم، منت بۆ حەپس کردووەو ئارەزووی خوێنم ئەکەیت. دایما لەسەر ئەو دارەی ژوور سەرت بەخوێندن خەریکم. وە ئەگەر فکرێکی کەت هەیە بەیانی بفەرموو. باغەوان وتی: مەگەر نازانیت چیت لە من کردووە؟ ئارەزووی ئەوە ئەکەیت بە مەراقی یارەوە بمکوژیت. منت لەگوڵ نائومێد کرد. ئەوە جەزاتە. بلبل وتی: ڕجا دەکەم لە حەپسی نەجاتم بدە، لە ئاخری خۆت بترسە. هەروەک حوکەما فەرموویانە: زۆر ڕاستە.

ئەووەڵ و ئاخـــــر لە لەوح نووســــــراوە

شـــیـــــرین بە شـــیـــــرین، تاڵی تاڵاوە

ئەو قســـەیە تەئسیری کردە دڵی باغەوان، بلبلی نەجات دا. بلبل زوبانی بە دوعا کردەوە، وتی:«ئەی باغەوان، (هل جزاء الاحسان الا الاحسان)؟ لازمە جەزای چاکەت بدەمەوە. لەژێر ئەو دارە مەسینەیەک هەیە، پڕە لە ئاڵتوون، دەری بهێنە، بۆ لازماتی خۆت سەرفی کە. باغەوان ژێر دارەکەی هەڵکەند، قسەی بلبل بە ڕاست گەڕا. ڕووی کردە بلبل، وتی: زۆر عەجایبە.. مەسینەیەک پڕە لە ئاڵتوون لەژێر ئەرزدا ئەیبینیت، داوێ بۆ گرتنت لەسەر ئەرز نابینیت! بلبل وتی: نەتبیستووە فەرموویانە: «اذا نزل القدر، بطل الحذر». وەقتێ بەڵا هات چاو نابینێت، بەتەدبیر عیلاج ناکرێ.

شەترەبە وتی: بۆیە ئەم میسالەم بۆ هێنایتەوە تا بۆت مەعلووم بێ لەگەڵ قەزاو قەدەر هیچ ناکرێ. ڕازیم بە قەزای خودا. هەرچی بۆ من مەعلووم کرابێ ڕەد بوونەوەی نییە. دیمنە وتی: ئەی شەترەبە، بەتەحقیق بۆم مەعلووم کراوە فکری شێر لەگەڵ تۆ ئەواسیتەی

فیتنەیەو ئەخۆفی لەسەرو شاخی تۆ کردووە. من ئەیناسم. زۆر بێ ڕەحم و زاڵمەو غەددارە. ڕێگەی وەفا و شەرت نازانێ. ئەجری خزمەت بە تاڵی ئەداتەوە. ڕەوشتی وەک ماری سفرە وایە، زەهری بەهیچ دەرمانێ عیلاج ناکرێ، لە زاهیری تەماشا مەکە. بە دڵ زۆر کەم وەفا و حیلەبازە. شەترەبە وتی: چەند زەمانێکە ساردو گەرمیی زەمانەم چەشتووە. ئێستا وەقتی زوڵم و کوشتنە، چونکی میقدارێکە بێ بارکێشان لەم بێشەدا ئیسراحەت ئەکەم، وە ئەگەر ئەجەل دامێن گیرم نەبوایە ڕێگەم نە ئەکەوتە ئێرە، وە من لە ڕەفاقەتی شێرم چی؟ لە ئەووەڵەوە بزانییایە شێر خۆی بۆ خواردنی من حازر کردووە، بەهەزار کەمەند نەئەبووم بە ئەسیری. ئەمما تەقدیری خوداو زویان لوروسیی تۆ منی هێنایە ئێرە. ئێستا لە دەست چووە چاری بە تەدبیر ناکرێ. بە نەزانیی خۆم نزیک ئەم ئاگرە بوم. فیتنە گری ئەسەندووە، لە دووکەڵی تەنگە نەفەس بووم. عاقڵان وتوویانە: هەرکەس بە بەشی خۆی نارازی بوو و تەڵەبی زیادی کرد، میسلی کەسێکە بگاتە کێوی ئەڵماس، وەقتێ چاوی بەپارچە ئەڵماس بکەوێ زیاتر ئەڕوات بە تەمەع، وەقتێ بەخۆی ئەزانێ قاچی پارچە پارچە بووە، گەڕاندنەوەی مومکین نابێ، ئەمرێ، ئەبێتە خواردنی تەیران، وە هەتا تەمەع زیاد بێ لە هیلاکەت نزیکە.

دیمنە وتی: قسەکانت زۆر پەسەندو مەعقووڵە. هەر ئازارێ بێتە ڕێگەی ئینسان، واسیتەی تەمەعە. گەردنێ بەزنجیری تەمەع بەستراببێ، ئاخری بە تیغی پەشیمانی ئەبڕرێت. زۆرکەس بە واسیتەی تەمەعەوە تووشی مردن هاتوون، هەروەک ڕاوچییەکە لەبەر تەمەعی پێستی ڕێوی بە چنگ پڵنگەوە بە کوشت چوو.

شەترەبە پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

دیمنە وتی: ئەگێڕنەوە پیاوێکی ڕاوچی تەسادوفی ڕێوییەکی کرد. ڕێوییەکە مووی نایاب و لایق بوو. بۆ گرتنی ڕێوییەکە ڕۆیشت، هەتا کونی ڕێوییەکەی مەعلووم کرد. لە نزیک کونەکە چاڵی هەڵکەند. میقدارێ گۆشتی خستە سەر پووش لەسەر چاڵەکە داینا، خۆی لەکەنارێکەوە پەنهام کرد. ڕێوی لە کون چووە دەرەوە، بۆنی گۆشتی کرد. بە خۆی گوت ئەگەرچی بۆنی خواردن بە لووتما دێت، ئەمما بۆنێ کرووزی لە دڵم ئەدا. عاقڵان دڵیان لە هەرچی ترسابێ، دەست بۆ بردنییان بە حەرام زانیوە. مومکینە حەیوانێ مردار بووبێتەوەو داوێکی لەژێرا قایم کرابێ. لازمە پارێزگاریی ئەو داوە بکەم، هەروەک

حوکەما فەرمووویانە: وەقتێ تووشی دوو ڕێگە بوویت، ڕۆیشتنی هەر ڕێگەیەکیان بە ئارەزووی دڵ بوو، ئەو ڕێگەیە بگرە. بەو فکرە ڕێوی ڕووی نەکردە گۆشتەکە. بەسەلامەتی ڕۆیشت. میقداری بەینی بوو پڵنگێ لەسەر شاخەکەوە بە بۆنی گۆشتەکەوە هات. پڵنگ خۆی خستە چاڵەکەوە. کابرا وایزانی ڕێوییەکەیە هەڵسا، خۆی دا بەسەر چاڵەکەدا. پڵنگ وایزانی مەنعی خواردنی گۆشتەکەی لێ ئەکا، ڕاوچییەکەی پارچە پارچە کرد. بە واسیتەی تەمەعەوە ڕاوچی مرد، وە ڕێوی بە واسیتەی قەناعەتەوە لە بەڵا بەسەلامەتی نەجاتی بوو و ڕۆیشت.

دینە وتی: ئەم میسالەم لەبەر ئەوە هێنایەوە بۆت مەعلووم بێ هەر کەس لە دەرەجەی خۆی تەمەعی زیاد بوو تووشی هیلاکەت ئەبێ. شەترەبە وتی: من سەهوم کرد ئیختیاری خزمەتی شێرم کرد. بۆم مەعلووم نەکرابوو قەدری خزمەت نازانێت، چونکی ڕەفاقەتی من و شێر موشابەهەی ئەوەیە گۆرانی بۆ کەڕ وەیا شیعر خوێندنەوە بەسەر ئاوەوە وەک یەک وایە. حوکەما فەرمووویانە: وەفای پادشاه و بەری بیی تاڵ وەک یەکە. دینە وتی: ئەم قسە دووورو درێژانە گەڕێ، تەدبیر لە ئەحواڵی خۆت کە. شەترەبە وتی: لازم بە تەدبیر ناکا، وە ئەخلاقی شێر شارەزا بووم. بۆم مەعلووم کراوە ئیشی فیتنەو فەسادە. ئەگەر لە قسەی فیتنەو فەساد نەترسم، بەدڵما نایەت لە تەرەف شێرەوە زەرەر مەند بیم، ئەما ئەترسم ئەوەم بەسەر بێت بەسەر حوشترەکە هات.

دینە پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

شەترەبە وتی: ئەگێڕنەوە قەلێکی ڕووڕەش، گورگێکی مانگر، چەقێلێکی فێلاوی خزمەتکاری شێرێ بوون. لە بێشەیەکدا نزیک بە جادەی عام بوون. تەسادوف حوشترێ لە کاروان جێ مابوو. وردە وردە بە لەوەڕ داخڵ بە بێشەی ئەو حیلەبازانەبوو. وەقتێ نزیک بەشێر بووەوە، ڕەسمی خزمەتی بەجێهێنا، خۆی بە خزمەتکاری شێر قوبووڵ کرد. شێر سوئالی لە حوشتر کرد: تا ئێستا لە کوێ بوویت؟ حوشتر جوابی دایەوە: لەم سەحرایە بە درک خواردن خەریک بوم، ئێستا بە نیازی خزمەت داخڵ بە حوزووری جەنابت بووم، وە ئەمر ئەمری جەنابتە. شێر وتی: ئەگەر تاقەت ئەگریت لەوە ئەمین بە کەس ئیقتیداری نابێت دەستی زوڵم بۆ تۆ درێژ کات. بەدڵێکی خۆش، بە ئیسراحەت ئەتوانی لەم بێشەدا بژیت. میقداری چەند مانگێ بەیەکەوە ڕایانبوارد. ڕۆژێ شێر چوو بوو بۆ ڕاو، تووشی

فیل هاتبوو بوو بەشەڕیان. برینی زۆر لە شێر کرابوو، بەبێ تاقەتی داخڵی بە بێشەکە بووبووەوە. نەخۆش کەوت، ئیقتیداری ڕاوی نەما. گورگ و چەقەڵ و قەل بەواسیتەی شێرەوە خواردنیان دەست ئەکەوت. ئەوانیش بەبرسی مانەوە. وەقتێ شێر تەماشای ئەوانی کرد، بۆی مەعلووم کرا برسییانە، ڕەگی حەمیەتی کەوتە حەرەکە. وتی: بزانن لەم نزیکانە شتێک بدۆزنەوە بۆتان بکرم، دەفعی برسێتیتان بکات. ئەوان لە خزمەت شێر دوورکەوتنەوە، هەرچەند تەماشایان کرد هیچیان نەدۆزییەوە. هەرسێکیان بەتەدبیرکردن خەریک بوون، وتیان باقی بوونی حوشتر لەم بێشەدا بۆچی چاکەو ئێمە لە ڕەفاقەتی حوشتر ئیستیفادەمان دەست ناکەوێت، وا چاکە لای شێر بە کوشتنی بدەین. چەقەڵ وتی: لەسەر ئەم فکرە لاچن، زۆر ناشیرینە، چونکە شێر ئەمانی داوە. بۆ ئێمە جوان نییە فکری خەیانەت کردن. حوکەما فەرموویانە: هەرکەس ڕێگەی غەدر بۆ کەسێ بدۆزێتەوە ئاخری بە نسیب خۆی ئەبێت. مەعلوومە ئینسانی ئەسڵ لە خەیانەت دوورە. قەل وتی: ئەم ئیشە عائیدی من بێ، ئێوە حەقتان بەسەرەوە نییە. لەم جێگە بە ئیسراحەت دانیشن. ئێستا ئەچمە خزمەت شێرو دێمەوە، خەبەرات مەعلووم ئەکەم. قەل ڕۆیشت بۆ خزمەت شێر. شێر سوئالی کرد چیتان دۆزیوەتەوە؟ قەل وتی: قوربان، لەتاو برسێتی ئەقووەتی ڕۆیشتن و ئەحوکمی چاومان ماوە. ئەمما فکرێکمان کردووە، ئەگەر ئەمری جەنابت بێ عەرزی بکەم. شێر وتی: بەڵێ. قەل وتی: مەعلوومە حوشتر لەناو ئێمەدا غەریبەو لە ڕەفاقەتی مەنفەعەت دەست ناکەوێت. دەرحەق زەمان، خودا ڕزقێکە بۆ ئێمەی ناردووە. وامان بەچاک زانیوە لائیقی خواردنە بۆ جەنابت. شێر وتی: لەوە زیاتر فکرتان نەکردووە، بەچی شەرتێ وە مەزهەبێ خواردنی لائیقە؟ من ئامانم داوە. شەرت شکاندن نیشانەی نامەردانە.

نیشانەی مەردی ساحێب وەفایە
لەشەرت و وەفای ئەبوە جەفایە
حەڵاڵی سەگ بێ نان و شۆربایە
دایم پاسەوان لەبەر دەرگایە

قەل وتی: من ئەو مەسئەلە ئەزانم، ئەمما ڕۆحی خۆم فیدای سەری جەنابت دەکەم. فەرموویانە: یەک ئەفس فیدای ئەهلێ، وە ئەهلێ فیدای قەبیلەیێ، وە قەبیلەیەک فیدای شارێک، وە شارێک فیدای سەری پادشاه بکرێت، سەلامەتییە، چونکە پادشاه ئەما

مەملەکەت بەفیدا دەچێت.

ئەگەر بۆ سەلامەتیی سەری پادشاه، شەرت شکا عەیب نییە. وەقتێ شێر ئەو قسانەی لە قەل بیست. سەری شۆڕ کردەوە، قەل چووەوە بۆ لای ڕەفیقەکانی. وتی: لە ئەوەڵەوە فکرەکەمان بۆ شێر بەیان کرد، قوبووڵی نەکرد. لە ئاخریدا ڕازی بوو. لازمە ئێوەش بە تەدبیری من موعامەلە بکەن. ئێستا هەرسێکمان بچین بۆ لای حوشتر، نەخۆشیی شێر بەیان بکەین، بڵێین ژیانی ئێمە بە واسیتەی پادشاوە مومکین نەبێ. وا چاکە خۆمان فیدای سەری پادشاه بکەین تا ناوو شۆرەتمان بەدنیادا بڵاوبێتەوە. بچینە خزمەت شێر، یەکەیەکە عەرزی شێر بکەین: ئێمە هیچمان لەدەست نایەت. ئەمما ڕۆحی خۆمان فیدا ئەکەین. ئەو وەقتە یەکێکمان بڵێت: شێر ئیمرۆ ناشتای نەکردووە. مەمنوون ئەبم بە گۆشتی من ناشتایەک بکات. ئێمەش ئەڵێین گۆشتی تۆ قابیلی خواردنی پادشاه نییە، تا سەرە دێتە سەر حوشتر، هەرسێکمان قوبووڵی ئەکەین. بەم تەدبیرە کوشتنی حوشتر مومکین ئەبێ. هەرسێکیان چوونە لای حوشتر، دەستیان کرد بە بەیانی نەخۆشیی پادشاه. بەزوبان لووسێتی حوشتری دڵ سافیان خەڵەتان. هەرچواریان بە ئیتتیفاق چوونە خزمەت شێر. لە ئەووەڵەوە قەل زوبانی بە مەدح و سەنای شێر کردەوە. وتی: قوربان، وەک مەعلووم بووە ناساغیی جەنابت بووەتە باعیسی حەیاتی ئێمە. موددەتێکە بە برسێتی ماویتەوە.

مەسڵەحەت ئەوەیە من سەر ببڕن بکەن بە قوربانی بۆ خواردنی جەنابت، بەڵکی ئینشائەڵلا قووەت پەیدا بکەیت. ڕەفیقانی وتیان: خۆت چیت و گۆشتت چییە؟ قابیلی خواردنی پادشاه نییە. قەل بێ دەنگ بوو. چەقەڵ چووە پێشەوە، وتی: قوربان، موددەتێکە لەژێر حیمایەی جەنابتا ژیانمان مومکین بووە، وە ئەم گۆشتەی بە خۆمەوە ئەبینم قابیلی خواردنی جەنابتە. ڕەفیقەکانی وتیان: گۆشتی تۆ نەخۆشیی پادشاه زیاد ئەکا. چەقەڵ بێ دەنگ بوو، گورگ چووە پێشەوە ڕەسمی ئەدەبی بەجێهێنا، وتی: قوربان، ئارەزوو ئەکەم ئەمڕۆ دانی پادشاه بە خواردنی گۆشتی من تیژ ببێت و ناو سکی پادشاه لە گۆشتی چەورم تێر ببێت. ڕەفیقەکانی وتیان: گۆشتی تۆ ئینسان ئەخنکێنێ. لە زەهری هەلاهەل کوشندەترە، قابیلی خواردنی پادشاه نییە. گورگ بێ دەنگ بوو. حوشتر چووە پێشەوە، ملی بۆ درێژ کرد (کل طویل احمق)، وتی: قوربان، موددەتێکە بە ئیسراحەت لەم بێشەدا ژیاوم و گۆشتێکی زۆرم پەیدا کردووە. ڕۆحی خۆم فیدای جەنابت دەکەم. ئەگەر قابیلی مەتبەخی پادشاه ئەبم، باعیسی مەمنوونییە. ڕەفیقەکانی وتیان:

ڕەحمەت لە نەسیحەت کەرت. ئافەرین، حەڵاڵزادە! وەفای حوقووقت بەجێهێنا، مومکینە بەیەک لوقمە گۆشتی تۆ شیفای دەردی پادشاە بێت. بە ئیتتیفاق پەلاماری حوشتریان دا، ئێستا ڕۆح لە ملی دەرنەچووبوو، ئەعزای ڕانی لوقمە لوقمە کرا.

شەترەبە وتی: هێنانەوەی ئەم مەسەلەیەم لەبەر ئەوە بوو بۆت مەعلووم بێ دوشمن ئیتتیفاق بکەن تەدبیر لە کوشتنی کەسێ بکەن ڕۆحی بەسەلامەت دەرناچێت. دیمنە وتی: ئێستا فکرت چییە؟ شەترەبە وتی: فکرم ئەوەیە ئەگەر مەسئەلە ئەوەبێ، لازمە شەڕ بکەم، وە هەرکەس بۆ ڕێگەی نەجاتی سەعی کرد بکوژرێت بەشەهید ناو ئەبرێت (ومن قتل دون نفسه فهو شهيد). وە ئەگەر ڕۆژم تەواو نەبووبێت، بەناموس و حەمییەت ناو ئەبرێم. وە ئەگەر ئەجەل هاتبێ، چارە نییە. دیمنە وتی: پیاوی بە غیرەت ئەووەڵ زەربە ناوەشێنێت، ئەمما ئاگەهداریی پاسەوانیی خۆی ئەکات. هەر وەقت زەربەی لە دوشمن خوارد، ئەنجا زەربەی خۆی ئاشکرا ئەکات. وە هەم لازمە لە مەکری دوشمن ئەمین نەبوون، چونکە ئاگرێ گڕ بگرێت، هەرچی نزیک بووبێ، ئەسووتێ. خۆت ئەخلاق و قووەتی شێرت بۆ مەعلووم کراوە، وە ئاگەهداری ئەحواڵی خۆت بە، لە خۆفی شێر ئەمین نەبیت. وە هەرکەس دوشمنی بەبچووک تەماشا کردو ئەهمیەتی نەزانی، پەشیمان ئەبێتەوە، هەروەک دەریا لە زەلیلیی تەیتووی.

شەترەبە پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

دیمنە وتی: ئەگێڕنەوە لە قەراغ بەحر نەوعە تەیرێ هەیە ناوی تەیتووە. جووتێ لەو تەیرانە لە قەراغ بەحر هێلانەیان دروست کردبوو. وەقتی هێلکە کردنیان هات. مێکە ڕووی کردە نێرەکە، وتی: جێگەیەک بدۆزینەوە لە ئافات دوور بێ. نێرەکە وتی: جێگە لەمە خۆشتر و فێنکتر مومکین نابێ، لازمە لەم جێگەدا هێلکە بکەیت. مێکە وتی: نێرە لە بەحر نزیکە، لە شەپۆلی ئەترسم خۆمان و بێچووەکانمان غەرق بکات. نێرەکە وتی: فکر ناکەم وەکیلی بەحر ئەم بێ حورمەتییە بەسەر ئێمە بێنێ. وە ئەگەر زەرەر بە ئێمە بگەیێنێ کارێکی بەسەر دێنم بە حیکایەت بیگێڕنەوە. مێیەکە وتی: ئەم لاف و گەزافە نالایقە. تۆ بە چ قووەتێکەوە ئینتیقام لە وەکیلی دەریا ئەسێنی؟ لەسەر ئەم فکرە لاچۆ. بەقسەم بکە، جێگەیەک بۆ ڕەحەتیی خۆمان بدۆزەرەوە، هەر کەس بەقسەی نەسیحەت باوەڕ نەکات ئەوەی بەسەر دێت بەسەر ڕەقەکە هات.

نێرەکە پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

مێیەکە وتی: ئەگێڕنەوە گۆمەئاوێ بوو جووتێ مراوی پێکەوە لەسەر ئەو گۆمەئاوە ئەژیان. وە لەگەڵ ڕەقەیەک ڕەفاقەتیان گرت. موددەتێ بەخۆشیی یەک ئەیانبوارد، تەسادوف ئاوی گۆمەکە وشک بوو، مراوییەکان ئیرادەی سەفەریان کرد، چوونە لای ڕەقەو بەگریانەوە دوعا خوازییان کرد. ڕەقە دەستی کرد بە گریان، وتی: ئەی ڕەفیقینە حەققی ڕەفاقەتم بەسەرتانەوە هەیە. یەک ڕجام هەیە: ئەووەڵەن بمکوژن، ئەنجا تۆغر بکەن، چونکە تاقەتی دووریی ئێوەم نییە. ئێستا لە بەرچاوم گوم ئەبوون دڵم ئاگری گرتووە. مراوییەکان وتیان: ئێمە لە دووریی تۆ جەرگمان کون کون ئەبێ، وە مەعلوومی جەنابتە ژیانمان بە ئاوەوە مومکین ئەبێ، وە ئیرادەی سەفەرمان بۆیە کردووە. ڕەقە وتی: ئەی ڕەفیقان ئێوە ئەزانن وشک بوونی ئاو بۆ من زۆر زەحمەتە. ژیانی من بە بێ ئاو مومکین نابێ، وە ئەگەر حوقووقی ڕەفاقەت ئەزانن و تووشی مەراقم ناکەن لەگەڵ خۆتان تەفریقم مەکەن. ئێوە لە ڕۆحم شیرینترن. وەقتێ ڕۆح ئەما جەسەد بێ ڕۆح بە عەمەل نایەت. مراوییەکان وتیان: ئەی ڕەفیق مەراقی تۆ لە تەرکی وەتەن ناخۆشترە. وەقتێ ئێمە بکەوینە ئیسراحەت، فکری تۆ بکەینەوە، خواردنمان ئەبێتە زەهرەمار. ئەما ڕۆیشتنی تۆ لەگەڵ ئێمە مومکین نابێ چونکە ئێمە بە ئاسمانا ئەفڕین و تۆ بە ئەرزدا ئەڕۆیت. زۆرمان فەرقە. ڕەقە وتی: تەدبیری ئەم سەفەرە خۆتان ئەیزانن. ڕجا ئەکەم بە مەراقەوە مەمکوژن. مراوییەکان وتیان: ئەی ڕەفیق، ئێمە تەدبیرمان لەم سەفەرە کردووەو فکری ڕەفاقەتی تۆمان کردووە. شەرت ئەوەیە لە قسەمان دەرنەچیت. ڕەقە وتی: زۆر ناشیرینە ئێوە بۆ مەسڵەحەتی من تەدبیر بکەن و من قسەتان بشکێنم. شەرتە هەر قسەیەک لە تەرەف ئێوەوە بکرێت بەسەرچاو جێ بەجێی بکەم و هەتا بەڕۆح زیندوو بم، بەشەرتی خزمەتکاری خزمەتتان بکەم. مراوییەکان وتیان: ئێمە وەقتێ تۆ بە ئاسمانا بڵند ئەکەینەوە لازمە قسە نەکەیت. مومکینە بەسەر ئاوەدانییا بفڕین. بەنی ئادەم غەوغا بکەن و بەردمان بۆ بهاوێژن. شەرت ئەوەیە تۆ سوئال لە ئێمە نەکەیت و تەماشای خەڵق نەکەیت. سەلامەتی و مەتڵەب حاسڵ بوون لە بێدەنگیدایە. بەو قەرارە ڕازی بوون، مراوییەکان تەختەدارێکیان هێنا، وتیان بە ڕەقە: بەدەم ناوەڕاستی تەختەکە بگرەو، مراوییەکان هەریەکە سەری تەختەکەیان بە دەنووک گرت، بە ئاسمانا بەرز بوونەوە.

تەسادوف ڕێگەیان کەوتە سەر ئاوەدانیین. ئەهلی دێیەکە تەماشای ئاسمانیان کرد جووتێ مرواری ڕەقەیەکیان هەڵگرتووە، زۆر لایان عەجیب بوو، دەستیان کرد بە هەڵلاکێشان و بەرد هاویشتن بۆ مراوی و ڕەقەکە. ڕەقە بانگی کرد: مەگەر چاوتان کوێر بووە، نابینن؟ دەم کردنەوەو کەوتنە خوارەوەی یەکێ بوو. مراوییەکان وتیان: «وما علی الرسول الا البلاغ». ڕەفاقەتی ئێمە لە تۆ حەرام بوو. ڕەفاقەتی نا ئەسڵ پەشیمانییە. عەزیەت کێشان بۆ ڕەفیقی بێ عەقڵ بێ فائیدەیە، چونکە قسە تەئسیر لە دڵی بێ عەقڵ ناکات. زەحمەت لازم نییە. مێیەکە وتی: ئەم میسالەم بۆیە هێنایەوە هەر کەس بەقسەی نەسیحەت باوەڕ نەکات، سەعی لە ئەمانی خۆی نەکات. لازمە دەرمان لە پێش دەردا پەیدا بکرێ. نێرەکە وتی: لەمەعنای قسەکان حالی بووم، ئەمما مەترسە. بۆت مەعلووم بێ ترسنۆک بە مەقسەد ناگات و، بۆت مەعلووم بێت وەکیلی دەریا ڕیعایەتی ئێمە نەکات، زەرەر بەبێچووی ئێمە ناگەیەنێ، ناعیلاج مێیەکە هێلکەی کردو بێچووی هەڵهێنا. بەحر شەپۆلی دا، بێچووی مراوییەکانی برد. مێیەکە لە پاش ئەو واقیعاتە بە گریانەوە ڕووی کردە نێرەکە، وتی زۆرم نەسیحەت کردی، بەقسەت نەکردم تا جگەر سووتاو بووین. تەدبیرێ بکە تا هەردووکمان بەمەراقەوە نەمردووین. نێرەکە وتی: قسەی بێ حورمەتی مەکە، وە لەسەر قەولی خۆم ماوم و حەققی خۆم لە وەکیلی دەریا ئەسێنم. ئەو قەسەیەی کردو ڕۆیشت شکاتی ئەحوالی لای عومومی تەیران کرد، وتی: ئەگەر ئێوە موعاوەنەتم نەکەن، مومکینە وەکیلی دەریا دەست درێژی بۆ ئێوەش بکا وردە وردە ناو جینسی ئێمە لە دنیادا نەیەڵێت. عومومی تەیرەکان بەیەکەوە فڕین، چوونە لای سیمرغ، بەیاناتی ئەحوالیان بۆ سیمرغ گێڕایەوە، وتیان لازمە لە ئەحوالی ڕەعیەت بێ خەبەر نەبی. ئەگەر حەقمان لە وەکیلی دەریا نەسێنی، شکات ئەبەینە لای یەکێکی کە، بەپادشای خۆمان قبوولی ئەکەین. پادشاە ئەوەیە خوێنی خۆی بەسەر ملتا بڕژێنێ. سیمرغ وتی: چیتان لێ قەوماوە بەیانی بکەن و حەقتان بسێنم. قسەی بێچووە تەتیووەکان بۆ سیمرغ بەیان کرا. سیمرغ لەگەڵ تەیرەکان چوونە سەر وەکیلی دەریا. نەسیم ئەو خەبەرەی بە وەکیلی دەریا گەیاند. وەکیلی دەریا بۆی مەعلووم بوو قووەتی سیمرغ و لەشکری تەیرانی نییە. بە عوزر هێنانەوە چووە بەردەمی سیمرغ و بێچووی تەیتووەکانی تەسلیم کردەوە. مەقسەدی ئەم میساله بۆ ئەوەیە دوشمن هەرچەند بچووک بێ بە بە بچووک تەماشای مەکە. نیشتێ بە دەرزییەکی بچووک مومکین نەبێ بە هەزار شمشێر دروست نابێ. دەنکە کیبریتێ زۆر بچووکە. وەقتێ داگیرسا هەرچی نزیک بێ ئەسووتێ. حوکەما

وتوویانە: ڕەفیق و دۆست ئەگەر هەزار بێ کەمە. دوشمن ئەگەر یەکێ بێ زۆرە. شەترەبە وتی: ئەووەڵ من قسە ناکەم هەتا بە نامەردی ناو نەبرێم. وەقتێ شێر فکری لە من گۆڕا موحافەزەی خۆم ئەکەم. دیمنە وتی: وەقتێ نزیک بەشێر بوویت، تەماشاکە شێر چاوی سوور هەڵگەڕاو کلکی بە ئەرزدا کێشا، بۆت مەعلووم ئەبێ قەسدی کوشتنت ئەکا. شەترەبە وتی: ئەگەر ئەو موعامەلە لە شێر ببینم دوشمنایەتیی مەعلووم ئەکەم. دیمنە دوعا خوازیی لە شەترەبە کرد، چووە لای کەلیلە. کەلیلە سوئالی کرد: ماددەکەت گەیشتە چی؟ دیمنە وتی: الحمدلله بە مەرامی خۆم مەسئەلە گرانەکە بە ئاسانی جێ بەجێ کرا. کەلیلە و دیمنە بەیەکەوە چوون بۆ خزمەتی شێر. تەسادوف شەترەبە داخڵ بە خزمەتی شێر بوو بوو، وەقتێ شێر چاوی بەشەترەبە کەوت بە دمدمەی دیمنە دەستی کرد بە ئەڕانن و کلکی ئەکێشا بە ئەرزدا. شەترەبە بۆی مەعلووم بوو ئاگری فیتنە داگیرساوە. بەخۆی وت: نزیک بوونی پادشاهان ڕێگەی خۆف و هیلاکەتە. نزیکیی کونەمارو خزمەتی شێر لە مردن نزیکە. لازمە ئەئمەین بوون لەمارو لە شێر ئەکرێت.تەحریکاتی دیمنە لە هەردوو لا ئاشکرا بوو، بوو بەشەڕیان و ئەو سەحرایە لە ئەڕەی شێر چۆڵ بوو.

لە ئەڕەی شــێــر و لە بۆڕەی مــام گــا
حــەیوان ڕایان کــرد هەر یەک بۆ یەک لا
خــۆیان شــاردەوە حــەیوانی فــەقــیــر
بێــشــەیان چۆڵ کــرد لە جــوان و لە پیــر

کەلیلە ڕووی کردە دیمنە، وتی: ئەی بێ عەقڵ ئاخری ئەم فیتنەیە ئەزانی؟ دیمنە وتی: ئاخری فیتنە چییە؟ کەلیلە وتی: ئەم فیتنەیەی تۆ داتگیرساند حەوت نەوع زەرەری هەیە. ئەووەڵ بێ فائیدە وەلی نیعمەتی خۆت تووشی مەشققەت کرد. دووەم شەرتی خۆت لەگەڵ شەترەبە شکاند. سێهەم بۆ کوشتنی شەترەبە سەعیت کرد. چوارەم بوویتە باعیسی قەتلی بێ گوناهێ. پێنجەم مەجمووعی حەیواناتت تەفرو توونا کرد. شەشەم سوپەهسالاری حەیواناتت بە پادشاە بە کوشت دا- جێگەی لەم ماوەدەتا پڕ نابێتەوە-. حەوتەم فیتنەیی و دوو زوبانیی خۆتت ئاشکرا کرد. مووددەتێکە من بە نەسیحەت کردنی تۆ خەریکم تەئسیری نەبوو. پێشوونان وتوویانە: لە هەموو کەس کەم عەقڵتر ئەوەیە فیتنەی نووستوو خەبەر کاتەوە، ئیشێ بەقسەو سوڵح دروست بێ بە فیتنەو دو زوبانی ڕێکی خات دیمنە وتی: ئەتبیستووە وتوویانە ئیشێ بە عەقڵ موکین نەبێ، بەشێتی کردنی لازمە؟ کەلیلە

وتی: لەم شێتیتە چ جوانییەکت موشاهەدە کردووەو، عەقڵ و زیرەکیت کامەیە؟ حوکەما فەرموویانە: بەعزە ئیشێ بە عەقڵ و تەدبیر دروست ئەبێ، بەسەد هەزار لەشکر مومکین نابێ. مووددەتێکە مەغروورێ. خود پەسندیی تۆم بۆ مەعلووم کرابوو، ئەمما سەبرم کرد، فکرم کرد، بەڵکی لە خەوی جەهالەت خەبەر بیتەوە، هەتا هات دوو زوبانی و فیتنەی نامووبارەکت درێژ بوو. حەقمە کەم عەقڵی و نائەسڵیت بەیان بکەم. کەسێ ئەسڵ بوو، مەعریفەتدار بوو، فیتنەیی و دووزوبانی نازانێ. چەند دەفعە بە واسیتەی رەفاقەتەوە نەسیحەتم کردیت، وتم زۆر عەیبە، خەریکی فیتنەو دووزوبانی مەبە، فیتنەو دووزوبانی ئیشی شەیتانە و بەقسەی منت نەکرد، بە ئارەزووی نەفس ئەم فیتنەیەت داگیرساند. خۆت ناوناوە چی؟ دیمنە وتی: ئەی رەفیق، ئەگەر خەتا لە من واقیع بووە بەیانی بفەرموو. کەلیلە وتی: لەوە زیاتر تاقەتم نەماوە. خەتای تۆ تەواوبوونی نییە. چونکە زۆر مەغروورێ و خۆت‌ابە عاقڵ حیساب ئەکەیت. حوکەما فەرموویانە: بۆ پادشاه لەوە خراپتر نییە وەزیری بەد ئەفعال بێ. ئینسانی عاقڵ فەرق بە ئیش و قسە ئەکات. قسەیش چوار نەوعە: ئەووەڵ شەرت ئەکات و ئەیشکێنێ، ئەوە عادەتی منافقانە. دووەم شەرت ناکاو ئەیکات، ئەوە عادەتی پیاوان و ساحیب غیرەتانە. سێهەم ئەوی وتی لازمە بیکات، ئەوە عادەتی مەعاش دەرانە. چوارەم نالێت و نایکات، ئەوە عادەتی تەمەڵ و بەخیلانە. ئەی دیمنە، راستی تۆ لەو تائیفەیت. شەرت ئەکەیت و ئەیشکێنیت. من دائیما لە نەسیحەتی خێرت غافڵ نەبووم، وە رەفاقەتی تۆم بەباش زانیوە. ئێستا مەعلووم بوو بە قسەی نامووبارەکت شێر وەفای شکاندو خەریکی کوشتنی شەترەبەیە. ئەو موعامەلەیە زۆر رێگەی خەتەرە، ئەگەر ئازارێ بەشێر گەیشت. وەهەرچی داخڵی ئەم بێشە بێ، بەفەنا دەچێت، گوناهیان بە ئەستۆی تۆ ئەبێ.

وا لە ئەزعا خەلقە! گوێ بگرن لە گوفتاری وەتەن

بۆم بکەن ئەم دەفعەیە ئێوەو خودا چاری وەتەن

دیمنە وتی: من وەزیرێکی ناسیح بووم. لە باغی پادشادا لەبەمامی چاکە زیاتر ئەمناشتووە، وە لە مەنفەعەت زیاتر خراپەم بۆ پادشاه نەبووە. کەلیلە وتی: نەسیحەت و ئەمام و مەنفەعەت ئەوەیە وەلی نیعمەتی خۆت تووشی دەردو فیراق کرد و شەرت شکاندنی بەدونیادا ئاشکرا کرد. حوکەما فەرموویانە: لە شەش ئیش مەنفەعەت دەست ناکەوێت. ئەووەڵ قەولی بێ عەمەل. دووەم ماڵێ خێری لێ ئەکرێ. سێهەم رەفیقی بێ

تەجرەبە. چوارەم عیلمی بێ عەمەل. پێنجەم خێری بێ نییەت. شەشەم بەدەنی دەردەدار. ئەم ئەشیایانە بەیانم کرد لە مەراق زیاتر نەفعی نییە. پادشاە ئەگەرچی بە نەفسی خۆی عادل و کەم ئازار بێ، ئەگەر وەزیرەکەی ئارەزووی فیتنەو دووزوبانیی کرد، میللەت دەخاتە ژێر زوڵم و پەرێشانییەوە. شکاتی فەقیران ناگاتە خزمەت پادشاە. مەسەلا ئاوێ زۆر شیرین و ڕووناک بوو ئەگەر نەهەنگی تیا بوو کەس نزیکی نابێ.

دیمنە وتی: مەقسەدی من لەم ئیشەدا لە جێگەی خۆم زیاتر نەبوە. کەلیلە وتی: زینەتی پادشاە بە مەئموورو لەشکرەوەیە. ئارەزووی نەفسی پیسی تۆ ئەوەیە عموومی مەئموووران لە پادشاە دوور بێ، وەزیفەیان بە تۆ دروست بکرێ. ئەو فکرە واسیتەی بەخیل و کەم عەقڵییە.مەعلوومە پادشاهان بە واسیتەی مەئموورو لەشکرەوە حورمەت پەیدا ئەکەن. مەسەلا جوانێ هەزار کەس عاشقی جەماڵی بێن لە جوانیی ئەو کەم نابێتەوە. مەسەلەی پادشاە هەتا لەشکر و سوپای زۆر بێ ئێستا کەمە. بێ عەقڵیی تۆ مەعلوومە. عاقڵان فەرموویانە: نیشانەی کەم عەقڵی پێنجە. ئەووەڵ بۆ مەنفەعەتی خۆی زەرمردان لە خەڵق. دووەم بەبێ عیبادەت ئارەزووی بەهەشت. سێهەم بەبێ حەیایی پەلاماری ژنان. چوارەم نەخوێندەوار بی موجادەلە بکری لەگەڵ عولەما. پێنجەم بێ وەفایی دەرحەق بە ڕەفیق و مەعلوومی کرد بە واسیتەی ڕەفاقەتەوە زۆرم نەسیحەت کردی، تەئسیری نەسیحەتەکانم لە تۆ ئەوەندەیە وەک شوعلەی ڕۆژ لەگەڵ تاریکی چەندیان فەرقە، تەئسیری قسەی من لەگەڵ دڵرەشی وەک تۆ ئەوەندەی فەرقە.

بە ئاوی زەمزەمەوە جۆگەی کەوسەر
پاک نابێتەوە پێستی ئەهلی شەڕ

مەسەلەی من و تۆ وەک مەسەلەی تەیرەکەو مەیموونەکان وایە، هەرچەندە تەیرەکە بانگی کردن: خۆتان عەزیەت مەدەن بێهوودەیە، بەقسەی تەیرەکەیان نەکرد، تەیرەکە تووشی دەردی خۆی هات.

دیمنە پرسیی: چۆن بووە؟

حیکایەت

کەلیلە وتی: ئەگێڕنەوە میقدارێ مەیموون لە شاخێک بە میوە و گیای شاخەکە ئەژیان، تەسادوف شەوێکی تاریک، ڕەشتر لە دڵی منافقان، ئەو شەوە لەشکری ساردی هوجوومی کردە سەر مەیموونەکان، لە شیددەتی ساردی نزیک بوو خوێنی بەدەنیان

ببەستێ، قەراریان لێ برا، بە ئەترافی خۆیانا ڕایان نەکرد. تەسادوف پارچە شووشەیێ کەوتبوو، وایان زانی ئاگرە، مەیموونەکان چوون داری زۆریان هێنا لەسەر پارچە شووشەکە کۆمەڵیان کرد. تەیرێ بەسەر دارێکەوە نیشتبوو، بانگی کردن: ئەوە ئاگر نییە، خۆتان عەزیەت مەدەن، تەیرێکی کە بانگی تەیرەکەی کرد: دەمی خۆت هیلاک مەکە، باوەڕ بەقسەی تۆ ناکەن، ئەسیحەتی ئەو کەسانە وەک شمشێر ماڵێن بە بەردا وایە، کەسێ لە جوابی تۆ کەڕ بوو، خۆت هیلاک مەکە بڕۆ. تەیرەکە تەماشای کرد گوێ نادەنە قسەی، لە دارەکە چووە خوارەوە حاڵیان کات، مەیموونەکان ئەتراڤیان گرت، سەری تەیرەکەیان هەڵکێشا. کەلیلە وتی: ئەسیحەتی من بۆ ناموبارەکی وەک تۆ ئەترسم ئاخری تووشی بەلایەک بیم. ئەسیحەت کردنی کەم عەقڵان وەک بلوێر بۆ گا لێدان وایە. دیمنە وتی: ئەی ڕەفیق، عالمان لە ئەسیحەت کردنی جاهیلان قوسوور ناکەن، واعیزان تەرکی وەعز خوێندن ناکەن، ئایا تەئسیر بکات یا نەیکات. ئومێد دەکەم دەرگای ئەسیحەتم لێ دانەخەیت. کەلیلە وتی: لە ئەسیحەت قوسوورم نەکردووە، ئەمما زۆر ترسم هەیە چونکە بناغەی ئیشت بە حیلە هەڵبەستووە، لە ڕووخانێ نزیکە، وە زەرەری بۆ خۆت بگەڕێتەوە، ئەو وەقتە

پشتی دەست لە پەشیمانییا بگەزیت. ئەساسی نیشنی بە فێڵ دانرابێ، جەزای ئاخری مردنە، هەروەک شەریکە زیرەکەکە بە مەکری خۆی لەناو چوو، شەریکە غافڵەکە بە واسیتەی ڕاستیوە بەمەتڵەب گەیشت.

دیمنە پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

کەلیلە وتی: ئەگێڕنەوە دوو شەریک بوون یەکێکیان (زیرەک) و یەکێکیان (غافڵ) ناو بوون. هەردوودکیان بە خەیاڵی کەسابەت، ڕێگەی سەفەریان گرتە پێش. میقداری ڕێگە ڕۆیشتن. کیسەیە پڕ بوو لە درهەم دۆزییانەوە، هەڵیانگرت. زیرەک ناو بە غافڵی وت: ئەی ڕەفیق، موعامەلەی بێ قانزاج زۆرە. مەسڵەحەت ئەوەیە بگەڕێینەوە، بە ئیسراحەت لە ماڵی خۆمان دانیشین، وردە وردە ئەم پارەیە سەرف کەین چونکی هەتا پارە زۆر بێ مەراقی زیاترە. چاوی تەمەعکار بە خۆڵی قەبر نەبێ پڕ نابێتەوە.

هەردووکیان گەڕانەوە. لە نزیک شارەکە دانیشتن. غافڵ وتی: لازمە ئەم پارەیە بکەین بە دووکەرتەوە، هەریەکەمان بەشێکی هەڵگرین. زیرەک وتی: قابیلی تەقسیم نییە. لازمە میقداری بۆ خەرجی هەڵگرین و باقییەکەی لە جێگەیەک بشارینەوە هەموو ڕۆژێ بە قەدەر ئیحتیاجی ماڵ سەرف کرێت، بەو نەوعە دەوامی زۆر ئەبێ. غافڵ بەو قسەیە ڕازی بوو، میقداری پارەیان هەڵگرت و باقیی کیسەکە لەژێر دارێکدا شاردیانەوە، ڕۆیشتنەوە ماڵەوە. بۆ ڕۆژی دوایی زیرەک چوو کیسەکەی لەژێر دارەکە دەرهێنا بردیە ماڵەوە. غافڵ لەو مەسئەلەیە بێ خەبەر بوو. ئەو میقدارە هەڵیانگرتبوو تەواو بوو. غافڵ چووە لای زیرەک، وتی: خەرجیم نەماوە، با بچین میقداری پارە لە کیسەکە دەربێنین. زیرەک وتی: موبارەکە. هەردووکیان ڕۆیشتن بۆ بن دارەکە، پارەکەیان نەدۆزییەوە، زیرەک بەرۆکی غافڵی گرت، وتی: پارەکە تۆ بردووتە، چونکە لە من و تۆ زیاتر کەس خەبەری شاردنەوەی کیسەکەی نەبوو. غافڵ سوێندی بۆ خوارد، باوەڕی نەکرد، بوو بە شەڕیان، شکاتیان گەیشتە مەحکەمەی شەرعییە. قازی سوئالی لە زیرەک کرد ئیسپاتی ئەکەیت غافڵ پارەکەی بردووە؟ زیرەک جوابی دایەوە: (أيها القاضي أبقاك الله) ئیسپاتی من لەو دارە زیاتر نییە ئومێد ئەکەم بێتە زوبان. دزێتیی ئەم غەددارە بەیان بکات. قازی ئەمری کرد بۆ سبحەینێ بچن سوئال لە دارەکە بکەن. زیرەک ڕۆیشتە ماڵەوە، بە تەواوی قسەی بۆ باوکی کرد، وتی: بابە بە فکری تۆ دارەکەم بەشاهید داناوە، بۆ ڕێگەی فێڵ ئەو

قەسەیەم بە قازی وتووە. بێتو موافەقەتی تەدبیری من بکەیت، تا مردن بەو پارەیە نەژین. باوکی وتی: تەدبیرەکەی چییە؟ زیرەک وتی: ناو دارەکە بۆشە، جێگەی یەک پیاو لەناو دارەکەدا نەبێتەوە. مەسلەحەت ئەوەیە ئیمشەو برۆیت لەناو دارەکەدا خۆت بشاریتەوە، هەتا سوبحەینێ قازی دێت. وەقتێ سوئالی کرد، تۆ بڵێیت کیسە پارەکە غافل بردوویەتی. باوکی وتی: ئەی ئەولادم، لەسەر خەیالی ئەم مەکرو فێڵە لاچۆ. ئەگەر خەڵق بخەڵەتێنی، خالق ناخەڵەتێنی. مەکرو فێڵ لەگەڵ خودا ناکرێ. مالی دونیا ئەوەندە دەوامی نییە. دینی خۆت و دینی من زایع بکرێ. تەرکی ئەم مەکرە بکە. زۆر واقیع بووە مەکرو فێڵ ئاخری ڕووی کردووەتە ساحێبی، فێڵەکەی ئاشکرابووە، ئابڕووی دنیا و قیامەتی ڕژیشتووە. من ئەترسم مەکری تۆ وەک وەک مەکری بۆقەکە بێت.

زیرەک پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

باوکی وتی: ئەگێڕنەوە بۆقێ کونی نزیکی کونەمارێ بوو. هەر وەقت بۆقەکە بێچووی هەڵئەهێنا مارەکە ئەچوو ئەیخوارد. بۆ قەکە ڕەفاقەتی لەگەڵ قرژاڵێک بوو، شکایەتی ئەحوالی خۆی بردە لای قرژاڵەکە، وتی: ئەی ڕەفیق تەدبیر چییە لەدەست ئەم زاڵمەی غەددارەی بێ ڕەحمە؟ نە موقابەلەی بۆم مومکین ئەبێ و نە تەرکی وەتەن، چونکە جێگەکەم زۆر فەرەحەو ساحێب ئاوەو گوڵی بۆن خۆشی لە هەمو ئەوع تیایە. وەسفی جێگەکەی بەم شیعرانە بەیان کرد:

پڕ گوڵ و عەنبەر وەتەن خاکی وەکوو جامی بلوور
پڕ بەچەشمەی ئاوی ڕەوشەن میسلی چاوی پڕ لە نوور
خاتەمی پەنجەی سولەیمانی نەبێت ئەمبیستووە
کێوی یاقووت و زومەڕڕەد، قوببە قوببە سەوزو سوور
دەشتی فابریقەی گوڵ و سەوزەو ڕەیاحینە بەهار
بادی عەتتارە کە دێنێ قافڵەی موشکین لە دوور

لە پاشا بۆق بە قرژاڵی وت لەمەدرەسە ڕێگەی ئەجاتت چی خوێندووە؟ وە تەدبیرێ بۆ ئەحوالم بدۆزەرەوە. قرژاڵ وتی: لە فلان جێگە خورماسیچانێ هەیە زۆر بەدەستە، لازمە بچیت میقدارێ ماسی بگری لە کونی خورماسیچانەکەوە یەکە یەکە تا کونە مارەکە دایێنیت. وەقتێ خورماسیچان هاتە دەرەوە ماسییەکان یەکەیەکە ئەخوات هەتا ئەگاتە

سەر کونەمارەکە، مارەکەش نەخوات، تۆ لە دەست زوڵمی نەجاتت نەبێ. بۆقەکە بەو تەدبیرە مارەکەی دەرخوارد خورماسیچان دا. دوو سێ ڕۆژی پێ چوو، خورماسیچان بە خەیاڵی ماسی خواردن بە هەموو لایەکدا ئەگەڕا، تەسادوف ڕێگەی کەوتە کونە بۆقەکە. بۆق و بێچووی عومووم خوارد. باوکی وتی ئەم حیکایەتەم بۆیە بۆ کردی تا بۆت مەعلووم بێ جەزای خراپە خراپەیە، زیرەک وتی: بابە، واز لەم مەسئەلە دوورو درێژانە بێنە. ئەم فکرەی من زۆر ئاسانەو دەوامی پارەکە زۆرە. باوکی کوڕەکە لەبەر خۆشەویستیی کوڕەکەی لە ڕێگەی دین و دیانەت دەرچوو، نزیک بە ڕێگەی زوڵم و خیانەت بوو (انما أموالكم وأولادكم فتنة) بەرۆکی گرت، ڕێگەی شەریعەتی بۆ گوم بوو. بەو شەوە ڕۆیشت چووە ناو دارەکەوە خۆی شاردەوە. وەقتێ ڕۆژ بووەوە قازی لەگەڵ میقداری مەئموورانی و لەگەڵ زیرەک و غافڵ چوونە بن دارەکە. قازی سوئالی حەق و ناحەقی زیرەک و غافڵی لە دارەکە کرد. لەناو دارەکەوە بانگ کرا: ئەی قازی، کیسەی پارەکە غافڵ بردی. زیرەک ڕاست ئەڵێت: غافڵ درۆزنە، خیانەت غافڵ کردوویەتی. قازی لەو مەسئەلە سەرسام ما. بە عەقڵ بۆی مەعلووم کرا کەسێ لەناو دارەکەدا خۆی شاردووەتەوە، فکری کرد لازمە بە سیاسەت ئەم مەسئەلە ئاشکرا بکەم، ئەمری کرد بە کۆمەڵ کردنی دارو چیلکە و پووش لەبن دارەکە، ئاگریان تێ بەردا تا گۆشتی ناو دارەکە ببرژێت. پیرەکە نەختێ سەبری کرد، وایزانی ئەکوژێتەوە. نیهایەت ئێسقانی پیرەکە تەزیی ئاگری چەشت بانگی کرد: ئامان، قازی! قازی ئەمری کرد هێنایانە دەرەوە، لە حەقیقەتی ئەحواڵی زیرەک و غافڵ سوئالیان کرد. پیرە نیو سووتاو ئەووەڵ و ئاخری قسەی بەیان کرد. ڕاستیی غافڵ و فێڵی زیرەک لە خەڵقەکە مەعلووم کرا.

پیرەکە میقداری نیو سەعات ژیا، ئەمری خودای بەجێهێناو پارەکەیان بۆ غافڵ سەندەوە. زیرەک باوکی بە مردوی گرت بە کۆڵەوە، ڕۆیشتە ماڵەوە. مەعلوومە هەر کەس چاڵ بۆ کەسێ هەڵکەنێ خۆی تێ ئەکەوێ. غافڵ بە دڵێکی خۆشەوە ڕۆیشتە ماڵەوە. زیرەک بە ڕووی ڕەش لە تەعزیەدا دانیشت.

کەلیلە وتی: هێنانەوەی ئەم میسالەم بۆ ئەوە بوو بۆت مەعلووم بێ ئاخری مەکر ڕوو ئەکاتەوە ساحێبی. وا ئەزانم تۆیش لەم نیشە تووشی زەرەر دێیت و پەشیمانی حاسڵ ئەکەیت. کەیفی خۆتە.

دیمنە وتی: تۆ عەقڵ بەمەکر و تەدبیر بە فێڵ ناو ئەبەیت. من ئەم زەحمەتەم بە تەدبیر و

عەقڵ کردووە. کەلیلە وتی: لە کەم عەقڵی و فەسادیت هەرچەند بەیان بکەم تەواو نابێت. وەفاو چاکەت لەگەڵ وەلی نیعمەتی خۆت ئەوەیە کەوا دیارە، وەرگەڕاندنی دێتەوە ڕێگەت. بۆت مەعلووم بووە دوو زوبانی چەند خراپەو دوو ڕوویی چەند عەیبە؟ دیمنە وتی: قەڵەم ئەگەر دوو زوبان نەبوایە حوکمی پادشاهانی ئیجرا نەئەکرد. تیغ یەک زوبانە، خواردنی لە خوێن زیاتر نییە. گوڵ ئەگەر دوو ڕوو نەبوایە شەوقی پەیدا نەئەکرد و عالەم عاشقی بۆنی نەئەبوون. شانە چونکە دو ڕووە دایم لەگەڵ زوڵفی جوانان تێکەڵە.

کەلیلە وتی: ئەی دیمنە، تۆ ئەو قەڵەمە نیت بۆ سری پادشا مەحرەم بی، تۆ ئەو مارە دوو زوبانەیت برینی زوبانت زەهری هەلاهەلە، تۆ ئەوگوڵە دوو ڕووە نیت خەڵق ئارەزووی بۆنت کەن، بەڵکی ئەو دڕکانەیت ئازارت بە دڵی خەڵق گەیاندووە. مار سەد دەرەجە لە تۆ چاترە. لە زوبانێکی زەهر ئەدات، لە زوبانێکی دەرمان. تۆیش ئەگەر زوبانێکت بۆ ڕەفیقانت دەرمانی بدایەو زوبانێکت بۆ دوشمنان زەهراوی بوایە، عەیبی نەبوو، هەروەک ئەڵێن:

دەرمان و زەهرە لەسەر زوبانە
یەکێکی دۆستە، زەهر بۆ دوشمنانە

دیمنە وتی: لە تەعنەدانم دەست هەڵگرە، مومکینە شێر و شەترەبە ئاشت ببنەوە، وەک پێشوو خۆشەویستی پەیدا بکەنەوە. کەلیلە وتی: ئەم مەکرەت تازەیە، مەکری تۆ نەوع نەوعە ئەی غەددار. سێ ئەشیا باقی ئەمێنێت تا بە یەک نەگەن. ئەووەڵ ئاوی سەرچاوە شیرینە تا داخڵ بە بەحر ئەبێ. وەقتێ داخڵ بە بەحر بوو تاڵ ئەبێ. دووەم خزمایەتی و ڕەفاقەتی هەتا فیتنەو فەساد لە بەینا نەبێ. ڕەفاقەت و خزمایەتی ئەوەندە خۆشە ڕێگەی دوو زوبان و فیتنە نەدرێت. وەقتێ بەقسەی فیتنە موعامەلە کرا لە یەک مەحرووم ئەبن. سێهەم موعامەلە و ئاڵ و وێر لە ڕێگەی ڕاستەوە، ئەگەر بە واسیتەی فیتنەوە خواریی موعامەلەیان ئاشکرا بوو. موعامەلە و هاتوچۆیان ئەبڕێت. ئێستا شەترەبە لەدەست شێر نەجاتی بوو، زەحمەتە ڕەفاقەت و ئەمین بوونیان لەیەک چونکە عاقڵان فەرموویانە:

پەتێ بپچڕێ بەستنی ئەتوانی
گرێی تێ کەوێ سافی ناتوانی

دیمنە وتی: ئەگەر دەست لە خزمەتی شێر هەڵگرم، لە کونجێ دانیشم، بە تەدبیری تۆ موعامەلە بکەم لە ڕەفاقەتم جیا نابیتەوە؟ کەلیلە وتی: حاشا لە خۆت و لە ڕەفاقەتت.

زۆر لە ڕەفاقەتی تۆ بێزارم. عولەما فەرموویانە: لە ڕەفاقەتی جاهیل و فاسیق دوور بە. ڕەفاقەتی جاهیل و ڕەفاقەتی مار وەک یەکە. زۆر لە واقیع بووە چەند کەسانێ چەند موددەتێ لەگەڵ مار ڕەفیق بوون، وەقتێ ناغافڵ مارەکە داویە بە ڕەفیقەکەیەوە مردووە. ڕەفاقەت لەگەڵ عاقڵان و ساڵحان لازمە، مەسەلا لە گوزەری عەتتارخانەوە ئەڕۆیت ئاشیلی بۆنی خۆش ئەبێ. ڕەفیقی عەتتار بەبۆنت خۆش ئەبێ. لە جاهیل دوور بە پرشنگت بۆ دێ. هەرکەس وەک تۆ بێ وەفا و بەخیل بوو ڕەفاقەتی حەرامە. لە جێگایەک شێر ڕوتبەی وەزیری بە تۆ دا، سەری تۆی لەناو جەمعی حەیواناتا بەرز کردەوە، لە جیاتیی چاکە ئەو موعامەلەیەت لەگەڵ کرد. وا دیارە. ڕجا دەکەم هەتا لە واسیتەی شوومیتەوە تووشی موقەددەرێ نەبووم دەست لە ڕەفاقەتم هەڵگرە، وە ئەگەر دە ڕۆژ ڕێگە لە تۆ دوور بم، ئێستا کەمە. هەرکەس ڕەفاقەتی لەگەڵ نەزان کرد. ئەوەی تووش دێ تووشی باغەوانەکە هات.

دیمنە پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

کەلیلە وتی: ئەگێڕنەوە کابرایەکی باغەوان عومری خۆی لە باغێکدا سەرف کردبوو. ئەو باغە لە ئەنواعی میوە بە خەیاڵدا بێ تیا مەوجوود بوو. گوڵی هەمە نەوع و سەوزەو میوەهاتی لە حیساب دەرچوو بوو. باغەوان لە خۆشیی باغەکەی تەرکی ئاوەدانیی کردبوو، فکری دایک و باوک و ماڵ و مناڵی نەبوو. چەند ساڵێ بە تەنهایی نیدارەی کرد. ڕۆژێ زۆر بێ تاقەت بوو، لە باغەکەی چووە دەرەوە، فکری ئەوەی کرد ڕەفیقێ پەیدا بکات. تەسادوف ورچێکی ناشیرین بە تەنها لەو سەحرایەدا ئەسووڕایەوە. باغەوان میقدارێ سێو و قەیسی و میوەهاتی پیشان بە ورچ دا، بە نیشارەت بانگی ورچی کرد. ورچ چوو بۆ لای، هەردووکیان چوونە ناو باغەکەوە، وایان لێ هات بوون بە ڕەفیق، قسەکردنیان لەگەڵ یەک بەنیشارەت بوو. هەردووکیان مەحەببەتیان دەرحەق یەک پەیدا کرد. هەر وەقت باغەوان ئەنووست، ورچەکە باوەشێنی ئەکرد تا خەبەر ئەبووەوە. تەسادوف ڕۆژێ باغەوان خەوی لێ کەوتبوو، مێش هوجوومیان کردبوە سەر دەمو چاوی باغەوان، ورچەکە لەلایەکەوە مێشەکانی دەرئەکرد و لەلایەکی کەوە ئەهاتنەوە. نیهایەت ورچ ڕقی هەڵسا، ڕۆیشت تاشەبەردێکی دوو باتمانیی هەڵگرت، بە خەیاڵی مێش کوشتن لەسەر سەری باغەوان وەستا، بە هەموو قووەتی خۆی تاشەبەردەکەی کێشا بەسەر سەری

باغەوانەکەدا. لەبای بەردەکە مێشەکان فڕین، ئەما باغەوانەکە خەو و مردنی یەکێ بوو. بە واسیتەی ڕەفیقی کەم عەقڵەوە بەو دەردە چوو. عاقڵان فەرموویانە: دوشمنی عاقڵ لە ڕەفیقی نەزان چاکترە. ئەم میسالەم بۆیە هێنایەوە کەسێ عەقڵی نەبوو ڕەفاقەتی حەرامە. دیمنە وتی: من ئەوەندە کەم عەقڵ نیم چاک و خراپ لەیەک جیا نەکەمەوە. کەلیلە وتی: بەڵێ ئەیزانم کە عەقڵیی تۆ ئەوەندە نییە، ئەما دڵت وەک قەتران ڕەش بووە، لە ئەحواڵی خۆت خەبەردار نیت. بەفکرێکی نامویارەکت هەزار داوی بەڵا دروست ئەکەیت. لەبەین شەترەبەو شێردا فیتنەت داگیرساندووە. ئێستا ئیددیعای دامێن پاکی و عەقڵداری ئەکەیت. مەسەلەی تۆ لەگەڵ ڕەفیق وەک مەسەلەی بازرگانەکەو مشکە سەد مەن ئاسن خۆرەکە وایە.

دیمنە وتی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

کەلیلە وتی: ئەگێڕنەوە بازرگانێ بوو ئیرادەی سەفەری کرد، سەد مەن ئاسنی لە ماڵەوە بوو. بە ئەمانەت بردیە لای ڕەفیقێکی داینا و خۆی ڕۆیشت بۆ سەفەر، لە پاش چەند ڕۆژێ ڕەفیقەکەی سەد مەن ئاسنەکەی فرۆشت و پارەکەی خەرج کرد. وەقتێ بازرگان لەسەفەر هاتەوە، چووە ماڵی ڕەفیقەکەی بۆ گواستنەوەی ئاسنەکە. ڕەفیقەکەی وتی: ئەی ڕەفیق، زۆر خەجاڵەتی تۆ بووم، چونکە لە پاش ڕۆیشتنی جەنابت عومومی ئاسنەکەم خستە ناو ئەو گەنجینەوەو دەرگام لەسەر قوفڵ دا. لە پاش موددەتێ دەرگام کردەوە تەماشام کرد ئاسنەکە نەماوە. لەگەڵ ورد بوومەوە، کونە مشکێ دیار بوو، عومومی ئاسنەکە مشک خواردبووی. بازرگان وتی: شتێکی غەریب نییە، چونکە مشک بۆ خواردنی ئاسن زۆر خێرایە. دەمی بگاتێ وا ئەزانێ نان و حەڵوایە. لوقمەیەکی چەورو نەرمەو خوسووس دانی پێ تیژ ئەکا. ڕەفیقەکەی زۆر دڵی بەقسەی بازرگان خۆش بوو، وایزانی باوەڕی بەقسەی کردووە، دەستی لە ئاسنەکە شتووە. بازرگان ماڵئاوایی لە ڕەفیقەکەی کرد و ڕۆیشت. کابرای خاین فکری کرد دڵی بازرگان ئاشت کاتەوە. وتی: لازمە زیافەتێکی بۆ بکەم. جوابی بۆ بازرگان نارد سوبحەینێ تەشریفت بۆ نان خواردن لە ماڵی ئێمەیت. سەرم بەرز بکەیتەوە، باعیسی وەفایە. بازرگان بۆ وەقتی مەغریب چووە ماڵی ڕەفیقەکەی، وتی: ئەی ڕەفیق، قوسووروسم عەفو بفەرموو ئێستا ئیشێکی زۆر عەجەلەم هەیە. بۆ سوبحەینێ قاوەڵتی بە خزمەت ئەگەم. بازرگان چووە دەرەوە، تەماشای

کرد کوڕی ڕەفیقەکەی لەبەر دەرگا بەیاری کردن خەریک بوو. بازرگان کوڕەکەی هەڵگرت، لەژێر عەباکەی شاردیەوە، بردی بۆ ماڵی خۆیان قایمی کرد. بۆ سوبحەینێ زوو چووە ماڵی ڕەفیقەکەی. تەماشای کرد ڕەفیقەکەو منداڵەکانی بە گریان خەریکن، زۆر حاڵیان خراپە. ڕەفیقەکەی بە باوکەڕۆ ڕووی کردە بازرگان، وتی: ئەی ڕەفیق، قوسوورم عەفو کە، لە ئێوارەوە کوڕەکەم گوم بووە. دوو سێ دەفعە بەناو شارا جارم بۆ داوە، خەبەری نییە.

وەکــوو یەعــقــووب دەم بە زار و پەرێشــانم

لە گـــوم بوونی یووسف خـــەبەر نازانم

بازرگان وتی: وەقتێ ئێوارە لە خزمەت مەرەخەس بووم تەماشام کرد مشک گرەیەک منداڵێکی بە دەنووک گرتبوو بە ئاسمانا بەرز بووبوەوە. ڕەفیقەکەی وتی: ئەمە چ قسەیەکە تۆ ئەیکەیت؟ درۆ بەم نەوعە کراوە. مشک گرەیەک هەموو بەدەنی ئەلی درهەم نابێ، منداڵێک دە حۆقە گۆشتی هەبێ چۆن ئەتوانێ بیبات. بازرگان دەستی کرد بە پێکەنین، وتی: ئەی زاڵم، کامان درۆزنین: مشکێ سەد مەن ئاسن بخوات و، مشک گرەیەک منالێ بەرێت، کامیان عەجیبە؟ کابرا بۆی مەعلووم بوو قسە لەچی ئەکا. ڕووی کردە بازرگان، وتی: مەترسە، مشک ئاسنەکەی نەخواردووە. بازرگان وتی: ئەمێ بە مشککرە منالەکەی نەبردووە؟ ئاسنەکە لە مشک بستێنەرەوە، منیش منالەکە لە مشککرەکە ئەستێنمەوە.

کەلیلە وتی: ئەم میسالەم بۆیە هێنایەوە کەسێ وەفای لەگەڵ ڕەفیق نەبوو، خەیانەتی دەرحەق بە وەلی نیعمەتی خۆی کرد، ئومێدی چاکەی لێ نابینرێ. تۆ ئەم موعامەلەیەت لەگەڵ شێر کرد، بە تەمای ڕەفاقەتی کەس مەبە. لە ڕەفاقەتی غەددارێکی وەک ناموبارەکت خۆپاراستن واجبە.

قسەی کەلیلە و دیمنە گەیشتە ئێرە. شێر لە کوشتنی شەترەبە خەلاص بووبوو. شەترەبە بە مردووی لەناو خوێن و خۆڵا تێکەڵ بووبوو. بێشەکە لە حەیاتی شەترەبە خالی کرابوو. وەقتێ وردە وردە غەزەبی شێر نیشتەوە، کەوتە بەحری خەیالاتەوە. بە خۆی وت: حەیف بۆ شەترەبە. بۆم مەعلووم نەبوو ئەوی بەزوبان شەترەبەوە بەیان کرابوو ڕاست بوو وەیا درۆ. زۆر سەهوم کرد وەزیری عاقڵم بەدەستی خۆم لەناوبرد. پەشیمان بووەوە، دەستە ئەژنۆ دانیشت، سەری خەجالەتی بە ئەرزدا شۆڕکردەوە. دەستی کرد بە گریان بۆ شەترەبە. وتی: کەس وەک من نامەردیی بەسەر خۆی نەهێنا، بەبێ گوناه قەتڵێ ناحەقم کرد. دیمنە

تەماشای کرد شێر پەشیمان بووەتەوە، کەلیلەی بەجێهێشت، چوو بۆ خزمەت شێر. دەستەو نەزەر ڕاوەستا، ڕەسمی ئەدەبی بە جێهێنا، وتی: ئەی پادشاە، عاجزی و ماتیت واسیتەی چییە. ڕۆژ لەمە موبارەکتر دەست نەکەوتووە، دوشمنت لەناو خوێن و خوێنا مردووە، وەجەنابت بەسەلامەتی نەجاتت بووە. شێر جەوابی دایەوە وتی: هەرچەندە فکری عەقڵ و تەدبیری شەترەبە ئەکەمەوە دڵم زۆر عاجزە. بەڕاستی پشت و پەناهی لەشکر بوو، وە ئەتباعی من بە واسیتەی شەترەبەوە زۆر بوو بوو. دیمنە وتی: قوربان، مەراق خواردن بۆ ئەو کافرەی غەدداره باش نییە. (الحمدلله) قووەتت بە سەریا شکا. شوکرانەی لازمە. دیمنە وتی: لازمە ئەم فەتح نامەیە بنووسرێتەوە، بۆ یادگار هەڵگیرێ، هەموو ساڵێ لەم وەقتەدا بکرێ بە جەژن. بۆ پادشاهان وا دروستە دڵیان لە مەنسوورێ عاجز بێ لە زیندانا حەپسی بکەن، وە ئەگەر گوناهیان بوو بوو کوشتنیان حەلاڵە. ئیشی حوکەما ئەوەیە: ئەمووستێ ئەگەر مار گەستی ئەیبڕن لەبەر ئەوە زەهرەکەی بۆ جێگەیەکی کە ئەڕوات. دوشمنێ ئارەزووی کوشتنی کردی، بۆ لەناوچوونی دڵ خۆش بوون لازمە. شێر لە قسەی دیمنە ئەختێ سەبووریی دڵی هات.

وە لەنەسیحەتی دووەمدا بەیانی ئەکەین دیمنە لە جیاتی شەترەبە بەسیاسەت ئەکوژرێت. ئینسانی فیتنە ئەوعی دووپشکە. کەم هەڵئەکەوێ دووپشک بە سەلامەتی بگاتەوە جێگای خۆی. ئینسانی فیتنە بە تەمای ژیان نەبێ. گەنم بچێنرێت گەنم ئەدووررێتەوە.

**نەسیحەتی دووەم**

بەیانی جەزای فیتنە و دوو زوبان و ئاخری ئیشیان

دابیشلیم ڕووی کردە برەهمەن فەرمووی: بە واسیتەی زوبانی موبارەکتەوە بۆم مەعلووم کرا شێر بەواسیتەی فیتنە و دوو زوبانیی دیمنەوە ڕێگەی ڕاستی لێ گوم بوو. ئومێد ئەکەم بەیانی ئاشکرا بوونی فتینەی دیمنە بەیان بفەرموویت، بە چ سیاسەتێ خوێنی شەترەبە لەسەر دیمنە سوبووت کرا، چۆن کوژرا؟ حەکیم بیدپای برەهمەن فەرمووی: ئەی پادشاە، بە ماددەی قانوون لازمە لەسەرخۆ بناغەی ئیش دەربخرێ، ئینجا دەستی بۆ درێژ بکرێ. بەبێ تەحقیق کردن دەست لە هەرچی بدرێ پەشیمانی لەدوو دێت. لازمە بۆ پادشاهان ئومووراتی حوکوومەتیان بە تەدبیری مەجلیس بکرێت، وە لە قسە ورد ببنەوە، وە ئەهلی فیتنە و خاین بخەنە ژێرداری سیاسەتەوە بەنەوعێ جەزا بدرێن ببێتە تەنبیهی عالەم. میسالی وەک مەسەلەی شێر و دیمنەیە.

وەقتێ شێر مەکر و حیلەی دینەی بۆ مەعلووم کرا، بە نەوعێ جەزای دا بۆ عالەم بە عەمەل هات. وەقتێ شێر لە کوشتنی شەترەبە بووەوە، پەشیمانی حاسڵ کرد. دەستە نەژنۆ دانیشت، لە مەراقا بەو دیوو بەو دیوی خۆیا ئەکەوت. هەناسەی هەڵ ئەکێشا، بە خۆی ئەوت: ئەوەی من کردم، تا ئێستا هیچ نامەردێ نەیکردووە. بە خیلافی ڕێگەی عەدالەتم کرد، وە بە ئارەزووی نەفسی کافر عەجەلەم لەم قەتڵە کرد. موددەتێ بەو عاجزییە مایەوە. عاجزییەکەی تەئسیری کردە سەر حەیوانەکانی ناو بێشەکە. عوموومیان وەک شێر پەرێشان حاڵ بوون (سر الناس علی دین ملوکهم). وردە وردە حەیوانات لەشێر نزیک بوونەوە. هەر وەقت بەیانی ڕەوشتی شەترەبە ئەکرا شێر دەستی ئەکرد بەگریان. نیهایەت شەوێ شێر لەگەڵ پڵنگ ڕووبەڕوو دانیشتن، عیجز و مەراقی خۆی بۆ پڵنگ گێڕایەوە. پڵنگ وتی: ئەی پادشاه، لازم ناکات لە ئیشی ڕابوردوو مەراق خواردن، چونکە ئیشێ کە لە دەست چوو، نە بەقووەت و نە بە مەراق نایێتەوە جێگەی خۆی. پیاوی ساحێب عەقڵ فکری ئیشی ڕابوردوو ناکەن، وە ئەگەر بۆ ئیشی ڕابوردوو مەراق بخۆن لەسەفاهەت وەیا لە مردن نزیک ئەبن، وە هەر کەس شوێن ئیشی ڕابوردوو بکەوێ ئەوەی بەسەر دێ بەسەر ڕێوییەکە هات.

شێر پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

پڵنگ وتی: ئەگێڕنەوە ڕێوی زۆر برسی بوو. لەسەحرادا بۆ خواردن ئەگەڕا. تەسادوف بۆنی خواردنی کرد. بەبۆن کردن ڕۆیشت، گەیشتە سەر پارچە پێستێ. دڕندە گۆشتیان خواردبوو، پارچەیەک لە پێستەکەی بە جێمابوو. ڕێوی دڵی ڕوون بووەوە، پارچە پێستەکەی بەدەمەوە گرت، ڕۆیشت. لە ڕێگە تووشی ئاوادانی بوو. لە قەراغ ئاوەدانییەکە میقدارێ مریشک بە چینەکردن خەریک بوون. منداڵێکی زیرەک بە دیار مریشەکەکانەوە بوو.

ڕێوی فکری خواردنی مریشکی کرد. پارچە پێستەکەی داناو بۆ دزینی مریشک ئامادە بوو. تووشی چەقەڵێ بوو. چەقەڵ وتی: ئەی ڕەفیق، فکرت چییە؟ ڕێوی وتی: تەماشا ناکەیت (ولکم فیها ماتشتهي انفسکم) من موددەتێکە بەبرسییەتی لەم سەحرایەدا ئەسووڕێمەوە. ڕۆح هاتبوە سەر لێوم. پارچە پێستێ لە دڕندە مابوەوە دۆزیەوە. ئەمما ئێستا ئارەزووی خواردنی یەکێ لەم مریشکانە ئەکەم. چەقەڵ وتی: هەیهاتە هەیهات! من

مووددەتێکە لە کەمینی ئەم مریشکانە دام، ئارەزوو ئەکەم یەکێکیان بدزم، لە ترسی ئەو منداڵە زیرەکە قووەتم نییە، نە بەشەو نە بەڕۆژ ڕێگەی فرسەت نییە. تۆ پارچە پێستێکت دەست کەوتووە قەناعەتی پێ بکە لە ڕێگەی خۆتەوە بڕۆ، واز لەم تەمەعە بێنە. ڕێوی وتی: ئەی ڕەفیق، حەیفە ئینسان تووشی گوڵ هات لە ترسی دڕک دەستی بۆ درێژ نەکات. غیرەتی من قبووڵ ناکات بە پارچە پێستێکی بێ لەزەت نەفسی خۆم کوێر بکەمەوە، وەدەست لەم مریشکە قەڵەوانە هەڵ بگرم. چەقەڵ وتی: ئەی بێ غیرەت تەماعکاریت ناو ناوە غیرەت. ئارەزوو ئەکەیت خۆت تووشی بەلا بکەیت. حوکەما فەرموویانە: دەوڵەت بە فەقیری و قەناعەت دەست ئەکەوێ. ئیسراحەت لە عەجەلە نەکردنە. (العجلة من الشیطان) مەخەرە پێش دەمی خۆت و، ڕێگەی (الرزق مقسوم) بگرە. ئەترسم لە واسیتەی تەمەعەوە پارچە پێستەکەت لە دەست دەرچێ، وەک کەرەکە بۆ کلک ئەگەڕا، هەردوو گوێی بە بڕین چوو. ڕێوی پرسیی: چۆن بووە؟ چەقەڵ وتی: بەشیعری مەسنەوییەوە:

**حیکایەت**

کەرێ بوو کلکی لە بن بڕابوو
لە قەهری دڵی فکری نەمابوو
بۆ دۆزینەوەی کلکی ئەگەڕا
بە ڕێگەو سەحرادا دایم ئەزەڕا
قەزای خودا بوو، لازمە وابێ
دەمی لە کەغی فەللاحێ نابێ
فەللاح کە لە دوور چاوی بەکەر کەوت
دڵی ئاگری سەند وەک کیبریت و نەوت
بە دار و بەشەق کەری هەڵبڕی
چەقۆی دەرهێنا هەردوو گوێی بڕی
کەری هیچ نەزان بۆ کلک ئەگەڕا
تووشی ئەوەبوو هەردوو گوێی بڕا
هەر کەس بۆ تەمەع پێی لە ڕێ ناوە
ئەوەی بەسەر دێ لە کەر قەوماوە

ڕێوی لە واسیتەی بێ عەقڵیەوە ڕووی کردە چەقەڵ، وتی: مەگەر تۆ زیرەکی و عەقڵی من شارەزا نەبوویت؟ تەماشا کە هەر ئێستا مریشکێ ئەفڕێنم، ئەو وەقتە ئەڵێیت (بارک الله). ئەوەی وت و پێستەکەی بەجێهێشت، ڕووی کردە لای مریشکەکان. چەقەڵ بۆی مەعلووم بوو نەسیحەتی تەئسیر لە ڕێوی ناکا. ڕۆیشتەوە بۆ جێگەی خۆی. لەو وەقتەدا قەلەڕەشکەیەک لە ئاسمانەوە چاوی بە پارچە پێستەکە کەوت، بۆی نیشتەوە، پێستەکەی بە دەنووک هەڵگرت. بە ئاسمانا بەرزبووەوە. لەولاوە ڕێوی نزیک بە مریشک بووەوە. منداڵەکە فەرقی کرد. ئەو دارەی بە دەستیەوە بوو هاویشتی بۆ ڕێوی، دای لە دەستی، شکانی. ڕێوی لە ترسی ڕۆح و لەتاو ئازاری دەستی بەشەلە شەل گەڕایەوە سەر پارچە پێستەکە. تەماشای کرد پێستەکە نەماوە. بۆ شکاتی حاڵی سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە، تەماشای کرد پارچە پێستەکە بە دەنووک قەلەڕەشەوەیە، وتی:

ڕزقی تۆ بۆ تۆم پەیدا کرد
بەفکری مریشکێ دەستم شکاو کرد

ڕێوی دەستی کرد بە گریان، ئەوەندە سەری بە ئەرزدا ماڵی تا ڕۆحی دەرچوو، بە ئازارەوە مرد. ئەم میسالەم بۆیە هێنایەوە تا جەنابت فکرت بێتەوە سەر خۆت. مەعلوومە جەنابت بەدەستی خۆت یەکێ لە ئەرکانی حوکوومەتت لەناو بردووە. بۆ ژیانی باقیی میللەت فکرت نەماوە. قسەکردنت دەرحەق ئومەرا کەم بووە. شەترەبە تازە زیندوو نابێتەوە. وام بۆ مەعلووم کراوە نزیکە هەموو ڕەعیەت ڕێگەی فیرار بگرنە پێش. ئەو وەقتە مەراق و غەمت دووقات زیاد ئەبێ. لە پاش ئەو قسانە شێر بۆی مەعلووم بوو هەرچی پڵنگ بەیانی کرد هەمووی نەسیحەتە، ڕووی کردە پڵنگ، وتی: مەعلوومە قسەکانت زۆر بە تەئسیرە. ئەمما فکری ئەم گوناهە کە دەرحەق شەترەبە کردوومە زۆر بێ خوڵقی کردووم. دوور بوونم لە میللەت، قوسوورم دەرحەق بە مەئموران لەبەر ئەوەیە. پڵنگ وتی: ئەو مەسئەلەیە بە عاجزی دروست نابێ، بەڵکی بە تەدبیر دەرمانی ئەکرێ. چاک وایە بۆ جەنابت تەرکی ئەم عاجزی و ماتییە بکەیت، لەسەر تەختی پادشاهی دانیشیت، وردە وردە قسەی شەترەبە ئاشکرا بکەیت. ئەگەر ئەوەی بە گوێی جەنابتا گەیشتووە ڕاست بووبێ شەترەبە بە جەزای خۆی گەیشت. وە ئەگەر بە زوبانی شەترەبەوە فیتنەیی کرابێ لازمە ساحێب غەرەز بکەیت بە نیشانەی تیری بەلا، ئەوی بە دەست و بە تەدبیر مومکین ئەبێ لازم بە خەفەت ناکا. شێر وتی: وەزیریی بێشە بە تۆ لایقە. ئەوا تۆم بە وەزیری خۆم قەبووڵ کرد. موددەتێکە ئارەزووی ئاشکرا کردنی تەدبیر و عەقڵی تۆم

نەکرد. ئێستایش بە هەر نەوع مومکین نەبێ لە ڕێگەی عەدالەتەوە دڵی خوێناویم بە قسەی ڕاست پاک بکەرەوە. پڵنگ تەعەهھودی کرد بە موددەتێکی کەم مەسئەلەی شەترەبە نەووەڵ و ئاخری ئاشکرا بکا. شێر بەو وەعدەیە دڵ خۆش بوو. وەقتی ئێوارە پڵنگ ڕوخسەتی لە شێر وەرگرت، ڕۆیشت بۆ گەڕان. تەسادوف ڕێگەی کەوتە جێگای کەلیلە و دیمنە. لەو وەقتەدا بە قسەکردن خەریک بوون، دەنگیان بەرز نەبوەوە. پڵنگ لە پێش ئەو مەسئەلەدا دڵی لە دیمنە خراپ کردبوو، بۆ گوێ گرتنی سوئال و جوابی کەلیلە و دیمنە چووە پێشەوە، خۆی ڕاگرت. کەلیلە وتی: ئەی دیمنە، زۆر ئیشێکی خراپت کردو فیتنەیەکی گەورەت داگیرساند. بە واسیتەی فیتنەو دوو زوبانی تۆوە پادشاە شەرتی

شکاندو بە خائین مەشهوور بوو. ئاگری فیتنە و فەسادت لەناو دڕندە و حەیواناتا بڵاو بووەوە. ئەمین بە ساعەت بە ساعەت جەزای ئەو فیتنەیەت ئەگەڕێتەوە سەر خۆت. هەرکەس تیغی زوڵم تیژ کات سەری خۆی پێ ئەبڕێت. مەعلوومە ئەهلی ئەم پیشەیە بە فیتنەی تۆ بزانن عوزرت قبووڵ ناکەن و دەستی ڕەجا و عەفو بۆ تۆ درێژ ناکەن، بۆ خنکاندنت هەموو ئیتتیفاق ئەکەن. من قسەکردنم لەگەڵ تۆ حەرامە. حوکەما فەرموویانە: ڕەفیقی منافق مەکە، لەگەڵ فیتنە و دوو زوباندا دامەنیشە، چونکە نزیک بە کوورە بێ پرشنگ نابێ. لە ڕەفیقیی تۆ بێزارم. ڕەفیقی لەگەڵ یەکێکی وەک خۆت لایقە. دوور بوونم لە تۆ ڕێگەی پاکییە، چونکە ڕەواجی قسەم لای تۆ نییە. دیمنە وتی: ئەی ڕەفیق، لە ڕەفاقەتی خۆتم مەحرووم مەکە. سەعاتێ لە تۆ دوور بم ژیانم مومکین نابێ. ئەوەندە بۆ خوسووسی شەترەبە لۆمەم مەکە. ئیشێک لەدەست چوو، ناو هێنانی باعیس بە دڵ تەنگییە. قسەکردن لە ئیشی ڕابوردوو جوان نییە. قسەی لۆمەو تەعنە کۆتاهی بێنە. (الحمد الله) دوشمنم بە جەهەننەم چوو، وەقتی جەژن و شایی منە. دنیا بە ئارەزووی دڵی من بوو. ڕجا ئەکەم ئەختێ قسەی فەرەح و موشفیقانە بێنەرە ناوەوە، باعیسی ئەجرو ئیحسانە. کەلیلە وتی: لەگەڵ ئەمەی ڕێگەی ڕاستت گوم کردووە، ئاگری فیتنە و فەسادت داگیرساندووە، جەزای وەفا و ئینسانییەتت بە فیتنە و دوو زوبانی ئەدا کردووە، شەرت و سوێندت بەیەکەوە شکاندووە، ئێستا بە ئومێدی ئیسراحەت و ژیان هەیت. خەیاڵی بەتاڵ ئەکەیت. چاوەڕوان بە ئیمڕۆ، سوبحەینێ، بە جەزای خۆت ئەگەیت، دیمنە وتی: ئەوە ئەبوو من فەرق بە چاک و خراپ نەکەم، دووزوبانی و مەکر و حیلە بە چاک بزانم. ئەمما ئەوەی کە من کردم باعیس بە جێگەی خۆم بوو. ئەو فیتنە و دووزوبانی، وەک جەنابت ئەفەرموویت، حیرس و تەمەعی دونیا پێی کردم. ئێستا چارەی ئەم ئیشە نازانم. تیا موتەحەییر ماوم. فکرم هەیە تەدبیرێ بدۆزمەوە. وەقتێ پڵنگ بە تەواوی بۆی مەعلووم بوو دیمنە شەترەبەی بە کوشت داوە، بۆ ئاشکراکردنی چووە لای دایکی شێر، وتی: ئەی خانم، قسەیەکی سیڕی هەیە زات ناکەم بیگێڕمەوە چونکە باعیسی فیتنەیە. لازمە بە عەقڵ دروست بکرێ. دایکی شێر سوێندی بۆ پڵنگ خوارد بە ئەوعێ زەرەری بۆ کەس نەبێ بەیانی بکەم. دڵی پڵنگ تەئمین بوو. ئەووەڵ و ئاخری قیسسەی کەلیلە و دیمنەی بۆ دایکی شێر گێڕایەوە. پڵنگ وتی: بۆم مەعلووم بووە کەلیلە زۆر لە دیمنە بێزارە لە واسیتەی عاجز بوونی شێرەوە، دایکی شێر لەو قیسسەیە زۆر عاجز بوو. بۆ ڕۆژی دوای چووە لای شێر، تەماشای کرد شێر زۆر بێ تاقەتە، ڕووی کردە شێر، وتی: واسیتەی

ئەم ڕەنگ زەردو عاجزییەت چییە؟ شێر جوابی دایەوە، وتی: ئەی دایە، ئەم زەردو عاجزیە هەمووی واسیتەی کوشتنی شەترەبەیە. هەرچەند فکری عەقڵ و زانستی شەترەبە دەکەمەوە، مردنم لا خۆشترە، تا قیامەت لە فکرم ناچێتەوە. وەقتێ بە ئیشێ وە یا بە تەدبیرێ موحتاج ئەبم، ئەمبینی شەترەبە فکر ئەکەمەوە، لە گریان زیاتر چارەم نییە. لە مەئموران عاقڵ و بە تەدبیر و بە وەفا لایق بەشەترەبە بوو، ئەویش نەما. دایکی شێر وتی: وا دیارە دڵی تۆ بە بێ گوناهیی شەترەبە ئەسووتێ. فکر دەکەیتەوە لە کوشتنی بەبێ تەجرەبە، بەبێ گوناه. پەشیمان بوویتەوە، بۆت مەعلووم نەکرا لایقی کوشتن بوو، وەیا بە قسەی فیتنە ئەو خەتایە لەدەستت قەوما. لە قسەی عاقڵان لات دا. فەرموویانە: بەپەلە و گەرمی ئیش کردن ئاخری پەشیمانییە. شێر وتی: ئەی دایە، ڕاست ئەفەرموویت بە عەجەلە ئەو ئیشەم لەدەست قەوما و سەبرم نەکرد. ئەوا ئێستا لەناو حەیواناتا ناوم بە خراپە بڵاوبووەتەوە، بە شەرت شکاو مەشهوور بووم. ئەوەندە ناوی شەترەبە دەبەم، تا خیانەت وەیا بێ گوناهی ئاشکرا بکەم، خۆم لە لۆمەی میللەت نەجات بدەم. هەرچەند ئارەزوو دەکەم بۆم مومکین نابێ، چونکە شەترەبە خراپەی لێ دەرنەکەوتبوو. بە ئاشکرا من زوڵمم لێ کرد، کوشتم. ڕێگەیەک نادۆزمەوە سەبووریی خۆمی پێ بدەمەوە. ئەگەر تۆ خەبەرێک وەیا تەدبیرێ ئەزانی، بەیان کردنی ڕێگەی نەجاتە بۆ من. دایکی شێر وتی: قسەیەکم بیستووە لەیەکێ مەئموورەو ڕاست قسەیە، قیسمەی ئەووەڵ و ئاخری شەترەبەی بۆ گێڕامەوە. ئەمما سوێندێک دراوم ناوی ئەو کەسە ناڵێم، وە مەعلوومە لە جەنابت سر ئاشکراکردن زۆر عەیبەو نیشانەی بێ عەقڵییە. عولەما فەرموویانە: سر ئاشکراکردن گوناهە، سر داپۆشین ئەمری خودایە (ان الله هو ستار العیوب). لەبەر ئەمە ئەبوایە دڵی جگەر گۆشەم لە غەم نەجات ئەدا. شێر وتی: ئیختیلافات لە قسەی عولەمادا زۆرە، قیسمێکیان ئەمریان کردووە سرێ فیتنە داگیرسێنێ ئاشکراکردنی حەرامە. وە قیسمێکیان فەرموویانە: کەسێک ئاگای لە قەتڵێ بێ و شاهادەتی بە ڕاستی ئاشکرا نەکات نیوەی گوناهی قەتڵەکە بە گەردنی ئەو کەسە ئەبێ چونکە شەهادەت ئەمری خودایە، ئاشکراکردنی ڕێگەی شەریعەتە. ئەمما من خۆف ئەکەم مومکینە ئەو کەسەی قسەی بۆ جەنابت کردبێ، ئیخفالات بوون بێ، ترس و خۆفی لە من پەیدا کردبێ تۆی کردووە بە واسیتە ڕجا لە من بکەیت زەرەری پێ نەگەیەنم. وە من ڕجا دەکەم هەرچیت بیستووە بەیانی بفەرموو، وە عەهد دەکەم لە قسەو تەدبیری تۆ دەرنەچم. دایکی شێر وتی: قسەکانت زۆر لایقە، ئەمما بۆ من زۆر ناشیرینە سر ئاشکرا بکەم چونکە سر

ئاشکراکردن دوو زەرەری هەیە، ئەووەڵ ئەو کەسە سری لێ ئاشکرا کردبێ ئەبێتە دوشمن. دووەم لەناو مەملەکەتدا بە دووزوبان شۆرەت پەیدا ئەکا، ئیعتیباری لای کەس نامێنێ بەمەحرەمی بزانن. قسەی لا ئاشکرا بکەن. هەر کەس سر نەپۆشێ بە عاقڵ ناوناهێنن. مەگەر لە قیسەی پادشاە و جڵەو دارەکە بێ خەبەری؟ جڵەودار سری ئاشکرا کرد، ئەووەڵ خۆی لە ناوچوو. شێر پرسیی: چۆن بووە؟

## حیکایەت

دایکی شێر وتی: ئەگێڕنەوە پادشایەک بوو، زۆر عادڵ و میللەت پەروەر بوو، شوعلەی عەدالەتی عومومی مەملەکەتی ڕووناک کردبووەوە. ڕۆژێ پادشاە چوو بۆ ڕاو. وەقتێ خێوەت و بارەگاە دانرا، هەر کەس بە وەزیفەیەک خەریک بوو. پادشاە ڕووی کردە جڵەودارەکەی فەرمووی: هەردوو وڵاخەکەم زین بکە. فکرم هەیە بزانم کامیان زۆر ڕا ئەکەن. بۆ تەجرەبە یەکێکی پادشاە سواری بوو و یەکێکی جڵەودارەکە. ئولاغیان توند کرد تا لە لەشکر دوورکەوتنەوە. پادشاە ڕووی کردە جڵەودار، وتی: غاردانمان بەسە. هەردووکیان ڕاوەستان. پادشاە فەرمووی: ئەی جڵەودار، مەقسەدم ئەوەبوو لە لەشکر دوور بکەوەمەوە، وەتۆ مەحرەمی سری. قسەیەک بەیان ئەکەم لازمە تا مردن کەس لە دەمت نەیبیسێ، وە لە کەس ئەمێن نەبووم ئەم سرەم لای ئاشکرا کەم. جڵەودار وتی: ئەی شاە، ئەگەرچی لایقی سری جەنابت نیم، شەرتە بۆنی فەرموودەت لە دەمم دەرنەچێ،

مەگەر خۆڵی قەبر لەدەمم ببیسێ. دڵی پادشای ئەمین کرد. پادشاه فەرمووی بۆم مەعلووم کرا لەم ڕۆژاندا براکەم خەریکی لەناوبردنی من بووە، وا لازمە لە پێش ئەوەی من لەناو بەرێت، حەیاتی لە دنیادا نەهێڵم. جڵەودار وتی: قوربان، وا لازمە نە بەشەو و نە بە ڕۆژ لە مەکری ئەمین نەبی، خۆت موحافەزە بکەیت، وەبەندە ئومێد ئەکەم لەناوی بەرم. لەسەر ئەو فکرە قەراریان دا. گەڕانەوە. پادشاه ئەمری کرد ڕاو بە تاڵ کراو گەڕانەوە بۆ مەملەکەت. وەقتێ داخڵ بوونەوە بە مەملەکەت، جڵەودار چووە لای برای پادشاه، ئەوەی لە پادشای بیستبوو ئەووەڵ و ئاخر بۆ برای پادشای گێڕایەوە. برای پادشا وەعدەی بەجڵەودار دا هەر وەقت بوو بە حوکمدار ڕوتبە بە جڵەودار عەتا بفەرموێ، وە خۆی لە ئازاری براکەی مەحفووز کرد. لە پاش چەند مووددەتێ پادشاه ئەمری خودای کرد. بە ئیتتیفاقی وەزیر و مەئموووران برای پادشاه لە جێگەی پادشاه دانرا. ئەووەڵ حوکم لە زوبانی پادشاه چووە دەرەوە ئیعدام کردنی جڵەودار بوو. وەقتێ جڵەودار داخڵ بە مەجلیس کرا ڕووی کردە پادشا، وتی: عومری پادشاه هەر باقی بێت، بەندە گوناهم چییە؟ لە چاکە زیاتر ئازارم بۆ جەنابت نەبوە، وە خوصووص وەعدەی ڕوتبەت بۆ من ئیعدام کردنە. پادشاه جوابی دایەوە، وتی: ئەی غەددار، خراپترینی گوناه سر ئاشکراکردنە. لە جێگەیەک براکەم تۆی بە مەحرەم زانی سری دڵی بۆ ڕوو ڕەشێکی وەک تۆ بەیان کرد، هاتی سرەکەت بۆ من ئاشکرا کرد، چۆن من ئیعتیبار بە تۆ بکەم؟ ژینی تۆ بۆ من و میللەت لە زەهر خراپترە. بۆ سیاسەت ئیعدام کردنت لایقە، لە پاش تۆ کەس جورئەتی سر ئاشکراکردن نەکات. هەرچەند جڵەودار پاڕایەوە، بێ فائیدە بوو، کردیان بە داری سیاسەتدا.

هێنانەوەی ئەم میسالەم لەبەر ئەوەیە لازمە سر ئاشکرا نەکرێت. سر ئاشکراکردن ئیشی بێ عەقڵانە. شێر وتی: ئەی دایکی خۆشەویستم، ئەو کەسەی سری ئەم مەسئەلەیی بۆ جەنابت ئاشکراکرد بێ حیکمەت نییە. بەعزێ کەس بۆ مەسڵەحەت سری خۆیان بۆ خۆشەویستیان ئاشکرا ئەکەن لەبەر موحتاج بوونی تەدبیر. سرێ داپۆشرابێ و ڕێگەی حەقی تاریک کردبێ، ئاشکراکردنی خێرێکی گەورەیە. ئومێد دەکەم ئەو قسەیە لە من نەشارێتەوە. بە واسیتەی موبارەکیی جەنابتەوە ئەم غەم و مەراقەم لە دڵ دەرچێت. ئەگەر بە زوبان ناتوانی، بە نووسین، ئەگەر بە نووسین مومکین نابێ، بە ئیشارەت، بە هەر نەوع لایقە بەیانی بفەرموو. دایکی شێر وتی: ئەگەر شەرت ئەکەیت ئەو فیتنەی گوناهکارە بە جەزا بگەیەنی و بە پاڕانەوەو زوبان لووسی ئیغفال نەبی، ڕەحمت دەرحەق ئەو غەددارە

نەبێ، ئەگەرچی عولەمای دین تووڵیان لە عەفوکردن زۆر داوە، ئەمما بە قەولی هەر چوار مەزهەبەکە کوشتنی ئەهلی فیتنە و فەساد دروستە، خوسووس ئەو نەوعە فیتنەیە. دڵی جەنابت بووەتە بە حری خوێن، وە لە ئەزەر میللەتدا بە زاڵم دانراییت. فەرموودەی خودایە (ولکم في القصاص). کوشتنی دیمنە حەڵاڵە، لەبەر ئەوە کەسێ فکری ئازاری میللەتی بوو ڕوو لەمەملەکەتی وێرانی ئەکا. مەعلوومە بەقسەو دووزوبانیی دیمنە شەترەبە کوژرا. شێر وتی: لازمە فکرێکی لێ بکرێ. دایکی شێر ڕۆیشتەوە بۆ جێگەی خۆی. شێر لە پاش فکرێکی زۆر ئەمری کرد بە حازر بوونی ئومەراو و زەرا. هەموو لە خزمەت شێردا کۆبوونەوە، وە لەسەر ئەمری شێر دیمنە داخڵ بە مەجلیس کرا.

وەقتێ دیمنە داخڵ بە مەجلیس بوو، تەماشای کرد دەرگای بەڵا کراوەتەوە، ڕێگەی نەجات داخراوە. دایکی شێر داخڵ بە مەجلیس بوو. دیمنە لە یەکێکی پرسی بە نەرمی، وتی: مەجلیس بۆ چ دانراوە، چی قەوماوە، شێر وا لەبەحری خەیاڵا ئەسووڕێتەوە؟ دایکی شێر گوێی لێ بوو، ڕووی کردە دیمنە، وتی: ئەم مەجلیسە بۆ نووسینی فەرمانی خنکاندنی تۆ گیراوە. بە واسیتەی دووزوبانی تۆوە، وەزیری زیرەک و عاقڵ وەک شەترەبە بێ کوژرا. لازمە تۆ لە سەعاتێ زیاتر نەبێ لە جەزای خوێنی شەترەبەدا. دیمنە وتی: عاقڵان چاکیان فەرمووەو ڕێگایەکی جوانیان داناوە. یەکێ لە قسەی حیکمەتیان ئەمەیە: ئەوی لە پاشاە دوورە، ڕەنگی سوورە. ئەوی لە پاشاە نزیکە، لەگەڵ بەڵا شەریکە. مەعلوومە هەر کەسێ ڕوتبەی گەورەی لای پادشاوە بوو، بەخیل و حەسوود ئارەزووی نەبوونی ئەکەن (والمخلصون علی خطر عظيم). لەبەر ئەوەیە ئەهلی حەقیقی پشتیان بە دیواری ئەمانەتەوە داوە، دەستیان لە دنیای غەدداری بێ بەقا هەڵگرتووە، لە چۆڵێک بە عیبادەت کردن خەریکن، ڕێگەی خەڵقیان لە خۆیان بەستووە. ئێستایش قانوونی پادشاهان ڕێگەی ڕاستی خوار ناکەن و بە ئارەزووی جاهیل موعامەلە ناکەن، وە فکری پادشاهان لە فکری میللەتەوە دوورە. زۆر بینراوە لە پادشاهان چەند کەسانێ جنێویان بەپادشاە داوە، لە جیاتیی جەزا خەڵات کراون، وە هەم بینراوە کەسێ ڕۆحی خۆی فیدای پادشا کردووە، وە خیانەتی زەڕڕەیەک نەبوە بە واسیتەی شتێکی بێ ئەهمیەتەوە بە داری سیاسەت کوژراوە. ئەگەر منیش مردن بەڕۆکی نەئەگرتم خزمەتی پادشام ئیختیار نە ئەکرد، وە لە عیبادەت خانە مەحرووم نە ئەبووم، وە خۆم نزیک بە سووتانن نە ئەکرد، وەتووشی دەرد و بەڵا نە ئەبووم. هەرکەس قەدری تەنهایی نەزانێ وە خزمەتی پادشا بە واجب بزانێ، ئەوەی بەسەر دێ، بەسەر عابیدەکە هات.

دایکی شێر پرسیی: چۆن بووه، بیگێرەوه.

**حیکایەت**

دیمنه وتی: بیستوومە عابیدێ تەرکی دونیای کردبوو. لە دووری شار لە کونجێ بە نوێژکردن خەریک بوو. پۆشینی پەلاس، خواردنی گیا بوو.شۆرەتی چاکەی لە هەموو لایەکەوە بلاو بووەوە. وەقتێ لە هەموو شارێکەوە خەلق ئەچوونە زیارەتی، نووری ڕووناکیان لەناوچەوانی عابید ئەدی. تەسادوف ئەو شارە پاشایەکی بوو لە تەبیعەت سەخی و بەڕەحمیدا ئەمسالی نەبوو. وەقتێ تووشی فەقیرێ بهاتایە، دەستی بۆ بەسنگەوە نەگرت، بە ئارەزووی فەقیرەکە موعامەلەی نەکرد. لەگەڵ ناوی عابیدەکەی بیست (نعم الامیر علی باب الفقیر) کەوتە دڵیەوە، چووە خزمەتی عابیدەکە تەڵەبی دوعای خێری لێ کرد. داوای نەسیحەتی بۆ پادشاهان بەکار بێ، کردی. عابید وتی: ئەی پادشاه، دوو ڕێگە هەیە. ئەووەڵ دنیا و ئاخر قیامەت. لازمە قیامەت لە بەرچاوت لانەدەیت، یەک زەڕڕە خودات لە فکر نەچێتەوە و زەخیرە بۆ قیامەت بنێریت. پادشاه وتی: زەخیرەی قیامەت چییە؟ عابید وتی: حەق سەندنی مەزڵوومان، مولاحەزەکردنی فەقیران، ڕەحم بوونت دەرحەق بە میللەت. وە هەر پادشایەک ئارەزووی بە هەشت بکا ڕەحم بە میللەت ئەکاو ئازار بە کەس ناگەیەنێ. هەناسەی فەقیرانی بۆ ئەکەوێتە کار، خودا ئەیبەخشێ. بە نەسیحەتی عابید خەزێنەی دڵی پادشا پڕ بوو، وەقسەی گەوهەرینی عابید دڵی پادشای ڕووناک کردەوە، خۆی بە مریدی عابیدەکە قوبووڵ کرد. پادشاه فەرمووی: لازمە هەموو ڕۆژێ بە قودوومی موبارەکت مەجلیسی ئێمە ڕووناک کەیتەوە. بەو نەوعە هاتوچۆکردنی عابید دەوامی بوو. ڕۆژێ عابیدو پادشاه بەیەکەوە دانیشتبوون. چەند کەسێ بەهاوارکردن ڕوویان کردە خزمەت پادشاه. عابید بانگی کردنە پێشەوە، یەکە یەکە قسەی لێ وەرگرتن. موافیقی حەق حوکمی بۆ دانان، وەپادشاه حوکمەکەی زۆر پێ خۆش بوو وە مەمنوونی عابید بوو. پادشاه ڕووی کردە عابید فەرمووی: ڕجا دەکەم هەموو ڕۆژ یەک سەعات لە دیوانی موحاکەمە لازمە حازر بی بۆ موحاکەمە کردنی میللەت، باعیسی ئەجرو ئیحسانە. عابید ئەمرەکەی قوبووڵ کرد. ئاخری وای لێ هات موحاکەمە، ئەمری موحاکەمەو کوشتن و عەفوکردن هەمووی بەزوبانی عابید قوبووڵ ئەکرا. مەرتەبە بەمەرتەبە ڕوتبەی عابید زیادی کرد. فکری نوێژو تاعەتی کەوتە سەر ئوموورات و خواردنی چەور و نەرم. ڕیازەتی گیای بە خواردنی شیرینی و لایق شکان. لەززەتی

خواردن و ئیسراحەت، عیبادەتی لە فکری عابید بردەوە. عابید لە ئەووەڵەوە فکری نانێکی بوو، ئەو وەقتە غەمی دونیایەکی بوو، چونکە دونیا وەک ژنی عەییار وایە چەند بەغیرەتێکی تووشی بەڵا کردووە، چەند سۆفییەکی بۆ تەمەع لە ڕێگەی دین لاداوە. حەڵقەی (حب الدنیا رأس کل خطیئة) لەگوێی عابید دەرچوو. وەقتێ پادشاە چاوی بە ئوموورات و عەدالەتی عابید کەوت، ئەمری ئیعدام و حەپسی ئەبەدی تەسلیم بە عابید کرد. تەسادوف ڕۆژێ یەکێ لە مورریدانی عابید چاوی بە عابید کەوت عەجایب ما، چونکە لەوە پێش بە خزمەت عابید گەیشتبوو، عادەتی شارەزا بوو لە ئێوارەوە تا ڕۆژ عابید بە نوێژکردن و گریان خەریک بوو. مریدەکە سەبری کرد تا مەجلیس چۆڵ بوو. وەقتێ عابید بە تەنها مایەوە، مرید چووە پێشەوە سڵاوی کردو لە خزمەت عابید دانیشت، وتی: یاشێخ ئەمە چ ئەحواڵێکە، بەخەوە وەیان بە ئاشکرایە ئەیبینم. عابیدەکە جوابێکی نەبوو ئیلزامی مریدەکەی پێ بدات. مریدەکە وتی: یاشێخ دونیا خوانێکە زەهراوییە بە خواردنی زەهر خۆت لەناو مەبە. فەرموودەی خودایە: «انما الحیاة الدنیا لعب ولهو». عابید وتی: ئەی دەروێش، بەواسیتەی ڕوتبەو هاتوچۆ کردنەوە عیبادەتم تەرک نەکردووە. لە ئەووەڵەوە چۆنت دیوم، لەسەر ڕەوشتی قەدیم لام نەداوە. عیبادەتم هەر باقییە. دەروێش وتی: ئێستا لە ئەحواڵی خۆت بێ خەبەری، ئارەزووی نەفس چاوو دڵتی گرتووە. وەقتێ بەخۆت ئەزانی لە پەشیمانییا پشتی دەستت بەدان ئەگەزیت. مەسەلەی تۆ وەک مەسەلەی کوێرەکە وایە، داردەستەکەی و لەگەڵ مار بۆ فەرق نەئەکرا.

عابید پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

دەروێش وتی: کوێرێ و چاوساغێ لە ڕێگە بوون بە ڕەفیق. ئەڕۆیشتن بە ڕێگەدا، شەویان بەسەرا هات. لەبەر ئیسراحەت دانیشتن. وەقتێ هەڵسان بڕۆن کوێرەکە دەستی گێڕا بۆ دارەکەی، مارێک کەوتە بەردەستی، وای زانی دارەکەیە. هەڵیگرت، دەستی لێ کوتا، نەرم و ساف بوو. پێ خۆشحاڵ بوو. سواری ولاغ بوو، ڕۆیشتن تا ڕۆژ بووەوە. چاوساغ تەماشای کرد کوێرەکە لە جیاتی دارەکە مارێکی بەدەستەوەیە، بانگی کرد: ئەی حافز، ئەوە مارە بەدەستەوە، فڕێی دە. کوێرەکە وای زانی چاوساغ تەمەعی کردووەتە دارەکەی، بۆیە وا ئەڵێ فڕێی دات ئەو هەڵیگری، جوابی دایەوە: ئەی ڕەفیق لەو کەسانە نیم بەقسە بخەڵەتێم. لە خوا بەزیادبێ دارەکەم گوم بوو دارێکی چاکترم دەست کەوت. وا

ئەزانم خەریکی بە فێڵ لەدەستم بسێنێ. چاوساغ دەستی کرد بە پێکەنین، وتی: وەڵڵا ئەوە دار نییە، مارێکە زەهراوییە. ڕجا دەکەم تا پێوەنەداوی بیکوتە بەئەرزدا. لە واسیتەی ڕەفاقەتەوە پێت ئەڵێم، پیاوی چاک بە، لە قسەم دەرمەچۆ. کوێرەکە وتی: ئەی بێ عەقڵ! قسە بۆ ماڵ ئەکەیت. بەهرەیەک خوا بە منی عەتا کردووە دەست تۆ ناکەوێت، قسەی پروپووچ مەکە. چاوساغ زۆری وت و کوێرە کەمی بیست. لەگەڵ ڕۆژ هەڵهات، دونیا گەرم بوو، مارەکە بووژایەوە، پێچی خواردو دای بەدەستی کوێرەکەوە. فەورەن کوێر ڕۆحی دەرچوو. دەروێش وتی: ئەم میسالەم بۆیە بۆت هێنایەوە لێت مەعلووم بێ دونیا مارێکە نەقش کراو، وە هەرکەس عاشقی نەقشی بوو ئاخری بەزەهری لەناو ئەچێت. وەقتێ عابید ئەو قسانەی لە دەروێش بیست، ترس و خۆفێک کەوتە دڵیەوە، دەستی کرد بە گریان، فرمێسکی پەشیمانی بەدەستی حەسرەت ئەسڕی. بەهەناسە هەڵکێشان و دەست بەدەست دانا ڕۆژی کردەوە. وەقتێ دائیرە دانرا عابید گریانی شەوی فکر چووەوە. بەشەو فکری تۆبەی ئەکرد، بە ڕۆژ فکری نە ئەما. موددەتی بەینی نەبوو، ئومەراو وزەرا قەراری عەزڵ بوونی عابیدیان دا. عابید عەزڵ کرا، لە گۆشەیەک دانیشت. ڕۆژێ لە وەقتی حوکمدارییا ئەمری بە کوشتنی پیاوێ کردبوو، کەسوکاری چوونە خزمەت پاشاە تەڵەبی حوقووقیان کرد. لە مەحکەمەی شەرعدا ئیسپاتیان کرد خزمەکەیان قاتیل نەبووە، بە نارەزووی نەفسی عابید کوژراوە. پادشاە ئەمری فەرموو بکوژرێتەوە. هەرچەندە عابید لە پادشاە پاڕایەوە وتی حەقی خوێنەکە تەسلیم بەکەسوکاری ئەکەم، فائیدەی نەبوو. وتیان هەرکەس بۆ ڕەزامەندیی خەڵق ڕوو لە خالق وەرگێڕێ جەزای جەهەنەمە. عابید کوژرا، بە جەزای دونیای گەیشت.

دیمنە وتی: هێنانەوەی ئەم میسالەم بۆ ئەوەیە منیش لەبەر خزمەتی پادشاە تەرکی نوێژ و تاعەتم کرد، هەر فکرێکم بوو نامە سەر ئومووراتی حوکمداری، وە هەر ڕێگەیەک بۆ پادشاە چاک بوو دۆزیمەوە. هەر چیم بەسەر دێ دووقات موستەحەقم، خۆم بەسەر خۆم هێنا. نزیک بە پادشاهان بەبێ بەڵاو سیاسەت نەبووە. وەقتێ ئەو قسە فەسیحانە لە زوبان دیمنە جاری بوو هەموو مەئموووران سەرسام بوون. شێر سەری بردە بەحری خەیاڵاتەوە، نەیزانی چ فکرێ دەرحەق بە دیمنە بکات. سیاگۆشێ لەو مەجلیسەدا حازر بوو، تەماشای کرد، کەس نییە جوابی دیمنە بدات، وەشێر عاجزە جوابی لە دیمنە. سیاگۆش ڕووی کردە دیمنە، وتی: ئەم بێ ئەدەبیانەی دەرحەق بە مەئمووورانی پادشاە کردت ناماقووڵی بوو، وجوودی ئەوەت نەبوو دەرحەق مەئمووران و نزیک بوون بە پادشاهان

قسەی زیادی بکەیت، لەبێ عەقڵیی تۆ دوورە. مەگەر نەتبیستووە حوکم کردنێکی پادشاە بەسەر میللەتدا خێری سەد ساڵ عیبادەتی میللەتی هەیە. زۆر تەسادوف بووە عابیدانی سەحرانشین لە واسیتەی هاتوچۆو خزمەت کردنی پادشاە کەشف و کەرامەتیان بۆ ئاشکرا بووە. لە جوملەی ئەو قیسسانە قیسسەی پیری دڵ ڕووناک شاهیدی حاڵە.

دیمنە پرسی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

سیاگۆش وتی: ئەگێڕنەوە لە شاری فارس سواری بوو بە هەناسەی موبارەکی گۆی مەقسەدی ئەفران. ناوی ئەو سوارە پیری دڵ ڕووناک بوو، شۆرەتی کەرامەتی لە ڕۆم وەنزیک بە مەغریب بوو بوو. موبارەکیی نوفووسی بە میسر و شامدا بڵاوبووبوەوە. حیجاز و یەمەنی داگیرکردبوو. عابیدانی عێراق، پیاوچاکانی خوراسان بۆ زیارەتی خەریک بوون. سادیقانی تورکستان، عاشقانی هیندستان تەریقەتیان لەسەر دەست وەرئەگرت. ڕۆژێ دەروێشێ لەسەمەرقەندەوە بە عەزیەتێکی زۆر خۆی گەیاندە فارس. مەعلوومە هەرکەسێ پێی بە دەرکی هیلاک کون نەبێ بۆن بە گوڵی مەقسەدەوە ناکا. وەقتێ دەروێش داخڵ بەشار بوو، خانەقای دۆزییەوە. بەزوبان دەروازەی خانەقای لستەوە. لە ڕووی ئەدەبەوە حەڵقەی دەرگای جووڵان. مجەوری خانەقا بە دەمیەوە هات، سوئال و جوابیان لە یەک کرد. دەروێش ئەحواڵی شێخی پرسی. مجەور وتی: شێخ چووتە خزمەتی پادشاە. سەبر کە میقدارێ، وەقتێ هاتنەوەیەتی. دەروێش کە ناوی خزمەتی پادشای بیست، وتی: ئاخ! عەزیەتی خۆم بەخۆڕایی دا شێخێ بۆ خزمەتی سوڵتان چووبێ، ئارەزووی مەجلیسی پادشا بکات، تەئسیراتی نوفووسی چۆن دەست ئەکەوێ؟ بەتاڵە. ئارەزووم کرد تا مردن خزمەتی بکەم بە مەقسەد نەگەیشتم. لە خانەقا دوورکەوتەوە، ڕووی کرد بۆ ناو شارەکە. دڵی لە شێخ خراپ کردبوو، فکری خراپەی دەرحەق شێخ ئەکرد. لە ئەحواڵی شێخ بێ خەبەر بوو. تەسادوف وەردیانی حەپسخانە ئەو شەوە حەپسێ لەدەستی ڕایکردبوو، بۆ حەپسەکە ئەگەڕا، چاوی بە دەروێشەکە کەوت، وایزانی حەپسەکەیە گرتی، بردیە خزمەت پادشاە. لە ڕێگە وەردیانەکە وتی: ئەی زاڵم! بۆیە ڕاتکرد لە دەست بڕین نەجاتت بێ و دەستی من لە جیاتی دەستی تۆ ببڕن. دەروێش زۆر پاڕایەوەو سوێندی بۆ وەردیان خوارد من لە حەپسی ڕام نەکردووەو غەریبم، لەم قسانە بێ خەبەرم، فائیدەی نەبوو. گەیشتنە خزمەت پادشاە. پادشاە ئەمری کرد بە جەللاب

دەستی ببڕن. لە دوور دەنگی پیری دڵ ڕووناک هات. بە پرتاو گەیشتە پێشەوە. ڕووی کردە وەردیان وتی: ئەوە دەروێشی منە، ئەو دزە نییە لە دەست ئێوە فیراری کردبێ، فکرتان خراپ مەکەن، زۆر گوناهە. بەقسەی شێخ دەروێش لە دەست بڕین نەجاتی بوو. وەردیان دەست و پێی پیری بە زوبان ئەلستەوە. عوزری زۆری بۆ شێخ هێنایەوە. شێخ عەفوی کرد. دەروێش لە خزمەت پیری دڵ ڕووناک هاتنە دەرەوە. لە ڕێگە شێخ دەستی نایە سەر شانی دەروێش و وتی: ئەی دەروێش، ئەگەر خزمەتی پادشاە ئیختیار ئەکەم مەزڵوومی وەک تۆ لەدەست زاڵم نەجات نادرێ. دڵ مەگۆڕە. دەروێش بۆی مەعلووم بوو ئەوەی بەسەری هات واسیتەی دڵ گۆڕین بوو کە دەرحەق شێخ کردی. فکری کردەوە وتی: هەرچی لەدەست پیاو چاکان ئەقەومێ، بە بێ حیکمەت نییە، وە لە عەقڵی هیچ ئەزان دوورە.

ئەو منداڵە بەدەست خـــضـــر ســـەربڕا
لە تەرەف خـــوداوە ئەمـــر بوو کـــرا
ئەو ســەفــینەیە کــە بەدەست کــونی کــرد
لە زوڵمی پادشـــاە بۆ نەجـــات بوونی کــرد
مـــــوســــا نەبی بوو نەیزانی تەواو
بۆچی چـاکی کـــــرد دیوارە ڕووخــــاو

سیاگۆش وتی: بەیان کردنی ئەم میسالەس بۆ ئەوە بوو لە مەجلیس مەعلووم بێ زۆر پیاو چاکان بوون خزمەتی پاشایان ئیختیار کردووە وە لە نزیک بوونی پادشاە تووشی عەزیەت نەبوون، وەک دیمنە ئەیڵێت. ئەی دیمنە، خۆت چیت، وجوودت چییە لە واسیتەی نزیکیی سـوڵتـان ئازارت پێ بگا؟ دیمنە وتی: ئەی سیـاگـۆش ئەوی بەیانت کـرد کـە پیاوچاکان خزمەتی پادشاهانیان ئیختیار کردووە، زۆر مەعقوولە، ئەمما لە ڕێگەیەکی کەوە بوون، بەبێ ئەمـر خودا دەستیـان بۆ هیچ ئەبردووەو بە ئارەزووی ئەفس ئیشیـان ئەکردووە. دەستیان لە ئیشی دنیا هەڵگرتووە. ڕوتبەی ئەو کەسانە لەگەڵ ئێمە فەرقی ئەرزو ئاسمانە و لایقی قسەی ئێمە نین. ئەمساڵی ئێمە بەو مەرتەبە چۆن ئەگا؟ بۆ ئێمە دروست نابێ، وەتۆ ئەڵێیت پادشاە سێبەری سەری بۆ میللەت باعیس بەژیان و ڕەحەتییە. منیش ئەڵێم وایە، ئەمما سیفەتی ئەو پادشایە لە ڕێگەی خوداوە نزیکە، لە کردەوەی بەتاڵ دوورە. ئەبەقسەی فیتنە باوەڕ ئەکا، وە ئە بێ گوناە جەزا ئەدا،وە بە چاوی

باتینی ئەزانن، ئەهلی خاین و ڕاست فەرق ئەکەن، وە کەسێ ئارەزووی بەرزیی پادشاه و میللەت بکا بەچاوی مەرحەمەت تەماشای ئەکەن، وە ڕەگ و ڕیشەی ئەهلی خائین دێننە دەرەوە.

دایکی شێر وتی: ئەوی تۆ بەیانت کرد هەمووی ڕاستە. بەقسەی خۆت کوشتنت واجبە. لە هەموو ئومەرا مەعلومە، وە حازرانی مەجلیس ئەیزانن. شەترەبە وەزیرێکی عاقڵ و زیرەک بوو، لە سەداقەتا ئەمسالی نەبوو، بە فیتنەیی و دووزوبانیی ئامۆبارەکت لەناوچوو. وەفاشکاندنی شێر بەناو میللەتدا بلاوبووەوە. ئاگری حەسادەتت دونیای داگیرکرد.

حازر بە ئینتیهای مەرگتە. دیمنە وتی: لە دڵ ڕووناکیی پادشاوە مەعلومە، وە حازرانی مەجلیس ئەزانن ڕەفاقەتی من لەگەڵ شەترەبە زۆر خۆش بوو، وە دوشمنایەتی لە بەینمانا واقیع نەبوو بوو،وە ئەگەر شەترەبە غەرەزی دەرحەق من بووبێ ئاشکرای نەکردبوو. من و شەترەبە لە ڕەفاقەت و خۆشەویستی زیاتر دەرحەق یەک نەمانبوو، وەڕوتبەی من لە خزمەت پادشادا لەشەترەبە کەمتر نەبوە، دوشمنیم دەرحەق شەترەبە چی بووە؟ ئەوەندە فەرق هەیە خەیانەتی بۆم مەعلووم کرابوو، بەنیسحەت بۆ پادشام بەیان کرد چونکە لە ڕێگەی ڕاستییەوە خزمەتی پادشام ئەکرد، وە ئەو قسەی بۆ پادشام بەیان کرد پادشاه بە چاوی موبارەکی بۆی مەعلووم کرا، بە عەقڵ و فکری خۆی ئیشی تەواو کرد، وەقسەی ڕاستی بەندەیش ئاشکرا بوو. زۆر کەس لەگەڵ شەترەبە یەک قسە و یەک تەدبیر بوون، لە خیانەت و فکردا شەریک بوون. ئێستا ئەوەی ڕاستە من بەیانی ئەکەم. ئەوان لە خۆیان ئەترسن. مەعلوومە قسەی حەق ناخۆشە. هەر وەقت ئەهلی فیتنە و خائین بۆ کوشتنی من بکەرێن، فکر ناکەم ویجدانی پادشاه جەزای چاکە و ئەسیحەتم گوم بکات، وە بە ئارەزووی دڵی فیتنە و خاین بێ گوناهێکی وەک من لەناوبەرێت، لە دوای من دڵی موبارەکی بخاتە بەحری پەشیمانییەوە. قسە گەیشتە ئێرە، وەقت درەنگ بوو. شێر ئەمری کرد دیمنە تەسلیم بە مەحکەمەی شەرع بکرێ، هەر نەوعێ قازی حوکمی بدات، لازمە موجازات بدرێ.

دیمنە ڕووی کردە شێر، وتی: کام حاکم ڕاستتر لە عەقڵی جەنابتە، وە کام قازی عالمتر لە ویجدانی جەنابتە؟ ئەلحەمدولیللا عەقڵ و دیانەت وەک ئاوێنە دیارە. بەیەقین ئەزانم تەماشای ویجدان و عەقڵی خۆت بکەیت، زاهیرو باتین و چاکە و خراپە دەرئەکەوێت.

ئەختێ لە نووری بەحری دڵت ورد بیتەوە ئەحوالاتی ئەم بچووکە مەعلووم ئەبێ، ئەو وەقتە یا ئەفەرموویت:«خذوه فغلوه، ثم الجحیم صلوه» وە یا ئەمر ئەفەرموویت بە عەفوو بەرائەتم. ئومێد دەکەم لە ئوفووسی موبارەکت ڕێگەی ئەجاتم بدۆزیتەوەو قسەی ڕاستم لە حوزووری مەجلیسدا دەرکەوێت.

شێر وتی: ئەی دیمنە، تەفتیش کردنی ئەم ئیشە زۆر تووڵانییە. ئەوەندە سەعی ئەکەم هەتا وەک موو لەناو هەویر دەربێ. خۆت ئەیزانی ڕاستی و ڕەحم تا قیامەت باقییە. ئارەزووی زوڵم ناکەم. لەویجدان و غیرەتدا کەس موقابیل بە خۆم نابینم. دیمنە وتی: لەواسیتەی ئەوە هیچ گوناه و خراپە لە خۆم نابینم، وەختە دڵم شەق بەرێ. ئەگەر لەم مەسئەلەدا گوناهێکم بوایە نزیک بە جەنابت ئەئەبووم، بەم دڵ دەنگییەوە چاوەڕوانی بەلا ئەئەبووم، بەڵکی ئەفسوونێکم ئەخوێند خۆم بە ئەرزدا ئەبردە خوارەوە، وەیا فیرارم ئەکرد لە جێگەیەکی بە ئیسراحەت ئەژیام و ئەمخوارد.

دایکی شێر وتی: ئەم قسە مناڵ خەڵەتێنانەت لە دڵی عاقڵ تەئسیر ناکا. بە زوبان لووسی خەریکی ڕێگەی ئەجات بدۆزیتەوە، وە لە جەزای فیتنەییت ئیسراحەتی ڕەحەتی بکەیت. دیمنە وتی: من دوشمنم زۆرە و زۆر کەس ڕقیان لە منە. ئومێد دەکەم ئینشائەڵڵا پاکێتیی من ئاشکرا بێ، ناماقووڵی بۆ دوشمنانم بێنێتەوە. لازمە بۆ عەدالەتی پادشاه مەسئەلەی من حەوالەی کەسێکی ئەمین بکات وە ئەو کەسە بوغزو دوشمنی لەگەڵ من نەبێ. بەڕاستی هەرچیی بۆ مەعلووم کرا عەرزی قوددوومی موبارەکی پادشای بکا. پادشاه بە مووجیبی حەق بە جەزای بەندە ئەمر بفەرموێت، هەتا ڕۆژی قیامەت بە واسیتەی گوناهی بێ وجوودێکی وەک منەوە عەزاب ئەدرێ و بۆ کوشتنی خۆم ناترسم. ترسم ئەوەیە بە خوێنی بێ گوناهێکی وەک من دامێنی موبارەکی پادشاه ناشیرین بێ.

شێر وتی: لە عەدالەت و ڕەحمی من دوورە بێ ئەمریی شەرع بکەم. هەروەخت خیانەت و فیتنەی تۆ ئیسپات کرا، بە ئەوعێ جەزات ئەدەم بە تەئریخ بیگێڕنەوە. دیمنە وتی: من بۆچ لە خیانەت بترسم، وە لەویجدان و ڕەحمی جەنابت خۆم مەحرووم بکەم. مەعلوومە عەدالەت و ڕەحمی جەنابت وەک ڕۆژ دنیای ڕووناک کردووە. ئومێد دەکەم لەویجدان و ڕەحمی جەنابت بێ بەش نەبم. خودا جەنابتی بۆ عەدالەت دروست کردووە. ناعەدلی لە جەنابت دوورە. یەکێ لە حازران وتی: ئەوەی دیمنە بەیانی ئەکا مەقسەدی گەورەیی پادشا نییە. مەتڵەبی ئەجات بوونی خۆیەتی. دیمنە وتی: کامەیە لەمن سادقتر و عاقڵتر،

خوسووس بۆ موحافەزەتی پادشاه ئارەزوو بکا. ئێستا لازمە بۆ نەجاتی خۆم سەعی بکەم تا مەملەکەت و حوکمداری لە پادشاه تێک نەچێت. ئومێد دەکەم بە قسەی جاهیلان فکر لە پادشاه نەگۆڕێت، وە ئیشی دوور بە نوفووسی موبارەکی نزیک بکاتەوە. سیاگۆش وتی: بە مەکرو زوبان لووسیی ئاموبارەکت مومکینە فکری پادشاه بگۆڕێت. دیمنە وتی: فکری ئێوە لەگەڵ پادشا زۆری فەرقە. بەحری مەرحەمەتی شاهان پڕ لە ڕەحمەتە. دایکی شێر وتی: ئەی غەددار، ئێستا ئومێدی نەجات بوونت ماوە؟ دیمنە وتی: ئەگەر کەسێ چاک و خراپ فەرق نەکات جەزای نەسیحەت بە خراپە بداتەوە، ئەو وەقتە من ئومێدم قەتع ئەبێ، چونکە هەرچی شەرتی خزمەت بوو وە نەسیحەتێ بۆ پادشاه لازم بوو، قوسوورم نەکرد، وە لەزاتی موبارەکی پادشا مەعلوومە پیاوی گوناهبار ئیقتیداری جوابی نییە. کەسێ خائین بێ ئیقتیداری حوزووری پادشاه ناتوانێ. مەسەلا ئەگەر من ئەم گوناههم کردبێ بە جەزای خۆم ئەگەم، وە ئەگەر پادشاه لە کوشتنی من عەلەجە بکات پەشیمان نەبێتەوە. هەر کەسێ لە ئیشی عەجەلە بکا. خانووی ئاوەدانی وێران ئەکا (العجلة من الشیطان). عەجەلە بۆ شەیتانە. هەر کەسی عەجەلە بکا و سەبری نەبێ ئەوەی بەسەر دێت بەسەر ژنە بازرگانەکە هات. لەبەر پەلەکردن فەرقی دۆستەکەی و غولامەکەی بۆ نەکرا.

شێر پرسیی: چۆن بووە؟

حیکایەت

دیمنە وتی: لە شاری کیشمیر بازرگانێ بوو، دەوڵەت و ماڵی لە حیساب نە ئەهات. خزمەتکار و کارەکەری زۆری بوو. ژنێک وەک مانگی چواردە، زوڵفی ژنەکە وەک ڕێحانە بۆنی ئەهات. حەلالی بازرگان بوو. پیاوێکی ڕەسسام دراوسێی بازرگان بوو. ئەو ڕەسسامە بەیەک دەقیقە ڕەسمی لەشکرێکی ئەکێشا. لە ڕەسسامییا ئەمسالی نەبوو. تەسادوف ڕەسسام و ژنی بازرگان دەستیان تێکەڵ کرد. هەر وەقت ئارەزووی یەکیان ئەکرد بەواسیتەی ژنە دەلالێکەوە ئیشیان دروست ئەبوو بە یەک ئەگەیشتن. ڕۆژێ ژنی بازرگان بە ڕەسسامەکەی وت: ئارەزوو ئەکەم لە سنعەتی جەنابت نیشانێک دروست بکەیت هەر وەقت ئارەزووی هاتنت کرد، بەو نیشانە بۆم مەعلووم بکرێ. خۆم بۆێ خۆش و ئامادە بکەم. ڕەسسام وتی: عەبایەک دروست ئەکەم لایەکی ڕەش و لایەکی سپی، هەر وەقت چاوت بەعەبا کەوت تۆ خۆت حازرکە. ئەو تەدبیرە لە مابەین هەردوکیان قەرار درا.

لەو وەقتەدا غولامێکی ڕەسسام گوێی لەو تەدبیرە بوو. وەقتێ عەباکە تەواو بوو هەموو ڕۆژ بەو نیشانە بەخزمەت یەک نەگەیشتن. تەسادوف ڕۆژێ ڕەسسام بەنێش چووبوو. غولامەکە عەباکەی لە کچی ڕەسسام وەرگرت تەماشای بکات. غولام بە بەهانەیەکەوە خۆی لە عەباوە پێچا. ڕووی کردە ماڵی بازرگان. ژنە بازرگان جێگەی حازر کرد. لەبەر خۆشەویستیی دۆستەکەی ورد نەبووەوە بزانێ غولامە یا ڕەسسامە. وەقتێ غولام لە کەیف بووەوە، ڕۆیشتە ماڵەوە عەباکەی تەسلیم بە کچە ڕەسسام کردەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو ڕەسسام چووەوە عەباکەی هەڵگرت ڕووی کردە ماڵە بازرگان. ژنە بازرگان چووە پێشەوە، وتی: چی قەوماوە؟ ئەمڕۆ گۆشت چۆلەکەت خواردووە؟ ئەمە دوو. ڕەسسام بەعەقڵ بۆی مەعلووم کرا، وتی: بۆ ئێش نەهاتووم. ئەمە ئاخر تەماشا کردنە. لە ماڵی بازرگان ڕۆیشتە دەرەوە. ڕۆیشتە ماڵەوە. عەباکەی سووتان. میقدارێ لە غولامەکە و کچەکەی دا، تەرکی هاتوچۆکردنی ژنە بازرگانی کرد. ئەگەر ژنەکە لەبەر عەجەلە نەبوایە فەرقی ڕەسسام و غولامی ئەکرد وەلە دووریی ڕەسسام مەحرووم نەئەبوو وە بە وەسڵی غولام نەئەگەیشت.

دیمنە وتی: هێنانەوەی ئەم میسالەم لەبەر ئەوەیە بۆ پادشاە مەعلووم بێ ئیشی عەجەلە زۆر خراپە و بۆ کوشتنی من عەجەلە نەکات، وە لە هەمووتان مەعلوومە (کل نفس ذائقة الموت) کەس لە مردن نەجاتی نەبوە، وە خوسووس من لە مردنی خۆم ناترسم. مەقسەدم ئەوەیە ڕۆژی قیامەت لەسەر کوشتنی من پادشاە جەزا نەدرێت. وە ئەگەر بزانم بە کوشتنی من فائیدەیێ دەست پادشاە ئەکەوێت، نەک ڕۆحێ، هەزار ڕۆحم بێ فیدای خۆڵی بەرپێی پادشای ئەکەم. ئەمما بۆم مەعلوومە ئیشی پادشاە بێ لەشکر و بێ تەدبیر دروست نابێ، وە بەقسەی فیتنە و دوشمن وردە وردە دەست بۆ کوشتنی مەئمووران درێژ بکرێ، وزەراو عولەما یەکە یەکە ڕێگەی فیرار ئەگرن وە پادشاە بە تەنها ئەمێنێتەوە و تەخت و تاجی لە دەست ئەچێ و دەفعەیەکی لەشکر و سوپای دەست ناکەوێت. دایکی شێر تەماشای کرد شێر گوێی لە قسەی دیمنە گرتووە، نزیکە بە زوبان لووسیی دیمنە دڵی ساف بێ دەست لە جەزای شەترەبە هەڵگرێ. ڕووی کردە شێر وتی: وا دیارە قسەی دیمنە بەڕاست ئەزانی و بە زوبانی لووس ئیخفالی کردی و قسەی ئێمە بە درۆ دەرچوو. مەعلووم بوو عەقڵ و زیرەکی لە تۆوە دوورە. بە عاجزی لە مەجلیس هەڵسا ڕۆیشتە جێگەی خۆی. شێر ئەمری کرد دیمنە زنجیر بکەن بیخەنە زیندانەوە تا موحاکەمەی لە مەحکەمەی شەرعدا تەواو ئەبێ. دیمنە زنجیر کرا، داخڵ بە زیندان بوو. مەجلیس بەتاڵ کرا.

بۆ سبحەینێ شێر ناردی بە شوێن دایکیا. دایکی شێر چووە لای شێر، وتی: کورم زوبان لووسی و فیتنە و فێڵی دیمنە بۆمن مەعلووم کرا بوو. تەماشات کرد قسەی درۆو دەلەسەی چۆن رێکخست، وە رێگەی قسە بدەیت لەم بەلایە خۆی نەجات نەدات، وە هەتا زوو ئەمر بە کوشتنی بکەیت درەنگە، با عیسی رەحەتیی دڵی تۆ و ئیسراحەتی میللەتە. ئیشی خێر بە عەجەلە نەکرێ ئافاتی بۆ پەیدا ئەبێت. شێر وتی: ئەوانەی نزیک بە پادشاە ئەبن دوشمنیان زۆرە. مەئموووران دەرحەق یەک حەسادەت زۆر ئەکەن. ئەوی لە پادشاە نزیکە دوشمنی زۆرترە. پیاوی فەقیر لە دوشمن ئەمینە. وە هەموو مەئموووران ئەزانن دیمنە زۆر عاقڵ و زیرەکە و تەدبیری لای من پەسەندە، مومکینە حەسوودان ئیتتیفاقیان کردبێ دیمنە بە کوشت بدەن. ئاگرێ بەقسەی حەسوود داگیرسا تەڕو وشک بەیەکەوە ئەسووتێنێ. حەسوود چاوی چاکەی دەرحەق خۆی نابینێت. مەگەر قسەی سێ حەسوودەکەت نەبیستووە.

دایکی پرسیی: چۆن بوو؟

**حیکایەت**

شێر وتی: ئەگێڕنەوە سێ کەس لە رێگەیەک بوون بە رەفیق. یەکێکیان پرسیی: ئێوە لە شاری خۆتان بۆ دوور کەوتوونەوە، ئەرکی وەتەنتان لەبەر چییە؟ ئەووەڵیان وتی: واسیتەی سەفەری من ئەوەیە چاوم بکەوتایە بە کەسێ چاکەی لەگەڵ یەکێکدا بکردایە ئاگری حەسادەتم دائەگیرسا، تاقەتم نەگرت و تەرکی وەتەنم کرد بۆ دەفعی غەم. دووەمیان وتی: مەسئەلەی منیش وەک تۆیە، تەرکی وەتەنم کرد.. سێهەمیان وتی: هەردووکتان ناو دەردی منن. هەرسێکیان یەک جینس بوون. رۆیشتن بە رێگەدا. تەسادوف کیسەیەکی پڕ لە درهەم دۆزییانەوە.

قەراریان دا کیسەکە بکەن بەسێ کەرتەوە، بگەڕێنەوە شاری خۆیان. وەقتی بەشکردنی عیرقی حەسادەتیان کەوتە بزووتن. هیچیان رازی نە ئەبوون وەک یەک بەش هەڵگرن. دەستە ئەژنۆ بە دیار کیسەکەوە راوەستابوون. نەکیسەکەیان لەیەک بەش ئەکرد وە نە لە جێگەی خۆی جێیان ئەهێشت. لەو چۆڵەدا دوو شەو و دوو رۆژ بەبرسییەتی مانەوە. خەو و ئیسراحەتیان بە شەڕوشۆڕ رائەبوارد.

بۆ رۆژی سێهەم پادشای ئەو شارە بۆ راو رووی کردە سەحرا، تەماشای کرد سێ کەس دانیشتوون. پادشا سوئالی لێ کردن: بۆچی دانیشتوون؟ هەرسێکیان بە راستی قسەی

حەسوودییان بۆ پادشاه بەیان کرد، وتیان: ئێمە لەبەر حەسوودی تەرکی وەتەنمان کرد. لە ڕێگە ئەم کیسە پارەمان دۆزیوەتەوە، چاوەڕێی (حاکمێک بووین لە بەینمان تەقسیم بکا) ئەلحەمدولیللا ئێستا خودا ڕەحمی پێ کردین حاکمێکی وەک جەنابت گەیشتە ئێرە. پادشاه فەرمووی: لازمە حەسوودیی خۆتان بەیان بکەن. بە گوێرەی حەسوودیتان پارەکە تەقسیم ئەکەم. ئەووەڵیان وتی: ئەی پادشاه، حەسوودیی من ئەوەیە ئارەزوو ناکەم چاکە دەرحەق کەس بکەم وە یا نیشێ بکەم خەڵق بە واسیتەی منەوە دڵخۆش بێن. دووەمیان وتی: من حەسوودیم ئەوەیە تاقەتی تەماشاکردنی کەسێ ناکەم دەرحەق کەس چاکە وەیا خێرێ بکات. سێهەمیان وتی: حەسوودیی من ئەوەیە ئارەزووی ئەوە ناکەم کەسێ چاکە لەگەڵ خۆشم بکات تا بە غەیری خۆم تەئسیری نەبێ. پادشاه ئەمووستی تەحەییوری بەدان گەست، لە حەسوودیی ئەوانە سەرسام ما. پادشاه فەرمووی: بەقسەی خۆتان ئەم پارەیە بۆ ئێوە حەرامە. دروستە بە گوێرەی حەسادەتتان جەزا بدرێن. ئەووەڵ کەستان بە ڕووتی و قووتی بەرەڵلا بکرێ. دووەم کەستان سەری لە بەدەن جودا بکرێ. سێیەم کەستان چوار مێخە بکێشرێتەوەو قەتران بەسەریا بڕێژێت هەتا ڕۆحی بەدەست عیزرائیلەوە داخڵ بە جەهەننەم بکرێ. پادشا ئەمری کرد سێ پارچە مەندیل بۆ فەرمانی ئەو سێ کەسە حازر بکرێ. بۆ ئەووەڵ کەسیان ئەم شیعرە نووسرا:

ئەو کەسە بەخالەت بە خەڵق بەرێ
قابیلی ئەفیە شاریەدەر کرێ

فەرمان دووەم کەسیان وا نووسرا:

ئەو کەسە بە بوونی خەڵق عاجزن
جەرگیان کون کون کەن بە نووکی سووژن

فەرمانی سێهەم کەسیان وا نووسرا:

ئەو کەسە موزیر بێ بۆ موسوڵمانان
بەسەریا ڕژێ سەراپا قەتران

پادشا هەرسێ حەسوودەکەی بە جەزای خۆی گەیاند وە بە جەزای خۆیان گەیشتن. شێر وتی: بەم میسالەدا وا دەرئەکەوێ ئینسانی حەسوود ئارەزووی زەرەری خەڵق زۆر ئەکەن و حەز بەمانی ڕەفیقیان ناکەن. دایکی شێر وتی: وا ئەزانم حەسوود لە نزیک تۆ نییە. هەموو مەئمووران بە کوشتنی دیمنە ڕازی بێ با عیس بەڕەحەتیی دڵی تۆیە. شێر وتی: لە

مەسئەلەی دیمنە گرتی تیا ماوە تا بە تەواوی ساف نەکری دەستی بۆ درێژ ناکەم، چونکە لە کوشتنی شەترەبە زۆر پەلەم کرد، وە لەسەرخۆ بۆ تەحقیق کردنی نەمپرسی، وا ئێستا پەشیمان بوومەتەوە. بەبێ ئیسپات بوون دەست لە عاقڵان درا ڕێگە گوم کردنە. حوکەما فەرموویانە:

خــەبەر دار ببــیت لە شـــەڕی کــەسێ
تەدبیـــر لازمـــە لەگـــەڵ چەند کـــەسێ

(وشاورهم في الأمر) چۆن فکری خۆم بەرمەوە؟

قسەی شێر و دایکی لێرەدا تەواو بوو. هەر یەکە چوونەوە جێگەی خۆیان. وەقتێ دیمنە زنجیر کراو خرایە زیندانەوە، کە لیلە ڕەحمی برادەریی و ڕەفاقەتی کەوتە جوولانن، چووە سەر زیندان بۆ چاوپێکەوتنی دیمنە. کە چاوی بە دیمنە کەوت زنجیرکراوە، فرمێسک وەک بارانی بەهار بە چاویا ڕژایە خوارەوە، وتی: ئەی برادەر بەم جۆرە چۆن نەتوانم تەماشات بکەم؟ لە پاش تۆ ژیانم بۆ چییە؟ مردن خۆشترە تۆ بەم ئەحواڵە ببینم. هەردوکمان ئاو جنس بووین، ژیانمان بەیەکــەوە ژیان بوو. ڕەفــیـــقی وەک تۆم لە دەست چوو. دیمنە بە گریانەوە وتی: زیندان و ئەم زنجیرە بە قەدەر یەک دەقیقـە دووریی تۆ لام گران نییـە. دووریی جەنابت جگەری سووتانم. کەلیلە وتی: ئەی ڕەفیق، مادام ئیشی تۆ گەیشتە ئەم ڕەزالەتە، تووشی دەردی خۆت هاتیت هەرچی بڵێم لۆمەم ناکرێ. لە ئەووەڵەوە ئەم زنجیر و حەپسییە نامە پێش چاوت. بەقسەت نەکردم بە خەیاڵی حرص و بێ عەقڵی ئەوەت هێنایە ڕێگای خــۆت کــەوا هاتە ڕێت. من هەر قـسـەیەکم بۆ کـردی دیاری دا. ئەگـەر لەئەوەڵەوە لە نەسیحەتت قسوورم بکردایە و بە ئارەزووی تۆ موعامەلەم بکردایە ئیمڕۆ لە خیانەتدا شـەریکی تۆ نەبووم. ئەم جۆرە قسانەم پێ نەئەکرا. ئەی بێ عەقڵ پێم نەوتی پێشـوونان وتوویانە: کـاشکی پێش ئەجەل بمریت. مەقـسـەدیان لەم جۆرە زەحـمـەتەیە. ئەوانەی بە زیندوویەتی مــردن داوا ئەکــەن وەک تۆ تووشی دەردی بێ دەرمـــان بوون. ئەوانەی بەم جۆرە دەردەوە ئەگلێن مردنیـان سـەد جـار چاکـتـرە. دیمنە وتی: ئەی ڕووحی شیرینم، ئەوەی شـەرتی وەفاو نەسـیحەت بو. بەزوبان جەنابت بێژرا. ئەمما حرس و تەمەع ڕێگەی جەنابێتی لێ گوم کردم و بۆ خۆم مەعلووم بوو بوو. ئاخری من پەشیمانییە. ئەفس و شـەیتـان وازیان نەهێنا. وەک نەخـۆش پارێزی بۆ دائەنرێ، ئەفس دەرخـواردی ئەدا. بە هیـلاکـەت ئەمرێ. ئەوانەی بە ئارەزووی ئەفس موعـامـەلە ئەکـەن هەرچییـان بەسـەر بێ

قابیلن و شکاتیان لای کەس مەعقوول نییە. خوسرووس من خۆم ئەم دەردەم تووشی خۆم کرد. دەرمانی بۆ کەس پەیدا ناکرێت. کەلیلە وتی: عاقڵ ئەوەیە لە ئەووەڵەوە ئاخری ئیشی تەماشا کات. لەپێش ناشتنی ئەمام، تەماشای بەری بکات. ئینجا بینێژێ و خزمەتی بکا. پەشیمان بوونی نابێ. بە پەشیمان بوونەوە قسەی ناحەز سبووت ئەبێ. دیمنە وتی: ئەوەی ڕەفیقی ئەو کەسانەی دشمنیان نییە مەعلوومە کەم غیرەتن و هەرکەس لە مەکری زەمان ئەمین بوو مەعلوومە کەم عەقڵەو هەرکەس بوو بە ساحێب دەوڵەت و ساحێب ڕوتبە لە هەموو لایەکەوە دوشمنی بۆ پەیدا ئەبێ. کەلیلە وتی: هەر ڕوتبە و دەوڵەتێکت بوو، ئەم ئەختە ڕەزالەتەت نایەنێت. لازم بوو لە ئەووەڵەوە تەماشای ڕوتبە و ماڵت ئەکردایە. بەواسیتەی ماڵی دونیاوە ئەبوویایە، دووچاری ئەم هیلاکەتە نەئەبوویت. ئەگەر ئاگری فیتنەت دانەگیرسانایە ئێستا جگەرت بەشیشەوە نەئەبرژا. دیمنە وتی: ئەزانم تۆوی ئەم بەڵایە خۆم چاندوومە و هەرکەس بیدروێتەوە تووشی بەڵا ئەبێت و جەزای خۆم ئەبینم، چونکە ئەم گرێیە نەبە ئەموستی تەدبیر ئەکرێتەوە و نەبە ئاوی ڕووناک ئەشۆرێتەوە. کەلیلە وتی: ئێستا فکری نەجاتت چە تەدبیرێکە. بیگێڕەوە بزانم. دیمنە وتی: وا دیارە سەفینەی حەیاتم لەسەر ئەم بەحرە غەرق ئەبێ. ڕێگەی نەجاتم لەم بەڵایە نابێت هەر حیلە و مەکرێ بزانم قسوور ناکەم. ئەمما یەک ترس هەیە لە هەموو خراپتر. کەلیلە وتی: ترسەکەت چییە بەیانی بکە. دیمنە وتی: لەوە ئەترسم بزانن من وتۆ ڕەفیق بووین. بۆ مەسئەلەی شەترەبە بێنە خزمەتت بە جەبر و یا بە لێدان قسەی من و مەسئەلەی شەترەبە بە تۆ دەربخەن. ئەو وەقتە ڕێگە نەجاتم دەست ناکەوێت. لێدان و ڕەزالەتم زیاد ئەکا بە دوو دەرەجە. ئەووەڵ: زاتی موبارەکت لە واسیطەی منەوە تووشی ڕەزالەت ئەبێ. دووەم: ڕێگەی نەجاتم بۆ مومکین نابێ، چونکە ڕاستی و دڵ ڕووناکی جەنابت لە هەموو کەسەوە مەعلوومە. شاهید لە تۆ ڕاستتر دەست ناکەوێ. بناغەی قسەی جەنابت لەسەر ڕاستی دانراوە. ئەو وەقتە چاومان بەیەک ناکەوێ تا ڕۆژی حەشر. کەلیلە وتی: ئەوەی بەیانت کرد ڕاستە و لەخۆت مەعلوومە تاقەت و سەبری لێدانم نییە. وەئەوەی بزانم بە ڕاستی بەیانی ئەکەم. لەبەر نەجات بوونی تۆ درۆ بەمن ناکرێ. مادام وایە لەپێش ئەوەی سوئاڵ لەمن بکەن. ئەحواڵاتی خۆت بە ڕاستی بۆ مەجلیس بەیان بکە. بەڵکی لە ڕووی ڕاستیەوە ڕێگەی نەجاتت دەست کەوێ و تۆبە لە گوناهی ڕابردوو بکەی زۆر لایقە، بۆ قیامەت بەکار دێت و ئەگەر نەجاتیشت نەبوو، لە عەزابی دونیا زیاتر گوناهت لەسەر نامێنێت. جەزای دونیا لە جەزای قیامەت چاکترە. دیمنە وتی: فیکرێ لە ئەحواڵی خۆم

نەکەم جوابت لێ نەگێڕمەوە. قسەی کەلیلە و دیمنە لێرەدا تەواو بوو. کەلیلە بەغەم و گریان، دوعا خوازیی لە دیمنە کرد ڕۆیشت. لەپاش چەند ڕۆژێ نەخۆش کەوت. تووڵی نەکێشا کەلیلە مرد. ئەمما لەو وەقتەدا کەلیلە و دیمنە سوئال و جوابیان لەیەک نەکرد. دزێ لە زیندانا حەپس بوو لە ئەووەڵ و ئاخری قسەیان گەیشت. لە دڵیا ما بۆ وەقتی خۆی. بۆ سبحەینێ لەسەر ئەمری شێر مەجلیس گیرایەوە. دایکی شێر قسەی دیمنەی هێنایە ناوەوە. وتی: زیندوویێتی دیمنە و کوشتنی پیاوچاکان وەک یەک نەزانم. فەرمووویانە کەسێ یارمەتی زاڵم و یا ڕێگەی فاسق بدات. شەریکە لەگەڵ گوناهیان. شێر ئەمری کرد، با حازر بوونی قازی و بەحازر بوونی دیمنە و بەحازر بوونی هەموو مەئموووران قازی ڕووی کردە مەئموووران. وتی: پادشا بۆ ئاشکرا بوونی فیتنەی دیمنە زۆر ئارەزوو ئەکات. ئەمری کردووە تا مەسئەلەی دیمنە تەواو نەکرێ، دەست لە موحاکەمەکەی نەدرێ و حوکمی دەرحەق بە دیمنە نەکرێ لە ڕێگەی ڕاستیەوە بێ و قسەی شک و یا بیستێ قبووڵ ناکرێ. لازمە هەرکەس لە مەسئەلەی دیمنە شتێک ئەزانی بە ئیسپات بوون بەیانی بکات. چونکە سێ فایدە دەست ئەخا. ئەووەڵ: ئەوەی ڕێگەی ڕاست و حەقە، موافیقی شەریعەت بەیان کردنی زۆر خێرە. دووەم: بناغەی زوڵم تێکدان و تەربیەی خائینان موافیق بە ئەمری خودایە. موناسیبی خولقی ئینسانە. سێهەم: نەمانی فیتنە و فەساد ڕێگەی نەجاتە بۆ هەموو عالەم هەرکەس لە مەسئەلە خەبەرداره جواب بداتەوە. کەس نەبوو جوابی قازی بدات چونکە حازران مەسئەلەی دیمنەیان بۆ ئیسپات نەئەکرا و ترسی ئەوەیان بوو خوێن بە ناحەق بڕژێت. وەختێ دیمنە تەماشای کرد کەس نەبوو جوابی قازی بداتەوە دڵی وەک گوڵی بەهار گەشایەوە، ڕووی خۆی عاجز کرد، گریانی عەمەلی دەست پێ کرد. وتی: ئەی قازیانی دین. ئەی ئومەرای سەرزەمین ئەگەر من خەتابار بوومایە و بەقسەی فیتنە و حەسوود لەم ئیشەدا بوومایە زوبانی قسەکردنم نە ئەبوو و بە جواب نەدانەوەی قازی زۆر دڵ خۆش ئەبووم. ئەمما بێ منەت بن هەرکەسێکتان شاهیدێکتان لایە، لەڕووی ڕاستیەوە بەیان بفەرموون سوێنێکتان ئەدەم تو ئەو خودایەی ڕووحی هەمووانی بەدەستە. چیتان لە من چاو پێ کەوتووە بۆ زاتی موبارەکی پادشاه بەیان بفەرموون و هەرکەس لە کوشتنی کەسێ خەبەردار بێ موافیقی شەرع شەهادەتی لازمە و هەرکەس بەشک و یا بە غەرەز من پیاو خراپ ئەکا. ئەوەی بەسەر دێ بەسەر حەکیمە هیچ نەزانەکە هات، قازی پرسی: چۆنە بیگێڕەوە.

دینە وتی: ئەگێڕنەوە کابرایەکی نابووت و بێ سەرمایە و بێ ئیمتیحان دەستی کرد بە حەکیمی کردن نەئەیزانی بنووسێ و نە ناوی دەرمانی بۆ ئەدۆزرایەوە. بۆ ناسینی دەرمان گوێز و تووری بۆ فەرق نە ئەکرا. لە ئەزم گرتنا دەست لەجێ چوو و لەرزوتای بۆ جیا نەئەکرایەوە. لەنووسینی دەرمان ئینگلیزی و کوردیی بەیەک ئەزانی. دەرمانی بەهەر نەخۆشێ ئەدا، هەناسەی ژیانی لێ ئەبڕا. ئەو پیاوە هیچ نەزانە، دووکانی لە شارەکەدا دانا. ئەمما حەکیمێکی زۆر عاقڵ و قدووم موبارەک، نفووسی وەک نفووسی عیسا، مردووی زیندوو ئەکردەوە. لە ئیشی حەکیمیدا ئەمسالی نەبوو. لەموددەتێکی کەمدا ئەو حەکیمە عاقڵە ناوی گوم بوو. لە کوڵجێ بە فەقیری ڕاینەبوارد. حەکیمە هیچ نەزانەکە شوورەتی حەکیمیی بەناو شارەکەدا بڵاوبووەوە. دەوری زەمان وا گەڕاوە، چەند ساحێب عەقڵی بۆ یەک نان کوشتووە و چەند نەزانێک بە ڕوتبە و ئیسراحەت گەیشتووە تەسادوف کچی پادشای شارەکە، بە واسیتەی مناڵ بوونەوە، ژان ئەیگرت کەوتە هیلاکەت، جوابیان بۆ پادشاه برد، یووسفی زەمان زۆر هیلاکە، پادشاه تەنها ئەو کچەی بوو لە برازای مارەی کردبوو. زۆر لای خۆشەویست بوو. ئەمری کرد هەرچی حەکیم لە شارەکە هەیە بۆ عیلاجی دەردی کچەکە حازر بکرێ، لەسەر ئەمری پادشاه حەکیمە عاقڵەکە برایە خزمەت پادشاه. پادشاه ئەمری کرد: لازمە هەر جۆرێ مومکین ئەبێ عیلاجی جگەرگۆشەم بکەیت و مەسئەلەی مناڵ بوون بۆ حەکیم بەیان کرا. کە کچەکە ژان ئەیگرێ، حەکیم وتی: دەرمانی ژانە مناڵ دەرمانێکە ناوی میهرانە، یەک دەنگ میهران، یەک مسقاڵ دارچینی، یەک مسقاڵ موشکی خالس و موقابیل بەو دەرمانانە، شەکری تێکەڵ بکرێ. دەرخواردی ئەو نەوعە نەخۆشە بدرێ. زوو ئەجاتی ئەبێ، پادشاه وتی: میهران لەکوێ دەست ئەکەوێ؟ حەکیم وتی: لە ئەجزاخانەی پادشاه چاوم پێ کەوتووە. لەناو قوتوویێکی زیوایە قفڵی ئاڵتوونی دراوە. یەکێ بنێرن بیهێنێ، من حوکمی چاوم نەماوە. لەو وەقتە حەکیمە هیچ نەزانەکە حازر بوو، گوێی لەقسەی حەکیم بوو. ڕووی کردە پادشاه وتی: ئەو دەرمانە ئیشی منە، تێکەڵ کردنی من ئەیزانم، پادشاه ئەمری کرد، لەگەڵ حەکیمە هیچ نەزان یەکێ بچێت لە ئەجزاخانە ئەو دەرمانە بێنن. حەکیم چوو دەرگای ئەجزاخانەی کردەوە، تەماشای کرد، لەو نەوعە قوتووانە زۆرە، لە حساب نەئەهات. زۆر گەڕا بۆ میهران. بۆی نەدۆزرایەوە. تەسادوف قوتوویێکی هەڵگرت. ئەو قوتووە زەهرەی هەلاهلی تیا بوو لەوە پێش تەسلیم بە ئەجزاخانە کرابوو بۆ لازمات.

حەکیمە هیچ نەزان قوتووەکەی برد، زەهرەکەی دەرهێنا، لەگەڵ دارە مشکینە و زەرنیق تێکەڵی کرد و میقداری شەکری تێ کرد. دەرخواردی کچی پادشای دا، خواردن و مردنی یەکێ بوو. جواب بۆ پادشاە برا، بۆ خۆت خۆش بی سەرت سەلامەت، یووسفی زەمان ڕۆژی کرد بۆ قیامەت. هاوار و گریان لەماڵی پادشاە بەرز بووەوە. پادشاە ئەمری کرد باقی دەرمانەکە دەرخوارد بە حەکیم بدرێ، لەسەر ئەمری پادشاە دەرمانەکەیان دەرخوارد حەکیم دا، لە جێگەی خۆی سارد بووەوە مرد. مەعلوومە هەرکەس خراپە بکات تووشی جەزای خراپ دێ. دینە وتی: ئەم میسالەم بۆیە هێنایەوە بۆتان مەعلووم بێ هەر ئیشێ لەڕووی نەزانییەوە بکرێت پەشیمانی لە دوو دێت. بۆ هەر ئیشێ شوبهەدار بێ دەستلێدانی ڕێگەی خەتەرە. یەکێ لە حازران وتی: ئەی دینە فیتنەیی و خیانەت بە چاوتا دیارە، نیشانی فیتنە و قەتڵ لە تۆ ئاشکرایە و مەعلوومە. قازی پرسی: لازمە ئیسپاتی بکەیت و مەسئەلەی قەتڵ و فیتنەی دینە بە تەواوی مەعلوومی حازران بکرێت. جوابی دایەوە وتی: لە عیلمی حیکمەتدا خوێندوومە. هەرکەس ئەبرۆی چاوی ڕاستی زیاتر بوو لە ئەبرۆی چاوی چەپی و حەرەکەتی برۆی لە ئەبرۆیەکی زیاتر بوو، لووتی بەلای چەپەوە خوار بوو و سەری شۆڕ بوو، دڵی نامویارەکی ئارەزووی فیتنە و فەسادی نەکات. ئەم نیشانانە هەمووی لەڕووی دینە دیارە. دینە وتی: لە ئیشی خودای بێ مەکان، عەیب گرتن زۆر ناماقووڵییە. سەهوو و غەڵەت بۆ خوا لایق نییە، ئەگەر ئەو نیشانانەی بەیانت کرد. دەلیل بە ڕێگەی ڕاستە و هەرکەس ئەو نیشانەی بۆ مەعلوومە، فیتنەیە. لازم بە مەحکەمەی شەرع ناکا. قازی داوای شاهید و ئیسپات نەکات. سوورەتێ خودا عەتای کردبی بەعەبد ناکرێ. پەناە بە خوا ئەگەر من ئەم ئیشەم کردبێ لەبەر ئەوەبوو خوا ئەم نیشانانەی لە من دروست کردووە و لابردنی بەکەس ناکرێ هەرجۆرێ وابوو لایقی جەزانیم. بەم قسەی تۆ لەبەلا نەجات بووم. چونکی خوا کردە و قسەی بێ عەقڵی و نەزانیی خۆت لە مەجلیس مەعلووم کرد. وەقتێ دینە ئەو جۆرە جوابانەی دایەوە. بێ دەنگی بۆ مەجلیس حاسڵ بوو. کەس قسەی بۆ نەکرا. قازی ئەمری کرد. دینە بەرنەوە زیندان و سوورەتی موحاکەمە عەرزی شێر کرا. ئەمما وەقتێ دینە خرایەوە زیندان. ئاشنایەکی کەلیلە، ناوی ڕووزبە بوو بەلای دینەدا ڕابورد. دینە بانگی کرد، وتی: ڕووزبە: دەورێکە بە خزمەت کەلیلە ناگەم، بەچی خەریکە؟ کە ناوی کەلیلەی بیست هەناسەی هەڵکێشا، دەستی کرد بە گریان ڕووزبە دینە لە گریانی ڕووزبە بێ تاقەت بوو وتی: ئەی ڕووزبە چی ڕووی داوە. ڕووزبە وتی: دەمێکە کەلیلە ئەمری خودای

کردووه. دیمنه که ناوی مردنی کەلیلەی بیست بێهۆش بوو. لەپاش هۆش هاتنەوە، دەستی کرد بەگریان. خۆی ئەکێشا به دار و دیوارا، خۆڵو بەردی ئەکرد بەسەر خۆیا، کەس تاقەتی گوێ گرتنی نەبوو. ڕووزبە. زوبانی بە نەسیحەت کردەوە، وتی: ئەی دیمنە لە هەموو کەس مەعلوومە لە دەست مردن کەس نەجاتی نەبووە. فەرمووده‌ی خوایە (کلّ شيء هالكٌ إلاّ وَجهَهُ). گریان بێ فائیدەیە. ئێمەیش دەرچوونمان بۆ مومکین نابێ. لازمە یەک لە دووی یەک بڕۆین لەسەبر زیاتر چارە نییە. (إنا للّٰه وإنا إليه راجعون ). دیمنە سەبووری بە قسەی ڕووزبە هات. وتی: ئەی ڕووزبە، لۆمەی گریانم مەکە. ڕەفیقی وەک کەلیلە بە تەدبیر و عاقڵ و ساحیب وەفا دەست ناکەوێ. خەزینەی سری بوو. لەخوا زیاتر بۆ هیچ کەس جاسووس دەرک نە ئەکرا. ئەگەر لەترسی قیامەت بموێرایە، بەگریان و لێدان خۆم ئەکوشت. ڕووزبە وتی: کەلیلە ئمری خوای کردووە. ڕەفیقی وەک کەلیلە لە دونیادا دوای نەهاتووە. دیمنە وتی: ئەگەر ڕاست ئەکەیت وەفا ناشکێنی. ئەتوانی لە جێگەی کەلیلە ببی بە ڕەفیق دەست بێنە پێشەوە، شەرتی برایەتی بگرین. ڕووزبە زۆر بەکەیف خۆشی چووە پێشەوە. بە ڕەسمی خۆیان شەرتی ڕەفیقی برایەتییان گرت. دیمنە وتی: زەحمەت نەبێ لە فلان جێگە، ئەمانەتێکی من و کەلیلە هەیە بیهێنە ئێرە، حەقت بە زایع ناڕوا. ڕووزبە بەنیشانەی دیمنە، ڕۆیشت ئەمانەتەکەی بردە لای دیمنە. دیمنە کردی بە دووبەش. بەشێکی بۆ خۆی هەڵگرت و بەشی کەلیلەی تەسلیم بە ڕووزبە کرد. دیمنە وتی: ئەی ڕەفیق، ڕجام ئەوەیە هەمیشە لەبەر دەرگای شێر دانیشیت هەر قسەیەکت بیست بۆم بگێڕیتەوە. ڕووزبە شەرتی کرد. هەتا ڕۆژی مردنی دیمنە هەرقسەیەک بکرایە بۆ دیمنەی ئەگێڕایەوە. ڕۆژێ لەبەیانا دایکی شێر چووە لای شێر لە موحاکەمەی دیمنە سوئالی کرد. شێر هەرچی لە قازییان بیستبوو بۆ دایکی گێڕایەوە. دایکی شێر دەستی کرد بە پەلەپەل. وتی: ئەگەر قسەی تونک بکەم تەبیعەتت ئەگۆڕێ و ئەگەر بێدەنگ ئەبم لە ڕێگەی عاقڵان دوور ئەکەومەوە، شێر وتی: دایە، دەرگای نەسیحەت داخستن نیشی عاقڵ نییە. لازمە هەرچی لە دڵتایە بەیان بفەرموویت. قسەی تۆ ڕاست و ڕەوانە، خواری لەقسەی تۆ تەماشا ناکرێ. دایکی شێر وتی: فەرق بە قسەی ڕاست و درۆ ناکەیت. قانزاج و زەرەر جیا ناکەیتەوە. چونکە دیمنە فرسەت بزانێ ئاگری فیتنە دائەگیرسێنێ. تەدبیر لە دەست ئەچێ. شێر وتی:. تۆ ئیمڕۆ خۆت گوم مەکە. مومکینە ئیشی دیمنە ببڕێتەوە، شێر ئەمری کرد بە کۆبوونەوەی مەجلیس. قازییان و ئومەرا هەرچی بوون هاتنە خزمەت شێر و دیمنە داخڵ بە مەجلیس کرا. هەمیسان قازی ڕووی کردە مەجلیس وتی: هەرکەس لە گوناهی

دینە شتێ ئەزانێ بەیانی بکا هەموو مەجلیس نە بە چاک و نە بە خراپ قسەیان بۆ نەکرا موعاوینی قازی رووی کردە دینە وتی: ئەگەرچی حازران، بۆ خوسووس نەجات بوونت بێدەنگ بوون. ئەمما دڵیان بۆ کوشتنی تۆ قەراری بەستووە.

ئارەزووی لەناو بردنت ئەکەن. تۆ بەم حاڵە ژینت بە عەمەل چی دێت. چاک وایە بە گوناهی خۆت ئیقرار بکەیت و تۆبە و پەشیمانی حاصل بکەیت. لەدونیا و قیامەت نەجاتت ئەبێ و دوو رێگەی چاک بۆ تۆ ئەمێنێ. ئەووەڵ: خۆت لە زنجیر و حەپسی خەلاس ئەبی. دووەم: خەلق لە مەجلیس گرتن خەلاس ئەبن. ئەی دینە، ئیقرار کردنت زۆر مەسڵەحەتە.. چونکە راستی وتن بۆ قیامەت چاکە و دڵی پادشا ئەکەوێتە ئیسراحەتەوە.. ئێمە زوبان فەسیحی عەقڵی تۆمان بۆ مەعلووم کراوە. عەقڵ بێنەرەوە سەرخۆت، مردن بە ناوی چاکە لە ژینی رەزالەت چاترە. دینە وتی: ئەی موعاوین لە دڵی خۆتەوە زەننی حازران تەماشا مەکە و حوکم بە زۆر ناکرێ. لەمەعنای (إنّ بعضَ الظنّ إثمٌ) غافڵ مەبە، ئەگەر ئێوە بە زەنن و بە شک خەریکن خوێنی من برێژن من قبووڵ ناکەم چونکە فەرموودەی خودایە..(ولا تلقُو بأيديكُم إلى التهلكة)، من بە کوشتنی کەس رازی نەبووم، ئیستا چۆن خۆم بە کوشتن ئەدەم. ئەی موعاوین واز لەم قسانە بێنە. ئەگەر نەسیحەتە، نەسیحەت وا نییە. ئەگەر گاڵتەیە لە مەحکەمەی شەرع دوورە، سەهوو و زەنن و گاڵتە بۆ مەحکەمەی شەرع نەهاتووە و جەنابت لە رێگەی راستییەوە داوای شەهادەتت نەکرد. من زۆرم ئومێد بە جەنابت هەبوو، بەدبەختی من دڵی تۆی لەمن وەرگێرا، بە زەننی جەنابت من گوناهبار بووم و قەتعی نەجات بوونم لە خۆم کرد. مەحکەمەی شەرع قسە لە شاهید و ئیسپات ئەکا و یا زەنن قبووڵ ئەکاو هەرکەس شاهیدی بەبێ مەعلوومات بدات، ئەوەی بەسەر دێت بەسەر بازەوانەکە هات. موعاوین پرسی چۆن بووە.

### حکایەت

دینە وتی: ئەگێرنەوە، مودیرێ لە ئاوادانیەک دانیشتبوو شەو و رۆژ خەریکی نانداني میوان بوو. ناو و شوورەتی بە ئەترافا بلاوکردبۆوە. ژنێکی بوو لە جوانیا بێ ئەمسال بوو. غولامێکی بەڵخی بازەوانی مودیر بوو. عاشقی ئاغا ژن بوو. ئارەزووی وەسڵی ئەکرد. دایما خەریکی سیحر بوو، تەئسیری نەبوو. ئاخری رێگەی فێڵی دۆزییەوە، تەسادوف رۆژێ دوو تووتیی بە دەست راوچییەکەوە بوو ئەیفرۆشت، غولام هەردوو تووتیەکەی کری،

تەعلیمی قسەی کردن. یەکێکیانی فێرکرد ئەیوت: ژنی ئاغا ژنم لەگەڵ دەرگاوان نوست. یەکێکیان ئەیگوت: من قسە ناکەم و هیچ ناڵێم. بە وەعدەی یەک حەفتە ئەو قسانەی فێری تووتییەکان کرد. بە زوبان بەلخی و بە دیاری بردی بۆ لای مودیر، مودیر عاشقی دەنگیان بوو. تووتییەکانی دایە دەست ژنەکە. زۆر بە دیققەت خزمەتیان ئەکردن. مودیر بەئارەزووی دەنگی ئەو تووتییانە دایم خەریکی بەزم و چاڵغی بوو. ئەمما لە قسەیان نەئەگەیشت. تەسادوف ڕۆژێ دوو میوانی بەلخی... ڕێگەیان کەوتە ماڵی مودیر. مودیر ئەمری کرد نان بۆ میوان دانرا، لەپاش نان خواردن، ئەسبابی خواردنەوە چووە بەردەمیان. لەسەر ئەمری مودیر، تووتییەکان حازر کران، وەقتێ دەستیان کرد بە خواردنەوە و تووتییەکان ئەو دوو کەلیمەی بە بەلخی تەعلیم درابوون. دەستیان پێ کرد، میوانەکان سەری خەجاڵەتیان شۆڕکردەوە. زۆر بە عاجزی دانیشتن. مودیر ئەو حاڵەی زۆر لا خراپ بوو. دڵخۆشی میوانەکانی ئەدایەوە. ئەسبابی عاجزیی لە میوانەکان ئەپرسی، میوانەکان ڕاستییان بۆ ئاشکرا نەئەکرا. نیهایەت مودیر سوێنگی بە دەما هات و ڕجای لە میوانەکان کرد. سەبەبی عاجزییان بۆ مودیر بەیان بکەن. یەکێ لە میوانەکان وتی: ئەی مودیر، جەنابت لە زوبان ئەم تووتییانە حاڵی نابی چی ئەڵێن؟ مودیر وتی: لە زوبانیان حاڵی نابم و عاشقی دەنگیان بووم و ئەگەر ئێوە لە زوبانیان حاڵی ئەبن بەیان بفەرموون باعیسی مەمنوونییە. میوانەکان وتیان. ئەم تووتییە ئەڵێت: ژنی مودیر لەگەڵ دەرگاوان نوست. ئەوی تریان ئەڵێ: من قسە ناکەم. مودیر ئەو قسەی بیست خەیاڵی سەرخۆشیی ئەما، دەستی لە شەراب گێڕایەوە. ڕووی کردە میوانەکان، وتی: ئەی میوانی خۆشەویست قسوورم عەفوو کەن، لەم حاڵە خەبەردار نەبووم، ئێستا بە فەرموودەی جەنابتان بۆم مەعلووم کرا و عادەتی تایفەی ئێمە وایە، بە حەرام ئەزانین، نان خواردنی ماڵێ ژنی خراپی تیابێ، لەو وەقتەدا غولام لە پشت دەرگاکە وەستابوو، گوێی لەو قسانە بوو، وتی: منیش چەند دەفعە چاوم پێ کەوتووە. لەو مەسئەلە خەبەردار هەم، مودیر نزیک بوو، لەهۆش بچێ، نییەتی کوشتنی ژنەکەی بوو، کەسێکی نارد ژنەکە بکوژن، ژنەکە سوئالی کرد، لەسەر چییە مودیر ئەمری بە کوشتنم کردووە؟ مەسئەلە بۆ ژن بەیان کرا. ژنەکە جوابی بۆ مودیر ڕەوانە کرد. کەمن بۆ کوشتنی خۆم باکم نییە، هەر وەقت ئەمر بفەرموویت حازرم. ئەوەندە فەرق هەیە، سەبر لازمە، کەسێ عاقڵ بێ عەجەلە لەنیش ناکا و خوسووسەن کوشتن. ئەگەر پەلە لە کوشتن کرا لە پاشا ئاشکرا بوو بێ گوناه کوژراوە، حەققی قەتلەکە تا قیامەت ئەمێنێ، پەشیمان بوون بەکار نایەت. مودیر ئەمری کرد،

ژنەکەیان هێنایە لای میوانەکان و قسەی توتییەکانیان بۆ ژنەکە بەیان کرا. ژنەکە وتی: ئەم تەیرانە جنسی ئینسان نین. بە قسەکردنیان چۆن باوەڕ ئەکرێت؟ مودیر وتی: ئەم تەیرانە وەک بەنی ئادەم ساحێب عەرز نین، هەرچی ئەبینن بەیانی ئەکەن و ئینکار لە قسەکردنیان ناکرێ درۆ بێ. ژنەکە وتی: لازمە لە ڕێگەی شەرعەوە بکوژرێم، هەر وەقت شەرع ئەمری بە کوشتنم کرد، حەلاڵە. مودیر وتی: شەرع ئەفەرموێت. بە چوار شاهێد نەبێ ژن زینای بەسەر ئیسپات ناکرێ. ژنەکە وتی: لە میوانە بەلخییەکان بپرسە، سوئال لە تەیرەکان بکەن لەو قسەیە زیاتر ئەزانن یانا. ئەگەر دەرکەوت لەو دوو کەلیمە زیاتر نازانن بۆم مەعلووم ئەبێ، ئیشی غولامە بازەوانەکەیە، دەمێکە خەریکی حەرامزادەییە. من وجوودم نە ئەزانی، میوانە بەلخییەکان تاسێ ڕۆژ لەگەڵ توتییەکان خەریک بوون، لەو دوو کەلیمەیە زیاتر نەیانئەزانی، مودیر بەو ئەحواڵە لەخوێنی ژنەکە خۆش بوو. ناردی بە شوێن بازەوانەکەدا، بازەوان، بە دڵێکی خۆش بازی نایە سەر قۆڵی، هاتە لای مودیر، وایئەزانی خەڵات ئەکرێ، ژنە ڕووی کردە بازەوان، وتی: ئەی غەددار، تۆ ئەزانی ئیشێ خودا نەهیی لێ کردبێ بیکەم، بازەوان وتی: بەڵێ، بازەکە پەلاماری چاوی دا. چاوێکی بازەوانی دەرهێنا. ژنەکە وتی: (جَزاءُ سيئةٍ سيئةٌ مثلها) چاوی شاهیدێ درۆزن بێ، لازمە لەبن هەڵکەنرێ. دینە وتی: ئەم میسالەم بۆیە هێنایەوە، بۆیان مەعلووم بێ ئیشێ بە چاو نەبینرێ، بەدرۆ بەیانی بکات خەجاڵەتی دونیا و قیامەت ئەبێ. ئەووەڵ و ئاخری قسەی دینە لەسەر کاغەز نووسرا، برایە بەردەم شێر دانرا، شێر خستییە بەردەم دایکی. وەقتێ دایکی شێر لەو ئەحواڵە خەبەردار بوو، وتی ئەی پادشاه، ئارەزووی من ئەوەیە هەتا زووە، ئەمر بە کوشتنی دینە بکرێ، لەوە ئەترسم بە زوبان لووسی و بەقسە و فیتنە تووشی بەلایەکت بکا لەوە زیاتر بێ کە تووشی شەترەبەی کرد، شەترەبە وەزیرێکی عاقڵ و زیرەک بوو لە ولسیتەی دوو زوبانی و فیتنەی دینەوە ڕێگەی نەجاتی بۆ خۆی نەدۆزییەوە. لەو قسانە شێر دڵی کەوتە خۆفو مەراقەوە، وتی: ئەی دایە بەیان بفەرموو کێ بوو قسەی دینە و شەترەبەی بۆ تۆ بەیان کردووە؟ بیگێڕەوە تا لە کوشتنی دینە پەشیمان نەبەوە، دایکی وتی ئەی پادشاه، سر ئاشکرا کردن زەحمەتە، ئەو کەسەی قسەی لای من کردووە، منی بە ئەمین حساب کردووە و شەرت و شرووت لەمابەینا بووە. ناتوانم ناوی ساحێب قسە بەیان بکەم، ئەمما ئەوەندە فەرق هەیە ئەچم ئیزن لەو کەسە ئەخوازم وەقتێ ئیزنی دام، بەتەواوی قسەی دینە و شەترەبە بۆ تۆ ئەگێڕمەوە، شێر ڕازی بوو، دایکی شێر ڕۆیشتەوە بۆ جێگەی خۆی کەوتە مەراقەوە، یەکێکی نارد بە دوای پڵنگدا،

وەقتێ پڵنگ چووە لای دایکی شێر، زۆر بە حورمەت و دڵخۆشی، میوانداریی کرد، وتی: ئەی پڵنگ، مەعلوومە شێر تۆی بە وەزیر قبووڵ کردووە و بە قسە و تەدبیری تۆ زۆر باوەڕ ئەکا لازمە تۆیش قسوورت دەرحەق بەشێر نەبێ و خزمەتی بە فەرز بزانیت، تا بە وەعدەی (لئن شکَرتُم لأزیدنَّکُم) ڕوتبەت لای شێر ڕۆژ بە ڕۆژ زیاد بکا. پڵنگ وتی: ئەی خانم، ئەو چاکەی کەشێر لەگەڵ منی کردووە و ڕوتبەی وەزیری بەمن بەخشیوە. لەژێر چاکەی تا مردن دەرچوونم نابێ و تا ئێستا بۆ خزمەتی قسوورم نەکردووە و لە ژێر ئەمری ڕووم وەرنەگێڕاوە و خوسووسی ئەمرێ بە زوبان جەنابت بکرێ. کردنی بەسەر سەر لازمە. دایکی شێر وتی: (وَما الأنعامُ إلاّ بالتَّمام). خۆت ئەیزانی شێر لە ئەووەڵەوە. گەر تێ بەربوونی دڵی بۆ تۆ بەیان کردبوو و تۆیش بۆ ئاشکرا کردنی خوێنی شەترەبە، وەعدەت فەرمووبوو (إذا وَعَدَه وفی) لازمە ئیمڕۆ وەفای خۆت بەجێ بێنی. بچیتە خزمەت شێر، هەرچیت بیستووە و ئەیزانی بیگێڕیتەوە، چونکە نزیکە زوبان لووسیی دیمنە، دڵی شێر سارد کاتەوە و ئەجاتی ببێ، مەعلوومە حەقی خۆی لە هەموو ئومەرا ئەکاتەوە. پڵنگ وتی: ئەی خانم، ئاشکرا کردنی مەسئەلەی شەترەبە لەسەر من بوو و هەتا ئێستا کە بێ دەنگ بووم لەبەر ئەوە بوو زوبان لووسی و تەڵەبازیی دیمنە لەزاتی شێر مەعلووم بکرێ. ئەگەر لەپێش جەنابتا قسەی دیمنم بۆ شێر بکردایە، باوەڕی نە ئەکرد، چونکە فێڵ و فیتنەی دیمنە لە شێر مەعلووم نەکرابوو، فکری ئەکرد من دوشمنایەتیم لەگەڵ دیمنە پەیدا کردووە. بەچاک تەماشا نە ئەکرا، ئێستاش ئیش گەیشتە ئەو ڕادەیە، دیمنە بە زوبانی لووسی خۆی ئەجات دا و ئێمە بە درۆزن دائرێین، لازمە خزمەتی خۆم بەجێ بێنم و شەهادەتێ کە مەعلوومم کردووە، لە ڕووی مەجلیس بیگێڕمەوە، فەرموو حازرم. پڵنگ لەگەڵ دایکی شێر چوونە خزمەت شێر، ئومەرا هەموو کۆبوونەوە، مەجلیس گیرا، شێر ڕووی کردە دایکی وتی: ئەمە ئاخر موحاکەمەی دیمنەیە، هەرکەس شاهیدەو لە مەسئەلەی شەترەبە و دیمنە خەبەرداره بەیانی بکا. پڵنگ ڕەسمی خزمەتی بەجێ هێنا چووە پێشەوە، قسەکردنی کەلیلە و دیمنە هەرچی بوو بوو لە ئەووەڵ تا ئاخر بۆ مەجلیسی گێڕایەوە. قسە دەماو دەم کەوت، تا گەیشتە گوێی ئەو حەپسە لە زیندان گوێی لە قسەی کەلیلە و دیمنە بوو، ئەویش وتی: من بەرن بۆ خزمەت شێر. شاهیدی ئەزانم. حەپسەکەیان برد بۆ خزمەت شێر، قازی ڕووی کردە حەپس، وتی: تا ئێستا بۆچی شەهادەتت تەئخیر کردبوو. جەوابی دایەوە، لەبەر ئەوە شاهیدیی یەک کەس دروست نەبوو چاوەڕوانی یەکێکی کەم کرد. وەقتێ زانیم. منیش هاتم ئەوەی زانیم بەیانم کرد. شێر بە حوکمی ئەو دوو شاهیدە

ناردی، دینەیان هێنا، فەرمانی جەزای شەترەبە خرایە ملی، چوار مێخەیان کرد. لەسەر پشت ڕایان خست. زوبانیان بڕی، بەدارکاری و ئەنواعی سیاسەت کوشتیان و لە چۆڵێک فڕێ درا. قەل و داڵ خواردیان. هەرکەس ئارەزووی فیتنە و دوو زوبانی کرد کوشتنی لە ژیانی چاکترە. فەرموودەی خوایە (فَقُطِعَ دابرُ القوم الذین ظلموا، والحمد لله رب العالمین).

### نەسیحەتی سێهەم

قانزاجی ڕەفاقەت لەگەڵ دۆست و برادەران.

دابشەلیم ڕووی کردە حەکیم بەرهەمەن، وتی: جەزای دوو زوبانی و فیتنە. موافیق بە ئەمری خودا گێڕاتەوە، ئومێد دەکەم. ڕێگەی ڕەفیقان و دڵ ساف یەک لە پشت یەک بن و لە ئیسراحەت و لە تەنگانە لەیەک جیا نەبنەوە. ڕێگەتان چۆنە بەیان بفەرموو، حەکیم وتی: ئەی پادشاە بۆ پیاوی عاقڵ لە دونیا دا لە ڕەفیقی چاک، چاتر نییە. قانزاجی ڕەفیق زۆر دەست ئەکەوێ. لە جوملەی ئەو حیکایەتانە کە لە ڕەفیقییەک دڵ دەست کەوتووە، حیکایەتی قەل و مشک و کۆتر و کیسەڵ و ئاسکە، قسەیەکی جوانە. بۆ عەقڵ گرتن دابشەلیم پرسی، چۆنە بەیان بفەرموو؟.

### حیکایەت

حەکیم وتی: ئەگێڕنەوە، لە ئەترافی کەشمیر، دارستانێکی زۆر خۆش و ئاوودار بوو. لە واسیتەی ئاو و هەواوە لە هەموو نەوعە حەیوانێ، ڕوویان تێ ئەکرد. لەهەر چوار فەسڵ ڕاوچی لەو دارستانەدا بە ڕاو خەریک بوون. تەسادوف دارێکی زۆر بەرز لە قەراغ دارستانەکە بوو، قەلە ڕەشێ بەسەر دارەکەوە هێلانەی کردبوو، ڕۆژێ قەلە ڕەشەکە لە هێلانەکەدا بۆ ڕاست و بۆ چەپ و بۆ ژێر دارەکە تەماشای ئەکرد، چاوی کەوت بە پیاوێ داری بە دەستەوە، داوی بەشانەوە، توورەکەی بەکۆڵەوە، ڕووی کردبووە بن دارەکەی قەل. قەل لە خۆی ترسا، فکری کرد، وتی: مومکینە ئەم کابرایە بۆ گرتنی من هاتبێ، چاک وایە خۆم بشارمەوە، لەبن گەڵاو لقی دارەکە خۆی شاردەوە، تەماشای کرد کابرا ڕاوچییەکە داوەکەی لەشان کردەوە لەژێر دارەکەدا نایەوە و ئەختێ دانی لە توورەکە دەرهێنا، کردی بەناو داوەکەدا، ڕۆیشت خۆی شاردەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو کۆمەڵێ کۆتر پەیدا بوون. گەورەی کۆترەکان. ناوی موتەووەقە بوو. زۆر زیرەک و ساحێب فیکر بوو، کۆترەکان لەژێر ئەمری موتەووەقە ڕوویان وەرنەئەگێڕا ئەمما وەقتێ کۆترەکان چاویان بە دان

کەوت، ئاگری برسییەتییان گڕی سەند، فیکری خواردنی دانەکەیان کەوتە سەر. موتەووەقە بە عەقڵ بۆ مەعلوم بوو فیکری کۆترەکان چییە. ئەوەی ئوسووڵی گەورەیی بوو قسووری نەکرد. زوبانی بە نەسیحەت کردەوە، رووی کردە کۆترەکان، وتی: ئەی فەقیرینە، ئێوە مەزانن ئەوە دانە، داو لەژێر دانەکە نراوەتەوە، جوابیان دایەوە، وتیان: ئەی گەورەی ئێمە، برسییەتی رەگی هاریی پێوەیە و خۆت ئەیزانی، بەبێ زەحمەت نان دەست کەس نەکەوتووە و هەرچی ئیرادەی خودا بێ رەد بوونەوەی نییە.

کۆترەکان هەموو روویان کردە دانەکە، موتەووەقە فیکری نەچوونی کرد. ئەمما قەزا و قەدەر رەد نابێتەوە. کۆترەکان دەنووکیان بۆ دان برد. داوەکە هاتەوە یەک، هەموویان بوون بە داوەوە.. موتەووەقە هاواری کرد: لە قسەی من دەرچوون ئەمەمان هاتە رێ. کابرای راوچی بە دڵێکی خۆشەوە رووی کرد بۆ لای داوەکە. کۆترەکان بەبەستێ بڕواتەوە بۆ ماڵەوە، وەقتێ کۆترەکان چاویان بە راوچی کەوت دەستیان کرد بە پەلەپەل و فڕەفڕ، هەر یەکە بۆ نەجاتی خۆی هەوڵی ئەدا، موتەووەقە وتی: وا دیارە هەرکەس بۆ نەجاتی خۆی پەلە ئەکات لە ئەحواڵی یەک ناپرسن. وا لازمە بۆ نەجاتی یەکتری هەوڵ بدەین، وەک دوو رەفیقەکە لەسەر کەشتی کەوتنە بەحرەوە، مەلەوانێ بۆ گرتنەوەی هەردووکیان خۆی خستە بەحرەکەوە، یەکێکی گرتەوە، وتی واز لەمن بێنە، رەفیقەکەم بگرەوە، پەلاماری ئەوی تریانی دا، ئەویش بەو نەوعە غەمی رەفیقەکەی بوو، لەبەر صافیی دڵیان لەیەک، هەردووکیان نەجاتیان بوو، ئێوەش هەرکەستان فیکری نەجات بوو: بکەن مومکین نابێ، مەگەر بە ئیتتیفاق لازمە هەموومان بە یەکەوە قووەت بکەین. داوەکە هەڵکەنین بەرز بینەوە، بڕۆین، بەتەدبیری موتەووەقە، یەک دەفعە قووەتیان کرد، داوەکەیان هەڵکەند و بەرز بوونەوە، رۆیشتن. کابرا کە چاوی بەو حاڵە کەوت، سەرسام بوو، دوای کۆترەکان کەوت، فیکری وا بوو ئەیانگرێتەوە، قەل وتی لازمە بزانم ئەم کۆترانە چۆن خۆیان نەجات ئەدەن، ئەویش دوایان کەوت. موتەووەقە ئاوڕی دایەوە، تەماشای کرد کابرای راوچی شوێنیان کەوتووە. وتی: ئەی رەفیقینە رووتان بکەن بۆ دارستان و شیو، تا چاوی کابرا خۆمان گوم بکەین، بە تەدبیری موتەووەقە، روویان کردە دارستان و شیو، لەبەر چاوی راوچی گوم بوون، راوچی بە نائومێدی گەڕایەوە، قەل شوێنیان کەوتبوو تا لەوانەوە عەقڵ وەرگرێت. عاقڵ ئەوەیە لە خێرەدەوە عەقڵ وەرئەگرێت. تەجرەبەی زەمان عەقڵ نیشان ئەدا، وەقتێ کۆترەکان لە دەست راوچی نەجاتیان بوو، روویان کردە موتەووەقە، وتیان ئەی گەورەی ئێمە، تەدبیر چییە؟ موتەووەقە وتی: چار ئەوەیە، رەفیقێکم لەم نزیکانە

هەیە، ناوی زیرەکە، بچین بۆ لای ئەو، داوەکەمان بە دان ئەبڕێت، هەموویان ڕوویان کردە بەر دەرگای مشک، کە ناوی زیرەک بوو، موتەووەقە بانگی کرد: ئەی ڕەفیق، ئیمڕۆ وەقتی وەفایە، زیرەک گوێی لە دەنگی موتەووەقە بوو لە کون هاتە دەرەوە، چاوی بە موتەووەقە کەوت، دەستی کرد بە گریان، وتی: ئەی ڕەفیق، ئەوە چە ئەحواڵێکە لێت قەوماوە؟ زیرەکی و عەقڵی تۆ مەشهوور بوو لە دنیا دا. چۆن تووشی ئەم داوە بوویت.

موتەووەقە وتی: ئەی ڕەفیق، قسە لە قەزا و قەدەر ناکرێ. لە ئەووەڵەوە، زۆر خۆم پاراست، بە قسەیان نەکردم. بە واسیتەی ئەمانەوە منیش بە داوەوە بووم، زیرەک وتی: فەرقت بۆ نەکرا داو نراوەتەوە، خۆت و ڕەفیقانت نزیکی نەکەون، موتەووەقە وتی: ئەی زیرەک، ئەم قسانە مەکە، ئەوانە کە لە من عاقڵتر و بە قووەتترن، قەزای خودایان بۆ ڕەد نەکراوەتەوە، زیرەک وتی: مەعلوومە، ئیشی خودا قسەی لێ ناکرێ، ئەلحەمدولیللا بە سەلامەتی گەیشتوونە ئێرە، ئاسانە نەجاتتان. ئیسراحەت بە مەشەققەت دەست ئەکەوێ، زیرەک چووە پێشەوە بۆ بڕینی داوەکە، موتەووەقە وتی: ئەی ڕەفیق، لە ئەووەڵەوە داوی ڕەفیقانم ببڕە، لەدوای هەموویان دەم بەرە بۆ داوی من، زیرەک بە قسەی نەکرد، لای موتەووەقە خەریکی بڕینی داوەکە بوو، تیکرار موتەووەقە وتی: ئەی زیرەک ڕجام ئەوەیە، من بخەیتە ئاخری هەموویان، زیرەک وتی: مەگەر لە ڕووحی خۆت بێزاری. ئارەزووی مردن نەکەیت. تیکراری قسەت کردەوە؟ موتەووەقە وتی: ئەی زیرەک، عاجز مەبە لە تیکرار کردنم، چونکە ئەم کۆترانە منیان بە گەورەی خۆیان داناوە و لەژێر ئەمری من دەرنەچوون، ئەگەرچی ئەم دەفعەیە قسەیان شکانم بووین بەداوەوە، ئەمما لە واسیتەی ڕەفاقەتی ئەوانەوە نەجاتم بووە و هەر پادشایەک لەبەر ڕەحەتی خۆی گوێی نەدایە بیستنی ڕەعییەت، زوو لەناو ئەچێت. زیرەک وتی: پادشا لەناو میللەتدا وەک ڕووحە، میللەت جەسەدە، لەجێگەیە، ڕووح نەبوو، جەسەد بۆچی چاکە؟ موتەووەقە وتی: ترسم ئەوەیە لە ئەووەڵەوە من بکەیتەوە و چەند ڕەفیقێکم بەداوەکەوە مابێ، تۆ هیلاک ببی، قەدەرێ ڕوو بدات و ئەگەر من بخەیتە ئاخیرەوە، گوێ نادەیتە هیلاکی، منیش نەجاتم نەبێ، چونکە هەموومان لە داوا شەریک بووین و لە ڕەحەتی، لازمە شەریک بێن، زیرەک لەبەر دڵی موتەووەقە، داوی هەموو کۆترەکانی بڕی، لە دوای هەموویان موتەووەقە نەجاتی بوو. موتەووەقە و کۆترەکان دوعا خوازییان لە زیرەک کرد. ڕۆیشتنەوە جێگەی خۆیان. زیرەک چووە کونەکە، قەل بە تەنها مایەوە، تەماشای بڕینی داوی کۆترەکانی کرد و لە ڕەفاقەتی زیرەک تەحەییور ما، فیکری کرد: منیش لازمە لە بەڵای زەمان ئەمین نەبم، بۆ ڕۆژێکی وا، ڕەفاقەت لەگەڵ ئەم مشکە بکەم. قەل چووە سەر کونە مشکەکە، بانگی کرد، زیرەک، جوابی دایەوە، کێیە؟ قەل وتی: منم، وەقتێ مشک دەنگی قەلی مەعلووم کرد. کەوتە فیکرەوە، چونکە سارد و گەرمیی دونیای دیبوو. بۆ ڕۆژی تەنگانەی دە دوازدە ڕێگەی لە کونەکەوە کردبوو. مشک لەدەمی کونێکەوە، ڕووی کردە قەل، وتی: تۆ چیت، ئیشت چییە؟ قەل وتی: من هاتووم شەرتی ڕەفاقەت لەگەڵ تۆ بکەم و مەسەلەی ڕاوچی و

کۆترەکانی بۆ مشک گێڕایەوە. وتی: بۆم مەعلووم بوو، وەفا و حقووق نەزانی. ئومێد دەکەم بەیەکەوە ڕەفاقەت پەیدا بکەین، وەک لەگەڵ کۆترەکان کردت. مشک وتی: ئەی قەل. ڕەفاقەت گرتنی من لەگەڵ تۆ، بەقەدەر مەشریق و مەغریب، لەگەڵ یەک دوورە. ئاسنی سارد مەکوتە. عەزیەتی خۆت مەدە. من و تۆ نابین بە ڕەفیق. مەعلوومە سەفینە بە زەوییا ناڕوات و ئەسپ بەسەر بەحرەوە ڕۆیشتنی مومکین نابێ. هەرکەس ئیشی بێ تەجرەبە بکات، گاڵتە بەخۆی ئەکات. ئەوەش لە من دوورە. قەل وتی: ئەی زیرەک ئەم قسانە مەکە. دەوڵەمەند، فەقیر مەحرووم ناکەن. من بە ئومێدی خزمەت ڕووم کردووەتە دەرگای جەنابت. شەرتی وەفاو عەقڵ نییە، بۆ تۆ دوورە دەست بنێیت بە ڕوومەوە.. بە نائومێدی بگەڕێمەوە. ئەگەر بمکوژیت دەست لە ڕەفاقەتت هەڵناگرم. مشک وتی: ئەی قەل، دان و داو بۆ من ڕۆ مەکە. من ئەخلاق و سیفەتی تۆ چاک شارەزا بووم. ڕەفاقەتی تۆ عەزابولئەلیمە. بە هیچ جۆرێ لە تۆ ئەمین نیم. هەرکەس لەگەڵ ناوجنسی خۆی ڕەفیقە و ئەگەر کەسێ لەگەڵ غەیرە جنسی ڕەفاقەت بکرێ، ئەوەی تووش دێت، تووشی کەوەکە هات، قەل پرسی چۆن بووە؟

**حیکایەت**

مشک وتی: ئەگێڕنەوە لە شاخێ کەوێک، دەنگی قاسپە قاسپی بەرز بوو بووەوە. بازێ گوێی لە دەنگی بوو، مەیلی ڕەفاقەتی کرد. فیکری کرد وتی: هەرکەس بێ ڕەفیقە، لەگەڵ غەم شەریکە، وا چاکە ڕەفاقەت لەگەڵ ئەو ڕووح سووکە دەنگ خۆشە و بەلەنجەیە بکرم. وردە وردە چوو نزیک بەکەو بووەوە، کە چاوی بە باز کەوت خۆی خستە قلیشی بەردێ گەورە، بازچووە بەر بەردەکە بانگی کرد، تا ئێستا لە ئەحواڵی تۆ بێ خەبەر بووم. لەبەر دەنگخۆشی ئارەزووی ڕەفاقەتت ئەکەم. ئەمین بە لەمەو پاش ترس و خۆف لەمن مەکە و ڕەفاقەتمان زۆر خۆش ئەبێ، کەو وتی ئەی پادشای تەیران. دەست لە فەقیرێکی وەک من هەڵگرە مووددەتێکە ئەخۆشم. گۆشتی من قابیلی خواردنی جەنابت نییە و من قابیلی ڕەفاقەتی جەنابت نیم. باز وتی ئەی کەو عەقڵ بێنەرەوە سەر خۆت. مەعلوومە چنگی من نوقسانیی پەیدا نەکردووە و نێچیر لە دەست من دەرنەچووە و دەنووکم بە گۆشتی تۆ تیژ نابێ، ئەمین بە فیکری خواردنت ناکەم. ئارەزووی ڕەفاقەتت ئەکەم. بە واسیتەی ڕەفیقیی منەوە تووشی قانزاج ئەبی. ئەووەڵ ناوجنسی من بزانن لەگەڵ من ڕەفیقی. دەستی زوڵم بۆ تۆ درێژ ناکەن. دووەم کە تۆ داخل بە جێگەی من بوویت لەناو ناوجنسی خۆت حورمەت

پەیدا ئەکەیت و ترست لەکەس نابێ و لە ئاوجنسی خۆت کامیان جوان بێ بۆت دێنم. بە ئارەزوو کەیفی لەگەڵ بکەیت. کەو وتی جەنابت پادشای، پادشای تەیرانی و من میللەتم و تەبعی پادشاە لەگەڵ میللەت وەک یەک نییە، مومکینە بێ ئەدەبییەک لە من دەرکەوێ بە تەبعی جەنابت نەبێ، جەرگ و ڕیخۆڵەم بە نووکی پەنجەت بێتە دەرەوە. چاک وایە، عەفووم بکەیت لە کونجێ دانیشم و بە دەست جەنابتەوە هیلاک نەبم. باز وتی: ئەی ڕەفیق، مەگەر نەتبیستووە. چاو عەیبی دۆست نابینێ، سەد جار دۆست بێ ئەدەبی بکا لای دۆست بە ناشیرین تەماشا ناکرێ. من ئەم قسەو قەول و قەرارەی تۆ بە ئەمانەت هەڵ ئەگرم. شەرتی وەفاو ڕەفاقەت ناشکێنم، هەرچی ئارەزووی دڵت بێ بیکەیت، من مەمنوون ئەبم. کەو هەرچەند پاڕایەوە باز جوابی ئەدا. بە دڵخۆشی دانەوە کەو لە قلیشە بەرد چووە دەرەوە، باز دەستی کرد بە ماچ کردنی یەکتریان گرتە باوەش، باز بە سوێنگ دڵی کەوی ئەمین کردەوە، چوونە هێلانەی بازەکە، دوو سێ ڕۆژ بەو نەوعە ڕایان بوارد، کەو ئەمینیی لە باز پەیدا کرد. زوبانی بە قسەی زل زل کردەوە، دەستی کرد بە قاسپە قاسپ، لەبەر دەنگی خۆی گوێی لە قسەی باز نەئەگرت. باز لەبەر ئەوەی شەرتی کردبوو. کەوی عاجز نەئەکرد. تەسادوف چەند ڕۆژێ باز نەخۆش کەوت. قووەتی فڕینی نەما. فیکری خواردنی کەوی کرد، بۆ بەهانە ئەگەڕا لەسەر کەو بدۆزێتەوە. کەو بە عەقڵ بۆی مەعلووم بوو، باز خەریکی بەهانەیە، چاوی بە مردنی خۆی کەوت، فیکری کردەوە بەخۆی وت: لە قسەی عاقڵان دەرچووم، فەرموویانە هەرکەس ڕەفاقەتی لەگەڵ جنسی خۆی نەگرت پەشیمان ئەبێتەوە. کەو لە ترسا یەک زەڕە لە خزمەت کردنی باز غافڵ نە ئەبوو، باز برسیەتی زۆری بۆ هێنا، بەهانەی بۆ ئەدۆزرایەوە، چونکە کەو لە فیکری گەیشتبوو، شەوێ بە خەیاڵی خواردنی کەو ئەوەی بە کەو وت: ئەوە مومکین ئەبێ من لەبەر هەتاو بسووتێم، تۆ لەژێر سێبەر ئیسراحەت بکەیت، کەو وتی: قوربان ئێستا شەوە، هەتاو لە کوێ لەتۆی داوە؟ باز وتی بێ ئەدەب ، من بە درۆ ئەخەیتەوە. پەلاماردان و خواردنی یەکێ بوو. مشک وتی هێنانەوەی ئەم میسالەم بۆ ئەوەیە بۆت مەعلووم بێ، ڕەفاقەتی من لەگەڵ تۆ مومکین نابێ، لە تۆ ئەمین نابم. چونکە من خواردنی تۆم و ڕەفاقەت و دانیشتنمان بەیەکەوە دروست نابێ، قەل وتی ئەی زیرەک، فیکر بێنەوە سەر خۆت، خواردنی تۆ قانزاج بە من ناگەیەنێت، لە ڕەفاقەت زیاتر لەگەڵ تۆ فیکری خراپەم نییە. لەبەر ڕەفاقەتی تۆ تەرکی وەتەنم کردووە. بە ئومێدی قانزاج کردن هاتوومە بەر دەرگای جەنابت، ئەوانەی نەجیب و خانەدانن کەسیان لە دەرگای خۆیان دەرنەکردووە، ڕجا ئەکەم

لە ڕەفـاقـەتم مـەبوورە و نائومـێـدی دەرگـای خـۆتم مـەکـە. زیرەک وتی ئەی قـەل دوشمنایەتییەک بە فیتنە پەیدا بووبێت، ئاشت بوونەوەی مومکینە و دوشمنایەتییەک لە ئەووەڵەوە بووبێ ڕێکخستنیان دروست نابێ، مەسەلا دوشمنی شێر و فیل تا قیامەت نابڕێتـەوە و ڕێـک کـەوتنیـان مـومکین نابێ. دوشـمنایەتی من و تۆ، وەک مـشک و پشیلەیە، وەک مەڕ و گورگ وایە، لەمابەین دوشمنی قەدیم ڕێککەوتن دەست نەکەوتووە. ئێستا دەست تۆ بکەوێت. قەل وتی: ئەی زیرەک، من و تۆ دوشمن نەبووین. ئەگەرچی وەک جەنابت ئەفەرموویت جنسی من و تۆ دوشمن بوون و لە من و تۆ ئاشکرا نەبووە، من بە ئومێدی وەفا ڕووم کردووەتە قاپیی جەنابت. ڕجا ئەکەم دڵت دەرحەق بەندە خراپ مەکە، شەرتی وەفا بەجێ بێنە. مشک وتی: ئەی قەل، زۆر ئارەزووی ڕەفاقەت ئەکەیت و لافی دۆستی لێ ئەدەیت. ئەترسم ئەوەندەی بەین نەبێ. تەنافی مـەحـەبـەت بپـچـڕێنی، چونکە مـەعلوومـە، ئاو دوو سێ ڕۆژ مـایەوە، بۆن و تامی ئەگـۆڕێت، ئەمما لەسـەر زاتی نەسلی لاناچێت، بکرێت بەسەر ئاگرا. ئیشی خۆی ئەکاو ئاگرەکە ئەکوژێنێتەوە، مەقسەدم تۆیە لەگەڵ من ڕەفاقەت بکریت بە موودەتێکی کەم. دوشمنایەتیی کۆن فکر کەیتەوە، وەک حوکەما فەرموویانە: ئەوانەی لە دوشمن ئەمێنن مەعلوومە ڕێگەی عەقڵ نازانن. ئەگەر من تۆ بە ڕەفیق قبووڵ بکەم. ئەوەم بەسەر دێت. بەسەر حوشتر سوارەکە هات.

قەل پرسی: چۆن بووە؟

حیکایەت

زیرەک وتی: ئەگێڕنەوە حوشترسوارێ، بە ڕێگەدا ئەڕۆیشت، تەماشای کرد، لە جێگەی کاروان، ئاگر بەجێ مابوو، با ئاگرەکەی بڵاو کردەوە. پووشی سەحراکە ئاگری گرت. مارێ لەناو ئاگرەکە، ڕێگەی دەرچوونی نەبوو. نزیک بوو ئاگر بیسووتێنێ، چاوی بەحوشترسوار کەوت دەستی کرد بە گریان، وتی: ئەی حوشترسوار، بۆ خاتری خوا، لەم ئاگرە نەجاتم بدە. حوشترسوار پیاوێکی بە ڕەحم بوو. فیکری کرد ئەگەرچی مار دوشمنی بەنی ئادەمە. ئێستا داماوە، خێرە نەجاتی بدەم حوشترسوار توورەکەیەکی پێ بووکردی بە نووکی دارێکەوە. درێژی کرد بۆ لای مار. مار چووە ناو توورەکەکەوە. حوشترسوار بەو جۆرە، مارەکەی لەناو ئاگر دەرهێنا دەرکی توورەکەکەی کردەوە. وتی ئەی مار. ئارەزووی کوێ ئەکەیت بڕۆ، ئەمما زەرەر لە بەنی ئادەم مەگەیەنە. زەرەر دان زۆر خراپە مار وتی: وامزانی پیاوێکی عاقڵی، ئەوە قسەیە تۆ ئەیکەیت، ناڕۆم تا بە خۆت و حوشترەکەتەوە نەدەم،

حوشترسوار وتی: من چاکەم لەگەڵ کردی، جەزام بە خراپە ئەدەیتەوە. مار وتی تۆ چاکەت لە جێگەی خۆی نەکرد، چونکە ئەزانی لە پێوەدان زیاتر بۆ بەنی ئادەم نەمبووە. بۆچ منت نەجات دا. بۆ تۆ نازانی لەگەڵ دوشمن چاکە کردن. وەک خراپە لەگەڵ دۆست وایە، لە جێگەی ئەم چاکەیەت ئەبێ بە خۆت و حوشترەکەتەوە بدەم، لەبەر ئەوە چونکە لە ڕێگەی حەدیس دەرچوویت. عولەما فەرموویانە: لەهەر جێگەیە تووشی مار بوون، بیکوژن. تۆ بێ ئەمری عولەمات کردووە، پێوەدانت دروستە. حوشترسوار وتی: ئەی مار، چاکە کردن جەزای خراپە دانەوە چۆن دروستە؟ مار وتی: بە مەزهەبی بەنی ئادەم جەزای چاکە خراپەیە. لەچە ڕێیەکەوە ئەڕۆن منیش لازمە بێمە ڕێگەی ئێوە، حوشترسوار هەرچەند پاڕایەوە. مار قبوولی نەکرد. وتی: لە ئەووەڵ بە خۆتەوە بدەم، یا بە حوشترەکەوە، حوشترسوار وتی: ڕجا ئەکەم.. لەسەر ئەم فکرە لاچۆ جەزای چاکە ئەوە نییە تۆ ئەیزانی. مار وتی: نوسوولی ئێوەیە، لازمە منیش بیکەم و ئەگەر ئینکار ئەکەیت ئەچین ئەپرسین. حوشترسوار ڕازی بوو بە یەکەوە ڕۆیشتن تووشی گامێشێ هاتن. مار ڕووی کردە گامێش وتی: جەزای چاکە چییە؟ گامێش وتی: جەزای چاکە خراپەیە بە مەزهەبی بەنی ئادەم، چونکە من چەند ساڵێکە لای بەنی ئادەمییکەم... هەموو ساڵێ بێچوویەکم ئەبوو، لە شیر و ماست و ڕۆن، قانزاجی لە من ئەکرد. وەقتێ کە پیر بووم، لە خزمەت کردنم عاجز بوون، بەرەڵای ئەم سەحرایەیان کردم. ئیمرۆ ساحێبەکەم بەلاما ڕۆیشت، زانی ئەختێ گۆشتم گرتووە. ڕۆیشت قەسابێکی هێنامە سەر، فرۆشتمی، سبحەینێ قەسابەکە ئەمبات سەرم ئەبڕێ، گۆشتەکەم ئەفرۆشن و پێستەکەم دەباغ ئەکەن، جەزای چاکە بە خراپە لای بەنی ئادەم دروستە. مار وتی: ئەڵێیت چی؟ ئەووەڵ بە خۆتەوە، یا بە حوشترەکەوە بدەم. حوشترسوار وتی: بە ئەمری شەرع شاهید ئەبێ دوو بێ. بە یەک شاهید قسە باوەڕ ناکرێ، مار تەماشای کرد، دارێ دیارە، وتی: قبووڵ ئەکەیت بچین لەو دارە سوئال بکەین؟ حوشترسوار ڕازی بوو، ڕوویان کرد بۆ لای دار، وەقتێ گەیشتنە بن دارەکە، مار وتی: ئەی دار، جەزای چاکە چییە. دار وتی: جەزای چاکە خراپەیە، بە مەزهەبی بەنی ئادەم مەعلوومە من لێرە ڕواوم. ڕێبوار دێن لەژێر سێبەرەکەم دائەنیشن و مانگوویان ئەحەسێتەوە، لە پاشا سەر هەڵئەبڕن. تەماشای لق و پۆپم ئەکەین یەکێ ئەڵێت ئەو لقە بۆ کلکە تەور باشە، یەکێ ئەڵێ ئەو لقەی بۆ دار دەست باشە، دەست ئەکەن بە لق و پۆپ بڕینم. جەزای سێبەرەکەم بە بڕینی لق و پۆپم ئەدەنەوە، جەزای چاکە بە خراپە لای بەنی ئادەم دروستە، مار وتی: لەسەر قسەی خۆت دوو شاهید شاهیدییان دا، ئێستا پێم بڵێ

ئەووەڵ بە خۆت، یا بە حوشترەکەوە بدەم. حوشترسوار وتی: ڕجا ئەکەم ئەگەر یەکێکی کە شاهیدیی دا من ڕازیم، بە ئارەزووی تۆ. تەسادوف تووشی ڕێوی هاتن، ڕێوی گوێی لە قسە کردنیان بوو. لە مەسئەلە گەیشتبوو. مار وتی: لە ڕێوی بپرسە بزانە ئەڵێت چی لە پێش ئەوەی حوشترسوار بانگ کات. ڕێوی وتی: جەزای چاکە خراپەیە. ئەی حوشترسوار، تۆ چاکەی چیت لەگەڵ ئەو مارە کردووە. وا دووچاری خراپە بوویت، حوشترسوار ئەووەڵ و ئاخری قسەی بۆ ڕێوی گێڕایەوە. ڕێوی وتی: ئەی حوشترسوار تۆ پیاوێکی ڕاست دیاری، بۆچی ئەم قسەیە بە درۆ ئەگێڕیتەوە. مار وتی: بەڵێ ڕاست ئەکات. ئەو توورەکەی منی پێ دەرهێنا، بە شانیەوە دیارە. ڕێوی خۆی توورە کرد، وتی: باوەڕ ناکەم، ماری بەو گەوردییە، توورەکەیە بەو بچووکییە، چۆن جێگەی بۆتەوە. مار وتی: بۆ چ توورە ئەبیت، ئەگەر باوەڕ ناکەیت لە جێگەیەکی دوور نییە، توورەکەکە بێنە ئەچمە ناوی لەبەر

باوەڕکردنی تۆ، ڕێوی وتی: ئەگەر بە چاو ببینم جێگەی تۆ لەو توورەکەدا ئەبێتەوە. حوکمێک دەرحەقتان دائەنێم، بە تەئریخ بکێڕێتەوە، مار بەقسەی ڕێوی خەڵەتا. حوشترسوار توورەکەی لەشان کردەوە، مار چووە ناو توورەکەکەوە، ڕێوی وتی: ئەی حوشترسوار دەرگای توورەکەکە بێنەرەوە یەک بزانم، بە قسەو تەدبیری ڕێوی دەرگای توورەکەی هێنایەوە یەک، ڕێوی وتی: بەری مەدە، خێرا خێرا توورەکەکە بکێشە بە زەویا تا رووحی دەرئەچێ، حوشترسوار بە تەدبیری ڕێوی، لە پێوەدانی ماری بەد ئەتوار ئەجاتی بوو.

هێنانەوەی ئەم میسالەم ئەوەیە هەرکەس ئەختێ عەقڵی بێ، لازمە بە قسەی دوشمن تەفرە ئەخوات بە هیچ ئەوعێ لە دوشمن ئەمێن ئەبێ، قەل وتی: ئەم قسە کردنانەت هەمووی حیکمەت بوو و هەر گەوهەرێ لە دڵت خستتە دەرەوە چاوی منی رووناک کردەوە، ئومێد دەکەم لە رووی ڕاستییەوە بەمن باوەڕ بکەیت. ڕێگەی ڕەفاقەت و دۆستی لەگەڵ من بگری، حوکەما فەرموویانە: ڕەفاقەتی عاقڵان خەزنەیەکە نابڕێتەوە. ڕەفاقەتی کەم عەقڵان ئاگرێکە ناکوژێتەوە، ڕەفاقەتی عاقڵ عاجزیی سەد ساڵە بە سەعاتێ لا ئەدا، خۆشەویستی بە ڕەگی بەرەڵلا ئەباتە خوارەوە، ڕەفاقەتی کەم عەقڵ، خۆشیی سەد ساڵە بەیەک قسە نایەنێ، پیاوی عاقڵ زوو دۆستایەتی ئەگرێ، درەنگ ئەبێ بە دوشمن، پیاوی کەم عەقڵ نەسیحەت بە دوشمنی ئەزانێ و لێت مەعلووم بێ لە دەرگای جەنابت، دوورنەکەوەمەوە، خواردن و خواردنەوە ناخۆم تا بە ڕەفاقەتم ئەمر نەفەرموویت، مشک وتی: زۆر ئارەزووی ئەوە ئەکەم لەگەڵ تۆ ببم بە ڕەفیق، لەم نزیکانە جێگەیەک بدۆزەرەوە هات و چۆ کردنمان بۆ یەک ئاسان بێ، قەل وتی: چاک ئەفەرموویت ئەما بە چاک نازانم چونکە نزیک ڕێگەیە، دائیما ڕێبوار هاتوچۆ ئەکات. ئەترسم قەدەرێ روو بدات. ئەگەر بە چاک ئەزانی جێگەی من ئاووهەوایەکی خۆشی هەیە و ڕەفیقێکی خۆشەریستم دراوسێیە. زۆر ساحیب وەفایە. ئەچین هەرسێکمان بە خۆشی یەک ڕائەبوێرین. مشک ڕازی بوو، هاتە دەرەوە، بە ئوسووڵی خۆیان شەرت و شرووتیان بەست، مشک وتی: ئارەزوو ئەکەم بچین بۆ جێگەی تۆ، چونکە ئێرە جێگەی من نییە، بە ئیسراحەت ئەحواڵی خۆم بۆت ئەگێڕمەوە. فەرموو با بڕۆین، قەل بە دەنووک، کلکی مشکی گرت. بە ئاسمانا بەرز بووەوە، رووی کردەوە جێگەی خۆی. وەقتێ کیسەڵ خەبەردار بوو، خۆی ئقووم بە ئاو کرد، قەل مشکی دانا، بانگی کرد: ئەی وەفادار کیسەڵ گوێی لە دەنگی قەل بوو، لە ئاوهاتە دەرەوە، رووی کردە قەل، وتی مووددەتێکە بەخزمەت ناگەم، لەبەر چییە. قەل بە داو بوونی

کۆترەکان و نەجات بوونیان و قسە کردنی ئەووەڵ و ئاخری لەگەڵ زیرەک بۆ کیسەڵ گێڕایەوە، وەقتێ کیسەڵ ئەو قسانەی بیست چووە خزمەت زیرەک. ڕەسمی میوانداریی بەجێ هێنا، ئەوەندە حورمەت و دڵخۆشیی زیرەکی دایەوە، زیرەک لەشەرما قسەی بۆ نەئەکرا. قەل چووە پێشەوە. ڕووی کردە زیرەک، وتی ڕجا ئەکەم مەسەلەی خۆت کە وەعدەت فەرموو بیگێڕەوە. تا کیسەڵ عەقڵ و زیرەکیی تۆ مەعلووم بکا. زیرەک ڕووی کردە کیسەڵ وتی ئەی ڕەفیق، من ئەسڵمن خەلقی شاری نادوت کە شارێکە لە هندوستان، جێگەی من لە خانووی عابیدێکا بوو. عابیدەکە دایم بە نوێژ و عیبادەت خەریک بوو، دەروێشان هەموو ڕۆژێ خواردنیان ئەهێنا بۆ عابید. میقدارێکی ئەخوارد و باقی هەڵئەگرت بۆ ئێوارەی منیش ئەچووم بێ ئەوەی عابید بزانێ، تێرم ئەخوارد و میقدارێکم ئەبرد بۆ خزمەتکارەکانم، چونکە لە واسیتەی نانی عابیدەوە چەند خزمەتکارێکم ڕاگرتبوو و عابیدەکە زۆر ئارەزووی لەناو بردنی منی ئەکرد، بۆی مومکین نە ئەبوو. تەسادوف شەوێ میوانێکی هات، عابید لەگەڵ میوانەکە دەستیان کرد بە قسە. میوان قسەی شارانی بۆ عابید ئەگێڕایەوە. لە وەقتی قسە کردندا. مشک لە کون هاتنە دەرەوە. عابید دەستی بە دەستا ئەکێشا، لەبەر ئەوە مشکەکان بڕۆن، میوان وای زانی عابید گاڵتە بەقسەی ئەکا دڵی عاجز بوو. ڕووی کردە عابید، وتی: ئەم چەپڵە لێدان و گاڵتە کردنە موناسیب حاڵی تۆی نابینم، عابید وتی: ئەی میوانی خۆشەویست، چەپڵە لێدانم بۆ قسەی جەنابت نییە. مەقسەدم ئەوەیە ئەو مشکانە دوور بکەونەوە. لە دەست ئەو مشکانە هەراسان بووم. نە خواردنم بە ڕەحەتی ماوە و نە ئەتوانم زەخیرە دابنێم، تەدبیر چییە؟ میوان پرسی: هەموو مشکەکان وەک یەک خێزان؟ عابید وتی: تەنها یەک مشکیان زۆر بە جەرگە. ترسی لێدان و کوشتن نازانێ، هەر وەقت ئەو مشکە هاتە دەرەوە، مشکەکانی تریش دوا بە دوای دێن. میوان وتی: ئەم مەسەلە، وەک مەسەلەی ژنە لادێیەکە وایە، کونجیی پاک کراو و نەپاک کراوی بەیەک موعامەلە ئەکرد. عابید پرسی چۆن بووە؟ بیگێڕەوە.

**حیکایەت**

میوان وتی: لەم ڕێگەوە کە هاتم. لە دێیەک شەو چوومە ماڵێ بە میوانی، وەقتی نووستن جێگەیان بۆ ڕاخستم، سەرم کردە سەر سەرین. هێشتا خەوم لێ نەکەوتبوو، گوێم گرتبوو پیاوەکە بە ژنەکەی وت: فکرم هەیە سبحەینێ زیافەت بکەم و چەند ڕەفیقێکم

بانگ کەمە سەر نان خواردن. ژنەکە وتی: ئابرووی خۆت مەبە. تۆ نە زەخیرە و نە فلس شک نابەیت. گۆشت و پیاز و برنج لە کوێ دێنی و ئەگەر ئیقتیدارت هەیە، زەخیرەی منالەکانت پاشەکەوت کە، بە رووتی و برسیەتی نەسووڕێنەوە، واز لە زیافەت کردن بێنە. پیاوەکە وتی چاوی تەمەعکار، بە خۆڵی قەبر نەبێ پڕ نابێتەوە، زەخیرەیەک بەکار بێ بۆ قیامەت باشە، زەخیرەی دونیایی پەشیمانیی لە شوێن دێت. کەسێ ئارەزووی زەخیرەی دونیا بکات، ئەوەی تووش دێت تووشی گورگەکە هات. ژنەکە پرسی چۆن بوو. پیاوەکە وتی: کابرایەکی ڕاوچی. کە ئاسک قووەتی دەرچوونی لەژێر دەستیا نەئەکرد. تەسادوف ڕۆژێ تەڵەی ئابووەوە. ئاسکێک بوو بە تەڵەکەیەوە، کابرا بە دڵێکی خۆشەوە رووی کردە ئاسک، ئاسک لە ترسی ڕووحی، تەڵەی هەڵکەند و ڕای کرد. ڕاوچی تیری بۆ خستە ناو کەوانەوە. هاویشتی بۆ ئاسک، بەتیر کوشتی، چوو سەری بڕی، دای بە کۆڵیا و رووی کردەوە بۆ ماڵ. لەڕێگە تووشی بەرازێ بوو، بەراز برسی بوو، ڕێگەی بە کابرا گرت. ڕاوچی تیری بۆ بەراز هاوێشت. دای لەسەر دڵی، بەراز لەتاو ئازار خۆی گەیانە سەر ڕاوچی، سواری سنگی بوو خنکانی. ڕاوچی و بەراز هەردووکیان ڕووحیان دەرچوو، میقداری چوار دەقیقە بەینی کەوت، گورگێ پەیدا بوو. تەماشای کرد. ئاسکێ و پیاوێک و بەرازێ، هەرسێکیان مردوون. گورگ زۆر دڵخۆش بوو. فکری کرد گۆشتەکان بشارێتەوە بۆ پاشەڕۆژ وردە وردە دەست کات بە خواردنی، لەبەر تەعەمی زەخیرە ئەووەڵ رووی کردە تیروکەوانەکە دانی لە چەرمی کەوان گیر کرد بیخوات. ترازاندنی کەوان و لەسەر دڵ کەوتنی یەکێ بوو. دەست بەجێ، ڕووحی دەرچوو و مرد. ژنەکە لە ترسی قسەی پیاوەکە بە ئومێدی (الرزق علی الله) رووی کردە مێردەکەی وتی: نەختێ کونجی و برنج بۆ زەخیرەی منالەکان داماوە کیفایەتی دە کەس نەکا بیخۆن، بۆ سبحەینێ ڕەفیق بانگ کە بۆیان دروست ئەکەم. وەقتێ ڕۆژ بووەوە. ژنەکە هەڵسا کونجی دەرهێنا، پاکی کرد و سپیی کرد. لەبەر هەتاو هەڵیخست، وشک بێتەوە، مێردەکەی دانا بۆ پاسەوانیی کونجییەکە. تەسادوف خەوی لێ کەوت. سەگ چوو دەمی نایە ناو کونجییەکە. ژنەکە چوو بەسەرا، بۆی مەعلووم بوو کونجی پیس بووە. بەکاری خواردن نەئەهات. کونجی هەڵگرت، ڕۆیشت بۆ بازاڕ، منیش دوا بە دوای ڕۆیشتم. ژنەکە چووە لای بەقاڵێ، وتی: کونجی سپی کراوم هەیە ئەیگۆڕمەوە بە کونجی پاک نەکراو. بەقاڵ هاواری کرد وتی: بێ حیکمەت نییە، کونجی سپی کراو بە کونجی نەپاک کراو نەگۆڕێتەوە، میوان وتی ئەی عابید ئەم قسەیەم بۆیە بۆ کردی. بێ حیکمەت نییە، ئەو تەنها مشکە جوڕئەتی پەیدا

کردووە، ناترسێ، ئەوە هێلانەی لەسەر خەزنە کردووە، فەرمـوو قولنگەیەک بێنە. من کونەکەی هەڵنەکەنم و پارەکەی دەردێنم، بزانە قووەت و پەلاماردانی نەمێنێت. مشک وتی: وەقتێ ئەو قسەیەم لە میوان بیست. جگەرم کەوتە خوارەوە، چونکە جەسارەت و حوکم لە واسیتەی ئەوەوە بوو. هەزار دینار پارەم بوو، لەخۆشیی پارەکە ترس و خۆفم لەکەس نەبوو. هەر وەقت فکری پارەکەم ئەکرد کەیف و شەوقێکی زۆرم پەیدا ئەکرد. عابید بە قسەی میوان قولنگەی هینا. دەستیان کرد بە هەڵکەندنی هێلانەکەم تا گەیشتە سەر دینارەکان. دەریان هێنا و بردیان، منیش بە موفلیسی مامەوە، حورمەت و گەورەییم لای مشکەکان نەما. ئەو مشکانەی خزمەتکار و نان خۆرم بوون، رووبان لێ وەرگێرام، وجوودیان نەئەزانیم، لای دوشمنم دەستیان کرد بە غەیبەت کردنم. مەشهوورە (من أقل دیناره قل مقداره) هەر کەس فەقیر بوو، حورمەتی نییە، حوکەما فەرموویانە کەسێ بێ رەفیق بوو، لەهەر جێگەیەک بێ، غەریبە، کەسێ ئەولادی نێرینەی نەبوو، ناوی گومە، کەسێ ماڵ و دەوڵەتی نەبوو قسەی مەعقوول نییە، کەسێ فەقیر بێ، بێ رەفیقە، مەعلوومە رەفاقەتی سپڵە زوو دەرئەکەوێ، رەفیق دوو جۆرە، جۆرێکیان گیانی گیانی، جۆرێکیان نانی نانی، رەفیقی گیانی گیانی ئەوەیە، شەریکی دەرد و غەمن، رەفیقی نانی نانی ئەوەیە، لەوەقتی خواردن و پارەداریا وەک زەردەواڵە گێزەگێز ئەکەن و ئەگەر خواردن شک نەبەن پێتەوە نەدەن، لە عاقڵێکیان پرسی: چەند کەس رەفیقتێ، وتی: ئەگەر کیسەکەم پڕ بێ، رەفیقم لە حیساب نایەت و ئەگەر کیسەکەم خاڵی بێت، رەفیقێکم لە دونیا دەست ناکەوێت و هەتا ماڵ و منداڵ گاڵتەم پێ ئەکەن، هەر کەس شوورەتی تیجارەتی بلاو بۆوە بەپارەدار زانرا، لە دڵی ئینسانا خوشەویست ئەبێ و ئیشی گرانی بۆ سەهل ئەبێ. مشک وتی: لەو وەقتەدا یەکێ لە خزمەتکارانم. بەلاما رۆیشت، منیش وتم: ئەی فلان بۆچی کەم مەرحەمەت بوویت. رەفاقەتی کۆنمان چیی لێ هات، بە روویەکی گرژەوە وتی: وا ئەزانم نزیک بە شێتی بوویت. مەگەر نازانی رەفیق و خزمەتکاری قابیلی کەسێکە پارەی بێ، مردن لە فەقیری چاکترە (کاد الفقر أن یکون کفرا)، لەبەر ئەوەیە، ئەوانەی ماڵی دونیایان لە دەست ئەچێ، هەر سەعاتە بە مردنێ ئەزانن، نزیک بوون بە تۆ بۆ من لایق نییە. منیش وتم: ئەی رەفیق، ئەو قسانە لە قسە ناچێ، کەتۆ ئەیکەیت. بزانە فەقیری تاجێکە دەست هەموو کەس ناکەوێ، حەدیسی شەریفە: (الفَقرُ کنز من کنوز الله) بۆچ ئەوەندە لۆمەی فەقیری ئەکەیت، زۆر گوناهە، ئەویش جوابی دایەوە وتی، هەیهات، هەیهات. ئەو فەقیرییەی پەسندی ئەنبییا و

ئەولیایە، لەگەڵ تۆ فەرقیان زۆرە، زیکرێکی خۆیان بە هەموو دونیا نافرۆشن و فەقیری ئەم زەمانە، عاقڵ بێ عەقڵ ئەکات و دووچاری دەرد و گوناه ئەبێ. ڕەفیقانی ڕووشکێنی ئەکەن و کەسێ شوورەتی چاکەی پەیدا کردبێ، فەقیری گومی ئەکات. مەدح و سەنای دەوڵەمەند بە فەقیری وەرئەگەڕێ، کەسێ کە فەقیر بوو ئەم ناوانە ناو ئەنرێت، غیرەت و نازایی بوو، ئەڵێن لە ڕووح بێزارە، ناتق و قسەزان بوو. ئەڵێن هەڵەوەڕە، هێواش حەرەکە بکا، ئەڵێن تەبدیل بووە، تەبیعەت سەخی بێ، ئەڵێن مەرایی کەرە، قسەی ناشیرین قبووڵ بکا. ئەڵێن ترسنۆکە، ئارەزووی تەنهایی بکا، ئەڵێن شێت بووە، دەم بە پێکەنین و ڕوو خۆش بێ، ئەڵێن جامبازە، خۆی پاک و تەمیز ڕاگرێ... ئەڵێن کیبری پەیدا کردووە، جلەکانی کۆنە بێ ئەڵێن ڕەزیلە، ئەگەر کەمخۆر بێ، ئەڵێن خۆی ئەنوێنێ، زۆر خۆر بوو. ئەڵێن گامێشە، ئارەزووی دانیشتن بکا. ئەڵێن تەمەڵە، بۆ سەفەر ڕۆیشت، ئەڵێن بەختی وەرگەڕاوە، نوێژکەر بێ ئەڵێن درۆزنە، هەموو ئیشێکی فەقیر بە عەیب تەماشا ئەکرێ، کەسێ دەوڵەمەند بوو، عەیبی تەماشا ناکرێ، مشک وتی: فیکرم کردەوە، قسەکانی ڕاست و دروست بوو. مردن لە موحتاجی چاترە، لازمە ئینسان نان لە گەرووی ئەژدەها دەرکێشێ و لە مەراق و غەمدا ڕووم لە مشک وەرگێڕا، چوومە بەر کونەکە، چاوم لێ بوو، عابید لەگەڵ میوانەکە پارەکەیان کرد بە دوو کەرتەوە، عابید پارەکەی خۆی نایە ژوورو سەری. خەوی لێ کەوت. منیش فیکرم کرد پارەکەی بدزم، وردە وردە چوومە ژوورو سەری عابید، میوانەکە بەخەبەر بوو، دارێکی بۆ هاویشتم، دای لە قاچم شکاندی، بەشەلەشەل چوومە کونەکە. میقداری سەعاتێکی بەین کەوت. دڵم گڕی گرت بۆ پارەکەم، تیکرار چوومەوە ژوورو سەری عابید. میوان خەوی مەرگی نەکردبوو. دارێکی کێشا بە پشتمدا. پەراسووی شکانم. هەر جۆرێ بوو، خۆم گەیانەوە کونەکە، تا ڕۆژ بێخود بووم. لەتاو ئازاری خۆم پارەم لە فیکر نەما. بە فەقیری ڕازی بووم. بەراستی بۆم مەعلووم کرا. هەرچی بەڵای بەسەر بێت، تەمەع ئەهێنێتە ڕێگە. باڵندە هەتا گەنوم نەبینێ گەردەنی خۆی ناخاتە ژێر داوەوە، لە واسیتەی تەمەع نەبێ غەوواس خۆی ناخاتە ناو بەحرەوە، وەقتێ ئەوەم تووش هات، دەستم لە تەمەع هەڵگرت و بە فەقیری ڕازی بووم، لە ژووری عابید هاتمە دەرەوە، ڕووم کردە سەحرا. لەڕێگە تووشی کۆترێ هاتم، بەداوەوە بوو بوو، ڕەفاقەتمان گرت و لەداوەکە نەجاتم دا، زۆری چاکە لەگەڵ کردم. هات و چۆ کردنمان لەبەینا پەیدابوو و شەرتی ڕەفاقەتمان لەقەل ئاشکرا بوو، لەگەڵ قەل بووین بە ڕەفیق و بەیانی ڕەفاقەتی جەنابتی بۆ کردم و بە خزمەت گەیشتم. ئومێد ئەکەم تا مردن ڕەفاقەتمان تێک

نەچێ. بە خۆشیی یەک ڕابوێرین. کیسەڵ وتی: زۆر مەمنوون بووم. بە هاتنی جەنابت. دڵم ڕوون بووەوە و تا مردن خزمەت کردنت بەسەر سەر ئەکەم. قسەی تۆ هەموو عەقڵ وەرگرتنە، لازمە بە فەرموودەی جەنابت، هەر جۆرێ بێ بە کەم وەیا زۆر قانیع بێن و هەرکەس بە ڕزقی خۆی ڕازی نەبێ، تەمەعی زیاد بکا، ئەوەی بەسەر دێ، بەسەر پشیلەکە هات.

قەل و مشک وتیان: چۆن بووە؟ بیگێڕەوە.کیسەڵ وتی مەمنوونم.

**حیکایەت**

ئەگێڕنەوە پیاوێک پشیلەیەکی بوو. ڕۆژێ میقدارێ گۆشتی بۆ پشیلە، بە مووچە بڕیبووەوە، چونکە سپڵەو بێ وەفا بوو، دائیما چاوی تێر نە ئەبوو، ڕۆژێ ڕووی کردە جێگەیەک، تەماشای کرد، چەند کۆترێ لە هێلانەکەیان بە گمەگم. خەریکن، پشیلە بە فیکری خواردنی کۆترەکان، نزیک بە هێلانە بووەوە، خاوەن کۆتر خەبەردار بوو، پەلاماری پشیلەی دا، تونگ گرتی، خنکانی و فڕێی دا. خاوەن پشیلەکە ڕابورد. تەماشای کرد پشیلەکەی پێستی لەبەر داماڵاوە. بەمردوویی کەوتووە، وتی: ئەی سپڵەی تەمەعکار، ئەگەر بەو مووچە گۆشتە ڕازی ئەبوویت، ئێستا پێستیان دا ئەئەماڵیت، ئەم میسالەم بۆیە هێنایەوە، هەر جۆرێ بێت، لە کونێ بە فەقیری ئیدارە بکەیت و فیکری ماڵی ڕابوردوو نەکەیت، چونکە شەرەفی ئینسان بە ماڵ نییە. بە کەماڵە، کەسێ عاقڵ و نەجیب بێ، حورمەتی لای هەموو کەس زۆرە. مەسەلا شێر ئەگەرچی زنجیر بکرێ. لەسام و هەیبەتی کەم نابێ سەگ ئەگەرچی ڕنجیری ئاڵتوون لەمل کات، بەوە ڕوتبەی زیاد نابێ. کەسێ کە بێ عەقڵ بێ بە درهەم و دینار عەقڵ زیاد ناکا. مەقسەدم دڵی جەنابتە، فکری غەریبی نەکەیت و لە ڕەفاقەتی ئێمە عاجز نەبیت. چونکە کەسێ عاقڵ بێ، لە هەر جێگەیەک بی غەریب نییە، کەسێ کە بێ عەقڵ بێ، لە ماڵی خۆشی غەریبە. پێشوونان وتوویانە شەش جۆر شت هەیە. زوو ئەگۆڕێت، ئەووەڵ: سێبەری هەورە بەیەک دەقیقە نامێنێت، دووەم: ڕەفیقی بە غەرەزی وەک تریشقە ئەڕوات. سێهەم: نارەزووی ژن، بە پێنج دەقیقە تەسکینی ئەدا. چوارەم: جوانیی بەنی ئادەم بە موددەیەک ئەگۆڕێت. پێنجەم: قسەی درۆزن، شەشەم: ماڵی دونیا ئاخری بە فەنا ئەچێ، کەسێ عاقڵ بێ، بە ماڵی دونیا مەغروور نابێ و بەفەقیریش عاجز نابێ: (لکیلا تأسوا علی ما فاتکم، ولاتفرحوا بما آتاکم) لازمە بزانیت بۆ ماڵی دونیا مەراق نەکەیت، ماڵی دونیا هەر ڕۆژێ

لای یەکێ ئەمانەتە، تەدبیر و عەقڵ و نەسیحەت. ماڵێکە پرانەوەی نییە، کیسەڵ ئەو قسانەی بۆ مشک کرد، قەل زۆر پێ خۆشحاڵ بوو، قەل وتی ئەی ڕەفیقینە شەرتی ڕەفاقەت ئەوەیە لە تەنگانە و کەم دەستیا ناوپشتی یەک بین، هەر وەک دوو ڕەفیقەکە، کەدەرحەق یەک بوون، مشک پرسی چۆنە بیگێڕەوە.

**حیکایەت**

قەل وتی بیستوومە، توجارێ، ڕەفیقێکی بوو، ڕەفیقەکەی لە نیوە شەودا لە دەرگای توجاری دا، توجار بە دەنگ زانی ڕەفیقەکەیەتی، فیکری کردەوە، وتی مومکینە، بە ئیشی زەرووری لەم ناوەقتەدا هاتبێ. یا موحتاجە بە پارە، یا موحتاجە بە مەسلەحە، یا موحتاجە بە خزمەتچی، توجارەکە کیسەیەکی پڕ کرد لە درهەم و شمشێری کردە مل و بە جارییەکەی وت: چرا هەڵگرە پێشم کەوە. ڕۆیشت دەرگای لە ڕەفیقەکەی کردەوە. دەستی کردە ملی ڕەفیقەکەی، وتی ئەی ڕەفیق هاتنت خێرە، فەرموو بزانم، ئەگەر موحتاجی بە پارە، یەک کیسەم بۆ پڕ کردووی لە درهەم. ئەگەر دوژمن زۆریان بۆ هێناوی بە شمشێرەوە حازرم، ئەگەر موحتاجی خزمەتچی بوویت، ئەوە جارییەکەم بە چراوە وەستاوە. وەقتێ ڕەفیقەکەی وەفاو خۆشەویستی توجاری بۆ مەعلووم کرا، دووقات ڕەفاقەت و خۆشەویستیان زیادی کرد، شەو و ڕۆژ لەیەک جیا نەئەبوونەوە. قەل وتی: ئەی ڕەفیقینە، لازمە ئێمە لەیەک غافڵ نەبین و دائیما ئاگەهداریی خۆمان بکەین. لەو قسەکردنانەدا بوون، یەک ئاسک پەیدا بوو، قەل فڕی، مشک چووە کونەوە، کیسەڵ خۆی کرد بە ناو ئاوا، ئاسک چووە سەر ئاوەکە. بەڕاست و چەپی خۆیدا ئەڕوانی، کیسەڵ لە ناو هاتە دەرەوە، وتی ئەی ئاسک بۆ چ بە ئەتراقی خۆتا تەماشا ئەکەیت وا دیارە ئەترسیت. ئاوت پێ ناخورێتەوە، بزانە ئەم جێگەیە جێگەی ترس نییە، چونکە لەڕێگەی ڕاوچی دوورە، ئاسک وتی: لەم نزیکانەوە. بەلەوەڕ خەریک بووم. داوێ نرابووەوە. نزیک بوو بە داوەکەوە ببم. لەبەر ئەوە ئەترسم. ڕاوچییەکە شوێنم کەوێ، کیسەڵ وتی: ڕاوچی ڕێگەی ناکەوێتە ئێرە، ئێمە سێ ڕەفیقین. موددەتێکە بە خۆشیی یەک ئەژین. ڕاوچیمان نەدیوە و ئەگەر تۆش ئارەزووی ڕەفیقیی ئێمە ئەکەیت، بەخۆشیی یەکەوە ڕائەبوێرین، ئاسک قبوڵی ڕەفاقەتی کردن. مشک و قەل چوونە پێش دەمی ئاسک، شەرت و ڕەفاقەتیان بەیەکەوە بەست، وتیان لازمە لەم نزیکانە، دوور نەکەوینەوە، ئاسک لە نزیک ئەوان خانووی دروست کرد. چەند موددەتێ هەر چواریان بەیەکەوە ئەژیان، تەسادوف ڕۆژێ

ئاسک میقداری گوم بوو، قەل و مشک و کیسەڵ چاوەڕوانی ئاسک بوون نەهاتەوە، مشک رووی کردە قەل وتی: زەحمەت نەبێ خەبەری ئاسک بزانە. قەل فڕی، میقداری ڕۆیشت. تەماشای کرد ئاسک بەداوەوە بووە، قەل گەڕایەوە خەبەری بە ڕەفیقەکانی دا. کیسەڵ رووی کردە مشک وتی: بەتۆ نەبێ ئاسک نەجاتی نادرێ. قەل بە دەنووک مشکی هەڵگرت ڕۆیشت بۆ لای ئاسک، نیشتەوە، مشک چووە پێش دەمی ئاسک وتی: نەی

ڕەفیقی پڕ عەقڵ، چۆن تووشی ئەم داوە بوویت؟ تۆ لەترسی داو گەیشتیتە لای ئێمە.
ئاسک وتی: ئەی ڕەفیق. وەقتێ قەدەر هات ناگەڕێتەوە. قەدەری خودا چاو کوێر ئەکا،
مشک وتی ڕاستە، قسەکانت. مشک بەدەم داوەکانی بڕی. کیسەڵ پەیدابوو. زۆر
دڵخۆشیی ئاسکی دایەوە، ئاسک ڕووی کردە کیسەڵ وتی: ڕووحی شیرینم. هاتنی تۆ
قانزاجی نەبوو، چونکە ئێستا ڕاوچی بێت من وەک بروسکە دەرئەچم، قەل ئەفڕێت،
مشک خۆی ئەکا بە کونا، زەحمەت بۆ تۆ ئەمێنێتەوە. کیسەڵ وتی: ئەی نووری چاوم،
من چۆن ئارامم ئەگرت، بەئیسراحەت دانیشم و تۆ لەژێر داوی بەڵادا بی، ژیانێ لەگەڵ
ڕەفیقان ئەبێ، ژەهری مارە، دووریی تۆ ئارامی لێ بڕیم، لەو قسە کردنەدا بوون ڕاوچی
پەیدا بوو، قەل فڕی، ئاسک ڕایکرد، مشک چووە کونەوە، کیسەڵ مایەوە. بە تەنها.
کابرای ڕاوچی تەماشای داوەکەی کرد. هەمووی بڕاوە، پچڕاوە، فیکری کردەوە چی ئەو
داوەی پچڕیوە؟ بە ئەتراف داوەکەدا گەڕا. چاوی بە کیسەڵ کەوت. لەبەر ئەوە ئائومێد
نەبێ، وەقتێ قەل و مشک بۆیان مەعلووم کرا. ڕاوچی کیسەڵی برد، هەر یەکە بە
تەدبیرێ خەریک بوون. ئاسک ڕووی کردە قەل، وتی: ئێمە ژیانمان لە پاش کیسەڵ بۆچی
چاکە، چوار ئیشی بە تەجرەبە ئاشکرا ئەبێ، جوورئەتی پیاوی ئازا لە وەقتی شەڕدا.
ئەمینداری لە وەقتی تەسلیم کردنەوەی ماڵدا، خۆشەویستی ماڵ و مناڵ لە وەقتی کەم
دەستیا، ڕەفاقەتی دۆستان لە وەقتی پەک کەوتندا. لازمە خواردن لە خۆمان حەرام
بکەین. تا ڕەفیقەکەمان نەجات نەدەین، مشک وتی: فیکری من ئەوەیە. بۆتان بەیان
ئەکەم، بزانن مەسڵەحەتدارە؟ ئەی ئاسک تۆ بچیتە پێش دەمی ڕاوچی خۆت بکەیت بە
نەخۆش، قەل بە ئەتراف سەرتا بسووڕێتەوە، ڕاوچی لەبەر تەمەع توورەکەکە دائەنێ،
میقداری سەعاتێ لە توورەکە دوور بکەونەوە، من کیسەڵ نەجات ئەدەم. ئاسک وتی
تەدبیرەکەت زۆر لایقە، ئومێدی نەجات بوونی کیسەڵ ئەکرێ، ئاسک ڕۆیشت، گەیشتە
پێش دەمی ڕاوچی، خۆی لێ ڕاکێشا، قەل بەسەر سەری ئاسکەکەوە نیشتەوە، ڕاوچی
تەماشای کرد، ئاسکێ کەوتووە. قەل خەریکە چاوی دەردێنێ. توورەکەکەی دانا، ڕای
کردە سەر ئاسک، ئاسک وردە وردە لەپێش دەمی ڕاوچی دوورکەوتەوە، بەو جۆرە
میقداری سەعاتێ ڕێگە، دوای ئاسک کەوت. ئاخری هیلاک بوو، پەشیمان بووەوە،
گەڕایەوە بۆ سەر توورەکەکەی، لەگەڵ گەیشت تەماشای کرد، دەرگای توورەکەکەی دڕاوە،
کیسەڵ نەماوە، ڕاوچییەکە ترس و خۆفی پەیدا کرد، لە بڕینی داوەکەو لە نەخۆشیی
ئاسکەکە و لە بڕینی توورەکەکەو لە نەمانی ئاسکەکە، کەوتە فیکرەوە، وتی: مومکینە

ئەمە تەلیسمە، ئەگەر ئەم جارە لەم تەلیسمە نەجاتم ئەبێ. تا بە ڕووح زیندوو بم تەرکی ڕاوچییەتی ئەکەم، بەو فیکر و خۆفەوە، دوورکەوتەوە، توورەکەکەی پارچە پارچە کرد، داوەکەی شکان، شەرتی کرد بە سەلامەتی بگاتە ماڵەوە، تەهلیغی ڕەفیقانی بکا، نزیک ئەو تەلیسمە نەکەون، ڕاوچی بەو نەوعە ڕۆیشتەوە، قەل و مشک و کیسەڵ لەبەر ڕاستی و خۆشەویستییان نەجاتیان بوو و بە ئیسراحەت و ڕەفاقەت تا مردن. ڕایان بوارد، ئەوەیە قانزاجی ڕەفیقی دڵ ساف لە جێگەیەک ئەو جانەوەرانە، ڕەفاقەت و وەفایان دەرحەق یەک کرد و بەنی ئادەم زیاتر تەماشا بکەن. (ومن یتوکل علی الله فهو حسبه).

نەسیحەتی چوارەم

پارێزگاری لە دوشمن و باوەڕ نەکردن بە زوبانیان

دابیشلیم ڕووی کردە حەکیم، فەرمووی: بەیانی ڕەفیق، کە دڵ ساف بوون، قانزاج کردنیان بۆم مەعلووم کرا، ئومێد دەکەم، مەکری دوشمن و قسەکردنیان چۆنە بەیان بفەرموویت، برەهمەن حەکیم فەرمووی: مەعنای وەسیەتی چوارەم ئەوەیە کەسێ عەقڵی بێ، دووربینی ئەحواڵ ئەکا. بە پاڕانەوە و گریانی دوشمن باوەڕ ئەکەن. ئەمین بوون لە دوشمن ڕێگای ڕەفیقی دوشمن. وەک ئاو و ئاگرە، ئاو و ئاگر دایم بەیەک دوشمن، چونکە دوشمن بۆ دروست بوونی مەتڵەبی هەموو جۆرە موعامەلەیەک بە فیکر دروست ئەکا. وەقتێ بە زوبانی لووس و پاڕانەوە سوڵحی کرد، ئەو وەقتە زەهری زیاتر لە ژێر زوبان حازر کردووە، خۆ پاراستن لە دوشمن لازمە، ئەگەر لە دوشمن غافڵ بێ، لە پاشا کاشکی و خۆزگە بەکار نایەت، هەرکەس لە دوشمن غافڵ بێ و بە قسەی دوشمن تەئمین بێ. ئەوەی بەسەر دێ بەسەر کونەبەبووەکان هات، دابیشلیم پرسی: چۆن بووە؟

حیکایەت

حەکیم وتی: لە ئەتراف شاری چین، شاخێکی زۆر بەرز بوو. دارستانی شاخەکە سەری لقیان تێکەڵ یەک بووبوو، میقداری قەلەباچکە، بەسەر ئەو دارانەوە هێلانەیان دروست کردبوو. گەورەکەیان ناوی پیرۆز بوو. هەموو قەلەباچکەکان لەژێر حوکمی پیرۆز ناوا بوون. چەند مەئموور و وەزیری دانا بووە میقداری کونەبەبوو لەوە پێش دوشمنایەتییان لەگەڵ قەلەباچکە پەیدا کردبوو، پادشای کونەبەبووەکان ناوی هۆشەنگ بوو، شەوێک بە ئەمری هۆشەنگ شەبەیخوونیان دا بەسەر قەلەباچکەکانا، (خذوهم فاقتلوهم حیث وجدتموهم) زۆریان لە قەلەباچکەکان کوشت، لەشکری کونەبەبوو، بە ئازایی و دڵخۆشی

گەڕانەوە جێگەی خۆیان. پیرۆز لەشکری قەلەباچکەکانی کۆ کردەوە. وتی: بۆتان مەعلووم بوو بەچنگ کوندەبەبووەوە، کوشتار و بریندارمان چەند لێ کرا، جۆرنەتو زاتیان چۆن کرد هێلانەی ئێمەیان دۆزییەوە و ئەگەر ئەم جارە بێنە سەرمان، مومکینە یەکێک بە زیندوویّتی نەجاتی نەبێ. لازمە هەرکەسە بە فیکری خۆی تەدبیرێ دروست بکا. ئێمەیش بە عەقڵ ورد ئەبینەوە، بە تەدبیرێ موعامەلە ئەکەین. پیرۆز قسەی تەواو کرد، پێنج قەل لە مەئموورانی چوونە پێشەوە لە عەقڵ و تەدبیرا مەشهوور بوون. قەلەباچکەکان،

بەقسـەی ئەو پێنج قـەڵەباچکەیە، زوو باوەڕیان نەکـرد، پیـرۆز ڕووی کـردە پێنج قەڵەباچکەکە، وەعدی خەڵاتی پادشاهانەی پێ دان. وتی: ئیمڕۆ عەقڵ و تەدبیری ئێوە تەماشـا ئەکەم. ئەبێت هەر کـەسـە تەدبیـری ئەم ئیشـە ئەزانێ بەیانی بکا، ئەوانیش زوبانیـان بە مـەدح و سـەنای پیـرۆز کـردەوە وتیـان ئەوەی پادشـاهـ، هەزار خـزمـەتکار، عـەقڵێکی پادشـایان نییە. ئەوەی جەنابت ئەیزانێ لە فـیکری ئێمـە دوورە و قـودرەتی ئەوەمـان نییە لە حوزوور جەنابتا قسە بکەین. (المأمور معذور) ئێمە مرقابیل عەقڵی خۆمـان زیاتر تەدبیر نازانین، مومکینە لایقی حوزووری جەنابت نەبێت. پادشا ڕووی کردە یەکێکیان تۆ تەدبیرت چییە بزانم؟ وتی: ئەی پادشا. لەپێش ئێمەدا، عـاقڵان و بەفـیکر زۆر بوون. ڕێگەی هەموو موعامەلەیەکیان دروست کردووە. فەرموویانە کەسێ موقابەلەی دوشمنی بۆ نەکرا دوشمن زۆری بۆ هێنا، چاک وایە ڕێگەی فیراری بگرێتە پێش و تەرکی وەتەن بکا. چونکە سـەلامـەتی لەخۆ پاراسـتنە، خۆ نەجات دان لە چنگ دوشـمن کـاری عـاقڵانە و... مـەعلومـە ئەو زاڵمـانە قـووەتمانی نەهێشـت، ئەو باقـییە کە نەجـاتی بووە ئەویش بریندارە و شەڕکردنی ئێمە لەگەڵ کونەبەبو دروست نییە. پادشاه ڕووی کردە دووەم قـەلیـان، وتی: فـیکری تۆ چیـیـە؟ وتی: ئەی پادشـاه، ئەوەی وەزیری ئەووەڵ بەیانی فـەرمـوو، تەرکی وەتەن کـردن و ڕاکردن لە دەست دوشـمـن بەبێ مـوقـابەلە و شـەڕ کـردن، ئیشی بێ غیرەت و بێ ناموسە، وا لازمە ئەسبابی شەڕ پەیدا بکەین، هەموو بە دڵێکی ساف وەک شێر حەملە بەرینە سەر دوشمن. یاخود بە دڵخۆشی و ئارەزوو ئەگەڕێینەوە و یاخـود ناوی بێ نامـووسی لەسـەر خۆمـان سـبووت ناکـەین. مـردنی ئازایی لە ژینی بێ نامـووسی چاکـترە، ناوی پادشـا بە مـوحـارەبە ئاشکرا ئەبێ و پادشـایەک لەشـەڕ کردن سـەرکەوت. ئارەزووی هەر مـەتلەبێ بکا لەبەردەمی حازر ئەکرێ، ئێستا چاک وایە چەند کەسێ بکەی بە نۆبەچی، هەر وەقت دوشمن هاتە پێشـەوە، خەبەردار بکرێین، وەک جاری پێشوو لە خۆمان غافڵ نەبین، ئومێد وایە بە ئارەزووی خۆمان بەسەر دوشمندا سەرکەوین. پادشاه ڕووی کردە سێهەم قەلیان وتی: فیکری تۆ چییـە؟ جوابی دایەوە بە فـیکری من جاسووس ڕەوانە بکەین، خەبەراتی دوشـمن بزانێ و لەقسـەو فـیکریان تێ بفکرێ ئەگەر فیکری سولحیان کرد و یا فیکری خەرجیان کرد، ئەتوانین هەموو ساڵ میقدارێ خەرج کۆ بکەینەوە بۆیان بنێرین، چونکە خۆف و ترس نامێنێ و ئێمەیش ئەبووژێینەوە. ئیختیاری غـوربەت و تەرکی وەتەن لەگـەڵ مـاڵ و منداڵ زۆر زەحـمـەتە، ئەگـەر سـولح کـرا لە ڕووی ئاشـتـیـیـەوە حەقی خۆمـان دەست ئەکەوێت، پادشا ڕووی کـردە چوارەهەم قەلەباچکەیان،

وتی: فیکری تۆ چییه؟ ئەویش وتی: ئەی پادشاه، مردن و فیرار کردن خۆشترە لەوە کە دەخالەت بەرینە لای دوشمن و رێگەی قەدیمـمان گوم بکەین. لە ئەووەڵەوە کونەبەبوو چاوەروانی دەستی ئێمە بوون و ئێستا ئێمە دەخالەت و خەرج قبووڵ بکەین، نەبووغمان چاکترە، چونکە پارانەوە، دوشمن گەورە ئەکات، ساڵ بە ساڵ خەرج زیاد ئەکا و هەتا بێت دەستی زوڵمـمان بەسەرا درێژ ئەکات، بناغـەی قووەتمان لەبن دێننە دەرەوە و بە مـردن رازیم. بە خەراج دڵن رازی نیم، پیرۆز رووی کردە وەزیری گەورەیان ناوی کارشناس بوو، وتی: ئەی کارشناس تەدبیری تۆ چییە؟ قسەی تۆ لە هەموو ئەسلەحەیەک چاترە لە سوڵح و یا لە شەڕ کامیان بە چاک ئەزانی. کارشناس وتی: ئەی پادشاه، لەشەڕ کردن زیاتر، تەدبیر نییە. کەوابێ ئەوانیش ئێستا فیکری تەدبیر ئەکەن، لەپێش ئەوەی شەبەیخوونیان دا بەسەر ئێمەدا من بە دڵ فەرقم کردبوو. چونکە دوشمن بە بچووک تەمـاشا ئەکراوە، لازمە لە حیلەی دوشـمن غافڵ نەبین و بەم حاڵە شەڕ بۆ ئێمە ناکرێ، لازمە بە تەدبیر حەقی خۆمـان لە دوشـمن وەرگرین. ئەوەی بە تەدبیر و سیاسەت دروست ئەبێ. بەسەد هەزار لەشکر دروست نابێ و عادەتی پادشاهانی پێشوو ئەوە بووە هەر ئیشێکیان بووبێ. مەجلیسیـان بۆ داناوە و تەدبیری بەچاک تەمـاشا کراوە، ئیشـەکەی بە ئاسانی دروست کـردووە و ئێـمـەیش بە تەدبیـر حـەقی خۆمـان لە دوشـمن وەرگـرین. ئەی پادشـاه بزانە پادشاهان لە واسیتەی تەدبیری وەزیرەوە ئیشیان بۆ سەهل ئەکرێ، تێ بفکرە، بەحر وردە وردە ئاوی دێتـە سـەر- ئاو ئەنرێت بەحر- و بەحری دڵـی جـەنابت بە تـەدبیـری وەزیر و عـاقـڵان پڕ بکە، لە پاشـا دەست بۆ دوشـمن درێژ بکە ئەی پادشـاه تەدبیـر دوو نەوعـە، تەدبیـری سـڕی و تـەدبیـری ئاشـکرایی هەیە، پادشـاه وتـی: تـەدبیـری سـڕی و تـەدبیـری ئاشکرایی چییـە بەیان بفەرموو. کارشـناس وتی: تەدبیـری سـڕی ئەوەیە، کـەس نەزانێ بەڵکو جاسـووس خەبەردار بوو، تەدبیری ئێـمـەی لە دوشـمن ئاشکرا کرد و یا کـەسێ لای خۆشەویستێکی گێڕایەوە دەماو دەم کەوت، دوشمن خەبەردار ئەبێ، عاقڵان زۆر سەعییان کـردووە تەدبیر ئاشکرا نەکرێ و هەر کـەس سـڕی خۆی ئاشکرا کرد، ئەوەی بەسـەر دێت بەسەر پادشای کشمیر هات.

پیرۆز پرسی، چۆن بووە؟

حیکایەت

کارشناس وتی: ئەگێڕنەوە لە شاری کشمیر، پادشاهێ بوو، بە حوکم و عەدالەت بێ

ئەمسال بوو و پادشاکە. ژنێکی بوو لە جوانیا ڕەفیقی نەبوو. پادشاە زۆری خۆش
ئەویست. تاقەتی نەئەگرت. سەعاتێ لە ژنەکەی دورکەوێتەوە و ژنەکەی بۆی مەعلووم بوو
لای پادشاە خۆشەویستە، ناز و تەکەبوری زۆری پەیدا کرد. تەسادوف ژنەکە عاشقی
خزمەتکاری بوو، وەعدەو قسەکردنیان بە ئیشارەت بوو، ڕۆژێ پادشاە و ژنەکەی بەیەکەوە
دانیشتبوون. جوانەکەی دۆستی ژنەکە ڕابورد، پادشای بانگی کرد بۆ خزمەت، ژنەکە وەک
گوڵ گەشایەوە، خۆی ئارایش دا، پادشا وای زانی بۆ خاتری دڵی پادشای خۆی ئارایش
داوە و تەماشای ژنەکەی نەکرد. فەرقی کرد لەگەڵ خزمەتکارەکەی بە ئیشارەتی یەک
خەریکن، ئاگری غیرەتی پادشاە هەڵگیرسا، دەستی لە خۆشەویستی ژنەکە هەڵگرت،
فیکری بوو هەردووکیان بکوژێت، کەوتە بەحری خەیاڵاتەوە. بەخۆی وت: سەبر کردن
لازمە و بۆ من ناشیرینە دوو گوناهبار کوشتن. پادشاە جار جار فیکری ئەکرد ژنەکە
بدوێنێ و غیرەت مەنعی ئەکرد، ئاخری ناردی بە شوێن وەزیردا، مەراقی خۆی بۆ وەزیر
بگێڕێتەوە، لەگەڵ وەزیر چووە خزمەتی پادشاە هەردووکیان دووبەدوو خەڵوەتیان کرد.
پادشاە وتی: ئەی وەزیر تۆ دونیات زۆر دیوە و عەقڵت زۆرە تەدبیری من چییە؟ قسەی
ژنەکەی و خزمەتکارەکەی بۆ وەزیر گێڕایەوە، وەزیر جوابی دایەوە، لازمە کەس نەزانێ
هەردووکیان دەرمانخوارد بکرێن، چونکە خیانەتیان لە جەنابت کردووە. ئەووەڵ دڵی
جەنابت لە غەم نەجاتی ئەبێ، دووەم پەردەی ناموس ئاشکرا نابێ، هەردووکیان
قەراریان دا دەرمانخوارد بکرێن. بۆ ڕۆژی دوای کچی وەزیر وتی بە باوکی. ئەی بابە،
ئیمڕۆ چوومە ماڵی پادشاە، ژنی پادشا، قسەی ناشیرین و بێ حورمەتی پێ وتم. وەزیر
وتی کچم عاجز مەبە. یا ئیمڕۆ و یا سبحەینێ، دەرمانخوارد ئەکرێت کچەکە لە خۆشیا
سوێنگی باوکی دا، ڕاستی قسەم پێ بڵێ، وەزیر ئەوەی لە پادشای بیستبوو بۆ کچەکەی
گێڕایەوە، وتی لای کەس قسە نەکەیت، کچەکە زۆر پێ خۆشحاڵ بوو ئەوەندەی بەین
نەبوو. یەکێ لە خادمانی پادشاە، بۆ دڵخۆشی دانەوەی کچی وەزیر چووە لای کچەکە،
لەپاش قسەکردنیان کچی وەزیر وتی: قوڕ بەسەری ئاخری عومرییەتی، کارەکەرەکە وتی:
کوانێ لە دەست ئەو بێ حەیایە نەجاتمان بوایە. کچی وەزیر وتی: ئەگەر لای کەس قسە
ناکەیت، ڕاستی قسەت بۆ نەگێڕمەوە، کارەکەر سوێنگی بۆ خوارد لای کەس قسە نەکات.
دڵی کچی وەزیر ئەمین بوو، ئەوەی لە باوکی بیستبوو بۆ کارەکەری گێڕایەوە، کارەکەر
دەستی بە دەمو چاویا هێنا، شوکرانەی بژارد، دوعاخوازیی لە کچەکە کرد، ڕۆیشتەوە
چووە لای ژنی پادشاە، ئەووەڵ و ئاخری قسەی بۆ گێڕایەوە، ژنەکە میقدارێ ئاڵتوون و

ئەختینەی هەڵگرت و خزمەتکارەکەی بانگ کرد، لە ناغافڵ هەردووکیان فیراریان کرد، لە دەست کوشتنی پادشاه، ئەجاتیان بوو، پادشاه بە مەتڵەب ئەگەیشت و لە قسەکردنی پەشیمان بووەوە، کارشناس وتی: بە گێڕانەوەی ئەم قسەیە لە جەنابت مەعلووم بێ قسەی سڕڕی، ئاشکراکردنی زۆر خراپە، یەکێ لە وەزیرەکان وتی: ئەوەی تۆ فکرت لێ کردووە، لە ڕێگەی عەقڵ دوورە، (وشاورهم فی الأمر) لە فیکر خۆمان..؟ لە ڕێگەی سیاسەت و تەدبیری لابدەین، دوای تەدبیری تۆ بکەوین پەشیمان ئەبینەوە، کارشناس وتی: مەعنای قسەی من، بە تەرکی تەدبیر مەزانن، چونکە پادشاه لازمە تەماشای تەدبیری هەموو لایەکمان بکا، تەدبیری سڕڕی دوو قانزاجی هەیە، ئەووەڵ هەر ئیشێ بە سڕڕی تەدبیری لێ بکرێ، تەئخیر بوونی نابێ، زوو دروست ئەبێ. (إستعينوا على حوائجكم بالكتمان) دووەم. ئەگەر موافیقی دڵی پادشاه نەبوو. تەمەشای ناکات و بە گوێی ساحیبی ناکاتەوە، پیرۆز وتی: ئەی کارشناس خراپی لە تەدبیر و عەقڵی تۆ نابینرێ، هەرچی بە چاک ئەزانیت بەیان بفەرموو، کارشناس وتی: ئەی پادشا هەرچی بە چاک بزانم. لە خزمەتتا بەیانی ئەکەم.. ئەمما لازمە بە خەڵوەتێ، پیرۆز وتی: خەڵوەتی چییە، چۆن ئەبێ؟ کارشناس وتی: من و تۆ هەردووکمان لە جێگەیەک بە تەنها تەدبیر دەست پێ ئەکەم، ئەوی بە چاک زانرا بیگرە پێش، ئەوی بەچاک نەزانرا، زەرەر نابەخشێ، چونکە لازمە بۆ پادشاهان سڕڕی خۆیان لای کەس ئاشکرا نەکەن و تەدبیر هەیە بە دوو سێ کەس نەکرێ، ئەمما تەدبیری کونەبەبوو لە خۆم و خۆت زیاتر نابێ کەس بزانێ، پیرۆز و کارشناس خەڵوەتیان گرت. پیرۆز پرسی، دوشمنی ئێوە و کونەبەبوو چی بووە. کارشناس وتی: لەمەو پێش قەلەباچکەیەک قسەیەکی بەکونەبەبوو وتووە، لەبەر ئەو قسەیە، ڕق و دوشمنایەتیان ئیمڕۆ بەسەر ئێمەدا ڕژان، پیرۆز وتی: چۆن بووە؟ کارشناس وتی: ڕۆژێ چەند کونەبەبووێ، کۆ ئەبنەوە و لەگەڵ میقدارێ تەیر تەدبیر ئەکەن. یەکێ بۆ پادشای خۆیان بدۆزنەوە. هەریەکە بە جۆرێ قسە ئەکەن و زۆریان ئیتتیفاق ئەکەن کونەبەبوو بکەن بە پادشاه، لەسەر ئەوە قەرار ئەبڕێتەوە. بە تەدبیری هەموویان ئەڵێن کەسێ کە داخڵ بە مەجلیس نەبووبێ، بە قسەی ئەو کەسە حوکمی پادشای بدرێت. تەسادوف قەلەباچکە نزیک بە مەجلیسیان ئەبێ، ئەوانیش ئەڵێن ئەوا، ئاوجنسی خۆمان هات پرسی پێ بکەن. بەقسەی ئەو موعامەلە بکەن. وەقتێ قەلەباچکە گەیشتە لایان، بەیانی قسەی بۆ ئەکەن، جوابیان ئەداتەوە، فیکرتان گۆڕاوە، عەقڵتان نەماوە، کونەبەبووی شووم حەددی پادشایی چییە. بازی تیژچنگ. تاوسی ڕەنگاو ڕەنگ، هومای موبارەک، نەماون کەس لە

دونیا دەست ناکەوێ. کونەبەبووی قەدەم شەڕ و ڕووگرژ و بە تەکەببور ئەدۆزنەوە و کەسێ کەم عەقڵیی کرد چۆن نەکرێ بە پادشاه. لەسەر ئەم فیکرە خراپە لاچن لازمە بناغەی ئیشی خۆتان لەسەر عەقڵ و تەدبیر دانێن و ئیشێ کە بە تەدبیر دروست نەکراێ، ئیسراحەت و ڕەحەتی لە کوێ دەست نەکەوێ. ئێمەیش تەدبیرێ بدۆزینەوە، هەروەک کەرویشکەکە. بۆ مەسلەحەت خۆی کرد. بە قاسیدی مانگ.

تەیرەکان پرسییان، چۆن بووە؟

**حیکایەت**

قەلەباچکەکە وتی: ئەگێڕنەوە، لە جزیرەی ئەتراف، زیرئاباد، ساڵێ باران نەباری لەبەر کەم بارانی هەرچی دار و گیای جزیرەکە بوو، وشک بوو. ئەو جزیرەیە میقدارێ فیل تیا ساکن بوو. لەگەڵ ئاوی جزیرەکە وشک بوو. فیلەکان شکاتیان بردە لای پادشاکەیان. پادشاهەکە ئەمری کرد لە ئەتراف جزیرەکە بگەڕێن. ئاو بدۆزنەوە، فیلەکان ڕۆیشتن بۆ گەڕان تا گەیشتنە سەرچاوەی کارێزێ. ناوی عەینولقەمەر بوو. فیلەکان گەڕانەوە خەبەریان بۆ پادشاه برد. بە ئەمری پادشاه، هەموو فیلەکان چوونە سەر کارێزەکە و ئەترافی کارێزەکە میقدارێ کەرویشک تیا ساکین بوو. لە وەقتی چوونی فیلەکان بۆ سەر کارێزەکە، چەند کەرویشکێ لەژێر پێی فیلەوە مردبوون. لەبەر ئەو خوسووسە کەرویشکەکانیش چوونە شکات لای پادشای خۆیان، وتیان ئەی پادشاه نیوەمان لەژێر دەست و پێی فیلان پان بووینەوە، حەقمان بسێنە، پادشاکە وتی: ئێمە بە زۆر ناتوانین حەقی خۆمان لە فیل بسێنین و هەر کەس تەدبیرێ ئەزانێ بەیانی بکا. بەڵکی بە تەدبیر ئیشمان دروست بێ، کەرویشکێ لەناو کەرویشکەکان چووە پێشەوە، ناوی تیژهۆش بوو، وتی: ئەی پادشا، ئەگەر بەچاک ئەزانی من بنێرە، بە عەقڵی خۆم ئەم ئیشە گرانە سەهل ئەکەم و یەکێکی ئەمینیش لەگەڵما بنێرە بۆ دڵپاکی ئێوە. پادشاه وتی: ئەی تیژهۆش. زیرەکی و ئەمینیی تۆ لەمن مەعلووم کراوە. لازم بەکەس ناکا لەگەڵ تۆ بێت. ئارەزوو ئەکەم بە فیکر و زانستی خۆت ئەم ئیشە دروست بکەیت. لە فیکر و قسە و نەسیحەت قسوور نەکەیت، پێشوونان فەرموویانە، کەسێ فرستادە بوو، لازمە زوبانی فەسیح بێ و لە قسە کردنا ترسی نەبێ. ئەسکەندەری زولقەرنەین، زۆر دەفعە تەبدیلی قیافەتی کردووە، ڕۆیشتووە بۆ جاسووسی ئەی تیژهۆش تۆ وەقتێ داخل بە مەجلیسی فیلان بوویت، موحافەزەی سوئال و جواب بکەیت، تیژهۆش وتی: ئەی پادشاه ئەگەرچی

میقداری فرستادەییم کردووە. لازمە بۆ جەنابت ڕێگەی ئەمر و قانوون بەمن نیشان بدەیت، پادشاه وتی: تا مومکینت ئەبێت قسەی هەڕەشە و ئاگراوی نەکەیت و ئاخری قسە بە نەرمی تەواو نەکەیت، تیژهۆش لە خزمەت پادشاه ڕوخسەتی خواست، ڕووی کرد بۆ لای لەشکری فیلان. وەقتێ نزیک بە فیلەکان بووەوە، ترسا فیکری کرد وتی: بەم

تاریکییە بڕۆم، لەژێر پێی فیلدا پان نەبمەوە، سەبری کرد تا ڕۆژ، وەقتێ دونیا ڕووناک بووەوە، چووە سەر بڵنداوێ بە قایم بانگی کرد وتی: من فرستادەم لە تەرەف مانگ و گوێتان نەگرن و یان نایگرن ئارەزووی خۆتانە. (وما علی الرسول إلا البلاغ) ئەوەی بەمن تەبلیغ کراوە منیش بۆتان ئەگێڕمەوە و خۆتان ئەیزانن، مانگ گەورەی ڕووناکیی شەوە، ئەگەر کەسێ خیلافی ئەمری بکا، خۆی بە کوشت ئەدا، پادشای فیلان چوو بە پیر کەروێشکەوە وتی: فەرموو بزانم ئەمرت چییە؟ تیژهۆش وتی: مانگ ئەفەرمووێت بە قووەت و گەورەیی خۆتان مەغروور مەبن و تەکەببور مەکەن، گەیشتنە بێ ئەدەبییەکی وا تەمەع بکەنە سەر چاوە کارێزی من و لەشکر و سوپاتان هێناوەتە سەر من، فکرتان چییە؟ تەیر قودرەتی نەبووە بەسەر چاوەی منا بفڕێ و جنۆکە نەیتوانیوە نزیک بەمن ببێ و ئێستا لە ڕووی خێرەوە فرستادەم بۆ لای ئێوە نارد، لازمە هەمووتان کۆچ ئەکەن و دوور ئەکەونەوە. وەئیللا کە هاتم یەکێکتان بە زیندوویەتی دەرناکەم و ئەگەر بە قسەی فرستادە باوەڕ ناکەیت، وەرە، من لەسەر کارێزەکە وەستام. پادشای فیلان لەگەڵ تیژهۆش ڕۆیشت بۆ سەرچاوەی عەینولقەممر و پادشاە تەماشای کرد سوورەتی مانگ لەناو ئاوەکە دیارە. تیژهۆش وتی: ئەی پادشاە ئەختێ ئاو هەڵگرە، ڕووی خۆت بشۆرە، سەجدە بەرە، بەڵکی مانگ قەهرت لێ ئەگرێ. فیل خەرتوومی درێژ کرد. گەیشتە ئاو، حەرەکەتی ئاو سوورەتی مانگی تێک دا، پادشاە وتی: ئەی فرستادە، بۆچی مانگ تێکچوو؟ تیژهۆش وتی: ڕقی هەڵساوە، هەتا ئەمردووی و ئەسووتاوی خۆت و لەشکرت بڕۆن. فیل بەقسەی فرستادە دەستی کرد بە پاڕانەوە، شەرتی کرد نزیک بە عەینولقەمەر نەکەون و ڕۆیشتن. تیژهۆش ئەو قسەی لە فیل بیست. ڕۆیشتەوە مژدەی بۆ پادشای خۆیان برد. ئەم میسالەم بۆیە هێنایەوە، هەموو نیشێ بە عەقڵ و تەدبیر دروست ئەبێ و ئێوەش ئەگەر عەقڵتان بوایە ناوی پادشاتان لەسەر کونەبەبوو دائەنەنا و لەشوومی و بەد ئەتواریی شارەزا ئەبوون، چونکە بۆ پادشاهان فیکر و زوڵم زۆر ناشیرینە، لەبەر ئەوە گەورەی ڕووی زەمینن، وەک ڕۆژ شوعلە بەسەر میللەتدا ئەڕێژن، مەعلوومە ڕووی ڕۆژ بە یەک پارچە هەور ئەشارڕێتەوە، زوڵم بەو ئەوعە ناوی پادشاهان گوم ئەکات. پادشاە لازمە ساحیب وەفا بێ. ئازاری بۆ میللەت ئەبێ. ئەگەر پادشاە دەستی زوڵمی درێژ کرد و لە ئازار و هەناسەی فەقیر ئەترسا، ئەوەی بەسەر دێت. بەسەر کەو و سوێسکە هات.

تەیرەکان پرسییان چۆن بووە؟

قەلەباچکە وتی: هێلانەم لە شاخێ بوو. نزیک بە هێلانەکەم کەوێک هێلانەی دروست کردبوو و بەنزیک بوونی یەک، زۆر پێ خۆشحاڵ بووین. هەموو ڕۆژ بۆ خواردن و گەڕان کەو ئەڕۆیشت ئەهاتەوە، ڕۆژێ ماوەیەکی زۆری پێ چوو نەهاتەوە وام زانی مردووە، تەماشام کرد، سوێسکەیەک چووە هێلانەی کەوەکە نیشتەوە، منیش لەبەر ئەوە بۆم مەعلووم نەبوو کەوەکە مردووە. وەیا زیندووە، مەنعی سوێسکەم بۆ نەکرا. فکرم کرد یەکێ ئەڕوات، یەکێ دێتە جێی. چەند ڕۆژێ بەو جۆرە ڕابوێرا، ڕۆژێ لەپڕ کەوەکە هاتەوە، تەماشای کرد سوێسکەیێ لە جێگەی نوستووە، بانگی کرد: ئەم جێگەیە جێگەی منە، هەڵسە بڕۆ، سوێسکە وتی: حاڵی حازر بە دەست منەوەیە و ئەگەر حەقێکت هەیە، ئیسپاتی بکە و خاقانی بنوێنە، بۆت جێ دێڵم. کەو وتی: تۆ فیکرت هەیە لێم داگیر بکەیت. بوو بە شەڕیان، منیش چووم لەیەک جیام کردنەوە و سوڵحم کردن بە قسەی من قانیع نەبوون، هەردووکیان وتیان: لازمە لە مەحکەمە ئیشی ئێمە ببڕێتەوە، کەو وتی: لەم نزیکانە. پشیلەیەک ماوەدەتێکە تەرکی دونیای کردووەو بە نوێژ و ڕۆژوو خەریکە و ناوی عیبادەتی بەو دنیادا بڵاو بووەتەوە، لەوە چاکتر نادۆزینەوە موحاکەمەمان بکا. لازمە موحاکەمەی ئێمە لای ئەو عابیدەی لەخوا ترسە بێ، قازی یەک شەرع بەڕاستی بکا ئەوە هەردووکیان ڕازی بوون، چوون بۆ موحاکەمە، منیش لە دوایانەوە چووم، تەماشای پشیلە بکەم چۆن بووە بە عابید و ئیشیان چۆن ئەبڕێتەوە. لەگەڵ کەو و سوێسکە نزیک بوونەوە، عابیدە دزۆزنە هەستایە سەرخۆی. ڕووی کردە میحراب، ئیحرامی بەست، دەستی کرد بە نوێژی دوور و درێژ، لەپاش نوێژەکە دەستی کرد بە گریان و پاڕانەوە لەخوا. کەو و سوێسکە لە نوێژ کردنی عابید و لە گریانی عەمەلەن، عاقیدەیان پەیدا کرد و سەبریان کرد تا لە نوێژ بووەوە. کەو وتی: ئەی موبارەک ئێمە هاتووینە خزمەت جەنابت. موحاکەمەمان لە ڕێگەی ڕاستەوە بەیان بفەرموویت، عابید بەدەم تەسبیحات و تەهلیلەوە وتی: قسەتان چییە؟ بەیانی بکەن. هەردووکیان ئەووەڵ و ئاخری قسەیان بۆ عابید گێڕایەوە. عابید هەناسەی هەڵکێشا وتی: ئاخ پیری، نە چاوم حوکمی ماوە، نە گوێم لە قسەکردنە. لاتان زەحمەت نەبێ بێنە پێشەوە بە قایم قسە بکەن، چونکە گوێم گرانە، تیکراری قسەتان بکەنەوە تا لە ڕێگەی ڕاستەوە حوکمتان بۆ دانێم و لەپێشەوە لازمە نەسیحەتی خێرتان بکەم. بزانن بەڕاستی قسەی خۆتان بگێڕنەوە و درۆ کردن خراپە، پیاوی درۆزن لە ڕەحمەت دوورە لە واسیتەی ماڵی دونیاوە خۆتان لە دونیا و قیامەت

بێبەش نەکەن.. کەو وتی ئەگەر کەسێ ڕێگەی ڕاست بگرێ موحتاج بە مەحکەمە نابێ و مەعلوومە جەنابت لە ڕێگەی شەرعەوە ئەمر ئەفەرموویت و ئێمە بە قسەی جەنابت قانع نەبین. الحمدلله خیانەت لەتۆ دوورە. ئومێد دەکەم هەرچی حەقە بەیان بفەرموویت، پشیلە وتی: ڕاست ئەکەیت و ئەیزانم ساحیب مەتڵەب حەقی دەست ئەکەوێت و ئەوەی خائین و درۆزنە. ئارەزووی موحاکەمە ناکات و ئەو کەسەی زوڵم لێی کراوێ. خۆی بۆ پێشەوە ئەکوتێ، ئەوانیش بەو قسەیە خەڵەتان چوونە پێش دەمی عابیدە درۆزنە، عابیدە درۆزنە هەڵمەتی دا هەر یەکەی بە چنگێ گرتن ئیفطاری ڕۆژووی هەزار ساڵەی بە گۆشتی کەو و سوێسکە کردەوە. هێنانەوەی ئەم میسالەم لەبەر ئەوەیە ئێوەش موراجەعەت بە پیاوی بەد ئەتوار مەکەن، ئەوەی من گێڕامەوە وەک یەک قەترە وایە لە بەحر هەڵگیرێ، ئامان، دەخیل خەیاڵی ئەوە نەکەن کونەبەبووی شووم بە پادشای خۆتان قبووڵ بکەن و لەسەر تەختی مەڵتەنەت حوکمداری بکا و تاجی پادشاهی لەسەر کات. ئەگەر نەفسی پیسی کونەبەبوو بزانیت. ئەکرێ بە پادشاه پەڕی هەمووتان بە ئاگری غەزەب ئەسووتێنێ، تەیرەکان بە قسەی قەلەباچکەکە ڕوویان لە کونەبەبووی شووم وەرگێڕا، کونەبەبوو نائومێد بوو، ڕووی کردە قەلەباچکەکە، وتی: ئەی ڕوو ڕەشی بێ شەرم، حەیات نەکرد. منت بێ حورمەت کرد. بەجۆرێ دوشمنایەتیت کرد بەسەد قەرن نەبڕێتەوە، ئاگری فیتنەیەکت داگیرسان بە ئاوی هەموو بەحر ناکوژێتەوە، نازانم بە چە دوشمنایەتییەک ئەم قسانەت دەرحەق من کرد و بۆت مەعلووم بێ، دارێک لەبن ببڕن، یەک لقی مابێ ئەبێتەوە بەدار، ئەمما بە ئەوعێ تۆ ڕەگی ڕووحی منت بڕی هەتا ڕۆژی حەشر چاک نابێتەوە. هەر وەک وتوویانە: بڕینی شیر و تیر چاک ئەبێتەوە، بڕینی زوبان بەڕاستی چاک بوونەوەی نییە، تیرێ لە دڵ کار بکا. دەرهێنانی گرانە، گڕی ئاگرێ گڵپە بسێنێ بە ئاو ئەکوژێتەوە و ئەگەر بە زوبان گڕ بگرێ ناکوژێتەوە و ئەم دوشمنایەتییە، بۆ ئاوجنسی هەردووکمان بوو بە ئیرس، ئەوەی وت و لە شەوقەی باڵی داو فڕی. قەلەباچکە بە تەنها مایەوە، پەشیمان بووەوە فیکری کردەوە. وتی: ئەمە قسە نەبوو من کردم و لە تائیفەی تەیران عاقڵتر نەبووم و شوومیی کونەبەبوو لە هەموو تەیران مەعلوومە و لەمنیان چاکتر ئەزانی و لە قسەی عاقڵان دەرچووم، فەرموویانە تەدبیر لە قسە بکرێ. ئینجا کردنی باشە و قسە زۆر کردن فیتنە دائەگیرسێنێ. قەلەباچکە زۆر پەشیمان بووەوە، فڕی ڕۆیشت و ئەی پادشاه، دوشمنایەتیی ئێمە و کونەبەبوو ئەوەیە عەرزم کردی، پادشاه وتی ئەی کارشناس، ئەوەی ڕاست بوو گێڕاتەوە و تێگەیشتم و لازمە چاری ئەم فەقیر و مەزڵوومانە بکرێت،

تەدبیر چییە، بەیان بفەرموو و حەق سەندنمان لە کونەبەبوو چۆن مومکین ئەبێ. کارشناس وتی: ئەی پادشا، ئەوەی وزەرا وتیان، وەک فیراری و یا سولح و یا شەڕ و خەرج هیچیان بە تەدبیر نازانم، فیکرم هەیە بە حیلە نەجاتی خۆمان بدەین. زۆر کەس بە حیلە خۆیان لە دەست بەلای گەورە نەجات داوەو زۆر تەسادوف نەکات. ئیش کردنی بە زۆر مومکین نەبووە، بەحیلە ڕێکیان خستووە، هەر وەک دزەکان، بە فێڵ و مەکر. مەڕەکەیان لە دەست عابید وەرگرت، پادشاه پرسی چۆن بووە.

حیکایەت

کارشناس وتی: ئەگێڕنەوە عابیدێ بوو مەڕێکی بۆ قوربانی کڕی، ملی مەڕەکەی گرت، ڕۆیشتەوە بۆ جێگەی خۆی، لەڕێگە تووشی، دزانی شارەکە بوو دزەکان نەیانتوانی بە زۆر مەڕەکە لە عابید وەرگرن. ئەمما فکریان کرد، وەک ڕێوی بە مەکر و حیلە خەوی کەروێشکی لە عابید بخەن. دەستیان کرد بە تەدبیر و بە فێڵ عابیدی دڵ ساف بخەڵەتێنن، ئەووەڵ دزیان چووە پێش دەمی عابید، وتی: یا شێخ ئەو سەگە بۆ کوێ ئەبەیت؟ دووەم دزیان وتی: یا شێخ ئەو سەگەت لە کوێ بوو؟ سێهەم دزیان وتی: مومکینە شێخ فیکری ڕاوی کردبێ، یەکێکیان وتی: ئەو سەگە سەگی شوانە، یەکێکیان وتی: ئەو قسانە مەکەن، عابید ئەو سەگە ئەبات لەبەر خوا نانی ئەداتێ، یەکێکیان وتی: ئەگەر عابیدە، بۆچی دەستی خۆی پیس ئەکات؟ نیهایەت ئەو قومارباازانە بەو جۆرە و قسەو فێڵە، دڵی عابیدەکەیان لەمە گۆڕی، فیکری خراپ کرد. وتی مومکینە ئەو کەسەی ئەم حەیوانەی بە من فرۆشتووە، ساحر بێ و چەشم بەندی کردبێ و ئەم سەگەی لەمن کردووە بە مەڕ، چاک وایە بەرەڵای بکەم و بگەڕێمەوە سەر ساحێب مەڕەکە، پارەکەی لێ بسێنمەوە، عابیدی دڵ ساف مەڕەکەی بەرەڵا کرد، گەڕایەوە بۆ لای ساحیب مەڕ و دزەکان مەڕەکەیان برد و سەریان بڕی خواردیان. کارشناس وتی: ئەی پادشاه، بۆیە ئەم میسالەم هێنایەوە، ئێمەش لازمە بە فێڵ حەقی خۆمان لە کونەبەبوو وەرگرین، چونکە ناتوانین موقابەلەیان بکەین، نیوەمان بەچنگ دوشمنەوە مرد و کوژرا، مەلیک پیرۆز وتی: ئەی کارشناس، هەرچی ئەزانی بەیان بفەرموو، کارشناس وتی: ئەی پادشاه من ئەبم بە فیدایی و خۆم فیدای میللەتی خۆم ئەکەم. تەدبیر ئەوەیە جەنابت کە چوویتە مەجلیس، ڕوو لە من وەربگێڕی، ئەمە بکەیت، پەڕو باڵم هەڵکێشن، سەر و چاوم خوێناوی بکەن و لەژێر ئەو دارە کە هێلانەی خۆمە دامنێن و جەنابت لەگەڵ هەموو لەشکر ئێرە جێ بێڵن و

بڕۆن، بۆ دارستانی فلان جێگە و سەبر بکەن تا من نیشی خۆم دروست ئەکەم و دێمەوە بۆ خزمەت جەنابت پادشا لە خەڵوەت چووە دەرەوە، ڕووی خۆی گرژ کرد و بە عاجزی ڕووی کردەوە مەجلیس و حازرانی مەجلیس چاوەڕوانی ئەوە بوون بزانن کارشناس و مەلیک پیرۆز تەدبیریان چۆن بووە، لەگەڵ پیرۆز داخڵ بە مەجلیس بوو، تەماشایان کرد، ڕووی گرژ و ڕقاوییە، کەسیان قودرەتی سوئاڵ کردنیان نەبوو، پیرۆز ئەمری کرد. پەڕو باڵی کارشناس لەبن دەربێنن. سەر و کلکی بە خوێن ڕەنگ بکەن، فڕێی دەنە بن دارەکە، بەو جۆرە پەڕو باڵی کارشناس دەرهات و بە ئەمری پیرۆز هەموو لەشکر ڕوویان کرد بۆ ئەو دارستانەی مەعلووم کرابوو، هەتا ئەو تەدبیرە تەواو بوو ڕۆژ ئاوا بوو، ئەمما لای لەشکری کونەبەبوو بەئەمری پادشا کە ناوی هۆشەنگ بوو مەجلیس گیرا، وتیان مەعلووم کرا جێگەی دوشمنان و نیوەیان کوژراو بریندار بوون. ئەگەر ئەم جارە شەبەیخوونی بەسەریانا بدەین، بە ئارەزووی خۆمان حەقمان دەست ئەکەوێ، بەو فیکرەوە هجوومیان کردە جێگەی قەلەباچکەکان تەماشایان کرد دارستانەکە چۆڵ بووە و بە گەڕان خەریک بوون. یەکێکیان گرتی لە دەنگی کارشناس بوو ئەیناڵان، چوو خەبەری برد بۆ هۆشەنگ شاە، هۆشەنگ لەگەڵ میقدارێ مەئموورانی چووە لای کارشناس، وتیان خەڵقی کوێیت و چی ئەکەیت لەبن ئەم دارە؟. جوابی دایەوە وتی: بەندە ناوم کارشناسە، وەزیری مەلیک پیرۆز، هۆشەنگ وتی: ناوی تۆم بیستووە، ئێستا بۆمان بگێڕەوە لەشکری ئێوە ڕووی کردە کوێ؟ کارشناس وتی: ئەحواڵم ببینە، شاهیدی خەبەرانە و من نازانم بۆ چە جێگە ڕوویان کردووە، هۆشەنگ وتی: تۆ وەزیری پادشاە بوویت، ئەمین و زیرەکیی تۆ مەشهوور بوو لەبەر چە خیانەتێ وایان لە تۆ کردووە و من لە ئەحواڵی تۆ زۆر تەحەییور ماوم. کارشناس وتی: ئەی مەلیک پیرۆز دڵی لەمن خراپ کردو حەسوودان یارمەتی قسەیان دا. ئەمەی بەسەر من هێنا، هۆشەنگ وتی: بۆچی دڵی خراپ کرد و گوناهت چی بوو؟ کارشناس وتی: لەپاش شەبەیخوون دانی ئێوە، پیرۆز ئێمەی گرد کردەوە بۆ تەدبیر کردن، هەریەکەمان بە جۆرێ تەدبیرمان کرد، ئاخیری تەدبیر من وتم: چاک وایە ئیشێ سەهل بێت بیکەین. وتیان: چییە؟ وتم: مەعلوومە ئیقتیداری شەڕ کردنمان نییە. لەبەر ئەوە قووەت و حوکمی لەشکری هۆشەنگ شاە لە ئێمە زیاترە و خوسووس پادشای هەموو تەیرانە و لازمە ئێمەیش بە پادشای خۆمانی قبووڵ بکەین. دەخالەت بە قودوومی هۆشەنگ شاە بکەین لە ژێر حیمایەی موبارەکیا ژیانمان دەست ئەکەوێ و هەر جۆرێ خەراج قبووڵ بکەن. ساڵ بە ساڵ پێشکەشی قودوومی شاە بکرێت. مەلیک پیرۆز ڕقی

هەڵسا وتی: ئەوە چە قسەیەکە من
لە لەشکری کونەبەبوو ئەترسێن و
قسەیەک بێ مەعنا بێ، تەنسیر لە
دڵ ناکات و هەتا زیندوو بم دەست
لەم مەسەلە هەڵناگرم، یا خۆم
مەحو ئەکەمەوەو یا دەمار لە
کونەبەبوو دەردێنم، من تکرار وتم:
ئەی مەلیک پیرۆز، ڕجا ئەکەم
لەسەر ئەم فیکرە لاچۆ و هەر کەس
بە ئارەزووی ئەفس دەست بۆ ئیش
درێژ کات، زوو پەشیمان
ئەبێتەوە، مەعلوومە ڕەشەبا زەرەر
بە گیای خەفیف ناگەیەنێ. ئەمما
سپی چنار لە ڕەگو ڕیشە
دەرئەکێشێ، ئەی مەلیک پیرۆز
مەسڵەحەت ئەوەیە کەسێ ڕەوانەی
خزمەتی هۆشەنگ شاە بکەیت،
بزانیت خەراج و هەر جۆرە
تەکالیفاتێ قبووڵ ئەکەن. تۆیش
قبوولی بکەیت و ئەگەر بێتو ئێمە
شەڕ بکەین. ئەو مەقدارەی بە
ساغ ماوە ئەویش ئەکوژرێت و لە تەدبیری من وەزیران ڕقیان هەڵسا ڕوویان کردە مەلیک
پیرۆز، وتیان کارشناس خائینە، ئارەزووی بەرزبوونەوەی دوشمن ئەکات، قەراریان دا
پەڕو باڵیان هەڵکێشام و بەم جۆرە دەردە مویتەلا بووم، ئەمما وا ئەزانم قسەکری
ڕێکخستنی ئەسبابی شەڕ ئەکەن، هۆشەنگ ڕووی کردە وەزیرێکی ناوی شەباهەنگ بوو،
وتی ئەی شەباهەنگ، تەماشای ئەحواڵی کارشناس چۆن ئەکەیت؟ شەهابەنگ وتی: ئەی
پادشاە هەتا زووە، دونیا لە پیسی ئەو حەرامزادەیە خاڵی بکرێ درەنگە، چونکە
تەماشای ڕوو ڕەشیی ئەکەم، شوعلەی ئاگری فیتنە لەژێر چاویا دیارە، کوشتنی فرسەتە،

ئەمانی ئەو حەرامزادەیە واسیتەی ڕەحەتیی ئێمەیە، عاقڵان فەرموویانە، هەر کەس ڕەحمی بە زەلیلیی دوشمن کرد و بە پاڕانەوەی باوەڕی کرد پەشیمانیی لە هەمووی خراپتر نەبێ، ڕجا ئەکەم ئەمر بفەرموو بە ئارەزووی خۆم ئازاری بدەم، کارشناس گوێی لەو قسانە بوو، ناڵانی ، وتی: جگەر و دڵم بەیەکەوە ڕزیوە، تۆیش بیکوڵێنەرەوە، هۆشەنگ شاە بە زەیی پیا هاتەوە، ڕووی کردە وەزیرێکی کە، وتی: تۆ فیکرت چییە؟ وەزیر وتی: من بە چاک نازانم دوشمنی زەلیل بکوژرێت. ڕەحم و ئینساف ڕێگەی عاقڵانە، چونکە پادشاهان هەرچەند لە دوشمن بگرن، خزمەتی ئەکەن و ناوی ئەنێن-دیل- و ناگەهداریی ئەم دیلە بە چاک ئەزانم، چونکە گەڵێ ئیش، دوشمن خۆشەویست ئەکات. هەروەک ژنە بازرگانەکە لە ترسی دز مێردەکەی لا خۆشەویست بوو.

هۆشەنگ پرسی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

وەزیر وتی: ئەگێڕنەوە بازرگانێ بوو زۆر ساحێب پارە بوو. ئەمما ناشیرینی، موقابیل بە جوانیی یووسف بوو، سەرەڕای ناشیرینی، پیر و ڕووگرژ بوو و هەر کەس بەخەو چاوی پێ بکەوتایە نەخۆش ئەکەوت. بۆگەنیی دەمی زۆر ناخۆش بوو و ژنێکی جوانی بوو، ڕووی وەک مانگی چواردە شوعلەی ئەداو هەر کەس چاوی بەو حۆرییە بکەوتایە بێ هۆش ئەبوو. ئەگەر بەیانی جوانیی ژنەکە بکرێ کتێبەکە تەواو ئەبێ و ژنەکە زۆر ڕەشید و ئازا بوو، سیحری هارووت و ماڕووت لەو کاری نەئەکرد و ئارەزووی مێردەکەی نەئەکرد، چونکە دێو سفەت بوو، تەسادوف شەوێ دز چووە ماڵی بازرگان، ژنەکە بەخەبەر بوو، بازرگان نوستبوو، ژنەکە لە ترسی دزەکە باوەشی کرد بە مێردەکەیا، بازرگان خەبەری بووەوە تەماشای کرد ژنەکەی دەستی کردووتە گەردنی، لە خۆشیا وەک ورچ بۆڕانی، وتی: خودایە ئەمە بە خەوە و یا ئاشکرایە؟ دەستم لە گەردنی حۆری دایە، مومکینە بەختم خەبەری بووەتەوە، خوایە تا سەر بێ، لەگەڵ تەماشای کرد، دز لەناو ماڵەکەدا ئەگەڕێت، بانگی کرد، ئەی قەدەم موبارەک، هەرچەنە ئارەزوو ئەکەیت لە ماڵی من ببە، گەردنت ئازا بێ، چونکە واسیتەی موبارەکی قودوومت ڕووح هاتەوە بەدەنما، موددەتێکە لە ڕووی مەحبووبەم بێ بەش بووم، لە ترس و خۆفی تۆ ئاشت بووەوە لەگەڵ من و هەرچەند ئارەزوو ئەکەیت حەقی خۆتە، من لام گران نییە، مەمنوون بووم، وەزیر وتی، هێنانەوەی ئەم میساڵە لەبەر ئەوە بوو، دروست بوونی گەڵێ ئیش لە واسیتەی تووش بوونی دوشمنەوە

مومکین نەبێ و ڕێگەی مەقسەد دەست نەکەوێت، ڕەحم کردن بە حاڵی کارشناس ڕێگەی چاکەیە، هۆشەنگ ڕووی کردە وەزیری سێهەم وتی: تۆ تەدبیرت چییە؟ وەزیر چووە پێشەوە، ڕەسمی خزمەتی بەجێ هێنا، وتی: ئەی پادشاە، کوشتنی کارشناس چاک نییە، چاک وایە خەڵات بکرێت و خزمەتی زۆر بکرێت و هەتا پادشاهی و گەورەیی تۆ مەعلووم بکات، حقووقی جەنابت بزانێ و ڕێگەی نەسیحەت گوم نەکات. سیاسەت وا لازمە سەعی بکەیت بۆ ژیانی، چونکە عاقڵان زۆر سەعییان کردووە، تایەفەیەک لە دوشمن جیا بکەنەوە، بۆ خوسووسی تەفرەقە کردنیان، ئەیانکەن بەگژ یەکا و ئیسراحەت دەست خۆیان... زۆر بینراوە لە واسیتەی دوو دوشمن ئیسراحەت بۆ ساحیب مەتڵەب پەیدا بووە، هەر وەک عابید لە هیلاکەتیی دز و دێو نەجاتی بوو، هۆشنگ پرسی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

لە ئەتراف بەغداد، عابیدێ بوو، شەو و ڕۆژ بە عیبادەت خەریک بوو. یەکێ لە دەروێشانی، گامێشێکی بۆ عابید بەدیاری برد، لەبەر ئەوە بە ماست و شیری ئیدارە بکات. دزێ لەو ئەحواڵە خەبەردار بوو، نزیک بە جێگەی عابید بوەوە، بۆ وەقتی فرسەت ئەگەڕا، تەسادوف دێوێ خۆی بردبووە سووڕەتی بەنی ئادەم، لە ڕێگە تووشی دزەکە بوو، هەردووکیان بوون بە ڕەفیق، سوئالیان لەیەک کرد. دزەکە ڕووی کردە دێو، وتی: تۆ چیت و فیکری چیت کردووە، جوابی دایە وتی: من دێوم، فیکرم کردووە ئەو عابیدە بکوژم و چەند کەسانێ لەسەر ڕێگەی ئێمە بوون، عابید لایداون. فیکرم وایە ئیمشەو نەجاتی قەتع بکەم. ئەی تۆ چیت و فیکری چیت کردووە؟ کابرا جوابی دایەوە وتی: من ئیشم شەو و ڕۆژ هەر دزییە. دڵی چەند کەسانێکم بریندار کردووە و فیکرم هەیە دڵی عابید بسووتێنم و گامێشەکەی بدزم، دێو وتی: هەردووکمان یەک ڕێگەمان گرتووەو فەسادیی هەردووکمان یەکە. لەگەڵ نزیک بە جێگەی عابید بوونەوە، تازە عابید لە نوێژ بووبووەوە و لەسەر جێگە خەوی لێ کەوتبوو، دزەکە فیکری کرد، وتی: ئەگەر ئەو شەیتانە قەسدی کوشتنی بکات خەلق ئەزانن و من گامێشەکەم بۆ نادزرێ. دێو، فیکری کرد، ئەگەر دزەکە گامێشەکە بدزێ، دەرگا ئەکاتەوە، عابید خەبەری ئەبێتەوە، کوشتنی بۆم مومکین نابێ، دێو، ڕووی کردە دزەکە وتی: سەبر کە هەتا من لە کوشتنی عابید ئەبمەوە، لە پاشا تۆ گامێشەکە بەرە، دزەکە وتی: تۆ سەبر کە هەتا من گامێشەکە ئەدزم، لەو قسە کردنەدا بوون، بوو بە هەرایان، دزەکە بانگی کرد، ئەی عابید ئەم دێوە هاتووە تۆ

بکوژێت، ئەویش هاواری کرد، ئەی عابید، ئەم دزە هاتووە گامێشەکەت بدزێ، عابید خەبەری بووەوە، بانگی دراوسێیەکانی کرد. دزو دێو لە ترسا هەر یەکە بۆ جێگەیەک رایان کرد، رووح و ماڵی عابید بە سەلامەتی نەجاتی بوو. لەگەڵ وەزیر لە قسە بوونەوە، وەزیری ئەووەڵ وتی: من ئەزانم ئەو قەلە روو رەشە بەد ئەتوارە، رێگە لە ئێوە گوم ئەکات. ئاخری بە فیتنە و زوبان لووسییەتی، پەرو باڵتان ئەسووتێنێ، رجا دەکەم لە خەوی غەفڵەت خەبەر بینەوە، عەداوەتی قەدیم لە فیکر خۆتان مەبەنەوە. مورووە کەرانە بە دور مەزانن. گەوهەری شاهوار و پارچە شووشە. لای ئێوە، وەک یەکە، حاڵی ئێوە وەک حاڵی دارتاشەکە وایە، بە مەکری ژنە سۆزانییەکەی هەڵخەڵەتا. هۆشەنگ پرسی چۆن بووە؟

حیکایەت

شەباهەنگ وتی: ئەگێرنەوە لە شاری سەرەندیب پیاوێکی دارتاش بوو، زۆر کەم عەقڵ و هیچ نەزان بوو. ژنێکی بوو لە جوانیا بێ ئەمسال بوو، کابرای دارتاش ژنەکەی زۆر خۆش ئەویست، سەعاتێ دووریی لە ژنەکەی بۆ مومکین نەئەبوو. قووەتی سەفەر کردنی نەبوو لەبەر خۆشەویستی ژنەکەی، ژنەکە بە سوورەتی ئاشکرا مەجبووری دارتاش بوو، ئەمما لەژێرەوە کەیف و بەزمی لەگەڵ بێگانە ئەکرد، کوڕێکی تازە پێگەیشتووی جوان، دراوسێی دارتاش کوڕەکە لەگەڵ ژنی دارتاش دەستیان تێکەڵ کرد، شەو و ڕۆژ لە کەیف و عیشرەتدا بوون. چەند کەسانێ لەو مەسئەلە خەبەردار بوون، قسەیان بۆ دارتاش کرد، دارتاش کەم غیرەت بوو، زۆر و لێدانی بەسەر ژنەکەدا نەبوو، وتی: هەتا بە چاوی خۆم نەیبینم باوەڕ ناکەم. ڕۆیشتە ماڵەوە، وتی: ئارامی جانم، فیکرم هەیە بچم بۆ سەفەر و لە فیراقی تۆ، قووەتی ڕۆیشتنم نییە، ژنەکە گریانی عەمەلی هێنایە خۆی و چەند فرمێسکێکی درۆی لە چاو هێنایە خوارەوە، وتی: من مەراقم سەد قات لەتۆ خراپترم. چەند ڕۆژ لە دووریی تۆ ئەمێنم، دارتاش وتی سێ ڕۆژم پێ ئەچێت ژنەکە هەڵسا توێشووی ڕێگەی بۆ دانا، دارتاش وتی: وا من ئەڕۆم و چەند نەسیحەتێک ئەکەم لە فیکرت نەچێت، ئەووەڵ، دەرگا لە بێگانە نەکەیتەوە و موحافەزەی ماڵەکەت لە دز و درۆزن بکەیت و هات و چۆی دراوسێ مەکە تا خۆم دێمەوە. ئەوەی وت و دوعا خوازیی لە ژنە کردو ڕۆیشت، وەقتی مەغریب ژنەکە جوابی بۆ دۆستەکەی نارد، باغ بەرەڵلا بوو. پەرژین و دڕک نەما. دارتاش ڕۆیشتووە، ئیمشەو فرسەتی کەیف و زەوقە. دۆستەکەی

جوابی بۆ نارد، سەعات یەکی شەو ئاودێریی باغەکە ئەکەم، ژنەکە دڵخۆش بوو، خۆی بۆن خۆش کرد، نوێنی نوستنی لەسەر کورسی ڕاخست، لە سەعات یەک دۆستەکەی چووە لای. دارتاش لە ڕێگەیەکی کەوە، داخلی ماڵەوە بوو، وەقتێ چووە ژوورەوە، ژنەکەی لەگەڵ دۆستەکەی، وەک مار تێکئالا بوون، خەریکی ئیشی خۆیان بوون، دارتاش بێ دەنگ بوو، تا هەر دووکیان خەویان لێ کەوت، وردە وردە چووە ژێر کورسییەکەوە. ئارەزووی ئەکرد، تیغ لە کالانا بە چاو ببینێت، ژنەکە چاوی بە دارتاش کەوت، بۆی مەعلووم بوو نەڕۆیشتووە بۆ سەفەر، لەبەر تەحقیقاتی ژنەکە سەفەری کردووە بە بەهانە. ژنەکە سەری بردە بن گوێی دۆستەکەی. دەستی گوشی. خەبەری کردەوە، لە مەسئەلەی دارتاشی حالی کرد، ژنەکە وتی بە دۆستەکەی ، بەدەنگی بەرز سوئال لە من بکە، مێردەکەت و من، کامان خۆشەویستین، دۆستەکەی بەو جۆرە سوئالی کرد، ژنەکە وتی: ڕاستی قسە ئەوەیە، ژنان کەم عەقڵن، بەسەهو لەگەڵ هەموو دراوسێیەک ئاشنایەتی و گاڵتە ئەکەن، ئەوە بۆ ڕابواردنە، ئەمما بۆ ئیشی ژن و مێردی، لەگەڵ مێردی خۆیان زیاتر، ئارەزووی کەس ناکەن، ژن بەدەنە، مێرد ڕووحە، ژن چاوە، مێرد بیلبیلەی چاوە، بەدەنی بێ ڕووح چاوی بێ بیلبیلە بەکاری چی دێت، هەزار ڕووحم بێ ئەیکەم بە قوربانی ئەو خوڵە مێردەکەم پێی پیا ئەنێ و ئەم قسەیە جارێکی کە بکەیت خوشک و برایەتیمان لەیەک حەرام ئەبێت. دارتاش کە گوێی لەو قسەیە بوو پەشیمان بووەوە، خۆشەویستیی ژنەکەی لا زیاد بوو. فیکری کرد وتی: خراپم کرد بە قسەی خەڵق دڵم لە ژنەکەم گۆڕی، چاک وایە خۆم ئاشکرا نەکەم و ژنەکە لای بێگانە خەجاڵەت نەکەم. بێ دەنگ بوو هەناسەی لە خۆی بڕی لەژێر کورسییەکە خەوی لێ کەوت، لەگەڵ دونیا ڕووناک بووەوە، دوستی ژنەکە وردە وردە لە کورسی چووە خوارەوە، ڕۆیشت و ژنەکە خۆی کرد بە نوستوو، دارتاش خەبەری بووەوە، بە هێواشی چووە سەر کورسییەکە، ژنەکەی خەبەر کردەوە، ژنەکە بەدرۆ چاوی گوڵۆفت، وتی: بەخێر بێیتەوە، تەشریفت کەی گەیشتە ماڵەوە، دارتاش وتی: ئەو وەقتە دەستت لە ملی کابرا کردبوو، بۆم مەعلووم کرا لە خراپە دوور بوون، خۆم ئاشکرا نەکرد هەتا لە کەیف کردن نەکەون و لەمەو پێش بەقسەی خەڵق دڵم لە تۆ خراپ کردبوو، ئارەزووم کرد بەچاو ببینم، (الحمدلله) دامێن پاکیتیی تۆم بۆ ئاشکرا بوو و گەردنم ئازا کە، ژنەکە دەستی کردە ملی دارتاش، وتی: ڕووحەکەم، زۆر لە تۆ ڕازیم و تۆیش لە من ڕازی بە، فیکرت دەرحەق من مەگۆڕە، دارتاش وتی: تۆبە، هەتا ڕووحم لە دونیا باقی بێت. دڵی تۆ نەشکێنم، بەو جۆرە دارتاش بە قسەی ژنەکەی خەڵەتا.

شەباهەنگ وتی: بۆیە ئەم میسالەم بۆ گێڕانەوە، ئێوەش بەقسەی ئەو قەلە ڕوو ڕەشە. وەک دارتاش نەخەڵەتێن. زۆر واقیع بووە دوشمن لە ڕێگەی دۆستایەتییەوە، زەفەریان بردووە و ڕێگەی دووریان بەحیلە نزیک کردووەتەوە و ئاگری فیتنەیان هەڵگیرسانووە، کارشناس وتی: ئەی وەزیر هەڵبەستنی قسە و دڵ ئازاردانی خۆتان پووچ ئەکەن، ئەحواڵی من شاهیدی قسەکردنمە، مەعلوومە کەس بەئارەزوو خۆی بەم جۆرە خۆی تووشی دەردی بێ دەرمان نەکردووە، کەس بۆ ڕەحەتی بێگانە خۆی نزیک بە ئەژدیها نەکردووە. مەعلوومە لە واسیتەی ڕێک نەکەوتنەوە تووشی ئەم دەردە هاتووم. شەباهەنگ وتی: بەچاوتا دیارە، ئارەزوو ئەکەیت بە زوبانی شیرین، تاڵاو بکەیت بەقوڕگمانا، زۆر کەس بوون بۆ مردنی دوشمن، ڕووحی خۆیان فیدا کردووە، لەبەر ئەوە ناوی چاکە گوم نەکەن، بوون بەفیدائی قەومەکەیان، هەروەک مەیموونەکە، بۆ ئیسراحەتی قەومەکەی خۆی بەکوشت دا، هۆشەنگ پرسی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

شەباهەنگ وتی: ئەگێڕنەوە، میقدارێ مەیموون، لە جەزیرەیەک بە میوە و گیا ئەژیان، هەردووان و سێیان لەژێر دارێ، بەکەیف کردن خەریک بوون، تەسادوف یەک ورچ ڕێگەی کەوتە ئەو جەزیرەیە تەماشای مەیموونەکانی کرد، بەخاڵەتی پێ بردن، فیکری کرد، وتی: قابیلە ئەو مەیموونانە بەو جۆرە کەیف بکەن و ئێمە دەنکە دەنکە گیامان دەست نەکەوێت. لەپاش فیکر کردن، ڕووی کردە ناو مەیموونەکان و لەگەڵ مەیموونەکان بوو بەشەڕ و چەند مەیموونێکی بریندار کرد، ئاخری هجوومیان کردە سەر ورچ، بریندار و نیوە مردوویان کرد. ورچ بە برینداری و نائومێدی گەڕایەوە، دەستی کرد بە بۆڕەبۆڕ، میقدارێ ورچ کۆ بوونەوە، سوئالیان کرد، بۆچی بریندار بوویت، بۆمان بگێڕەوە، بە دەست چە قەومێ وا بریندار کراویت، ورچ خەبەراتی مەیموونەکانی بۆ ورچەکان گێڕایەوە، وتی: باعیس بێ ناموسییە، بۆ ناوجنسی من، لەمەو پێش مەیموون جورئەتیان بەسەر ئێمەدا نەبووە، دائیمەن بەدەست ئێمەوە زەلیل بوون و ئەگەر بێت و ئەم حەقە نەسێنین. ناوی بێ غیرەتی ئێمە بە تەئریخ ئەگێڕنەوە، چاک وایە، شەبەیخوون بدەین بەسەریانا، حەقی خۆمان بەتەواوی دەستکەوێت، ورچەکان، دەماری غرووریان کەوتە بزووتن. زوبانیان بەلاف و گەزاف درێژ کرد، وتیان: دوشمنی ئێمە مێروولەیە و ئێمە ئەژدەیهاین و لە دەست ئێمە یەکێکیان، دەرناچێ، هەموو قەراریان دا، شەو هجووم کەنە سەر مەیموونەکان، لەگەڵ

ڕۆژئاوا بوو. دەنگی بگرە بکوژ. شاخەکەتی داگیرکرد. مەیموونەکان قسمێکیان چوو بوون بۆ ڕاو و قسمێکیان، چووبوون بۆ ئیش، لە تەدبیری ورچ خەبەردار نەبوون، وەختێ بەخۆیان زانی، لەشکری ورچ ڕژایە ناویانەوە. بوو بەشەڕیان، چەند مەیموون بریندار بوون، باقی مەیموونەکان فیراریان کرد. ورچەکان تەماشایان کرد جەزیرەیەکی ساحێب میوەیە، کردیان بەجێگەی خۆیان و زەخیرەیەک مەیموونەکان دایاننابوو زەوتیان کرد، ورچە برینداراوەکەیان کرد بە پادشای خۆیان. بۆ ڕۆژی دوایی، پادشای مەیموونەکان لە سەفەر هاتەوە، ڕووی کرد بۆ جەزیرەکە، لەڕێگە تووشی چەند برینداری بوو، پرسی: بۆچ بریندار کراون، وتیان لەشکری ورچ هجوومی کردە سەرمان. جەزیرەکەیان داگیرکرد. پادشاە ئەموستی حەسرەتی بەدەم گرت. وتی: حەیف، زەخیرەیەک بۆ ژیانمان دانرابوو لە دەستمان چوو. باقی مەیموونەکان بۆ ماڵ و مناڵ دەستیان کرد بەگریان. یەکێ لەناو مەیموونەکان ناوی موبارەک بوو، لە فیکر و سیاسەتدا بێ ئەمسال بوو. تەماشای کرد پادشاە زۆر عاجزە و مەیموونەکان بەگریان خەریکن. چووە پێش دەمی پادشاە، زوبانی بە نەسیحەت کردەوە وتی: گریان و هاوار بەکار نایەت. پەشیمان بوونەوەی لەدوا دێت، چونکە دۆست عاجز نەکا و دوشمن دڵخۆش نەکات و لەسەر ئەم بەڵایە سەبر لازمە، سەبرکردن کلیلی دەرگای نەجاتە، ئیشی گران بەتەدبیر سەهل نەکرێ، تەدبیر لە گریان چاکترە، پادشاە قسەی موبارەکی لا جوان بوو. وتی: تەدبیر چییە؟ موبارەک وتی: تەدبیرێ بە سەرێ لازمە. پادشاە و موبارەک چوونە جێگەیە، هەردووکیان بە قسەکردن خەریک بوون، موبارەک وتی: فیکرم کردەوە، ڕووحی خۆم بکەم بەفیدای قەوم، ژیانی نامەردی بەکار نایەت. مەعلوومە ئێمە هەمووەمان لە وەتەن تەریک بووین و قووەتمان نییە موقابەلەی ورچ بکەین. بە فێڵ نەبێت حەقمان دەست ناکەوێت، فیکرم وایە، ڕووحی خۆم بکەم بەفیدای قەومەکەمان. پادشاە وتی: ئەی موبارەک کە تۆ نەبێت ژیانی ئێمە بەکاری چی دێت، موبارەک وتی: نەبوونم لە ژیانم چاکترە، چونکە ماڵ و مناڵم سکی بەدەست دوشمنەوە هەڵدراوە، ژیانم لەپاش خۆشەویستانم زەهری مارە، ئارەزوو ئەکەم حقووقی نیعمەتی جەنابت و خوێنی خۆشەویستانم لە دوشمنی غەددار بسێنم و دڵی ئەو کەسانەی کەس و کاریان کوژراوە دامرێتەوە، وەسیەتی من ئەوەیە، پادشاە بۆ مردنی من عاجز نەبێ. لەگەڵ کەوتنە ئیسراحەت لەناو ئومەرا ناوم نەکوژێتەوە پادشاە پرسی، تەدبیرەکەت چییە؟ موبارەک وتی: فیکرم کردەوە. لە دەشتێ بێ ڕێ، لەشکری ورچ بەهیلاکەت بەرم و جەنابت تا سێ ڕۆژ لەم ئەترافە سەبر بکەیت و من کاری خۆم دروست ئەکەم و ئێستاکە

ڕۆیشتیتەوە مەجلیس ئەمە بفەرموویت. پێست و گۆشتم بە دان برینداربکەن و دەستم بشکێنن و بمبەن لە ئەتراف جەزیرەکە فڕێم دەن. بەموددەی سێ ڕۆژ ورچەکان لەناو ئەبەم و جەنابت بە وەتەن شاد ئەبیتەوە، پادشا و موبارەک لە تەدبیر بوونەوە، پادشاە ڕۆیشتەوە لای مەیموونەکان، ئەمری کرد، لازمە موبارەک بە برینداری و نیوە ڕووح بەرنە نزیک جەزیرەکە و بگەڕێنەوە. لەسەر ئەمری پادشاە گۆشت و پێستی موبارەکمان بە دان هەڵپچڕی، بردیان لە قەراغ جەزیرەکە دایاننا و گەڕانەوە، پادشاە و مەیموونەکان، ڕۆژێ ڕێگە جەزیرەکەیان جێ هێشت، موبارەک بەگریان و هاوار کردن، دەنگی گەیشتە لای ورچەکان. پادشاهی ورچەکان بەدەنگی گریانەوە ڕۆیشت، تەماشای کرد، مەیموونێکە، هەموو بەدەنی بریندار و دەستی شکاوە، پادشاە بەزەیی بەحاڵیا هات. پرسی، بۆچی ئەوەت بەسەر هاتووە؟ کێ زوڵمی لێ کردوویت حەقت بسێنم؟ موبارەک بەعەقڵ بۆی مەعلووم بوو پادشای ورچەکانە، وتی: ئەی پادشاە، من وەزیری پادشای مەیموونەکانم، وەقتێ ئێوە هوجوومتان کردبووە سەر جەزیرەکەمان. من لەگەڵ پادشاە و لەشکردا ڕۆیشتبووینە سەفەر بۆ ڕاوکردن، لەگەڵ هاتینەوە، خەبەراتی ئێوەمان زانی، منیش لەڕێگەی چاکەوە ڕووم کردە پادشاە وتم: لازمە بچینە خزمەت پادشای ورچان. بەدڵێکی ساف خزمەتیان بکەین. پادشاە لە قسەی من تووڕە بوو و قسەی نالایقی بە ئێوە داو تیکرار وتم: ژیانمان لەژێر حیمایەتی ئەوان نەبێ مومکین نابێ، پادشاە ئاگری قەهری داگیرسا، ئەمری کرد، بەم برینداری و دەست شکاوییە، من فڕێ دەن، وتی: بزانم ورچ حورمەتیان چییە؟ دەخالەت قبووڵ بکەم و ڕەحمیان بە حاڵی من نەکرد، ئەوە حاڵمە کە ئەیبینیت، پادشای ورچەکان ڕقی هەڵسا، وتی: ئێستا مەیموونەکان ڕوویان بۆ کوێ کردووە؟ موبارەک وتی: فیکری لەشکر کۆکردنەوە ئەکەن، شەبەیخوون بدەن بەسەرتانا، پادشای ورچەکان ترسی پەیدا کرد، وتی: ئەی موبارەک، تەدبیر چییە؟ فێڵێ ئەکەن زەرەر بە ئێمە بگا. موبارەک وتی: ئەگەر بەم دەردە نەئەچووم، لەشکرم کۆ ئەکردەوە، یەکێکیان بە ساغ دەرنەئەچوون، پادشای ورچەکان وتی: ئەگەر ڕێگەمان نیشان ئەدەیت، حەقی تۆ یەک بە هەزار ئەسێنم. بۆیان ئاشکرا ئەبێ حوکمداری و ئازایی من. موبارەک وتی: زۆر ئارەزوو ئەکەم و ناتوانم بەپێ بڕۆم، پادشاە وتی: بردنی تۆ سەهلە، ئەمری کرد، لەشکر کۆبوونەوە، ئەسبابی شەڕیان ڕێکخست، شەو هات شەبەیخوون بدەن، لەسەر ئەمری پادشا لەشکر کۆبوونەوە، موبارەکیان بەست بەکۆڵی ورچێکدا، بە ئیشارەتی موبارەک ڕێگەیان گرتە پێش، زۆر خێرا ئەڕۆیشتن، لەگەڵ دونیا ڕووناک بووەوە، نیوەی ڕێگەیان کردبوو،

ئەو سەحرایە سەمووم و هاڵاوی لاسایی جەهەننەمی نەکردەوە، یەک دەنک گیا لەو سەحرایەدا نەڕوابوو، ئاوی خواردن دەست نە نەکەوت، موبارەک وتی: خێرا بڕۆن ئەوەندەمان نەماوە بەمەرامی دڵم بگەم، لەگەڵ ڕۆژ هەڵهات ئەو دەشتە وەک مەنجەنیق داخرا، زیخ و لمی وەک ژیلەمۆی ئاگر سوور هەڵگەڕا، تەیر ڕێگەی بکەوتایە، وەک پەروانە ئەسووتا، ورچەکان دەست و پێیان نیوە سووتاو بوو، لەدوور نیشانەی سەمووم دەرکەوت، پادشای ورچەکان ڕووی کردە موبارەک وتی: ئەوە چییە دەرکەوت. موبارەک وتی: ئەوە ئاگرە لە ئێوە بەرئەبێت، بەڕاستی هەزار ڕووح بن، ڕووحێکتان بەسەلامەت دەرناکەیت، ئەوە جەزای ئەوەیە ئاگرتان لە دڵی مەیموونەکان بەردا، لەو قسەکردنا بوون، سەمووم گەیشتە سەریان. موبارەک و هەموو ورچەکان بەسەر یەکا مردن. لەپاش سێ ڕۆژە، پادشای مەیموونەکان، ڕۆیشتەوە جێگەی خۆی لە واسیتەی تەدبیری موبارەکەوە هەموویان کەوتنە ئیسراحەت و لەناو جەزیرەکە بە کەیف و شەوق ئەژیان، لە خۆشیا خەسارەتی کۆنیان فیکر نەما. شەباهەنگ وتی: بۆیە ئەم میسالەم هێنایەوە. لەزاتی پادشاە ئاشکرا بێ، زۆر کەس بوون ڕووحی خۆیان فیدای قەومەکەیان کردووە، بەفیکری من کارشناس وەک موبارەک دێتە بەر چاوم. چونکە لەمەو پێش، لە موعامەلەی ئەوان شارەزا بووم، لە کارشناس زیاتر لە دنیادا زیرەک و عاقڵم نەدیوە. لەئەووەڵەوە ئەحواڵی کارشناسم تەماشا کرد دووربینی ئەحواڵی بۆم مەعلووم کرا. ئێستا چاک وایە، لەپێش ئەوەی تووشی بەڵا بێ بە زیندوویی. کارشناس بخەینە ژێر خۆڵەوە. پادشا ڕووی وەرگێڕا، وتی: ئەم فەقیرە بە واسیتەی ئێمەوە تووشی دەرد هاتووە و ئێستا ئێمە بیکوژین زۆر بێ ڕەحمی و بێ غیرەتییە، هۆشەنگ ئەمری کرد، کارشناسیان هەڵگرت، بردیان لە جێگەیەک دایان ناو شەو و ڕۆژ خزمەتیان کرد، هەتا برین و شکاوی باڵەکانی چاک بووەوە. دیسان وەزیر وەک شەباهەنگ بێ، ڕووی کردە هۆشەنگ شاە، وتی ئەی پادشاە، من لەڕێگەی چاکەوە، هەرچی بە چاکم زانی عەرزم کردی و تەئسیری نەکرد، ڕجا دەکەم لەگەڵ کارشناس، وەک دوشمن مودارا بکەن، بەسوورەتی قەتعی لە فیکری غافڵ نەبن. لەبەر چاومە، ئەو ڕوو ڕەشە بۆ فرسەت ئەگەڕێت، هۆشەنگ وتی: ئەوەندە خەوف کردن لەیەک دوشمنی زەلیل، زۆر قسە کردن چاک نییە، وەقتێ کارشناس چاک بووەوە، خۆی لەگەڵ کونەبەبووەکان ڕێکخست، ڕەفاقەت و هات و چۆی لەگەڵ مەئموووران و وەزیران پەیدا کرد، وردە وردە حورمەتی لای پادشاە زیاد بوو، ئاخری بووە وەزیری هۆشەنگ. بەبێ تەدبیری کارشناس دەست بۆ ئومووورات درێژ نەئەکرا، ڕۆژێ هەموو ئومەرا و وزەرا، کۆبووبوونەوە، کارشناس

وتی: پادشای قەلەباچکە بەجۆرێ ئازاری منیان داوە، ئەگەر حەقی خۆم دەست نەکەوێت ئیسراحەتم بۆ ناکرێ، موددەتێکە بە فیکری خۆم تەدبیر ئەکەم و هەتا من لە سوورەتی ئەوانا بم حەقم دەست ناکەوێت، چاک وایە پادشاە ئەمر بفەرمووێت من بسووتێنن، چونکە بیستوومە کەسێ نزیک بە سووتان بوو، دوعای گیرا ئەبێت، بەڵکی کە نزیک بە سووتانن بووم دوعام گیرا بێ. خوا سوورەتی کونەبەبووم بەسەرا کێشێت، ئینتیقامی خۆم لە قەلەباچکەکان بسێنم، شەباهەنگ وتی: ئەم قسە کردنەت، بۆنی مردارەوە بووی لێ دێت. هۆشەنگ وتی: ئەی شەباهەنگ فیکرت چییە، جوابی دایەوە ئەی پادشاە، ئەوە مەکرێکە بە ناوی زەمهەریر ئاودراوە و ئەگەر هەموو پەڕی پیسی بە ئاوی سەلسەبیل و شەرابەن تەهوور بشۆرێت. ڕوو ڕەشی زاهیری و پیسیی باتینی، پاک نابێتەوەو ئەگەر وجوودی ئامویارەکی بە تاوس و یا سیمرخ بێ، بۆ ڕەفاقەتی قەومەکەی ئارەزوو ئەکات. هەروەک مشکەکە بەدوعای عابید. سوورەتی ئافرەتی پێ عەتا کرا. نە بە ڕەفاقەتی ڕۆژ و نە بە ڕەفاقەتی هەور و نە بە ڕەفاقەتی شاخ ڕازی بوو، تا لەگەڵ ئاوجنسی خۆی ئارەزووی دەست کەوت، هۆشەنگ پرسی، چۆن بووە؟.

**حیکایەت**

شەباهەنگ وتی: ئەگێرنەوە، عابیدێ لە چۆڵێکدا شەو و ڕۆژ خەریکی عیبادەت بوو، ڕۆژێ قەلێ بێچووە مشکێکی لەبەردەم عابید دانا و ڕۆیشت، عابید ڕەحمی پێ کرد و لەخیرقەکەیەوە پێچاو خواردنی دایە، تا گەوورە بوو، عابید فیکری کرد مومکینە ئەم مشکە زەرەری بۆ بەنی ئادەم بێ، دوعای کرد مشکەکە بێ بە بەنی ئادەم. دوعای گیرابوو، تەسادوف سوورەتی کچی پێ عەتاکرا، مریدێ چووە خزمەتی عابید، تەماشای کرد. منالێکی ساوا لای عابیدەکەیە، بە ئەمری عابید موریدەکە منالەکەی بردە لای خۆی. تا گەیشتە حەددی بولووغ، بردی و تەسلیمی بە عابید کردەوە. عابید ڕووی تێ کرد، وتی: ئێستا بلووغ بوویت. وەقتی شووت هاتووە. ئارەزووی خۆتە، کچەکە جەوابی دایەوە، وتی: شوو بەیەکێ ئەکەم. کەس قووەتی لەو زیاتر نەبێ، عابید وتی ئەوەی تۆ ئەڵێیت، ڕۆژە، قووەتی لە هەموو کەس زیاترە، بۆ سبحەینێ ڕۆژ هەڵهات، عابید چووە لای، ڕۆژ، بەیانی جوانیی کچەکەی بۆ کرد، وتی: ئارەزووی مێردێ ئەکات قووەتی لە هەموو کەس زیاتر بێ، ڕۆژ جەوابی عابیدەکەی دایەوە، وتی: هەور لە من بە قووەتترە، بە یەک دەقیقە ڕووناکی من ئەشارێتەوە. عابید چووە لای هەور، بەیانی جوانی و قسەی

کچەکەی بۆ کرد، هەور عەرەقی شەرمی دارژان. جەوابی دایەوە، وتی: (با) لەمن بەقووەتترە، وەقتێ با هات، من قووەتی وەستانم نییە. عابید چووە لای با، بەیانی جوانی و قسەی کچەکەی کرد. جەوابی دایەوە، وتی: هەرچەند، سپی چنار لەبن دەردێنم و گوێی بەنی نادەم کەر نەکەم، ئەمما قووەتم بەسەر شاخدا نییە، شاخ لەمن بەقووەتترە. عابید چووە لای شاخ، بەیانی جوانی و قسەی کچەکەی بۆ شاخ بەیان کرد. شاخ جەوابی دایەوە وتی: هەرچەند کەس قووەتی بەسەرما نییە، ئەمما مشک قووەتی لە من زیاترە، هەموو جەرگ و ئەترافی کون کون کردووم. عابید کچەکەی هەڵگرت، رووی کرد بۆ لای مشک، بەیانی قسەی کچەکەی کرد. مشک جەوابی دایەوە، وتی: زەمانێکە ئارەزووی ژن هێنان ئەکەم. ئەمما مومکین نەبووە، ئێستا لەسەر فەرموودەی جەنابت قبووڵم کرد و لازمە ژنی ئاوجنسی من بێ. کچەکە وتی: ئاسانە عابید دوعا بکات. ئەبم بە مشک دەست ئەکەمە گەردنی تۆ، عابید تەماشای کرد هەردووکیان ئارەزووی یەک ئەکەن، دوعای کرد کچەکە ببێ بە مشک، نیشانەی (وکل شيء برجع إلى أصله) ئاشکرا بوو. عابید هەردووکیانی تەسلیم بەیەک کرد گەڕایەوە، شەباهەنگ وتی: بۆیە ئەم قسانەم کرد. لەزاتی پادشاە مەعلوومی بێ ئاخری ئەو ڕوو ڕەشە بەناگری فیتنە ئەمان بڕژێنێ، هۆشەنگ تەدبیر و نەسیحەتی شەباهەنگی بە خراپ ئەزانی، دووربینی ئەحواڵی خۆیانی نەکرد، ئەمما کارشناس، هەر ڕۆژە حیکایەتێکی بۆ هۆشەنگ ئەکرد. وای لێهات بوو بە مەحرەمی سڕی، لە هەڵسان و موعامەلەیان شارەزابوو، ڕۆژێ فرسەتی زانی، ڕۆیشتەوە بۆ لای قەومەکانی. مەلیک پیرۆز وتی: ئەی کارشناس چاومان ڕوون. بەخێرهاتینەوە مەسئەلە چییە بیگێڕەوە. کارشناس وتی لە سایەی سەری پادشاوە. ئەوەی مەتڵەب بوو. دەستم کەوت خۆتان حازرکەن فرسەتە. پیرۆز وتی: تەدبیر چییە، کارشناس وتی: لە فلان شاخ، ئەشکەوتێ هەیە. ئێوە بچن، پووش و گەڵا لەبەر کونەکە، لەگەڵ چیلکە هەڵبچنن. لە نزیک ئەشکەوتەکە خانووی شوانی هەیە. منیش ئەچم دارێکی ئاگراوی دێنم. لەناو پووشەکە دایئەنێم، ئەمر بفەرموو بەلەشکر لە ئەتراف پووشەکە پاڵ بدەن بە یەکدا، تا پووشەکە ئاگر ئەسێنێ، ئەو کونەبەبووی بێتە دەرەوە، ئەسووتێ، ئەوەی لەناو کونەکەدا بێ، دووکەڵ ئەیکوژێ، پادشاە بەتەدبیری کارشناس ئەمری کرد. ئاگریان لە هەموو کونەبەبووەکان بەردا. لەگەڵ کونەبەبووەکان ئاگریان تێ بەردرا. قەلەباچکەکان، بەدڵخۆشی گەڕانەوە، مەلیک پیرۆز، لەتەدبیر و فیکری کارشناس مەمنوون بوو. زوبانی بەمەدح و سەنای کارشناس ئەکردەوە. کارشناس دوعای خێری بۆ ژیانی مەلیک کرد، وتی: لە

واسیتەی نفووسی پادشاوە فیکرم
دروست بوو، چونکە ئەووەڵ ڕۆژ دروشمی
تا مەوبارەک زوڵمی ئاشکرا بوو. ئەم
تەدبیرە بەفیکری منا هات، مەلیک
پیرۆز وتی: لە ڕەفاقەتی کونەبەبووەکان
زۆر مایتەوە چۆن تاقەتت گرت؟ چونکە
سەختی تەبع لەگەڵ ڕەزیل، ڕەفاقەتیان
زۆر زەحمەتە، کارشناس وتی:
فەرمووەدەکەت شیرینە. هیچ ناخۆشییەک
وەک ڕەفاقەتی ڕەفیقی خراپ زەحمت
نییە. ئەمما کەسێ عاقڵ بێ، بۆ دروست
کاری وەلیینێعیمەتی و قانزاجی
قەومەکەی هەرچەند زەحمەت بکێشێ، بە
ڕوتبەی ئەزانێت. مەعلوومە دەوڵەت
بەبێ زەحمەت دەست ناکەوێت و هیچ
گوڵێ بێ دڕک نەکراوەتەوە، مەلیک
پیرۆز وتی: لەقەو تەدبیری کونەبەبوو
چیت دیوە بیگێڕەوە، کارشناس وتی: بە
فیکر و عاقڵی، وەک ئەوەم ئەدیوە، کە
حوکمی کوشتنی ئەکردم پادشاکەیان بێ
ئەقڵ بوو. باوەڕی بەقسەی ئەو زیرەکە
نەئەکرد و قەومەکەیان فەرقیان بۆ
نەئەکرا، من غەریب بووم، بەفیکر و
تەدبیری مەشهوور بووم، ئەبە قسەی شەباهەنگ باوەڕیان ئەکرد و ئەبە عەقڵی خۆیان
ئەیانزانی کە من بۆ مەسڵەحەت بووم بە ڕەفیقیان، لازم بوو سرڕی خۆیان لەکەس ئاشکرا
نەکردایە، لەبەر بێ عەقڵی سرڕی خۆیان لەمن ئاشکرا کرد. ئەوەیان تووش هات کەسیان
بەزیندوویی دەرنەچوون، زوڵم کردنیان گەڕایەوە سەریان. مەعلوومە هەر پادشایەک
دەستی زوڵمی درێژ کرد. نیشانەی تێکچوونی حوکمدارییەتی، باقی بوونی پادشاهی،

بەکافری لەناو ناچێت، ئەمما بە زوڵم لەناو ئەچێت، چوار ئیشی هەیە، جەزای ئەگەڕێتەوە، ئەووەڵ زوڵم، هەرکەس زاڵم بێ، ئاخری خۆی لەناو ئەچێت، دووەم هەرکەس داوێن پیسیی کرد. حورمەتی خۆی لەناو ئەبا، سێهەم هەرکەس زۆر خواردن بخوا، دائیم نەخۆش و دەردەدارە، چوارەم هەر پادشایەک بەقسەی وەزیری عاقڵ نەکا، زوو لەسەر تەختی پادشاهی لائەچێت. لازمە شەش تائیفە، تەمەع لە شەش نەشیا نەکەن. ئەووەڵ پادشا تەمەع لە ئازاری میللەت، دووەم کەسی مەغروور و بە تەکەببور، تەمەع لە مەدح و سەنا، سێهەم. کەسێ ڕەوشتی خراپ بێ، تەمەع لە ڕەفیق گرتن، چوارەم کەسێ بێ حەیا و بێ ئابڕوو تەمەع لە ڕوتبەی گەورەیی، پێنجەم، کەسێ بەخیل بێ، تەمەع لە چاکە کردن. شەشەم، کەسێ گوناهکار بێ، تەمەع لە عەفو کردن. زۆر دەرکەوتووە، چەند کەسانێ لە واسیتەی تەکەببور و غورووریەوە تووشی بەڵا بوون. هەروەک هۆشەنگ لەبەر تەکەببور و مەغرووری شەبەیخوونی دا بەسەر ئێمەدا و ئاخری زوڵمەکەی گەڕایەوە سەر خۆیان، مەلیک پیرۆز وتی: ئەی کارشناس، ئێمە لە چاکەی تۆ دەرناچین، چونکە ئەو جۆرە کەتۆ قبووڵت کردووە و ئەگەر بەقسەی وەزیرەکەیان کاریان بکردایە. تۆ ئەکوژرای و ئێمە لە تۆ نائومێد ئەبووین. کارشناس وتی: کەسێ بە وەفا بزانێت، ئەگەر فیکرێکی کرد، ئەبێ دەست لە ڕووحی خۆی هەڵگرێت و هەرکەس ئارەزووی مەتڵەبێ بکات بۆ دروست بوونی مەتڵەبەکەی، بە خزمەتکاریی بچووکی خەریک بێ عەیب نییە. هەروەک پیرە مارەکە لەبەر مەسڵەحەت خۆی کرد بە وڵاغی بۆق،

پیرۆز پرسی: چۆن بووە؟ بیگێرەوە.

**حیکایەت**

کارشناس وتی: ئەگێرنەوە، مارێ پیر و بەڕیووتی ڕووی تێ کردبوو. قووەتی ڕاوکردنی نەمابوو. لەتاو برسییەتی عاجزبوو، گریانی بۆ زەمانی گەنجیەتی ئەهات. فیکری کرد، بۆی مەعلووم کرا قووەتی هەتا بێ، ڕوو لە کەم ئەکات. وای بە چاک زانی، ڕێگەی تەدبیر بدۆزێتەوە، وردە وردە ڕۆیشتە سەرچاوەی ئاوێک، میقدارێکی زۆر بۆق لەناو ئاوەکەدا بوون. پادشایەکیان بوو. حوکمی بەسەر هەموو بۆقەکانا ئەکرد، مارەکە بەنەخۆشی و سکە خشکێ لە قەراغ ئاوەکە ڕاکشا، بۆقێ چوو سوئالی لە مارەکە کرد، وا دیارە نەخۆش کەوتوویت؟ مار جەوابی دایەوە وتی: لە نەخۆشی خراپترم بەسەر هاتووە، بۆقەکە وتی: چیت بەسەر هاتووە؟ مار وتی: مەعلوومە ژیانی من بە بۆقەوەیە و ئیمڕۆ

بەسەر ناوجنسی خۆیدا نەکرد. ڕۆژێ مار وتی: عومری پادشا درێژ بێ، مەعلوومە ژیانم بەخواردن مومکین نەبێ، پادشاه وتی: ڕاستە، تۆ بەبێ خواردن قووەتی هەڵگرتنی منت نابێ، منیش بەبێ ئولاغ زەحمەتم زۆر ئەبێ، لەبەر ژیانی مار، ڕۆژێ دوو بۆق قەرار درا بدرێ بە مار. چەند موددەتێ بەو جۆرە تا مردنی، ئیدارەی کرد، لەبەر مەنفەعەت، بەخزمەت کردن ڕازی بوو و بە زەحمەت تەماشای نەکرد. کارشناس وتی: هێنانەوەی ئەم میسالەم بۆ ئەوە بوو، تا مەعلوومی جەنابت بێت، سەبر کردنم بۆیە بۆ کرا، سووتانی دوشمن و دڵخۆش بوونی قەومەکەم چاو لێ بوو، سەد ئەوەندە زەحمەتم بکێشایە، بەلامەوە جەژن بوو. حوکەما فەرموویانە، تەدبیر لە قووەت چاکترە، ئەگەر کەسێ موقابیل بەسەد کەس قووەتی بوو، بەتەدبیر مومکین نەبێ، یەکێ ببیستێ، زۆر ئاشکرا بووە، بە لەشکرێکی زۆر چاری دوشمن نەکراوە، بەیەک تەدبیر شار و میللەتەکە گیراوە، مەلیک پیرۆز وتی (الحمدلله) بە تەدبیری تۆ، ئێمە سەرکەوتین. کارشناس وتی: ئەم ئیش و کارە، بە عەقڵ و فیکری من، نەکرا، هەمووی بەواسیتەی نوفووسی پادشاوە، بەئاسانی دروست کرا، پادشای کونەبەبوو لەبەر کیبر و غورووری، وجوودی ئێمەیان نەئەزانی، فیکریان نەئەکرد، ئێمە لەبەر زەعیفی، حەقی خۆمان دەست کەوێت و لەزاتی موبارەکی مەلیک پیرۆز ئاشکرا بێ، چوار ئەشیا کەمە، زۆر ئەبێ، ئەووەڵ پشکۆیەک ئاگر، کەم دیارە و سووتانی زۆرە، دووەم قەرزداری ئەگەر درهەمێک بێ، ساحیب قەرز، وەک سەد دینار تەماشای ئەکات، سێهەم ئەخۆشی، ئەگەرچی ئەووەڵ جار نەکەوێت، هەتا بێت دەردەکەی زۆر ئەبێ. چوارەم، دوشمن ئەگەرچی زەعیف و کەم دەست بێ. ئاخری حەقی خۆی ئەسێنێ. هەروەک دوو چۆلەکەکە، حەقی خۆیان لەمار وەرگرت.

مەلیک پیرۆز وتی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

کارشناس وتی: ئەگێڕنەوە، دوو چۆلەکە لەبن گوێسوانەیەکدا هێلانەیان کردبوو، چەند زەمانێ بەخۆشیی یەک و بەبوون و نەبوون، ڕایان ئەبوارد، وەقتێ بێچوویان هەڵهێنا، هەردووکیان، لەهێلانە چووبوونە دەرەوە. بۆ خواردن هێنانی بێچووەکانیان. تەسادوف کە مێیەکە، پێشی نێرەکە، رووی کردەوە هێلانە، تەماشای کرد، مارێ لەناو هێلانەکەدا خەریکی خواردنی بێچووەکانیەتی، چۆلەکەکە، دەستی کرد بەگریان و هات و چۆکردن، لەپێش دەمی هێلانەکە، نێرەکە ڕووی کردەوە هێلانەکە، تەماشای کرد، مێیەکە بەگریان و

کارێکم بەسەرهات، خواردنی بۆق لەمن حەرام کرا و ئەگەر لەبرسا بمرم. ناتوانم بۆق بخۆم، بۆقەکە ڕۆیشتە لای پادشاکەیان قسەی مارەکەی گێڕایەوە، پادشای بۆقەکان موتەحەییر ما لە قسەی، ڕۆیشتە لای مارەکە، وتی: لەبەر چی خواردنی بۆق لە تۆ حەرام کرا؟ مار وتی: ئەی پادشاه. برسێتی و حرس پێی کردم، ڕۆژێ نارەزووی گرتنی یەک بۆقم کرد، بۆقەکە ڕای کردە ژووری عابیدێکەوە، منیش شوێنی کەوتم، ژووری عابید تاریک بوو، لەبەر برسێتی بۆم فەرق نەکرا. کوڕی عابیدەکە لە ژوورەوە نوستبوو، ئەموستە پێی کوڕەکە بەردەمم کەوت، وامزانی بۆقەکەیە، دانم پیانا، زەهری بن دانم ڕژایە سەر برینەکە. کوڕەکە ڕووحی دەرچوو، لەگەڵ عابید خەبەری زانی، شوێن من کەوت، منیش ڕووم کرد بۆ سەحرا، لەدەست عابید نەجاتم بوو، عابید لە دوورەوە دوعای لێ کردم، وتی: لە دونیا بێ حورمەت و بێ میقدار بیت و ببیت بە ولاغی پادشای بۆقەکان و ئیقتیداری خواردنت نەبێ لەوە زیاتر، پادشا بەسەدەقە بداتێ، ئەوا ئێستا منیش هاتووم، پادشا، من بە ئولاغی خۆی قەبووڵ کات، پادشای بۆق، بەقسەی مار ڕازی بوو. فیکری کرد، من سواری مار بیم، ناو و شوورەت پەیدا ئەکەم. پادشای بۆق هەرچەند سواری مار ئەبوو، تەکەبوری

هاوار خەریکە، بانگی کرد: ئەی ئارامی جانم، باعیسی گریانت نازانم، مێیەکە وتی: گریان بۆ من چاکە، منالە غەمرەوێنەکانم مار خواردی و هەرچەند پاڕامەوە و هاوارم کرد، مارە زالمەکە ڕەحمی پێ نەکردم و بە مارەکەم وت: ئەگەرچی خۆت بەگەورە ئەزانی، ئەمما لە دوشمنی بچووک بترسە. مومکینە ئێمە بۆ کوشتنی تۆ هەوڵ بدەین، مارەکە بەقسەی من پێکەنی، جەوابی دامەوە، وتی: ئێوە خۆتان بەچی ئەزانن و هەتا ئێوەش ئەخۆم دەست هەڵناگرم، ئێستا لە خواردنی بێچووەکانمان بووەتەوە و بۆ خواردنی ئێمە لە هێلانەکەمان نوستووە، نێرەکە ئاگر لە دڵی بەربوو، تەسادوف لەو وەقتەدا ساحیب خانووەکە خەریکی ئاگرکردنەوە بوو، پارچە پەڕۆیەکی ئاگراوی، نێرەکە بردی کردی بەبن گوێسوانەکەدا، ساحیب خانوو، لەترسی ئەوە، خانووەکە ئاگر نەگرێ، بەپاچ و خاکەناز، چووە سەربان، گوێسوانەکەی هەڵوەشان، مارەکە سەری بردە دەرەوە، ساحیب خانووەکە، سەری مارەکەی پان کردەوە و کوشتی، ئاگری دڵی چۆلەکەکان کوژایەوە، مەلیک پیرۆز وتی: ئەی کارشناس، ئینتیقام دەست کەوتنمان، بەواسیتەی فیکری موبارەکتەوە دەست کەوت و هەر تەدبیرێ بە زوبان جەنابتەوە کرابێ، قانزاجی زۆر بووە، بۆ بناغەی سەڵتەنەتی پادشاهان لە وەزیری بەفیکر چاکتر نییە. من هەموو وەقت، بە تەدبیری جەنابت گۆی مەقسەدم دەست کەوتووە و زیرەکی و عەقڵی تۆ گەیشتە دەرەجەیەک، موددەتێکی زۆر لەگەڵ دوشمن دەوامت کرد و قسەیەک بەزوبان تۆدا نەڕۆیشت، عەکسی تەبعی دوشمن بێت، کارشناس وتی: ئەویش لەواسیتەی نفووسی جەنابتەوە دەستم کەوت، چونکە دڵی پادشاە لەگەڵ بەندە ساف بوو و ئارەزووی ئیسراحەتی میللەتی ئەکرد. منیش لە واسیتەی نفووسی پادشاوە، فیکر و تەدبیرم کەوتە سەر ڕێگەی مەتلەب و هەرچیم بۆ دروست بوو تەئسیراتی دڵی ڕوونی جەنابت نیشانی دام و کردم. مەلیک پیرۆز وتی: لەو وەقتەوە، تۆ ڕۆیشتوویت، خواردنی ڕەحەتی و نوستنی ئیسراحەتم نەدیوە. (الحمدلله) ئێستا ئەم ژینە بەژین ئەزانم، لەگەڵ تۆ ڕاینەبوێرم. کارشناس وتی: پێشوونان فەرموویانە: ئەخۆش تا چاک نەبێ، لەززەتی خواردن نازانێ، حەماڵ تا کۆڵی گران هەڵنەگرێ، لە مانگوو حەسانەوە بێ خەبەرە، عاشق هەتا بە مەعشووقە نەگات، دڵی دانامرێ، ڕێبوار داخڵ بە قۆناغ نەبێ، ئیسراحەت ناکا. دوشمندار هەتا مردنی دوشمنی نەبینێ لەژیانی خۆی ئەمینی پەیدا ناکات. مەلیک پیرۆز وتی: ڕەوشت و فیکریان چۆن بوو؟ کارشناس وتی: فیکر و ڕەوشتیان لە ڕووی کیبرەوە بوو، وەک یەک. هەموو کەم عەقڵ بوون، عەقڵداریان لە شەباهەنگ زیاتر نەبوو، زۆر بۆ کوشتنی من ئارەزووی ئەکرد، ئەمما پادشاکەیان لەگەڵ

میللەتەکە فیکریان وابوو تەدبیری شەباهەنگ ڕوو لە حەسوودی ئەکا و هەتا مومکینی بوو، لە نەسیحەت قسووری نەکرد. من لە عومری خۆم، زیرەک و عاقڵی وەک شەباهەنگم نەدیوە. کونەبەبووەکان. کەم عەقڵ بوون. بەقسەی زیرەکی و زۆرزانیی شەباهەنگ، باوەڕیان نەکرد ئەوەیان بەسەرهات، لایق بوون، چونکە لازمە خۆپاراستن لە زوبان لووسیی دوشمن و هەرکەس عەقڵی بێ. بەقسەی دوشمن و گریان و پاڕانەوەی باوەڕ ناکا و دوشمن بەبێ وجود تەماشا ناکرێت و هەرکەس دوشمن بەبچووک تەماشا بکا، ئەوەی بەسەر دێت قەلەباچکەکان بەسەر کونەبەبووەکانیان هێنا و هەرکەس تەماشای ئەم نەسیحەتە بکات و دووربینیی ئەحواڵی خۆی و لەدوشمن ئەمین نەبوو. بەسەلامەتی لەدەست دوشمن نەجاتی نەبێ و قانزاجی تەدبیر و ڕەفاقەت لەم نەسیحەتەدا ئاشکرا بوو. هەموو کەس لازمە بزانێ.

## نەسیحەتی پێنجەم

زەرەری غافڵ بوون و لەدەست چوونی مەتڵەب

دابیشەلیم، ڕووی کردە برەهمەن، فەرمووی : خۆپاراستن لە دوشمن و باوەڕ نەکردن بەقسەیان ئەووەڵ و ئاخر بەزوبان جەنابتەوە بەیان کرا، ئومێد دەکەم بەیانی زەرەر و غافڵ بوون و مەتڵەب لە دەست چوون، بەیان بفەرموویت، برەهمەن فەرمووی، لەهەموو کەس ئاشکرایە، بۆ خوسووس ئیدارە، موحافەزەی ماڵ و کەسابەتیان ئەکەن و چەند کەسێ، بە ئاسانی ماڵیان دەست ئەکەوێ، زوو لەناوی ئەبەن و چەند کەسێ زۆر بەزەحمەت ماڵیان دەست ئەکەوێ، وردە وردە ئیدارەی پێ ئەکەن. لازمە کەسێ عەقڵی بوو، ماڵ و یا ڕەفیقێکی چاکی دەست کەوت، غافڵ نەبێ و ئەگەر غافڵ بوو، لەدەستی ئەچێ، پەشیمانی و دەردی ڕوو لە زیادی ئەکات. هەروەک کیسەڵ بە ئاسانی ڕەفاقەتی لەگەڵ مەیموونەکە گرت. لەبەر بێ عەقڵی، لەدەستی چوو، دابشەلیم پرسی: چۆن بووە؟

## حیکایەت

برەهمەن فەرمووی: ئەگێڕنەوە لەبەحری ئەخزەر، جەزیرەیەک بوو، میقدارێ مەیموون لەناو ئەو جەزیرەیەدا بوون، پادشایەکیان بوو، ناوی کاردان بوو، لەفیکر و ڕاستییا بێ ئەمسال بوو، مووددەتێ پادشای مەیموونەکان بوو، ئاخری پیری، ڕووی تێ کرد، دڵی مەئمووران دەرحەق کاردان خراپ بوو، لەبەر پیری عەزلیان کرد، یەکێ لەخزمانی پادشاه، تازە پێ ئەگەیشت، لەجێگەی کاردان کرا بە پادشاه، بۆ خۆشیی پادشاه جلووسیان دانا،

هەمموویان بە ڕەسمی خۆیان کردیان بە جەژن، کاردان لای ناشیرین بوو، لەناویانا دانیشێت، تەرکی وەتەنی کرد، بەقەراغ بەحرەکەدا، ڕۆیشتە خوارەوە، گەیشتە بن دار هەنجیری ئەو دار هەنجیرەی کرد بەوەتەن. ڕۆژێ لەسەر دار هەنجیرەکە، یەک هەنجیر لەدەست کەوتە ناو ئاوەکەوە، دەنگی شڵپەی ئاوەکەی لا خۆش بوو، هەمموو وەقت بەو فیکرە هەنجیرێکی ئەخوارد. هەنجیرێکی ئەخستە ناو ئاوەکەوە، تەسادوف کیسەڵێ بوو، گران گەیشتە بن دار هەنجیرەکە. بۆ ئیسراحەت لەبن هەنجیرەکە ڕاوەستا، لەو وەقتەدا مەیموون هەنجیری ئەخستە ناو ئاوەکەوە، کیسەڵ ئەیگرتەوە، ئەیخوارد، فیکری کرد، ئەو مەیموونە بەو جۆرە چاکە دانەوەی لازمە، بانگی مەیموونەکەی کرد، ئەی ڕەفیق من غەریبم و چاکەت لەمن ئەدیوە. تۆ ئەم هەمموو چاکەیەت لەگەڵ من کرد، تا مردن بۆم نادرێتەوە، مەیموون ئارەزووی ڕەفاقەتی کرد، بەیانی ڕەفیقی چاک و یەک قسەی بۆ کیسەڵ گێڕایەوە، وتی: لازمە، ڕەفیق وەک تای تەرازوو بەرامبەر یەک بن و ڕەفیقی بۆ هەمموو کەس ناکرێ، ڕەفاقەت لەگەڵ سێ تایەفە لازمە، ئەووەڵ، لەگەڵ عولەما، بەواسیتەی ڕەفاقەتەوە شرووتی دیانەت و ئاداب شارەزا ئەبی، دووەم، لەگەڵ عاقڵ، بەواسیتەی ڕەفیقی عاقڵەوە لەرێگەی خەتەر نەجات ئەبێ، سێهەم، لەگەڵ ئەوانەی دووزوبان نازانن و بەبێ تەمەع ڕەفاقەت ئەکەن و لەسێ تایەفە، خۆ پاراستن لازمە، ئەووەڵ، ئەو کەسانەی ئارەزووی فیتنە و دوو زوبانی ئەکەن. دووەم، ئەو کەسانە وەعدێک ئەدەن بەدرۆ دەردەچێت. سێهەم، ئەو کەسانەی کە عەقڵیان نییە، چونکە لە واسیتەی ڕەفیقی کەم عەقڵەوە، دەرد و بەڵا زۆرە، دوشمنی عاقڵ لە دۆستی نەزان چاترە... هەر وەک لە واسیتەی دوشمنە عاقڵەکەوە، پادشاە لە دەست دۆستە کەم عەقڵەکەی نەجاتی بوو. کیسەڵ پرسی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

کاردان وتی: ئەگێڕنەوە، لە شاری کشمیر، پادشایەک بوو، زۆر عادل و میللەت پەروەر بوو، ئەو پادشایە، مەیموونیکی بوو، شەو و ڕۆژ نۆبەچیی سەری پادشا بوو، بەشمشێرەوە لە ژوور سەری ئەوەستا، تەسادوف دزێکی عاقڵ، لە ڕێگەی دوورەوە داخل بە کشمیر بووبوو، بۆ دزی و دزێکی کەم عەقڵ، ئەهلی شارەکە بوو. تووشی دزە عاقڵەکە بوو. هەردووکیان بۆ دزی بوون بە ڕەفیق، دزە غەریبەکە وتی: تۆ شارەکە ئەزانی، ئیمشەو ڕوو بکەینە کوێ؟ دزەکە جەوابی دایەوە: ڕوو بکەین بۆ تاولەی پادشا، کەرێکی هەیە، بیدزین

و ڕوو بکەین بۆ مەیدانی بازاڕ، دووکانی شووشە فرۆشێ هەیە، بیبڕین و کەرەکە بار بکەین، بگەڕێینەوە، لەو تەدبیر کردنەدا بوون، حەسحەسێ پەیدا بوو. دزە عاقڵەکە، خۆی شاردەوە. دزە کەم عەقڵەکە بەدەست حەسحەسەوە گیرا، سوئالیان لە دزە کرد، فیکری چیت کردووە؟ جەوابی دایەوە، وتی: فیکرم کردووە، تاولەی پادشا ببڕم، کەرەکەی بدزم و لە دووکانی فلان کەس، باری کەم لەشووشە، ڕوو بکەم بۆ شارێکی کە، بیفرۆشم، حەسحەس ئەوەی بیست، پێکەنی، وتی: ئافەرین لازمە لەکەم عەقڵیی تۆ، چونکە، وڵاتی پادشا، سەد نۆبەچیی هەیە و دەست تۆ ناکەوێت و ئەگەر فیکری خەزینەی پادشات بکردایە سەهلتر بوو، کەم عەقڵیی تۆ، ئەم جۆرە بێ، لایقی زیندانی. ئەوەی وت و قۆڵبەست کرا، بردیان بۆ زیندان. خرایە زیندانەوە، دزە عاقڵەکە گوێی لەو قسانە بوو، فیکری کرد. ڕەفیقی نەزان، لە دوشمنی زانست خراپترە. بەقسەی حەسحەس، ڕووی کرد بۆ خەزینەی پادشاه. وەختێ گەیشتە خانووی پادشاه لە خۆشیی خەزینە، میقداری نیو سەعات سەری لوغمی کردە دەرەوە، لەگەڵ تەماشای کرد لە ئەنواعی سکە و ئاڵتوون و جەواهیرات ڕژکراوە و ئەترافی ژوورەکە بە شەمع ڕوون کراوە و پادشا لەسەر تەخت نوستووە و مەیموونێ بە شمشێرەوە لەژوور سەری پادشا نۆبەچییە، دزەکە موتەحییر بوو، فیکری کرد عەجەبا مەیموونێ بەو ناشیرینیە، چۆن ئەمین بوون لە عەقڵی کراوە، بۆ نۆبەچی سەری پادشا، لەو فیکرەدا بوو، لەسەقفی خانووەکەوە چەند مێروولەیەک کەوتە سەر سنگی پادشاه، پادشا بەدەم خەوەوە دەستی برد بۆ سنگی، خورانی، مەیموونەکە تەماشای کرد، مێروولە لەسەر سنگی پادشایە، ڕەگی جەهالەتی کەوتە حەرەکە، وتی: لە جێگەیەک من بەشیری تیژەوە، لەژوور سەری پادشاه نۆبەچی بم، ئێوە شەرم ناکەن، شمشێری ڕاست کردەوە بۆ سنگی پادشا مێروولەکان بکوژێ، دزەکە هاواری کرد، پەلاماری مەیموونەکەی دا، شمشێرەکەی لە دەست مەیموون سەند، پادشاه خەبەری بووەوە، تەماشای کرد، کابرایەکی غەریب شمشێری لە مەیموون سەندووە و لە بەرامبەر مەیموون وەستاوە، پادشا وتی: تۆ ئیشت چییە؟ دزەکە جەوابی دایەوە، من بۆ دزیی خەزێنەکە هاتم و دوشمنی عاقڵم. ئێستا لەواسیتەی حازر بوونی منەوە، لە دەست دۆستی کەم عەقڵ ڕووحت بە سەلامەت دەرچوو، قسەی ئەووەڵ و ئاخری بۆ پادشا گێڕایەوە، پادشا سەجدەی شوکری برد، وتی: (الحمدلله) ئەمرۆ ئیرادەی خودا هەر جۆرێ بێ، لازمە ببێ، دوشمنی عاقڵ لەجێگەی دۆستی کەم عەقڵ، ڕوتبەی بۆ بەچی بێ، پادشا ئەمری کرد. زنجیریان خستە گەردنی مەیموون، خرایە زیندانەوە و دزە عاقڵەکە بوو بە یەکێ لە

مەئموورانی پادشا، لازمە ڕەفاقەت لەگەڵ عاقڵان و خۆپارلستن لەکەم عەقڵان، کاردان وتی: ئەی کیسەڵ، ئەم حیکایەتەم بۆ کردی، بۆت مەعلووم بێ ڕەفاقەتی من لەگەڵ تۆ دروست نابێ لەوە ئەترسم شرووتی ڕەفاقەت بەجێ نەیەنیت. چونکە پێشوونان فەرموویانە ڕەفاقەتی ئەهلی دونیا سێ جۆرە، یەکەمیان کە ڕەفیقی گیانی گیانیی ناوە، وەک ڕووح و جەسەد، بەیەک لزوومن، تەرک بوونیان مومکین نابێ، دووەمیان، وەک دەرمان وایە، وەقتێ نەخۆش، دەردێ تووش هات، موحتاجی دەرمان ئەبێ، سێهەمیان وەک دەرد وایە، تەرک بوونیان لەمردن نزیکە، ئەوانە جانی جانیی ناوە، لەتەنگانە و فەرەحی شەریکن. ئەوانە دەرمانی ناوە، خزمێکە موحتاجی دەفع ئەکەن، ئەوانە دەردیان ناوە لەوەقتی خواردن دەستیان لەگەڵ دەستە و دوورکەوتنەوە قسەی نالایق و خراپ ئەکەن، کیسەڵ وتی: شرووتی ڕەفاقەت چۆنە بەیان بفەرموو، تا ئادابی بەجێ بهێنم. کاردان وتی: هەرکەسێ شەش ڕەوشتی بوو، ڕەفاقەتی زۆر خۆشە، ئەووەڵ، عەیبی ڕەفیقی ئاشکرا نەکات، دووەم، نازایی ڕەفیقی یەک بە هەزار بەیان بکا. سێهەم، بەخالەت بەبوونیی ڕەفیقی نەکا، چوارەم، چاکەی ڕەفیقی لەفیکر نەچێ، پێنجەم، ئەگەر خەتا و سەهو لەڕەفیق ببینێ، نەیگرێتە دڵ، شەشەم، ئەگەر موحتاج بوو، داوای شتێکی کرد. ڕەفیقەکەی ڕووی نەشکێنێ و هەرکەس لەم شرووتانە بەیان کرا دوور بوو. ڕەفاقەتی دروست نییە. کیسەڵ وتی: ئەی ڕەفیق، ئومێد دەکەم تا مردنم ئەم شرووتانە لە فیکری خۆم نەبەمەوە و بەتیغ سەرم ببڕی لەژێر دەستتا سەر هەڵنەبڕم، کاردان لەدار چووە خوارەوە، کیسەڵ لە ئاو هاتە دەرەوە دەست بووسیان لەگەڵ یەک کرد. کاردان سەڵتەنەتی کۆنی فیکر چووەوە. کیسەڵ ماڵ و منالی فیکر نەما موددەتێ بەخۆشیی یەک ڕایانبوارد. لەولاوە ژنی کیسەڵ مات و مەلوول بوو بەگریانەوە، ڕووی کردە لای ژنە دراوسێیەکەی، وتی: نازانم ئەو غەریبە لە کام قوڕ و ئاوی چەقیوە و بەم جۆرە هاتنەوەی تووڵی کێشا، دراوسێکەی وتی: تۆ لە من گەورەتر و عاقڵتری. ڕجا ئەکەم هەرچی ئەزانی بیگێڕەوە. دراوسێکەی وتی: بیستوومە مێردەکەت. ڕەفاقەتی لەگەڵ مەیموونێ گرتووە، لە خۆشەویستی مەیموونەکە فیکری لەلای تۆ نەماوە، تەماشا کردنی جەماڵی مەیموونەکەی لە تۆ زیاتر ئەوێت، ژنی کیسەڵ، ئاگر لە جەرگی بەربوو، ئارامی نەما، وتی: ئەوە شەرتی وەفایە، ئەو لەگەڵ منی ئەکا، لەجیاتی ڕەفاقەتی من، بووە بە ڕەفیقی سەگسارێ کە ئاوجنسی خۆی نییە و گلەیی زۆری لەبەختی خۆی کرد،دراوسێکەی وتی: ئەو قسانە بێ فائیدەیە، تۆ ئەیکەیت، تەدبیرێ بدۆزەرەوە، مەکری ژنان مەشهوورە، بە مەکر نەبێ چاری

مێردەکەت ناکرێ، تەدبیر ئەوەیە، خۆت بکەیت بە نەخۆش لەواسیتەی نەخۆشیی تۆوە مەیموونەکە بە کوشت بدەین. ژنە کیسەڵ خۆی کرد بە نەخۆش و یەکێکی نارد بە شوێن مێردەکەیا، خەبەری بێ حاڵیی ژنەکەی بە کیسەڵ دا، وەقتێ خەبەر گەیشتە کیسەڵ ئیزنی لە مەیموون خواست، مەیموون وتی: ئەی رەفیق، بەگورجی بگەڕێیتەوە، چونکە تاقەتی دووریی تۆم نییە، کیسەڵ وتی: ئەگەر ئیشەکە موهیم نەبوایە، دووریی تۆم ئیختیار نەئەکرد. دوعاخوازییان لەیەک کرد. گەیشتە ماڵەوە، کەسوکاری کۆبوونەوە، وتیان: تا ئێستا بەچی خەریک بوویت؟ ئەوا ژنەکەت لە مەراق دووریی تۆ دڵ و زوبانی گیراوە، قسەی بۆ ناکرێ. کیسەڵ رووی کردە ژنە دراوسێیەکە، وتی: دەرمانی چییە؟ دراوسێیەکە هەناسەی هەڵکێشا، وتی: دەرمانی دەردی دەست ناکەوێت. کیسەڵ وتی: ناوی دەرمانەکە چییە، بەڵکی بەحر و بەر بگەڕێم بۆی پەیدا بکەم. دراوسێیەکە وتی: دەرمانی ئەو دەردە دڵی مەیموونە. بە خواردنی دڵی مەیموون نەبێ دڵ و زوبانی بەر نابێ و، دڵی مەیموون مومکین نییە دەست ئێمە بکەوێ. لەبەر ئەوە ناردمان بە شوێنتا تا گەردنی یەک ئازا کەن و، ئومێدی ژینی نەماوە. ئەو قسەیە ئاگری لە کیسەڵ بەردا، کەوتە فکرو مەراقەوە. بۆ کوشتنی مەیموونەکەی رەفیقی کەوتە موجادەلە لەگەڵ نەفسی. نەفس قەراری دا کاردان بکوژێت. عەقڵ وتی: نامەرد، وەفاو شەرت شکاندن ئیشی نامەردانە. لەبەر ژنێکی مەککارە شورووت و رەفاقەت بشکێنیت، بە خراپە لە تەئریخ ناو ئەبرێیت. نەفسی ئەیوت: ماڵ وێران، ژن ئاوەدانیی ماڵەو، هەر چەند هەوڵ بدەیت ئێستا کەمە و، رەفاقەتی کەسێ ناوجنس نەبێ بەکاری چی دێت؟ ئاخری عیشقی ژنەکەی بردیە سەر قسەی نەفس. فکری کرد کاردان بکوژێ و دڵەکەی دەربێنێت، دەرخواردی ژنەکەی بدات. ئەوەندە بێ عەقڵ بوو نەیزانی وەفاو شورووت شکاندن لە رووڕەشی زیاتر نییە، پەشیمانیی لە شوێن دێت و، هەر کەس وەفاو شەرتی نەبێ نزیک بوونی خەتەرە. کیسەڵ بۆی مەعلووم بوو بەحیلە نەبێ ناتوانێ مەیموون بکوژێ. وای بە چاک زانی مەیموون بباتە ماڵەوە. بەو فکرەوە کیسەڵ رووی کردە لای مەیموون. کاردان لەگەڵ چاوی بەکیسەڵ کەوت باوەشی پیا کرد، ماچی کرد، وتی: ئەلحەمدولیللا ئەم جارە بەیەک گەیشتینەوە. باوەڕ ناکەم جارێکی کە دووریی تۆ ئیختیار بکەم. کیسەڵ وتی: ئەی رەفیق، لەگەڵ گەیشتمە ماڵەوە، لەبەر ماڵ و مناڵ نەختێ دڵم فەرەح بوو، ئەمما بە خۆم وت بێ غیرەتییە بەبێ غەم من ئیسراحەت بکەم و، رەفیقی جانی جانیم بەدەردو مەراقەوە تووش بکەم. دڵم ئارامی نەگرت، هاتمەوە خزمەت جەنابت. فکرم کردەوە چەند کەسوکارێکم بانگ کەمە

سەر زیافەت، وەئومێد دەکەم خانەی بەندە بە قودوومی موبارەکی جەنابت ڕوون ڕوون بکرێتەوەو، عەقڵ و تەدبیرت لە ڕەفیق و ئەربابم ئاشکرا بێ. ئومێد دەکەم دەست ئەنێیت بە ڕوومەوە، تەشریفت بێتە ماڵەوە تا ڕەفاقەت و دۆستایەتیی ئەولادی ئەولادمان ئەبڕێتەوە. کاردان وتی: ئەی ڕەفیق، لازم بە زیافەت ناکا. ئێمە بناغەی ڕەفاقەتمان تەواوە. خراپترینی ڕەفیق ئەوەیە تەکلیفی زیافەت ئەکاو لازم ناکا تۆ زەحمەت بکێشی و، ڕەفاقەتی تۆ لە هەموو شتێک بە چاکتر ئەزانم، چونکە من پادشا بووم، تەرکی وەتەن و جێگەی خۆم کردووە. زوور ئەبوومایە بە ڕەفیقی تۆ ڕەنگە لە مەراقدا بمردمایە. ئێستا لەبەر ڕەفاقەتی تۆ فکری وەتەن و جێگەی خۆم ناکەم. لازم ناکا خۆت بخەیتە کەشاکەشەوە. کیسەڵ وتی: ئەی ڕەفیق زیافەت کردنم بۆ خواردن و خواردنەوە نییە. ئارەزوو ئەکەم لەواسیتەی موبارەکیی تۆوە تووشی بەرەکەت ببین. کاردان وتی: بۆ ئوفووسی دۆستان فەرقی دوورو نزیک نییە. دۆست هەتا دوور بێ مەحەببەتی زیاترە. نزیک بوون مەحەببەت کەم ئەکا. کیسەڵ وتی: ئەی ڕەفیق، شورووتی ڕەفاقەت قسە نەشکاندنە. کاردان وتی: بەجێهێنانی قسەی ڕەفیق بەشەرعی مورووەت فەرزەو، خوسووس زۆر ئارەزووی زیارەتی ماڵ و منالت ئەکەم و هاتنم مومکین نابێ. کیسەڵ وتی: ئەی ڕەفیق پشتم بۆ تۆ دەکەم بە سەفینە، بە ئاسانی داخڵ بە ماڵ ئەبێ. دەم گەرمیی کیسەڵ مەیموونی هەڵفریواند. کاردان ڕازی بوو، چووە سەر پشتی کیسەڵ. ڕۆیشتنە ناو ئاوەکەوە. لەگەڵ گەیشتنە ناوەڕاستی ئاو کیسەڵ وەستا، فکری کردەوە، بەخۆی ئەوت بە خراپ مەشهوور ئەبم. بەقسەی ژنی ناقیس عەقڵ، ڕێگەی شەیتانم گرتووە. لەناو ڕەفیقان لە ژن کەمتر حیساب ئەکرێم. کاردان لە ڕاوەستانی ترسی پەیدا کرد، وتی: ئەی ڕەفیق، ڕاوەستانت لەبەر گرانیی منە؟ کیسەڵ وتی: ئەوە چ قسەیەکە. دەلیلت چییە؟ کاردان وتی: خەبەردارم لە فکری خۆم. تەدبیری کەت بەدەستەوەیە. ئەگەر خەبەردارم بکەیت مومکینە منیش یارمەتیت بدەم. کیسەڵ وتی: قسەکانت شیرینە. من فکری ئەوە ئەکەم ئەمە ئەوەڵ دەفعەیە جەنابت دێیتە ماڵی ئێمە. ئەمما ژنەکە ئەخۆشە. فکری ئەوەم کرد خزمەتی جەنابت بە تەواوی ئەکرێت و خەجاڵەتی بێتە سەرم. کاردان وتی: بەشەرتێ دڵت ساف بێ، ئەوەی بۆ بێگانە بکرێت بەجێ بێنرێت بە زۆر تەماشا ئەکرێت، چونکە عەیبی ڕەفیق لە ڕەفیق دەرناکەوێت. میقدارێکی کە ڕۆیشتن. تەکرار کیسەڵ وەستا، فکری کرد، وتی بەخۆی: ژنان شەرت و وەفایان نەبوە. زۆر کەم عەقڵییە بە قسەی ژن خیانەت لە ڕەفیقی جانی جانی بکەم. دڵی مەیموون کەوتە لێدان و ترسەوە،

وتی: ئەی ڕەفیق، فکرت چییە، لە منی ئاشکرا کە، بەڵکی بە فکر وەیا بە قووەت یارمەتیت بدەم. کیسەڵ وتی: فکرم ئەوەیە کەم خزمەتیی جەنابت ڕوویدات، چونکە ژنەکەم نەخۆشە. کاردان وتی: فکری کەم خزمەتیی من مەکەو بەیانی نەخۆشییەکەی بکێڕەوە، چونکە نەخۆش کەوتن لە نەخۆش بینین ناخۆشترە. وەهەر نەخۆشییێ دەرمانێکی بۆ دانراوە، وەبزانم نەخۆشییەکە چییە، لە مابەینی مەشریق تا بە مەغریب دەرمانی بۆ پەیدا ئەکەم. کیسەڵ وتی: ئەی ڕەفیق، دەرمانی نەخۆشییەکەی منی خستووەتە بەحری مەراقەوە. ئەڵێن بەدڵی مەیموون نەبێ چاک نابێتەوە. قسەی کیسەڵ ئاگری بەردایە دڵی مەیموون، چاوی تاریک بوو. خۆی بەخۆی وت من ئەووەڵ کەسم بە نەزانی تووشی دەردی بەڵا هاتم، وە ئەگەر داخڵ بە جەزیرەی کیسەڵەکان بووم ڕێگەی نەجاتم دەست ناکەوێت، وەهەر ئەمرێک بکەن لازمە ئیتاعەتیان بکەم. وە ئەگەر بە قسەی کیسەڵ باوەڕم نەکردایە تووشی ئەم جۆرە بەڵایانە نە ئەبووم. عەقڵی هاتەوە بەبەردا. وتی: ئەی ڕەفیق دەرمانی دەردی ژنەکەت زۆر ئاسانەو زۆر ژنانی ئێمەش تووشی ئەو جۆرە دەردە هاتوون، دڵمان بۆ دەرهێناون خواردوویانە چاک بوونەوە. دڵ دەرهێنانمان بە دەست خۆمانە. مع الأسف لە بن هەنجیرەکە ئەم قسەت نەکرد ئاسانتر بوو، چونکە پێشوونان وتوویانە: چوار ئەشیا بەچوار تایفە لایقە. ئەووەڵ تەڵەبی پادشاە هەرچی بکرێت بەجێهێنانی لەسەر میللەت لایقە. دووەم فەقیر تەڵەبی حەققولڵا بکات لە تەرەف دەوڵەمەندەوە عەتاکردن لایقە. سێهەم شاگرد ئارەزووی سنعەتی کرد نیشاندانی لە تەرەف ئوستادەوە لایە. چوارەم بۆ ڕەفیقانی جانی جانی دەرمانی دەرد پەیدا کردن لایقە. وەبەیانی نەخۆشیی ژنەکە زوو بکرایە، من ئەبووم بە واسیتەی چاک بوونەوە. ئێستا دڵم لەگەڵ خۆم نەهێناوە، چونکە غەریب بووم دڵم عاجزیی هەڵنەگرت، دەرم هێنا لەبن دار هەنجیرەکە دامناوەو بێگانەم دەست بکەوتایە تەسلیمم ئەکرد، وە خوسووس دۆستێکی وەک تۆ بەسەر سەر مەمنوون ئەبووم. کیسەڵ وتی: بەجێهێشتنی دڵت لەبەر چی بوو؟ (کیسەڵ وتی: وانییە). کاردان وتی: عادەتی مەیموون ئەوەیە ئارەزووی لای دۆست بکەن، دڵیان نابەن، لەبەر درەنگ ڕۆیشتنەوەیان عاجزییان بۆ پەیدا نەبێت. کیسەڵ وتی: تەدبیر چییە؟ کاردان وتی: ئەگەر بگەڕێینەوە لەبن دار هەنجیرەکە دڵم هەڵئەگرم لەگەڵ خۆم ئەیهێنم، دەرخواردی ژنەکەت ئەدرێت، چاک ئەبێتەوە، وئێمەش بە خۆشیی یەک ڕائەبوێرین. کیسەڵ بەناو ئاوەکەدا گەڕایەوە. لەگەڵ گەیشتنە قەراغ ئاوەکە مەیموون لە پشتی کیسەڵ چووە خوارەوە، سەرکەوتە دار هەنجیرەکە. کیسەڵ وتی: ئەی ڕەفیق، وەقت درەنگە، فەرموو. کاردان پێکەنی. وتی: مەعلوومی کرد

شەرتی ڕەفاقەتت شکاند، وەمن عومری خۆم لە پادشاییدا سەرف کردووە. ساردی و گەرمیی دونیام زۆر دیوە. زەمان کەم عەقڵێکی وەک تۆی کرد بە ڕەفیقم. تەئسیراتی قسەکردنت لای من نییە. لەمەجلیسی عاقڵان دانەنیشیت. عەقڵی تۆ تەجرەبە کرا. ئەم جارە خودا لە دەست کەم عەقڵیی تۆ نەجاتی دام. کیسەڵ وتی: ئەی ڕەفیق من بێ تەدبیری جەنابت نیشم نەکردووە، وەئەگەر بەتێغ سەرم ببڕی دەست لە ڕەفاقەتت هەڵناگرم. کاردان وتی: ئەی کەم عەقڵی هیچ نەزان من وەک ئەوە نیم ڕێوییەکە وتی: ئەو کەرە دڵ و گوێی بۆ نەکراوە. کیسەڵ پرسیی: چۆن بووە، بیگێڕەوە.

**حیکایەت**

کاردان وتی: ئەگێڕنەوە شێرێ بەڵەکیی تووش هاتبوو، شەو و ڕۆژ بە خۆ خوراندن خەریک بوو. تووکی ڕووتابوەوە. نەخۆشیی تووش بووبوو. قووەتی ڕاوکردنی نەمابوو. ڕێوییەک خزمەتی شێرەکەی ئەکرد. هەر خواردنێ لە شێر بمایەوە ڕێوییەکە ئەیخوارد. لە موددەتی نەخۆشیی شێرەکەدا خواردن دەست ڕێوی نەئەکەوت. برسیی بوو، چووە لای شێر. وتی: ئەی پادشاە، لەبەر چییە ناچیتە ڕاو؟ شێر وتی: نازانیت نەخۆشم، قووەتم نەماوە؟ ڕێوی وتی: دەرمانی چییە؟ شێر وتی: لەوانەی دەرمان ئەزانن پرسیومە، ئەڵێن نەخۆشیی تۆ بەڵەکییە، دەرمانی دڵ و گوێی کەرە. موددەتێکە فکرم کردووە. ئارەزوو ئەکەم دڵ و گوێی کەرێ بخۆم، دەستم ناکەوێت. ڕێوی وتی: ئەگەر ئەمری پادشاە هەیە قسەت بۆ بکەم. شێر وتی: ڕوخسەت هەیە. ڕێوی وتی: ئەی پادشاە، لەبەر ئەوە موو بە بەدەنی جەنابتەوە نەماوە، ڕۆیشتنە دەرەوەت چاک نییە لەبەر چاو پێکەوتنی دۆست و دوشمن، وەمن ئەتوانم بە قسەی شیرین لەم نزیکانە کەرێ بێنم دڵ و گوێی بخۆ، وە باقییەکەی بەخێری سەلامەتیت بەمن ببەخشە. شێر وتی: ئەگەر ئەوە بکەیت مەمنوون ئەبم. لەو نزیکانە کارێزێ بوو، گازرچییەک هەموو ڕۆژ بارێکی جاو ئەبردە سەر کارێزەکە گازریی ئەکرد، وەکەرێکی هەبوو بەرەڵڵای ئەکرد هەتا لە گازر کردن ئەبوەوە. ڕێوی ڕووی کرد بۆ کارێزەکە، چوو بە لای کەرەکەوە خۆشی چۆنیی لەگەڵ کرد، وتی: بۆچ وا زەعیف بوویت؟ کەر وتی: دایم لە ژێر باری ئەم زاڵمەدام، ڕەحمی نییە، خواردن و تیمارم کەمە. ڕێوی وتی: ئەی فەقیر بۆچ خۆت نەجات نادەیت، وە لەژێر زەحمەتی بارکێشان فیرار ناکەیت؟ کەر وتی: لەهەر جێگەیەک بم ئیسراحەتم دەست ناکەوێ و ئاوجینسی من هەموو لە ژێر باردان، وەچەند دەفعە فکرم بووە فیرار بکەم ئاخری پەشیمان بوومەتەوە لەبەر ئەوەی

دەست هەرکەس بکەوتمایە ئەندازەی باری نەئەزانیم، مومکین بوو ئەوەندە باری گران بکردمایە هەتا پشتم ئەشکا. ئەوا ڕێگەی فیرارم ئیختیار نەکردووە. ڕێوی وتی: «ان أرض الله واسعة» ئەتبیستووە؟ ئەتوانی خۆت ئەجات بدەیت و خواردنی ئیراحەت دەست خۆت بخەیت. کەر وتی: لەهەر جێگەیەک بم پشتی من لە ژێر بارا نەبێت. سەفەرکردن زەحمەتی زۆرە. تاقەتی دەردی سەفەرم نییە. ڕێوی وتی: هەر کەس بە واسیتەیەک خودا ڕزقی ئەدات، وەئەگەر ئارەزوو ئەکەیت جێگەیەکت نیشان ئەدەم وەک باغی بەهەشت ڕازاوەتەوە. ساڵێکی ئەو جێگەیە بە سەعاتێ ئەزانی. بەهاری چوار فەسڵ نابڕێتەوە. چەند ڕۆژێ لەمەوپێش کەرێکی وەک تۆم بردووە، ئێستا ئەوەندە قەڵەو بووە ناناسرێتەوە. ئەگەر ئارەزوو ئەکەیت تۆیش ئەبەم ببیت بە ڕەفیقی بەکەیف و خۆشی ڕابوێرن. کەری هیچ نەزان بە زوبانی ڕێویی فەنباز خەڵەتا، دوای ڕێوی کەوت، نزیک بە شێر بوون. شێر لەتاو برسییەتی پەلاماری کەرەکەی دا، قووەتی نەبوو کەر لە دەست شێر دەرچوو، فیراری کرد. ڕێوی ڕووی کردە شێر وتی: بێ فایدە عەزیەتی خۆت بۆ دا. لە عەجەلە کردنت قازانجی چیت دەست کەوت. شێر ئەو تەعنەدانەی زۆر پێ ناخۆش بوو، فکری کردەوە بڵێم بە ئارەزوو ئەجاتم دا، درۆیەو، بڵێم لە دەستم دەرچوو، بەبێ قووەت و کەم دەست ناو ئەبڕێم. چاک وایە. بە توندی جوابی بدەمەوە. ڕووی کردە ڕێوی، وتی:

نیشتی پادشاهان بیکەن میللەت خەبەریان نابێ و، قسە وتن لە کاری پادشاهان بێ ئەدەبییە. ئەوەی پادشاهان بیکەن لە فکری میللەت دوورە. ئەگەر ئەمجارە داخڵی ئێرەت کردەوە ڕاستیی تۆم بۆ مەعلووم ئەبێ. ڕێوی دیسان ڕۆیشتەوە بۆ لای کەر، خۆشی چۆنیی لەگەڵ کرد، وتی: بۆچی فیرارت کرد؟ کەر وتی: فێڵبازی غەددار! لەلایەکەوە باغ و خواردن بەمن ئەڵێیت، وە لەلایەکەوە فکرت هەیە دەرخواردی شێرم بدەیت. ڕێوی وتی: ئەی فەقیر! عەجایبە تۆ ماویت. ئەو سوورەتە کە تۆ بە شێری ئەزانی ئەوە تەلیسمە، حوکەمای لەمەو پێش بۆ ژیان و ئیسراحەتی حەیوانات دروستیان کردووە. ئەگەر تەلیسم بەند نەبوایە پڕ ئەبوو لە دڕندە، حەیوانات خواردنیان دەست نەئەکەوت. وەمن هەر کەسم خۆش ویستبێ، ڕێگای باغەکەم نیشان داوەو دوعای تەلیسم بەندەکەم بەسەرا خوێندووە، بەبێ ترس داخڵ بووە، وە لە ئەووەڵەوە فکرم چوو دوعاکە بخوێنم. ئێستا بۆ درۆو ڕاستی تەشریفت بێت بزانە خیلافی ڕەفاقەت لەگەڵ تۆ کراوە. دیسان کەر بەقسەی ڕێوی خەڵەتا، ڕووی کردەوە بێشەکەی شێر. ڕێوی لە پێشەوە چووە لای شێر، مژدەی هاتنی کەری دایە. ڕجای کرد شێر حەرەکەت نەکا تا کەر ئەمین ئەبێتەوە. لەگەڵ کەر گەیشتە پێشەوە تەماشای کرد شێرەکە ناجووڵێت، دڵی چاک بوو. ڕێوی وتی: ئەو سوورەتە تۆ ترست لێی بوو فەرموو تەماشا کە ڕۆحی هەیە یا نییە. کەر لە شێر فکری جووڵاندنی ئەبوو. ئەمین بوو، بۆی مەعلووم کرا تەلیسمە. دەستی کرد بەخواردن، برسییەتی هیلاکی کردبوو. لە پاش تێر خواردن لە تەنیشت شێرەکە نووست. شێر فرسەتی دەست کەوت سواری بوو سکی دڕی. بەڕێوییەکەی وت: ئۆبەچی بە تا ئەچم غوسڵ ئەکەم و خۆم بشۆرم. دێمەوە دڵ و گوێی دەردێنم ئەیخۆم. لەگەڵ شێر ڕۆیشت ڕێوی دڵ و گوێی کەرەکەی دەرهێنا خواردی. شێر هاتەوە، هەر چەند گەڕا دڵ و گوێی کەرەکەی ئەدی. بەڕێویی وت: ئەو دوو ئەعزایە کە (بە قسەی) حەکیم بۆ عیلاجی دەردی من دەرمان بوو چیی لێ هات؟ ڕێوی وتی: ئەی پادشا، ئەو کەرە دڵ و گوێی بۆ نەکرابوو. ئەگەر دڵی بوایە کە جێگەی عەقڵە شوێن قسەی من نەئەکەوت. ئەگەر گوێی بۆ دروست بکرایە ئەووەڵ جار نەڕەی تۆی ئەبیست، بە فێڵ و قسەی من نەئەخەڵەتا. مەعلوومە دڵ و گوێی ئەبوو. کاردان وتی: بۆیە ئەم میسالەم گێڕایەوە بۆت مەعلووم بێ من دڵ و گوێم بۆ کراوە، بە قسەی کەم عەقڵێکی وەک تۆ جارێکی کە زەحمەتە من باوەڕ بکەم. ئەم جارە خودا ڕەحمی پێ کردم نزیک بوو بە دەست بێ عەقڵیی ئێوەوە بە هیلاکەت بچم. ناسنی سارد مەکوتە. ڕەفاقەتی من لە دنیاو لە قیامەت لەگەڵ تۆ دروست نییە. کیسەڵ وتی: ڕاست ئەفەرموویت دووریی

ڕەفاقەتی تۆ بە جۆرێ عاجزی کردم زەحمەتە ژیانم - ئەوەی وت و ڕووی کردەوە جێگەی خۆی، بەداغی مەراقەوە مرد. ئەوەیە بەیانی پەشیمانیی لە دەست چوونی (شتێ) مەتڵەب بێ و، هەر کەس ماڵ وەیا ڕەفیقی دەست کەوت لازمە حورمەتی بزانێ، لە دەست خۆی دەرنەکات، وەخوسووس کەم وەفایی لەگەڵ ڕەفیق نەکا.

**نەسیحەتی شەشەم**

پەلەکردن زەرەرە. تەحەممول کردن قازانجە

دابشلیم ڕووی کردە حەکیم بڕەهمەن، فەرمووی: بەیانت فەرموو کەسێ شتێکی دەست کەوێ بەکەم عەقڵی لە دەست خۆی بدات، پەشیمانیی لە دوو دێت و، پەشیمانی دەرمانی دەردی ناکات. بە زوبانی جەنابت مەعلووم کرا. ئومێد دەکەم بەیانی بفەرموو کەسێ لە نیش کردن پەلە بکا زەرەری چۆنەو تەحەممول قازانجی چییە؟ بڕەهمەن فەرمووی: هەر کەسێ بناغەی ئیش لەسەر تەدبیر و سەبر و تەحەممول دروست کات تێکچوونی بۆ کەس مومکین نابێ. لە هەموو شتێک چاکتر سەبر و بێ دەنگییە. هەر کەس حیلمی نەبێ بە ساحێب عەقڵ تەماشا ناکرێت. (حلم) هەڵگێڕیتەوە بە عەرەبی ئەبێ بە (ملح) یەعنی خوێ. تەعامێ کە خوێی نەبێ بێ لەزەتە. کەسێ حیلمی نەبوو وەک خواردنی بێ لەزەت وایە. ئەمری خودا بەوەحی بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هاتە خوارەوە: «ولو کنت فظا غلیظ القلب لانفضوا من حولک». دیسان خودا لە سیفەتی ئیبراهیم (علیه السلام) فەرموویەتی: «ان ابراهیم لاواه حلیم». مەعالووم بوو چاکترینی هەموو شتێک حیلمە. کەسێ حەلیم بوو لای هەموو عالەم خۆشەویستە. پەلەکردن زۆر خراپە. پەلەکردن کاری شەیتانە. هەر کەس پەلەی کرد ئەوەی بەسەر دێت بەسەر عابیدەکە هات. دابشلیم پرسی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

بڕەهمەن وتی: ئەگێڕنەوە عابیدێ بوو لەبەر تەنهایی فکری ژن هێنانی کرد. ئەو حەدیثەی فکر کردەوە: «النکاح من سنتی، فمن رغب عن سنتی فلیس منی». ڕۆیشتە لای ڕەفیقێکی، قسەی ژن هێنانی دەست پێ کرد. ڕەفیقەکەی وتی: فکرێکی جوانت کردووە. ژن هێنان زۆر چاکە. کەسێ کە ژنی هێنا لە گوناە دوور ئەکەوێتەوە. حەدیثە «تناکحوا، توالدوا». وتی: بگەڕێ بۆ ژنێک ئەسڵ بێ، سالح بێ، سک و زا بکات، مێرد خۆشەویست بێ، لە خیانەت دوور بێ. ژنێ کە ئەم ڕەوشتانەی بوو ڕووناکی نەخاتە

مالەوە. وە لە سێ تائیفە ژن خۆپاراستن لازمە. ئەووەڵ (حەننانە)، دووەم (مەننانە)، سێهەم (ئەننانە). حەننانە بێوەژنە کە تەڵاق دراپێ، هەروەقت ئازارێکی لە مێردی تازەی دی فکری مێردە کۆنەکەی ئەکا. مەننانە ژنێکە ساحێب خانوو و پارە بێ. ئەو جۆرە ژنانە حوکمیان بەسەر مێردیانا ئەکەن، حورمەتی مێرد نازانن. ئەننانە ژنێکە لەگەڵ چاوی بە مێردەکەی ئەکەوێ خۆی ئەخۆش ئەخات، دەست ئەکا بە نکەنک. ڕەفاقەتی ئەو جۆرە ژنانە لە زەهری مار خراپترە. عابید وتی: خۆشیی ژن چۆنە؟ ڕەفیقەکەی وتی: ژنی جوان قووەت بە پیاو پەیدا ئەکا. ژنی پیر ڕەگی پیاو سست ئەکا. ژن عومری لە دە هەتا بیستساڵ جێگەی نومێدە. لە بیست هەتا سی ساڵ ئارامی دڵە و لەزەتی ڕۆحە. لە سی هەتا چل ساڵ پێکەوەنەرە. لە چل هەتا پەنجا لە ڕێگەی ئابروو نەچووندایە. لە پەنجا عومری زیاد بوو وەک توزی ڕەشەبا چاو کوێرکەرە، نزیک بوونیان لە زەهر خراپترە. هەناسەیان لە ئاگری جەهەننەم تیژترە. قودوومیان لەبایەقوش شوومترە. جیماع کردنیان هێنانی سیل و زیقونەفەس و کۆکەڕەشەیە. عابید وتی: ڕەفاقەتی چ جۆرە ژنێ چاکە؟ ڕەفیقەکەی وتی: ژنی کەم عومر و گەنج بە تەنها مەقبووڵ نییە. چاکترینی ژن، ژنێکە ساحێب حەیاو ڕوو خۆش و نیش پوخت بێ و، حوسنی جوانی بۆ ئەوە نوور لەسەر نوورە. ژنی جوان و ساحێب حەیا ڕووناکیی ماڵە. ڕەفیقی ڕۆحە. فەقیر ئەکا بە سوڵتان. ئەخۆشی سەرەمەرگ دوور ئەخاتەوە. لە پاش ئەو قسەکردنانە عابید بۆ ژنی جوان ئەگەڕا. تەسادوف ژنێکی ناوداری بە نسیب بوو. ئەو ژنە لە جوانی و حەیادا ڕەفیقی نەبوو. عابید لەگەڵ بوو بە ڕەفیقی ئەو ژنە حەمدو سەنای خودای بەجێ هێنا. دەستی پاڕانەوەی بۆ قاپیی خودا درێژ کرد خودا ئەولادی پێ عەتا بفەرموێ. دوعای قبووڵ بوو. ژنەکە حامیلە بوو. عابید ڕووی کردە ژنەکەی، وتی: ئەی ئارامی جانم، نزیکە خودا ئەولادێکی نێرینەمان پێ عەتا بفەرموێت، ڕووی وەک مانگی چواردە وا بێ. ناوێکی موبارەکی ئەنێم. عومری خۆم لە خزمەتیا سەرف ئەکەم. فێری خوێندنی ئەکەم. لە مەکتەب ڕێگەی قانوون و قازێتیی تەعلیم ئەکەم. بە موددەتێکی کەم ئەبێت بە یەکێکی ناودارو ژنێکی لایقی بۆ دێنم. خودا ئەولادیان ئەداتێ و ئەولادەکان گەورە ئەبن، ژن دێنن و زوریەتمان زۆر ئەبێ. ناومان تا قیامەت ناکوژێتەوە. ژنەکە وتی: ئەی ڕەفیق، ئەم قسەکردنانە موناسب بە حاڵی جەنابت نییە، چونکە ئەم حەملە مەعلووم نییە منداڵ بێ، وە ئەگەر منداڵیش بێ مەعلووم نییە کوڕ بێ، وە ئەگەر کوڕیش بێ مەعلووم نییە بژی. ئەم قسە کردنانەت وەک قسەی جاهیل وایەو ئاخری ئەم حەملە مەعلووم نییە. قسەی تۆ و فکری عابیدەکە دۆشاو و ڕۆنی بە

ڕووی خۆیا ڕژاند، وەک یەکە. عابید پرسیی چۆن بووە؟

**حیکایەت**

ژنەکە وتی: ئەگێڕنەوە عابیدێ دراوسێی بازرگانێ بوو. بازرگان لە بەر دراوسێیەتی مولاحەزەی عابیدەکەی زۆر ئەکرد. بازرگان موعامەلەی دۆشاو و ڕۆنی ئەکرد. ڕۆژێ میقدارێکی بۆ عابید تەعیین کردبوو. عابید میقدارێکی ئەخوارد و میقدارێکی هەڵئەگرت. ڕۆژێ تەخمینی کرد وتی ئەم کوپەیە بە دە حوققە پڕ ئەبێت. وەقتێ کە پڕ بوو ئەیفرۆشم بە دە درهەم، دە درهەمەکە پێنج مەڕی پێ ئەکڕم، ئەو پێنج مەڕە هەریەکە دوو بەرخیان ئەبێ، بە ساڵێک ئەبنە بیست و پێنج، بە دە ساڵ ئەبنە سێ هەزار. ئەو وەقتە میقدارێکی ئەفرۆشم و هەرچی لازماتی ماڵ بێ ئەیکڕم. ژن دێنم. لە پاش ساڵێ ژنەکە کوڕێکی ئەبێت، فێری خوێندن و عیلمی ئەکەم. لە پاش یەک دوو ساڵ مومکینە قسەم بشکێنێ و، هەر وەقت قسەی شکاندم بەو دارە دارکاریی ئەکەم. بەو خەیالاتەوە دارەکەی هەڵگرت، ڕووی کردە کوپە دۆشاوەکە، وایزانی کوڕەکەیەتی بێ ئەدەبیی کردووە، دارێکی کێشا بە کوپە دۆشاوەکەدا، لەناو تاقدا بوو، هەموو دۆشاوەکە بەسەرو چاوی عابیدا هاتە خوارەوە. ئەو هەموو خەیالاتانەی وەک بای هیزە ڕۆیشت و، منیش بۆیە ئەم قسەیەم گێڕایەوە، لە شوێن ئەگەر و مەگەر نەگەڕێیت. ئەگەر مەگەر جووت بکرێ کاشکیی لێ ئەبێ. کەسێ عەقڵی بوو ئەم جۆرە خەیالانە ناکات. عابید بە قسەی ژنەکە لە خەوی غەفڵەت خەبەر بووەوە، تەرکی ئەو جۆرە قسانەی کرد. وەقتێ حەملی ژنەکە تەواو بوو خودا ئەولادێکی نێرینەی پێ عەتا کردن. عابید وەک گوڵ گەشایەوە. شەو و ڕۆژ منالەکەی بەجێ نەئەهێشت. تەسادف ڕۆژێ ژنەکە چووبوو بۆ حەمام، بێشکەی لای عابید جێ هێشتبوو. لە پڕ مویاشیری حاکم چووە ماڵی عابید، وتی: پادشاه بانگت ئەکات. عابید وەستانی مومکین نەبوو، لەگەڵ مویاشیر ڕۆیشت. ماڵی عابید خورماسیچانێکیان بۆ گرتنی مشک و جانەوەر بەرەڵای خانووەکە کرابوو. لەگەڵ عابید دەرگای داخست ڕۆیشت، مارێ لە خانووەکەدا هاتە دەرەوە فکری ئەوەی کرد کوڕی عابیدەکە بگەزێ، خورماسیچان پەلاماری مارەکەی دا، گرتی، پارچە پارچەی کرد. کوڕی عابید لەبەر موحافەزەی خورماسیچان لە دەست مار نەجاتی بوو. وەقتێ عابید ڕۆیشتەوە تەماشای کرد دەمی خورماسیچانەکە خوێناوییە، وای فکر کرد خوێنی کوڕەکەیەتی بە دەمیەوە، لە پێش ئەوەی تەماشای کوڕەکە بکات، ئەو دارەی کە بە دەستیەوە بوو کێشای

بە پشتی خورماسیچانەکەدا، خورماسیچان مرد. لەگەڵ چووە پێشەوە چاوی بە کوڕەکە کەوت سەلامەتە، مارێکی دووگەزی لە ئەترافی کوڕەکە (دی) پارچە پارچە کراوە. بۆی مەعلووم کرا خورماسیچان مارەکەی کوشتووە. عابید زۆر پەشیمان بووەوە، فکری کرد ئەگەر لە ئەووەڵەوە ورد بووماییەوە تووشی ئەم جۆرە مەراقە نە ئەبووم. تەسادوف ژنەکە لە حەمام ڕۆیشتەوە تەماشای کرد خورماسیچان بە مردوویی لەبەردەمی عابید کەوتووە، عابید بۆی ئەگری و مارێکی دووگەزیش کوژراوە. ژنەکە سوئالی گریانی لە عابید کرد. عابید مەسئەلەکەی بۆ گێڕایەوە. ژنەکە وتی: لە ئاخری عومرتا خودا ئەولادێکی پێ عەتا فەرموویت، شوکری نیعمەتی ئەوەیە بەجێت هێنا؟ لە واسیتەی خورماسیچانەکەوە کوڕەکە لە پێوەدانی ئەو مارە ئەجاتی بوو، لە جێگەی چاکەی کوشتت. ڕۆژی ئاخرت جوابت چییە؟ عابید وتی: لە خۆم مەعلومە، لە واسیتەی عەجەلەکردنەوە تووشی ئەو گوناهە بووم. زۆر پەشیمان بوومەتەوە، تۆش ئەوەندە لۆمەم مەکە. ژنەکە وتی: زۆر کەس وەک تۆ پەلەیان کردووە و لە ئیش ورد نەبوونەوە و ئەموستی حەسرەتیان بە دان گەستووە. مەسئەلەی تۆ وەک مەسئەلەی پادشاکە وایە لە کوشتنی بازەکە پەشیمان بۆوە چەند ساڵ بە دەرد و غەمەوە تلایەوە. عابید پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

ژنەکە وتی: ئەگێڕنەوە پادشایەک بوو زۆر ئارەزووی ڕاوی ئەکرد. عومری خۆی بە ڕاوکردن ڕائەبوارد. بازێکی تیژ باڵی بوو باڵندە لە ژێر چنگی دەرنەئەچوو، لای پادشاه زۆر خۆشەویست بوو. پادشاه بە نەفسی خۆی خزمەتی ئەکرد. ڕۆژێ پادشاه لە ڕاوبوو، ئاسکێکی بەرچاو کەوت، ئولاغی بە شوێن ئاسکدا توند کرد، لە لەشکر دوور کەوتەوە، تووینەتی زۆری بۆ هێنا. گەیشتە بن شاخێک. تەماشای کرد تنۆک تنۆک ئاو دێتە خوارەوە. پادشا جامی نایە بەر ئاوەکە. وەقتێ پڕ بوو هەڵی گرت بیخواتەوە، بازەکە باڵی کێشا بەجامەکەدا ڕژاندی. دووەم جار پادشا جامی نایە بەر ئاوەکە. لەگەڵ پڕ بوو پادشا هەڵیگرت بیخواتەوە، دیسان بازەکە ڕژاندی. پادشاه لەبەر تووینێتی خەیاڵی لەسەرا نەمابوو، بازەکەی کێشا بە زەوی کوشتی. تەسادوف ڕیکابدارەکە گەیشتە لای پادشا، بازەکەی بە مردوویی چاوپێ کەوت و هیلاکیی پادشای بۆ مەعلووم بوو، مەتارەی ئاوی دەرهێناو جامەکەی شۆری. پادشاه وتی: ئەی ڕیکابدار، ئارەزووی ئاوی ئەو شاخە ئەکەم، هەر ئێستا بچۆ لەو ئاوە جامەکە پڕ بکە بۆم بێنە، ڕیکابدار جامی برد، ڕووی کرد بۆ سەر

ئاوەکە. تەماشای کرد کانییە بچکۆلەیەک لەسەر شاخەکەیە، ئەژدەهایەکی گەورە لەناو ئاوەکەدا مردووە، تەئسیراتی گەرمیی ڕۆژ لە ئەژدەهاکەی داوە. زەهری تک تک تێکەڵ بە ئاوەکە ئەبێت. ڕیکابدار ئەو حاڵاتەی چاو پێکەوت، گەڕایەوە، مەسئەلەی بۆ پادشا بەیان کرد. جامی لە مەتارە پڕ کرد، دایە دەست پادشاه. پادشا ئاوەکەی وەرگرت، بردی بۆ دەمی هەناسەی هەڵکێشا. ڕیکابدار سوئالی کوشتنی بازەکەی پرسیی. پادشاه ڕژاندی، دوو دەفعە ئاوەکەی گێڕایەوە، وتی بە دەستی خۆم ڕۆح لەبەرێکی وەک بازەکەم کوشت. واسیتەی بازەکە نەبوایە زەهرەکەم ئەخواردەوە. ڕیکابدار وتی: ئەی پادشاه، لازم بوو ئاگری غەزەبت بە ئاوی حیلم بکوژانایەوە، وەهەموو ڕەعیەت لازمە ژینی جەنابت لە باز بناسن. پادشا وتی: بەڕاستی هەتا مردن چاکەی بازەکەم لە فکر ناچێتەوە. زۆر پەشیمان بوومەوە. دەرمانی پەشیمانی هەر مەراقە. دەستی بە دەستا ئەماڵی لە پەشیمانییا. ژنەکە وتی: بۆیە ئەم میسالەم هێنایەوە زۆر کەس وەک تۆ پەلەیان لە ئیش کردووە و دەرمانی پەشیمانییان دەست نەکەوتووە. ئەوانەی پەلەپەل ئەکەن دایم مەحرومن. عابید وتی: ڕۆحی شیرینم، بەم حیکایەتە سەبووریی دڵی منت هێنا، برینی دڵی منت دەرمان کرد. بۆم مەعلووم کرا شەریکم لەم جۆرە گوناهە لە دونیادا زۆرە، هەر وەک قیسسەی ئەوان ئەگێڕنەوە، مەسئەلەی منیش لەسەر کاغەز ئەنووسن و هەر کەس تەماشای کرد بۆی مەعلووم ئەبێ پەلەپەل ئاخری پەشیمانییەو، هەر کەس خۆی بە عاقڵ بزانێ پەلەپەل لە ئیش ناکا. لازمە هەموو کەس بەبێ تەدبیر دەست بۆ ئیش درێژ نەکەن. سەبر کردن کلیلی دەرگای مەقسەدە. بە هێواش ئیش کردن تێکچوونی نییە.

**ئەسیحەتی حەوتەم**

به عەقڵ و تەدبیر نەجات بوون لە دەست دوشمن

دابیشلیم وتی: لە پەلەپەل کردن و پەشیمان بوونەوەی بە زوبان جەنابت بۆم مەعلووم کرا. ئومێد دەکەم بەیانی وەسیەتی حەوتەم، کەسێ دوشمن ئەترافی بگرێ، ڕێگەی نەجاتی بە چ فکرێ دەست ئەکەوێت؟ ئەگەر بۆ دروست بوونی ئیشی خۆی لەگەڵ یەکێ لە دوشمنەکان ڕێکخست بە عەیب تەماشا ناکرێ؟ بڕەهمەن جوابی دایەوە: وتی: ئەی پادشا، دۆست و دوشمن هەتا سەر باقی نامێنێ. زەمان گۆڕاندنی زۆرە. زەمان وەک هەوری بەهار تەماشا ئەکرێت، وەقت ئەبێ خۆشە. خۆشەویستی و دوشمنی ئەهلی زەمان لەکەم ئیعتیباری، وەک ئەم میسالانە وایە: (١) نزیکبوون بە پادشا، (٢) جوانیی

گەنجان، (٣) دەنگی تازە پێگەیشتووان، (٤) وەفای ژنان، (٥) قسەی شێتان، (٦) سەخاوەتی سەرخۆشان، (٧) خەڵەتاندنی دوشمنان. هەر کەس عەقڵی بێت نزیک نابێ بەوانە بەیان کرا. زۆر ڕێک کەوتووە چەند ڕەفیقێک جانی جانی بوون، ئاخری بە واسیتەی نەفس و شەیتانەوە بوون بە دوشمن. وەهەم ڕێک کەوتووە دوو دوشمن بەواسیتەی مەقسەدێکەوە بوون بە ڕەفیق، دوشمنایەتیی کۆنیان لە فکر نەماوە. هەر جۆرێ وا بێ دوشمن و ڕەفیقی زەمان دەوامیان نییە. لازمە تا سەر نە لە دوژمن بترسیت و نە لە ڕەفیق ئەمین بی. دووربینیی ئەحواڵ لە هەموو شتێک چاکترە، هەروەک مشکەکە بە تەدبیر لە دەست پشیلەکە نەجاتی بوو.

دابیشلیم وتی: چۆنە؟

**حیکایەت**

بڕەهمەن وتی: ئەگێڕنەوە لە ئێران شارێک هەیە ناوی (بەردەع)ە. ئەو شارە باغ و دارستانی زۆرە. لەبن دارێکی بەرز مشکێ هێلانەی دروست کردبوو. لە نزیک دارەکە پشیلەیەک جێگەی گرتبوو، تەسادوف ڕۆژێ کابرایەکی ڕاوچی لە نزیک هێلانەی مشکەکە داوی نابووەوە، نەختێ گۆشتی کرد بە تەڵەوە. بەجێی هێشت. لەگەڵ پشیلەی تەمەعکار بۆنی گوشتی کرد ئارامی نەما، چووە سەر گۆشتەکە. ئێستا دەمی لە گۆشت نەدا بوو بەتەڵەوە. مشک لەولاوە بۆ خواردن لە هێلانەکە چووە دەرەوە، بەو لاو بەو لای خۆیا ئەڕوانی. چاوی بە پشیلە کەوت، هێزی ئەژنۆی نەما، لە جێگەی خۆی ڕاوەستا. بە تەمای ژینی نەبوو. لەگەڵ ورد بووەوە، بۆی مەعلووم کرا پشیلە بەتەڵەوە بووە. مشک فکری بوو بگەڕێتەوە. تەماشای کرد خورما سیچانێ ڕێگەی گرتووە، فکری هەیە پەلاماری مشک بدات. مشک فکری بوو سەرکەوێتە سەر دارەکە، تەماشای کرد قەلەڕەشێ بەسەر دارەکەوەیە. مشک لەو ئاوەدا سەرسام بوو، فکری لە سەرا نەما، چونکە ئەڕۆیشتە پێش دەمی پشیلە ئەخورا، وە ئەگەڕایەوە بۆ جێگەی خۆی خورماسیچان ئەیخوارد. سەر ئەکەوتە سەر دار، قەلەڕەشەکە ئەیخوارد. دەرگای بەڵای لە سێ جێگەوە بۆ کرابووەوە. مشک فکری کرد وتی: کەسێ حیلم و سەبری نەبێ بە عاقڵ دانانرێ. کەسێ عاقڵ بێ نە بە ماڵی دونیا لووت بەرز ئەبێ و نە بەزەحمەتی زەمان ئەناڵێ. کەسێ عەقڵ موعاوەنەتی بکا، تووشی زەحمەتی دونیا نابێ. هەموو شتێک بەتەدبیر دروست ئەکرێ. دڵی عاقڵ لازمە بەحر بێ لە هەموو جۆرە بە قیمەتێکی تیا دەست کەوێت. فکری کرد

سولح لەگەڵ پشیلە بکەم بۆ من چاکە، چونکە بەتەڵەوە بووە موحتاجی منەو منیش بەواسیتەی پشیلەوە نەجاتم ئەبێ. ئەگەر پشیلە قسەی من بەڕاست بزانێ و بە قسەم بکا، هەردوکمان بەواسیتەی ڕاستییەوە نەجاتمان ئەبێ. لەپاش ئەو تەدبیرە ڕووی کرد بۆ لای پشیلە، وتی: ئەی دوشمنی تازە ڕەفیق، حاڵت چۆنە؟ پشیلە بە دەنگی مەحزوونەوە وتی: نابینیت گەردنم بە داوی بەڵاوە بووە و ڕێگەی نەجاتم دەست ناکەوێت، نزیکە بمرم؟ مشک وتی: کارێکم هەیە وەقت موساعەدە ناکات بەیانی بکەم. پشیلە وتی: هەرچی لە دڵتایە بەیانی بکە، شاردنەوەی جوان نییە. مشک وتی: قسەی ڕاست ئەوەیە من دائیما ئارەزووی ئەوەم بوو تۆ نەخۆش و بەدەردی غەممەوە بتلێیتەوە. عاجزیی تۆ جەژنی من بوو. ئەمما ئێستا لەو بەڵایەدا شەریکی تۆم، چونکە ڕێگەی نەجاتم وەقتێ دەست ئەکەوێ تۆ نەجات بدەم، لەبەر ئەوە هاتومە بەر دەمت قسەی من نەشکێنی. موشاهەدەی ئەوە ئەکەیت بە فێڵ وا ئەکەم. بۆ ڕاستیی قسە تەماشا کە، لە دوامەوە خورماسیچان حازرە بۆ من و، بەسەرمەوە قەلەڕەشکەیەک خۆی حازر کردووە بۆ گرتنم. هەردوکیان فکریان بوو من بگرن. ئێستا کە نزیک بە تۆ بووم، هەردوکیان نائومێد بوون. ئەگەر دڵم پاک ئەکەیتەوەو ئەمینی لە تۆ حاسڵ بکەم، منیش لە دەست دوشمن نەجات ئەبم و تۆیش لە ژێر بەڵا نەجاتت ئەدرێ و ئەتوانم مووی داوەکە بەدان ببڕم. لە قسەی مشک پشیلە کەوتە فکری دوور و درێژەوە. ئارەزووی بوو ڕاستیی قسە تەجرەبە کات، غائیلەی پەیدا کرد. مشک وتی: فکری چی ئەکەیت؟ قسەی من بە ڕاست بزانە. ترس و غائیلە لە قسەی من مەکە. ئەم وەقتە بە فرسەت بزانە. هەروەک من دڵ بە وەفای تۆ خۆش ئەکەم، تۆیش بە بوونی من دڵ خۆش کە، چونکە نەجاتی هەردوکمان بەواسیتەی یەکەوە مومکین ئەبێ. مەسەلەی من و تۆ وەک سەفینە و سەفینەوان وایە. سەفینە بەواسیتەی سەفینەوانەوە دێتە قەراغ بەحر. سەفینەوان بە واسیتەی سەفینەوە مەعیشەت پەیدا ئەکات و پەلەکردنی من لەبەر وەخت نەمانە. ئەترسم درەنگ ببێ فرسەت لە دەست دەرچێت. پشیلە وتی: قسەی تۆ بۆنی ڕاستیی لێ دێت و، سولح کردن موبارەکە. شەرت بێ خیانەت دەرحەق تۆ نەکەم و هەر ئەمرێک بکەیت بەسەر سەر قوبوولی بکەم. ئەمرت چییە، بەیانی بفەرموو. مشک وتی: شەرت ئەوەیە کە هاتمە پێش دەمت بە ئیحتیرامێکی تەواو قیام بکەیت و بە دەنگی بەرز خۆشی چۆنی بکەیت، وە هەتا دوشمنەکانم بزیان مەعلووم ببێ ئێمە ئاشنایەتییەکی کۆنمان هەیە، ئەوان لەمن نائومێد ئەبن و منیش بە ئیسراحەت داوەکەی تۆ ئەبڕم. مشک قسەی تەواو کرد. پشیلە قوبوولی کرد. مشک چووە پێش دەمی پشیلە،

پشیله لەبەری هەڵسا، بەدەنگی بەرز خۆشی چۆنیی لەگەڵ کرد، وتی: قودوومت خێرە، هەردوو چاوم و، دڵم بەهێتی موبارەکت ڕوون بووەوە. خورما سیچان و قەلەکە دەستیان نەگەیشتە مشک، بەنانومێدی گەڕانەوە. وەقتێ مشک لەدەست هەردوو دوشمنەکەی نەجاتی بوو، بەبڕینی داوەکە خەریک بوو، وردە وردە داوەکەی ئەبڕی، فکری ئەکرد چۆن لەدەست پشیلە خۆی نەجات بدات. پشیلە بۆی مەعلووم کرا مشک ترسی هەیە، خەریکە داوەکـە تەواو نەبڕێت، بانگی کـرد، وتی: وا ئەزانم هیـلاک بوویت، ئارەزووی بڕینی داوەکەت نەماوەو بە مەقسەدی خۆت گەیشتیت، وەفاو شەرتت لەفکر چووەوە. من ئەیزانم وەفا لە قوتووی هیچ عەتارێکدا دەست ناکەوێت و لە خەزێنەی زەمانەدا نەماوە. هەروەک سیمرغ و کیمیا ناویان هەیە، ڕەنگیان نییە. مشک وتی: بێ وەفایی لەمن نابینی و ناوی چاکەی من لەگەڵ تۆ بە تەشریغ ئەگێڕنەوە. من ئەزانم وەفا زنجیرێکە پچڕاندنی زۆر زەحمەتەو، هەر کەسێ وەفای نەبێ لە عەقڵ و دیانەت دوورە. هەر کەسێ لە قسەو وەفا دوورە، لە ڕەحمـەتی خودا نائومێدە. پشیلە وتی: وەک ئەزانی شەرت و وەفـا ڕێگەی عـاقڵانە، بۆچی لە بڕینی داوەکە سستی ئەکەی. وەهەرکەس شەرت و وەفا بشکێنێ، ئەوەی بەسەر دێت بەسەر ژنە لادێییەکە هات.

مشک پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

پشیلە وتی: ئەگێڕنەوە لە ئەترافی ئێران پیاوێکی فەللاح بوو، ئەو پیاوە ساردو گەرمیی زەمانی زۆر بەسەر هاتبوو، وە ژنێکی زۆر جوان و لایقی بوو. تەسادوف ئەهاتی ڕووی کردە کابرا، فەقیری بەرۆکی گرت، دەستمایەو جووتی فەلاحەتی نەما. هەر جۆرێ بوو پێی تەوەککولی لە دامێنی قەناعەتەوە پێچا. دونیـای غەددار چەند عـاقـڵان و خانەدانی بۆ نانێ کوشتووە، وەچەند کەم عەقڵاتێکی لە ناو ناز و نیعمەتدا خستووە. خوڵاصە کابرای فەللاح ئیقتیداری تۆو چەندن و زەراعەتی نەما. بەبێ کار و کاسبی لە ماڵەوە دانیشت. ڕۆژێ ژنەکەی وتی: هەتا کەی وەک تەمەڵەکان لە جێگەی خۆت ڕاست نابیتەوە. ڕابواردنی بەم فەقیرییە مردن سەد قات چاکترەو، لە هەموو عالەمەوە مەعلوومە. ڕزق خودا ئەینێرێت، ئەمجا بەواسیتەی کەسابەتەوە نان پەیدا ئەکرێت. ئێستا چاک وایە هەر جۆرێ ئەبێ هەوڵی کاسبی بدەیت. وتوویانە: دەستی ماندوو لەسەر سکی تێرە. کابرا وتی: ئەی ڕۆحی شیرینم، قسەکانت هەمووی ڕاستە و خۆت ئەیزانی لەم

دێیەدا ڕەفیقم لە دەوڵەمەندییا نەبوە. ئەوانەی دراوسێ بە ئێمە بوون، یەکە یەکە لە شوان و سەپانیی منەوە پێگەیشتوون، وە مەعلومە دەستمایەم نەماوە. ئیقتیدارم نابێ فەلاحەت بکەم. لە جووتیاری و گاوانی زیاتر هیچم بۆ مومکین نابێ. منیش جووتیاری، شوان و سەپانم لا ناشیرینە و، گۆشتم لە جێگەی خۆم بڕژێت ناوی سووک لەسەر خۆم دانانێم. وەئەگەر تۆیش نارەزوو ئەکەیت من کاسبی بکەم، لازمە خۆت بێچیتەوە، بڕۆین تەرکی وەتەن، هەر جۆرێ بێ کاسبی ئەکەم و نان پەیدا کردنم لەسەر شان گران نابێ. ژنەکە لەبەر موحتاجی قوبووڵی ڕێگەی غەریبیی کردو لەگەڵ مێردەکەی خۆیان کۆ کردەوە، ڕوویان کرد بۆ ڕێگەی بەغداد. میقدارێ ڕێگە ڕۆیشتن. لە ژێر سێبەری دارێکدا دانیشتن، ماندوویان دەرچێت. پیاوەکە وتی: ئەی نووری چاوم، فکرم وایە ڕوو بکەینە شارێ، نە ئێمە کەس بناسین و نەکەس بمانناسێت. مومکینە ئەهلی ئەو شارە زۆرزان و فێڵباز بن، وە خوسووس خودا ئەم جوانییەی لە ڕووی تۆ نەقش کردووە. لەوە ئەترسم بە زوبانی لووس وەیا بە ماڵی زۆر تۆ تەفرە بدەن دەست لە ڕەفاقەتی من هەڵگری و دانیمی مەراق بخەیتە دڵمەوە. ژیانی من لە دوای تۆ زۆر گرانە. ژنەکە جوابی دایەوە وتی: تەرکی ئەو جۆرە خەیالاتە بکە، وە ئەگەر من نارەزووی ڕەفاقەتی تۆم نەبوایە تەرکی وەتەنم نەئەکرد، وە شەرتی ئەووەڵ شەوی زاواو بووکی ئەگەیەنمە قیامەت و، دڵخۆشیی مێردەکەی دایەوە، بە سوێند دڵی تەئمین کرد. پیاوەکە سەری کردە سەر ڕانی ژنەکە، خەوی پیاکەوت. تەسادوف سوارێ ئەسبابی شاهانەی لەبەر کردبوو. لە دوورەوە بریسکەی ئەهات. نزیک بە ژنەکە بووەوە. ژنەکە وایزانێ یوسفی میسرە زیندوو بووەتەوە، نەک بە دڵێ، بە هەزار دڵ، عاشقی سوارەکە بوو. وەلەگەڵ سوارەکە چاوی بە ژنەکە کەوت وایزانی حۆریی بەهەشتە هاتۆتە سەر دونیا. هەردوکیان نارەزووی یەکیان کرد. ئەو سوارە کوڕی پادشای ئەو ئەترافە بوو، بەواسیتەی ڕاوکردنەوە لە لەشکر دوور بووبۆوە، ڕووی کردە ژنەکە، وتی: ئەی حۆری، لە کام دەرگاوە لە بەهەشت هاتوویتە دەرەوە، چۆن گەیشتوویتە ئێرە؟ ژنەکە هەناسەی هەڵکێشا، وتی: لە چاوی فرمێسکاوی و لە دڵی خوێناویم بپرسە. ئەمە لیباسی جەژنە پۆشیومە. لە ئەووەڵی عومرم تا ئێستا زەهر ئەخۆمەوە بە دەست ئەم پیرەمێردەوە، وە لەبەر فەقیری تەرکی وەتەنمان کردووە، وە بۆ ئیسراحەت لە ژێر ئەم سێبەرەدا دانیشتووین. کوڕە پادشاە وتی: حەیفە وەک شەهباز خۆت ئەسیری قەفەس کردووە. چاک نییە عومری خۆت لەگەڵ ئەو پیرەناشیرینە سەرف بکەیت و بە فەقیری ڕوو بکەیتە غەریبی. وەرە لەگەڵ من، ئەبێت بە شاژنی شارەکەم، دائیما لەناو ناز و نیعمەتی

دونیادا ئیسراحەت بکەیت و، شەوو ڕۆژ بە دەنگی چاڵغی و عوودو کەمانچە کەیف نەکەین، ژنەکە بەو قسانە شەرت و قسەی مێردەکەی لە فکر نەما. سوارەکە بۆی مەعلووم بوو ژنەکە ئارەزوو نەکات، وتی: وەقت درەنگە، وەرە لە پشتمەوە سوار بە با بڕۆین. ژنەکە سەری مێردەکەی خستە زەوی، ڕاست بۆوە لە پشت سوارەکەوە سوار بوو، دەستی مەحەبەتی لەکەمەری مەعشوقەی توند کرد. لەو وەقتەدا کابرا خەبەری بۆوە، تەماشای کرد ژنەکەی سواری پشت کوڕێکی جوان بووە، بانگی کرد: ئەی بێ وەفا، خەریکی چیت؟ شەرت و وەفا لای ژن هەر وایە. ژنەکە جوابی دایەوە، وتی: دەمی خۆت هیلاک مەکە، لە مەحبووبان حوسنی عەهد تەڵەب کردن وەک بە یەک گەیشتنی سوهەیل و سوڕەییا وایە. ڕابواردن لەگەڵ ناشیرین وەک ڕواندنی گوڵ لە ژیلەمۆدا وایە. مێردەکەی وتی: لە ڕێگەی ئینساف چوویتە دەرەوە. سوێندەکانت شکاند. هوشیار بە خێر نایەتە ڕێگەت، پەشیمان ئەبیتەوە. ژنەکە دەستی لە جوانەکەوە ژەند، وتی: خێرا بڕۆ، لە بۆڕەبۆڕی ئەو بەرازە نەجاتم بدە، کوڕە پادشا ئولاغی توند کرد، ڕۆیشت، لە پێش چاوی فەللاح گوم بوون. فەللاح بە دڵێکی عاجزەوە کەوتە ڕێگە، فکری بێ وەفاییی ژنەکەی ئەکرد. وتی: نیعتیمادم بەقسەی ژن کرد، تەرکی وەتەنم کرد. ئێستا نەڕووی وەتەن نە قووەتی ڕێگەم هەیەو، ئاخری کارم چۆن ئەبێ! لەولاوە کوڕە پادشاە و ژنەکە میقدارێ بە قسەکردن خەریک بوون، زۆر یەکتریان لا جوان بوو. تەسادوف ژنەکە بۆ ئیشی سەر ئاو لە کوڕەکە دوور کەوتەوە. یەک شێر لەناکاو پەیدا بوو، نەڕاندی، پەلاماری ژنەکەی دا هەڵیدڕی، کوڕەکە خۆی هاویشتە سەر ئولاغی، لە ترسا ئاوڕی بۆ پشتی نەدایەوە، ڕۆیشت. میقدارێکی بەین بوو، فەللاح گەیشتە سەر ئاوەکە، ئەختێ ئاوی خواردەوەو ئیسراحەتی کرد، بۆ غەریبی و فەقیریی خۆی ئەیناڵاند. ورد بووەوە شوێن پێی ژنەکەی ناسییەوە، بە شوێن پێی ژنەکەدا ڕۆیشت. تەماشای کرد میقدارێ ئێسقان و مووی سەری ژنەکە کەوتووە و جێگە چنگی شێر لە زەوییەکە لەگەڵ خوێن تێکەڵ بووە. فکری کردەوە، بۆی مەعلووم کرا بە واسیتەی شەرت شکاندنەوە ژنەکە بە چنگی شێر کوت کوت کراوە. بۆ مردنی ژنەکەو بۆ فەقیری و غەریبیی خۆی دەستی کرد بە گریان. پشیلە وتی: تۆیش بزانە هەر کەس وەفا و شەرتی شکاند تەوقی بەلا ئەچێتە گەردنی. مشک وتی: من ئەزانم شکاندنی شەرت و وەفا لە عاقڵان دوورە. خۆشەویستی و ڕەفاقەتی تۆ ئەو وەقتە مەعلووم بوو، بەواسیتەی تۆوە دوشمنەکانم ڕۆیشتن، وە لەسەر من لازمە داوەکەی تۆ بە تەواوی ببڕم، ئەمما گرێیەک لە دڵما پەیدا بووە، وەهەتا گرێیەکە بە تەدبیر ساف نەکەم بە

تەواوی داوەکەت نابڕێت. پشیلە وتی: وا دیارە لەمن ئەمین نەبوویت و بە سوێندخواردنم دڵ ساف نەبوویت. ڕجا ئەکەم فکری لەمەو پێش مەکە. دوشمنایەتیی کۆن فکر مەکەرەوەو، هەردوکمان لە تازەوە ڕەفاقەت و خۆشەویستیمان پەیدا کردووەو، بە خەیاڵی نەفس و شەیتان خەتەرە پەیدا مەکە. ئومێدم وایە شەرتت نەشکێنی و سوێند خواردنت بە درۆ دەرنەچێ. مشک وتی: ئەو گرتیە کە لە دڵمایە لە وەفا شکاندن دوورە. فکرم وا نییە داوەکە بەساغی جێ بێڵم و تۆ لە دەست بەڵا نەجات نەدەم. پشیلە وتی: فکرت چییە، ئاشکرای کە. مشک وتی: ڕەفیقی ئەم زەمانە دوو جۆرە. جۆرێکیان دڵ سافن، قسەو موعامەلەیان ڕاستە. بەبێ تەمەع هاتوچۆی ڕەفیقی ئەکات. جۆرێکیان بۆ تەمەعی دونیا و بۆ خواردن ئەبن بە ڕەفیق. وەقسە ئاشکرا کردن لە ڕەفیقی جانی جانی مومکین ئەبێ و، ئاشکرا کردنی قسە لە ڕفیقی نانی نانی ئابڕووچوونە، وەمنیش ئەووەڵ لازمە پارێزگاریی ڕۆحی خۆم بکەم، وە دووەم شەرت و وەفا لازمە بەجێ بێنم، چونکە بەواسیتەی تۆوە لە چنگ دوشمن نەجاتم بوو، وە منیش تۆ لە ژێر بەڵا نەجات ئەدەم. پشیلە وتی: واسیتەی گرتیی دڵت چییە، چونکە تۆ لە نیهایەتی زیرەکیدایت، وە هەتا ئێستا من شارەزا نەبووم. تۆ بووی بە کلیلی دەرگای عەقڵ. مشک وتی: هەر دەردە دەرمانێکی بۆ دانراوە. فکرم وایە داوەکە یەکەیەکە ببڕم و یەکێکی بێڵمەوە. ئەو یەکە بۆ نەجات بوونی خۆم بەکار دێ. پشیلە بۆی مەعلووم بوو مشک زۆرزانە، بۆی ناخەڵەتێ. ئەو شەوە بە حەپسی مایەوە. لەگەڵ ڕۆژ بووەوە ڕاوچی ڕووی کردە تەڵەکە. پشیلە کەوتە پەل. نزیک بوو دەستی ڕاوچی بگاتە پشیلە. مشک داوەکەی بڕی، پشیلە لە ترسا سەرکەوتە سەر دارەکەو مشک ڕۆیشتە کونەوە. ڕاوچییەکە تەماشای کرد داوەکە کوت و پچڕ بووە، بە نائومێدی گەڕایەوە. میقدارێکی بەین بوو، مشک سەری لە کون بردە دەرەوە، چاوی بە پشیلە کەوت، گەڕایەوە. پشیلە بانگی کرد: ئەی ساحێب وەفا، خۆت گوم مەکە. لەبەر چی ئەترسیت! چاکەی تۆ لەبەر چاومە، بوویت بەباعیسی نەجات بوونم. مژدە بە ئەهلی خۆت بدە بناغەی خۆشەویستیمان دامەزراو، چاکەی تۆ چۆن ئەدا بکەم. مشک زاتی نەکرد لە کون بچێتە دەرەوە. فکری کردەوە، وتی: چاک وایە دەست لە ڕەفاقەتی هەموو کەس هەڵگرم، لە جێگەیەک بە تەنها بژیم. سەلامەتی لە تەنهاییدایە. وەئەگەر ڕەفاقەت بکرم لەگەڵ ئاوجنسی خۆم دروستە. پشیلە بانگی کرد: تازە ڕەفیق، خۆف لەمن مەکەو لە نزیک بوونم مەترسە. حوکەما فەرموویانە: کەسێ ڕەفیقێکی بەزەحمەت دەست کەوت، ناشیرینە لە دەست خۆی دەرکات. تۆ بوویت بەواسیتەی زیندوو

بوونەوەی من، وەتا بەڕۆح زیندوو بم چاکەی تۆم فکر ناچێ. سوێندی زۆری خوارد، مشک گوێی نەدایە. مشک جوابی دایەوە: لە ئیجادبوونمانەوە تایفەی ئێمە و ئێوە بە یەک دوشمن بوون و تا قیامەت نابن بە دۆست، وە ڕەفیقیی من و تۆ ڕێک ناکەوێ. وەهەر کەس ڕەفاقەتی لەگەڵ ناوجنسی خۆی نەگرت ئەوەی بەسەر دێت بەسەر بۆقەکە هات.

پشیلە پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

مشک وتی: ئەگێڕنەوە لە کەنار جۆگە ئاوێ مشکێ هێلانەی دروست کردبوو. بۆقێ دراوسێی مشک بوو. ڕۆژێ بۆق لە کەنار جۆگەکە دەستی کرد بە قڕەقڕ. دەنگی لە دەنگی بارکەڕۆ ناخۆشتر بوو. تەسادوف ئەو ڕۆژە مشک خەریکی بەزم بوو، لە دەنگی بۆق چووە دەرەوە. بە چەپڵە لێدان و سەر جووڵاندن تێریک بە بۆق بوو. چەپڵە لێدان و سەر جووڵاندنی مشک لای بۆق خۆشی بوو، وایزانی ڕاستە. خۆشەویستیی مشک چووە دڵی بۆقەوە. ڕەفاقەتی لەگەڵ مشک پەیدا کرد. بوون بە ڕەفیقی یەک. مووددەتێ بەیەکەوە

ڕەفیق بوون. ڕۆژێ بۆق وتی: ئەی ڕەفیق، ئێمە هەردوکمان بووین بەڕەفیق. وەقت ئەبێ دێمە لات، سەعاتێ لە بەر کونەکە بانگ ئەکەم مومکینە تۆ گوێت لێ نەبێ، وەیا تۆ لە کون دێیتە دەرەوە من خەبەردار نەبم. تەئخیر بووغان ئەبێتە باعیسی دڵ عاجزی. ڕجا ئەکەم فکرێ بدۆزەرەوە بەیەک گەیشتنمان ئاسان بێ. مشک وتی: موددەیەکە فکر ئەکەمەوە. چاک وایە پەتێ پەیدا کەین سەرێکی ببەسترێ بە قاچی منەوە و سەرێکی بە قاچی تۆوە، هەروەقت ئارەزووی یەکمان کرد پەتەکە ڕاکێشین، بە خزمەت یەک ئەگەین. بەو تەدبیرە موددەتێ ڕایان بوارد. پەتەکە بەسترابوو بە قاچی هەردوکیانەوە. تەسادوف ڕۆژێ مشک لە کون چووبووە دەرەوە بۆ خواردن ئەگەڕا. قەلەڕەشێ چاوی بەمشک کەوت، بۆی هاتە خوارەوە، دەنووکی دا بە مشکدا، بەرز بووەوەو سەرێکی پەتەکە بە قاچی بۆقەکەوە بوو. ئەویش سەرەوخوار بە نێوی ئاسمانا شۆڕ بووەوە. خەڵق چاویان بەو کارە کەوت، سەرسام بوون وتیان: ئاخر زەمانە، قەل ڕاوی بۆق ئەکات. بۆق وتی: قەل ڕاوی بۆقی نەکردووە، بەواسیتەی ڕەفاقەتی ناجنسەوە تووشی ئەم بەلایە بووم و خۆم بەسەر خۆم هێنا. مشک وتی: بۆیە ئەم میسالەم بۆ هێنایتەوە لەگەڵ ناوجنس نەبێ ڕەفاقەت خراپە. وەئەگەر منیش بە ڕەفاقەتی تۆ ڕازی بم لە بۆقەکە خراپترم بەسەر دێت. پشیلە وتی: ئەگەر فکری ڕەفاقەتت نەبوو، ئەو هەموو چاکەیەت بۆ لەگەڵ کردم و بۆ دڵت لەمن سەندو، خەریکی بە دەردو مەراقەوە بمکوژی؟ مشک وتی: ئەو وەقتە من ڕەفاقەتی تۆم کرد لەبەر ئیحتیاجی بوو، وەکەسێ زەڕڕەیەک عەقلی بێ، بۆ دروست بوونی کاری دوشمن بە دۆست تەماشا ئەکا، وەکەسێ دەستی نەبێ بە جوولەکە ئەڵێت بەڕیشی مەردانەت قەسەم. بۆ مەخافات ڕێک کەوتن لەگەڵ دوشمن بەعەیب تەماشا ناکرێ، وەئەگەر زانیی تووشی زەرەر دێت، لە ڕەفاقەتی دوور کەوتنەوە ڕەوشتی عاقلانە. وە لە هەموو عالەمەوە ئاشکرایە جنسی من بە جنسی تۆ دۆشمنە و ڕەفیقیی من و تۆ دروست نییە، وە هەریەکەمان ڕێگەی خۆمان بگرین و بڕۆین لە قسە چاترە. قسە کردنیان دوایی هات، ڕۆیشتن و دوعا خوازییان لە یەک کرد.

قانزاجی ئەم حیکایەتە بۆ ئەوەیە کەسێ عەقلی بوو، بۆ دروست بوونی کاری خۆی لەگەڵ دوشمن ڕێک بخا، بەعەیب تەماشا ناکرێ و، لازمە لە دوشمنەکەشی ئەمین نەبێ. مشکێکی بچووک بۆ نەجات بوونی خۆی لەگەڵ پشیلە ڕێک خست، وە لەدەست پشیلەش خۆی نەجات دا. حەیفە بەنی ئادەم بە هەموو عەقڵەوە لە دەست دوشمن ڕێگەی نەجات نەدۆزێتەوە.

**نەسیحەتی هەشتەم**

دوور بوون لە ئەهلی حەسوود و بوغزاوی و، باوەڕنەکردن بە زوبان لووسییان

دابیشلیم رووی کردە برەهمەن، وتی: ئەحوالاتی ئەوکەسە کە دوشمن ئەترافی بگری و سولح بکات لەگەڵ یەکێکیان، ڕێگەی ئەجات بدۆزێتەوە و لە مەکری ئەمین نەبێ، بە زوبانی جەنابت بەیان کرا، وەتێی گەیشتم. ئومێد دەکەم بەیانی دوور بوون لە ئەهلی حەسوود و بوغزاوی و باوەڕنەکردن بە زوبان لووسییان بەیان بفەرموویت.

برەهمەن وتی: هەر کەسێ دوشمنیی کەسێکی کردو ئازاریان بە یەک گەیاند، بە سوورەتی قەتعی ئەمین بوونیان لەیەک دروست نابێ، هەر وەک پەپوەکە بەقسەی پادشاکە باوەڕی نەکرد.

دابیشلیم پرسی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

برەهمەن وتی: ئەگێڕنەوە پادشایەک بوو ناوی ئیبنومەدیەن بوو، زۆر عادڵ و میللەت پەروەرو ساحێب لەشکر بوو. لەمەدرسەی هەموو عیلمێک دەرچووبوو. لە عیلم و زیرەکیدا بێ ئەمسال بوو. ئەو پادشایە پەپوویەکی بوو زۆری خۆش ئەویست، وە پەپوەکە زۆر جوان و دەنگ خۆش بوو، وە زوبانی قسەکردنی لەگەڵ پادشا پەیدا کردبوو. تەسادوف پەپوەکە لەماڵی پادشا هێلکەی کردو بێچوویەکی هەڵهێنا. پادشاه ئەمری کرد پەپوەکەو بێچووەکە بەرنە هۆدەی حەرەم و زۆر بە دیققەت ئەهلی حەرەم خزمەتیان بکەن. تەسادوف ئەو ڕۆژە خودا کوڕێکی لایقی بە پادشا عەتا کرد. کوڕە پادشا و بێچووی پەپوەکە بە یەکەوە گەورە بوون. کوڕە پادشا هۆگری بێچووی پەپوەکە بوو. پەپوەکە هەرچەندە ئەڕۆیشت خواردنی بۆ بێچووەکانی ئەهێنا دوو عەدەدی ئەهێنا، یەکێکی بۆ کوڕە پادشاه و یەکێکی بۆ بێچووەکەی. لەگەڵ تەماشایان کرد جۆرە میوەیەک کە پەپوو ئەیهێنا دەست پادشا نە ئەکەوت، لەبەر ئەوە زۆر لای پادشاه خۆشەویست بوو. ڕۆژێ پەپوەکە دوور کەوتبووەوە بۆ میوە هێنان، درەنگی پێ چوو. کوڕە پادشا بێچووە پەپوەکەی بەسەر دەستەوە بوو. ڕۆیشتە خوارەوە، نینۆکی قاچی دەستی کوڕەکەی رووشاند. کوڕەکە رقی هەڵسا، هەردوو قاچی گرت، بە توندی کێشای بە زەویدا، بێچووە پەپوەکە مرد. لەگەڵ پەپوەکە هاتەوە بێچووەکەی بە مردوویی چاو پێ کەوت، نزیک بوو ڕۆحی لە قەفەسەی سنگی دەرچێت، دەستی کرد بە گریان. فکری کرد، وتی: بۆ من لازم بوو لە بن دڕکێ وە یا

کەنلانێ هێلکەم بکردایە، خانووی پادشا جێگەی من نەبوو، وە حەقی خزمەتی کورە پادشام نەبوو. وە ئەگەر لە کونجێ قەناعەتم بکردایە تووشی ئەم دەرد و مەراقە نە ئەبووم.
لە پاش فکرێکی دوور و درێژ وتی: چاک وایە خوێنی جگەر سووتاویم گوم نەکەم و خواردنم حەرامە، چونکە بێ وەفایی لەگەڵ من کراو، منیش بە سەر فرسەتەوە ئەڕۆم.
پەلاماری کورەکەی داو هەردوو چاوی بە دەنووک و نینۆک دەرکێشا، فڕی بەسەر دیواری خانووەکەوە نیشتەوە. جوابی چاو دەرهاتنی کورەکە گەیشتە لای پادشاه. پادشاه بە گریان رووی کرد بۆ لای کورەکە. چاوی پادشاه بە پەپوو کەوت، فکری کرد بە فێڵ پەپوەکە بگری، لە جیاتی چاوی کورەکەی پەرو باڵی بسووتێنێت. بەرامبەر بە پەپوەکە وەستا، وتی: ئەی پەپوو، بە دەست تۆوە گوناهێ قەوماو من لام گران نییەو، رجا ئەکەم دووری ئیختیار مەکە، بە دەردو غەمەوە مەمکوژە. پەپوو وتی: ئەی پادشاه ئەیزانم تۆ تاجێکی بەسەر میللەتەوەو، من موددەتێکە لە رێگەی نەزانی پێم دانابوو، فکرم بوو لە ژێر سێبەری جەنابتا بژیم، هەروەک کۆتر هێلانە لە خانووی موبارکتا بینا بکەم. ئێستا خوێنی بێچووەکەم وەک قوربانی حاجییان لە ئەیوانی حەرەمدا رژاوە، چۆن ئومێدی تەواف بە خانووی جەنابت بکەم؟ وە لە جەنابت ئاشکرایە گوناهبار بەتەمای ژینی ئابێ و من بەبێ ئیختیار بەڵکی لە رێگەی موکافاتەوە لە دەستم قەوما، مەگەر پادشاه مەسئەلەی دزەکان و دڵ چاکی نەبیستووە؟
پادشا پرسی: چۆن بووە؟
**حیکایەت**
پەپوو وتی: لە شارێکی خوار بەغداد دەروێشێ بوو زۆر موسوڵمان و دڵ ساف بوو، بە واسیتەی تاعەتەوە زۆر لای خەڵق مەرغووب بوو، وایان بۆ مەعلوومە ئەولیایە. ناو نرابوو (دڵزان). رۆژێ دڵزان بە تەنها رووی کردە رێگەی حەج، تەسادوف تووشی میقدارێ دز بوو، رێگەیان پێ گرت. دڵزان وتی: ئەگەر بۆ تەمەع وا رێگەم پێ ئەگرن، ئەوە کیسە پارەکە، برۆن و خۆتان هیلاک مەکەن و من ئەتوانم بەبێ رێگەی بەیتوڵلا بگرم و برۆم. تەوەککولی زۆر بوو. دزەکان بێ رەحم بوون، شمشێریان دەرکێشا بیکوژن. کابرا بە دەست دزەکانەوە سەرسام مابوو، رووی کردە ئاسمان، وتی: خودایە لە تۆ زیاتر ئومێدم نییە. تەسادوف میقدارێ قوڵنگ بە ئاسمانا ئەرۆیشت. دڵزان وتی: ئەی قوڵنگینە، ئێوە بە شاهید بن بە دەست ئەم غەددارانەوە خەریک ماوم و ئێوەش خوێنی من گوم مەکەن. بۆ

ئاشكرا كردنی كوشتنم هەوڵ بدەن. دزەكان پێكەنین، وتیان: ناوت چییە؟ وتی: ناوم دڵزانە. وتیان: حەیفە وا ناو نراویت. بۆمان مەعلووم كرا لە تۆ هیچ نەزانتر دەست ناكەوێت. هەتا زوو بكوژرێیت درەنگە. دڵزان وتی: ئێوە بە كوشتنی من قانزاج ناكەن و قەتڵ كردن خراپە. قاتیل دوورە لە ڕەحمەت. دڵزان زۆری قسەی پاڕانەوە گێڕایەوە. بێ فائیدە بوو، ئاخری كوشتیان. وەقتێ خەبەری كوژراویی دڵزان بە ئەهلی شارەكە گەیشت زۆر لایان ناخۆش بوو. تەسادوف ڕۆژێ ئەهلی شارەكە چووبوونە سەحرا بۆ نوێژە بارانە. ئەوانەی دڵزانیان كوشتبوو لەوێ حازر بوون. پۆلێ قولنگ بە ئاسمانا دەستیان كرد بە زیقە زیق. یەكێ لە دزەكان بە سوورەتی گاڵتە بە ڕەفیقێكی وت: قولنگەكان قسەی دڵزان ئەگێڕنەوە. یەكێ لە ئەهلی شارەكە گوێی لێ بوو. ئەویش بە ڕەفیقێكی وت. قسە دەما و دەم بڵاو بووەوە، گەیشتە لای پادشا. ئەمر كرا دزەكان بگرن. خرانە ژێر داری سیاسەتەوە. ئاخری بەیانی كوشتنی دڵزانیان كرد. لە جەزای كوشتنی دڵزان هەموویان ئیعدام كران و لاشەیان فڕێ درا، بوون بە خۆراكی دڕندەو تەیران. پەپوو وتی: بۆیە ئەم قیسسەیەم بۆ جەنابی پادشاه گێڕایەوە تا بۆت مەعلووم بێ من جوورنەتی كوێر كردنی شاهزادەم نەبوو، ئەمرۆ ئیرادەی خودا پێی كردم. تەیرێكی بچووكی وەك من ئەوەی لەدەست نە ئەهات، ڕێككەوت بوو، لە ڕێگەی مكافاتەوە دەستم كەوت، وە ئێستایش

عەقڵم وا حوکم ئەکات بە قسەی جەنابت باوەڕ نەکەم و، بە زوبان لووسی حەیاتی خۆم نەخەمە ژێر هیلاکەتەوە. دووری لە جەنابت بۆ من چاکە.

پادشاه وتی: ئەوەی بەیانت کرد هەموو ڕاستە و تۆ خەتابار ناکەم، چونکە کوڕەکەی من بێچووی تۆی کوشتووە. تۆ بە حوکمی جەزای موکافات سەندووە، وە حەقی تۆ لەسەر من زۆرە کە بە کوێریی کوڕەکەم ڕازی بوویت. ڕجا ئەکەم دووری ئیختیار مەکە. تاقەتی دووریی تۆم نییە و ئینتیقام وەرگرتن بە عەیب ئەزانم و، عەفو کردن با خوسووس ئیشی چاکانە. منیش بە چاکی ئەزانم و، فکرم نییە جەزای هیچ کەسێکم دابێ. فکرم ئەوەیە لە جێگەی خراپە چاکە بکەم. پەپوو وتی: بیستوومە کەسێ ئازار بە کەسێ بگەیەنێت، ساحێب ئازارەکە کە دەستی بوو زەهر بە قوڕگی ئەو کەسە دا ئەکات. نزیک بوونم بە تۆ ڕێگەی کەم عەقڵانە. پادشاه وتی: ترس و خۆف مەکە. موددەتێکە ئولفەتم لەگەڵ تۆ گرتووە. بەرامبەر بە کوڕەکەم خۆشەویست بوویت و، ئەمین بە زەرەرم بۆ تۆ نابێ. پەپوو وتی: خۆشەویستان، وا بیستراوە کە بۆت بەیان ئەکەم:

(١) دایک و باوک وەک ڕەفیق . (٢) برا وەک بڕبڕەی پشت. (٣) خاڵ و مام وەک ئاشنا. (٤) ژن بۆ ئاودەمی و خزمەت. (٥) کچ وەک دوشمنی خزم. (٦) کوڕ بۆ ڕووناکیی چاو و جێگەنشین تەماشا ئەکرێت.

کەس ئارەزوو ناکات لە خۆی دەست ڕۆیشتوو تر ببینێ و ئارەزوو ئەکات کوڕەکەی لە خۆی زیاتر ناو و شۆرەت پەیدا کات، ئاشکرایە من وەک کوڕەکەت خۆشەویست نابم، وە ئەگەر بڵێیت بەرامبەر بە ڕۆحی خۆم خۆشەویستیت دیسان باوەڕ ناکەم. مەگەر پادشا مەسئەلەی پیرەژن و کچەکەی نەبیستووە؟

پادشاه وتی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

پەپوو وتی: ئەگێڕنەوە پیرەژنێ بوو سەد و بیست ساڵ عومری بوو، پشتی وەک قەفی گۆچان چەمابووەوە. پیرەژن کچێکی زۆر لایقی بوو، هەر کەس چاوی بەو کچە ئەکەوت تا هەفتەیەک بێهۆش ئەبوو. تەسادوف ڕۆژێ کچەکە تای لێ هات، کوڵمی وەک یاقووت سوور هەڵگەڕا. پیرەژن خۆی گێڕا بە دەوری سەریا، وتی: خودایە خۆت ئەزانی لەو کچە زیاتر نیمە و عومرم زۆر سەرف کردووە و کچەکەم ئەووەڵی عومریەتی، عومری من بخەیتە سەر عومری کچەکەم. شەو و ڕۆژ بە دوعا کردنەوە خەریک بوو. ڕۆژێ چوو بۆ دەرمان

پەیدا کردن. گایەکی بوو لە لەوەڕ. ڕۆیشتەوە، بۆنی چێشتی کرد. چووە ژوورەوە، دیزەیەک چێشتاوی بوو. گا سەری پیا کرد، چوو بە سەریا. لەو وەقتەدا پیرەژن هاتەوە. فکری گای نەبوو. کە چاوی بە گا کەوت، وای زانی عیزرائیلە بۆ ڕۆح کێشانی هاتووە. گا ڕوو بە ڕووی پیرێژن هات، پیرێژن وتی: قوربان من نەخۆش نیم، نەخۆش کچەکەمە لەسەر جێگە کەوتووە، واز لە من بێنە، ڕۆحی ئەو بکێشە. کەوابێ مەعلومە هەر کەسێ ڕۆحی خۆی لە هەموو کەس لا خۆشەویستترە. تۆ من ئیخفال مەکە.

پەپوو وتی: ئەی پادشا، خۆت ئەیزانی من بە تەنها ماومەوە. چ ڕۆح لەبەرێ ئەتوانێ جگەر گۆشەی بە کوژراوی ببینێ و خۆی ئیسراحەت بکات؟ وە ئەمین بە بەزوبان لووسی ناخەڵەتێم (یا لیت بینی وبینک بعد المشرقین) ئەخوێنم. پادشا وتی: ئەگەر لە ئەووەڵەوە خەتا لە تۆ بقەومایە ترساندنت حەق بوو، ئەمما خەتا لە کوڕەکەم واقیع بووە، تۆ قیصاصی خۆت وەرگرتووە، بە ڕێگەی ڕاستی قابیلی جەزا نیت. ویجدان و عەدالەتی من ڕێگە نەدات کوڕەکەم لە جێگەی بێچووەکەت بکوژرێتەوە، وە ئێستا تۆ بە کوێر کردنی کوڕەکەم دەستت هەڵگرتووە، زۆر مەمنوونم. ڕجا ئەکەم چەند ساڵە ئولفەتم لەگەڵ تۆ گرتووە، تووشی دەردی دووریم مەکە. مەعلومە خۆشەویستی تۆم بە کوڕەکە نەویستووەو، قودرەتی خودا ڕەدبوونەوەی نییە. کوڕەکە کوێر بووە، خۆشیی دەنگی تۆ کەم نەبوە. ئومێد دەکەم لە من دوور نەکەویتەوە وەک یەعقووب بە دەردی «یا أسفا علی یوسف وابیضت عیناه من الحزن» گرفتارم نەکەیت. مەسەلەی من لەگەڵ تۆ وەک گۆرانی بێژەکە وایە.

پەپوو پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

پادشا وتی: بیستوومە پادشایەک گۆرانی بێژێکی بوو، دەنگی وەک داوود. ئاو لە ڕۆیشتن، تەیری لە فڕین ئەگێڕایەوە. پادشا زۆر گۆرانی بێژەکەی خۆش ئەویست. بەزمی پادشا بە دەنگی گۆرانی بێژەکە ئەگەڕا. کوڕێک عومری دوازدە ساڵە، بوو بە شاگردی گۆرانی بێژەکە. بە موددەتێکی کەم فێری هەموو جۆرە شیعر و غەزەل و مەسنەوی و مەقامات بوو. شۆرەتی کوڕەکە لە شارەکە دا بڵاوبووەوە. پادشاه خەبەری زانی. ئەمری کرد بە حازر بوونی کوڕەکە. لەگەڵ کوڕەکە داخڵ بە خزمەتی پادشاه بوو، ڕووی وەک ڕۆژ ئەدرەوشایەوە. دستی کرد بە عوود لێدان و چاڵغی و بەستە وتن. پیر و گەنجی سەرخۆش ئەکرد. وەستای کوڕەکە بەخالەتی پێ برد، چونکە لای پادشاه ڕوتبەی درابوویە. ئاخری

ڕۆژێ گۆرانی بێژەکە شاگردەکەی کوشت. پادشاه خەبەری زانی کوڕەکە کوژراوە. ڕقی هەڵسا. ئەمری کرد گۆرانی بێژەکە بکوژنەوە. گۆرانی بێژ برایە خزمەت پادشاه، پادشاه بەرقەوە وتی: ئەی غەددار، بۆ تۆ نازانی زۆر ئارەزووی عوود و چاڵغی و گۆرانی ئەکەم و، ئارەزووی من دوو جۆرە، جۆرێکی بە دەنگی تۆ و جۆرێکی بە دەنگی عوود و چاڵغیی کورە تازە پێگەیشتووەکە ڕام ئەبوارد، چۆن زاتت کرد بوویتە واسیتەی ئەمانی نیوە ئارەزووم؟ لازمە ئێستا سەرت لە لاشە جیا بکەنەوە تا جارێکی کە کەس نەتوانێ ئەو جۆرە ئیشانە بکات. گۆرانی بێژەکە پێکەنی، وتی: ئەی پادشاه، من خراپم کرد، نیوەی بکوژێت هەموو ئارەزووی جەنابتم فەوتاند. ئەگەر پادشاه، من بکوژێت هەموو ئارەزووی خۆی ئەفەوتێنێ. چۆن ناوی خراپە بۆ خۆی دائەنێت! پادشاه ئەو قسەی زۆر پێ خۆش بوو، لە گۆرانی بێژەکە خۆش بوو. گۆرانی بێژ ئەو شیعرانەی بۆ خوێندەوە[1]:

سلێمانی کە پایتەختە و دیارە
بە ڕاستی جێی نەجیب و شەهریارە
بەشەر حەیرانە بۆ حەوز و حەیاتی
جەبەل لوبنان لە چاویا دێمە کارە
کەوا شێخ و بەگ و ئاغا و ڕەئیسی
هەتا خوا حەز ئەکات ساحێب ویقارە
لە گەورە تا بچووکی میللەتی کورد
لە مەیدانی حەریفا کارزارە
حەمییەتیان کە وەختێ دێتە جەولان
لە گوێ ناگرن سەدای تۆپ و تەیارە
بە هەڵمەت وەک پڵنگن ڕۆژی دەعوا
هەموو تەعلیم چییە و چاپووک سوارە
لە دونیا دا نییە ڕۆڵەی وەکوو کورد
لە سوننی تاقی شمشێر و قەیارە

(١) لەسەر نەغمەی:
هەر چەندەم خاک بە سەردا کرد لە هیجرەت
دڵی ماری سیاه ئێشکچیی گەنجە

به جەرگن تا خەیاڵ کەی بۆ شەڕ و شۆڕ
نیتر ڕۆحیان لە لا بێ نیعتیبارە
ئەگەر بۆ عەقڵ و فام و هۆش ئەپرسی
زەکاوەتیان وەکوو ڕۆژ وا دیارە
هەمیشە بۆ تەرەققیی عیلم و عیرفان
خەریکن دائیما بەم ڕۆژگارە
لە ئاداب و ئوسووڵی فەرعی دونیا
نیشانەی گەورەیی تیا ئاشکارە
نەتیجەی بەرزییە زانین لە دونیا
هەموو وەختێ نەزان هەر شەرمەزارە
موسوڵمان و برای دینین هەموومان
لەگەڵ یەک ئیحتیرام زۆر سازگارە

پادشاە وتی: بۆیە ئەم میسالەم هێنایەوە نیوەی ئارەزووم بە ژیانی کوڕەکەوە بوو، وە نیوەی ئارەزووم بە بوونی تۆوەیە، وە ئارەزووی کوڕەکەم بە قەدەری خودایی نەما. ڕجا ئەکەم تۆیش نیوەی ئارەزووم مەبە. تاقەتی دووریی تۆم نییە. پەپوو وتی: ئەی پادشا، دڵ ئاوێنەی دڵە. چاو دڵ نابینێت. ئەوەی تۆ بە زوبان بەیانی ئەفەرموویت، دڵت بە جۆرێکی کە ئاگری تێ بەربووە. وەدڵی من خەبەری داوە هەتا زووە لە تۆ دوور بکەومەوە، چونکە موددەتێکە لە قانوون و سیاسەتی جەنابت گەیشتووم. دوور بوونم چاکە. من ئەو کەسە نیم حەکیم پێی وت: دەرمانی چاو بۆ تۆ لە دەرمانی سک یەشە چاکترە.

پادشاە پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

پەپوو وتی: ئەگێڕنەوە کابرایەک چووە لای حەکیم وتی: ژانە سکم تووش هاتووە، دوو ڕۆژە ئیسراحەتم لێ هەڵگیراوە لەبەر ژانە سک. حەکیم وتی: ئەو ڕۆژە چیت خواردووە؟ کابرا وتی: یەک پارچە نانە سووتاوم خواردووە. حەکیم بانگی شاگردەکەی کرد: دەرمانی چاو ئێشە بێنێ بیکەمە چاوی ئەم کابرایە چاوی چاک بێتەوە. کابرا وتی: ئەی حەکیم، وەختی گاڵتە نییە، چاری سکم کە. من ژانە سکمە، تۆ دەرمانی چاو ئێشە بانگ ئەکەیت. حەکیم وتی: دەرمانی چاو ئێشە بۆ تۆ چاکە، چونکە حوکمی چاوت نییە،

فەرقی ڕەش و سپی ناکەیت. هەر وەقت چاوت ڕوون بووەوە لە ژانە سکیش نەجاتت نەبێ. پەپوو وتی: ئەی پادشاە، من دونیام بە قەدەر خۆم دیوە، چاک و خراپ لەیەک جیانەکەمەوە لەو کەم عەقلانە نیم ڕەش و سپی بەیەک بزانم و خۆم نزیک بە مردن بخەمەوە. پادشاە وتی: ئەی پەپوو، ئەو جۆرە کارانە لەبەینی دۆستا زۆر تەسادوفی کردووەو، بەو جۆرە نەبوون دووریی یەک ئیختیار بکەن، وەخوسووس عاقلان ئاگری قەهریان بە ئاوی حیلم کوژانۆتەوەو منیش لەسەبر و حیلمدا کەس موقابیل بە خۆم نابینم. ڕجا دەکەم ترس و خۆف مەکە. تاقەتی دووریی تۆم نییە. پەپوو وتی: ئەی پادشاە، هەر کەس زەحمەت بە ئاسان بزانێ تووشی دەردی بێ دەرمان ئەبێ. بەفکر وا ئەزانم برینی دڵ خۆش نابێتەوە، وە ئێستا بەقسەی تۆ کەروێشکەخەو لە خۆم بخەم، ڕێگەی نەجاتم قەتع ئەکرێت. چاک وایە باڵێکم بکەم بە سەد باڵ و لەدەست تۆ فیرار بکەم، چونکە بچووکێکی وەک من قووەتی دوشمنیی جەنابتی پێ ناکرێ، وە مەعلوومە بە زوبان لووسیی جەنابت منیش باوەڕ ناکەم. تۆیش زۆر ئازاری خۆت مەدە. مەسەلەی من لەگەڵ تۆ وەک قسەی پادشاکە وایە بۆ دوشمنەکەی نووسی.

پادشاە پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

پەپوو وتی: ئەگێڕنەوە لە تورکستان پادشایەک شۆرەتی عەدالەتی بڵاو بووبۆوە. وەزیرێکی بوو لە پادشا عاسی بوو. میقدارێ دزو جەردە لە وەزیر کۆ بووبوونەوە، دەستیان کرد بە خراپە. وەزیر جوابی بۆ پادشاە نووسی: ئەگەر نەمکات بە پادشای شارێک ئیسراحەتی تێک نەدەم. پادشاە کاغەزی بۆ نووسییەوە بە ئامۆژگاری و دڵ خۆشی دانەوە، تەئسیری نەکردە وەزیرەکە. دووەم جار کاغەزی بۆ نووسی، وتی: ئەی وەزیر، مەسەلەی من و تۆ وەک بەرد و شووشە وایە، ئایا بەرد بکێشی بە شووشەدا، ئایا شووشە بکێشی بە بەردا هەر شووشەکە ئەشکێ. ڕجا ئەکەم خۆت بە شکاندن مەدە. پەپوو وتی: من وەک شووشە وام و تۆیش وەک بەرد وایت، لە یەک بکەوین من زەرەر ئەکەم، وەهەر چەند جەنابت فکرت هەیە لە ڕێگەی ئاشتییەوە حەقی خۆت دەست کەویت، عەقڵ ڕێگەی من نادات پەڕو باڵم بە دەست تۆوە بسووتێ. پادشاە وتی: مەعلوومە من لەمەو پێش زۆرم تۆ خۆش ویستووە، لەبەر کەم ئازارێک چۆن تەرکی خۆشەویستی ئەکرێ؟ وا ئەزانم فکری وەفای قەدیم ناکەیتەوە. وەفا بۆ هەموو ڕۆح لەبەرێ بووە. تۆ بۆچ وەفات

لەبەر چاو گوم بوو؟ پەپوو وتی: بناغەی وەفا چۆن نەمێنێ؟ دڵم خەبەری داوە تۆ فکرت چییە؟ خەریکی بە زوبان لووسیەتی حەقی جگەر گۆشەکەت وەرگریت. ئەو خورمای تۆ خواردت دەنکەکەی لە گیرفانمایە، وە من نەیزانم بۆ کوێر بوونی کوڕەکەت بۆ چرووک لە دڵت دێتە دەرەوە و بۆنەکەی بە لووتی منا هاتووە. فەرموودەی خودایە: بە دەستی خۆتان خۆتان مەخەنە هیلاکەتەوە. پێشوونان فەرموویانە: سێ کار هەیە لە عەقڵ دوورە. ئەووەڵ ئەو کەسانە بە قووەتی خۆیان مەغروورن، ئەوانە زوو تووشی مردن ئەبن. دووەم ئەو کەسانە لە ئەندازەی خۆیان زیاد ئەخۆن، ئەوانە زوو دەردی مردن ئەگرن. سێهەم ئەو کەسانە بە قسەی دوشمن باوەڕ ئەکەن، ئەوانە زوو پەشیمان ئەبنەوە. وە لەپادشاە مەعلووم بێ من لەمەدرەسەی هەموو فێڵێ دەرچووم، وە لەوانە نیم قسەی چاک و خراپ جیا نەکەمەوە و قسەی زوبان و فکری دڵت مەعلووم نەکەم. وا بزانم دڵت ئارەزوو ئەکات برینەکەی جگەرت بە خوێنی من دەرمان ئەکرێت. پادشاە وتی: ئەی پەپوو مووەدەتێکە من دڵخۆشیی تۆ ئەدەمەوەو لە ڕێگەی ڕاستی خۆشەویستیی تۆ بەیان ئەکەم و تۆ بە جۆرێکی کەی ئەزانی، مەسەلەی من لەگەڵ تۆ وەک مەسەلەی عابیدەکە و گورگەکە وایە. پەپوو پرسیی چۆن بووە؟

**حیکایەت**

پادشاە وتی: ئەگێڕنەوە عابیدێ بوو شەوو ڕۆژ خەریکی تاعەتی خودا بوو. تەسادوف ڕۆژێ دوچاری گورگێ بوو. گورگەکە بۆ خواردن ئەگەڕا. عابید ڕووی کردە گورگ وتی: نزیک بە حەیاتی کەس مەکەوە، ڕۆژی قیامەت تووشی عەزابی خراپ ئەبیت. گورگ وتی: وەختی قسە نییە، ڕانێ لەو دیو ئەو گردە ئەلەوەڕێ، بەڵکی بچم فرسەت ببێ مەڕێ بفڕێنم و تۆ بە قسە من بگری، کە فرسەت نەما لە پەشیمانی زیاتر هیچ دەست ناکەوێ. عابید وتی: من ئامۆژگاریی خێرت ئەکەم و تۆ فکرت تێک ئەچوە. پادشا وتی: هەر چەند منیش قسەی ڕاستی بۆ تۆ ئەکەم، تۆ ترس و خۆفت هەر باقییە. پەپوو وتی: ئەی پادشاە. من ئامۆژگاریم لە گوێ گرتووە. بە عەقڵ ئەزانم دەرگای بەلا بۆ من کراوەتەوە و، ئاوێنەی تەجرەبە بەرامبەرم دانراوەو دڵم ئەزانێ دڵت سووتاوە. وا چاکە ڕێگەی دوور بگرمە پێش، ڕووبکەم بۆ جێگەیەک دەستی کەس نەمگاتێ، چونکە مەعلوومە پادشاە لە جێگەی کوێربوونی کوڕەکەی ئەمکوژێ. وەستانم ئاخرییەتی. پادشا وتی: هەموو خواردنێ لای من دەست ئەکەوێ. سەفەر بۆ کەسێکە موحتاج بێ. پەپوو وتی: هەر کەس پێنج

ڕەوشتی بوو ڕووی کرد بۆ هەر جێگەیەک بە غەریب و موحتاج تەماشا ناکرێ. ئەووەڵ: لە خراپە دوور بوون. دووەم :ڕێگەی چاکە گرتن. سێهەم: لە ڕێگەی ترس خۆ لادان. چوارەم: ڕەفیقی زەمانە گرتن. پێنجەم: ڕەوشتی ڕەفیق زانین. هەرکەس ئەو ڕەوشتانە بزانێ ڕوو بۆ هەر جێگایەک بکا مودارا ئەکات. کەسێ عاقڵ بوو مودارای لەناو کەسوکاریا بۆ نەکرا تەرکی وەتەنی بەناشیرین تەمەشا ناکرێت. پادشاه وتی: ڕۆیشتنت چەند ڕۆژ درێژە ئەکێشێ و، کەی دێیتەوە؟ پەپوو وتی: بەتەمای هاتنەوەم مەبە. قسەی من و تۆ وەک عەرەبەکە و نانەواکە وایە.

پادشاه پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

پەپوو وتی: ئەگێڕنەوە پیاوێکی نانەوا لە شاری بەغداد دووکانی نانەوایی دانابوو. میقداری نان بۆ فرۆشتن لەبەر دووکانەکە هەڵخرابوو. کابرایەکی میعدان چووە بەردەمی نانەواکە. بۆنی نان چوو بە سەریا، مەعیدەی گڕی تێ بەربوو، وتی: وەستا، بە چەند تێر نانم ئەکەیت؟ نانەوا فکری کرد ئەگەر لە زۆر خۆرەکان بێ بە یەک حوققە نان تێر ئەبێ، وە ئەگەر خواردنی حوشتری بێ بە دوو حوققە، وە ئەگەر خواردنی گامێش بێ بە سێ حوققە. حوققەی نان بە چوار فلس بوو. وەستا وتی: بە دوازدە فلس هەر چەند ئەتوانی نان بخۆ. عەرەب ۲۵۰ فلسی بە نانەوا دا: وتی: هەر چەند بخۆم عاجز مەبە. وەستا ڕازی بوو. ئەووەڵەن هەر نانێ هەڵخرا بوو کردی بە پاروو و خواردی، ئەنجا نان بە نان لە تەنوور ئەهاتە دەرەوە بە ئاوی شەتەکە تەڕی ئەکرد ئەیخوارد، وەستا تەماشای کرد تا گەیشتە نیو دینار نانی خورا. ڕووی کرد بۆ سێ ڕوبع دینار. ئاخری گەیشتە یەک دینار نان. نانەوا وتی: ئەی دەعبای عەرەب، تێر خواردنی تۆ چەندە، پێم بڵێ، چونکە هەویر و ئارد نەما. جوابی دایەوە: سەبرت بێ پەلە مەکە، تا ئاوی ئەم شەتە بڕوات من نان ئەخۆم. یا پارەکەم، وە یا تێر نان بێم. ئاخری وەستا پارەکەی دایەوە.

پەپوو وتی: بۆیە ئەم قسانەم بۆ پادشاه کرد هەتا ڕۆح لە قەفەسەی سنگدا بێ، چاوی پادشا بە من ناکەوێ. وە ئەگەر فکری تۆ بکەم خەبەرت لە بای شەماڵ ئەپرسم و جەماڵی پاکەماڵی پادشاه لە ئاوێنە دا تەماشا ئەکەم. پادشاه: دەستی کرد بە گریان، فرمێسکی حەسرەتی لە چاو ئەسڕی. وتی: ئەی پەپوو، بە ڕاستی بۆم مەعلووم کرا جارێکی کە دەستی من ناکەوێت. ڕجا دەکەم چەند قسەیەک بۆ یادگار بەیان بفەرموو. پەپوو وتی:

ئەی پادشا، خراپترین ماڵ ئەوەیە خێری بۆ کەس نەبێ. غافڵیی پادشاه ئەوەیە لە میللەت بێ خەبەرە. خراپترینی رەفیق ئەوەیە وەختی تەنگانە بەکار نایەت. خراپترینی ژن ئەوەیە لەگەڵ مێرد دەم بەرزی ئەکا. خراپترینی ئەولاد ئەوەیە بێ ئەمریی دایک و باوک ئەکات. وێرانترینی شار ئەوەیە خەڵقی گرانفرۆش و بێ ئینسافن. ناخۆشترینی رەفاقەت ئەوەیە ئازار بەیەک بگەیەنن. ئەو قسانەی وت و دوعا خوازیی خواست، رۆیشت. پادشا بە ناومێدی گەڕایەوە. دەستی بە دەستا ئەکێشا. وتی: زۆر خەریک بووم و زۆر میسالم بۆ پەیوو هێنایەوە، بەڵکی حەققی چاوی کوڕەکەم وەرگرتایە. دەستم نەکەوت. وە تێفکرین لەم حیکایەتانە زۆر لازمە. کەسێ عاقڵ بێ بەقسە و مەکری دوشمن تەفرە ناخوات، وە ئەم حیکایەتانە بۆ تازە پێگەیشتووەکانمان لە ناو دڵیانا قوفڵ بدرێت.

**نەسیحەتی نۆ**

لە خەتا خۆش بوون چاکترینی رەوشتە خوسووس، وە بۆ پادشاهان و بۆ ئەهلی دەست رۆیشتوو.

دابیشلیم رووی کردە حەکیم، وتی: باوەڕ نەکردن بە زوبان لووسیی دوشمن و خۆ پاراستن لە فێڵ و قسەیان، بە زوبانی جەنابتەوە بەیان کرا، تێی گەیشتم. ئومێد دەکەم بەیانی خەتاکردن و خۆشبوونیان، رێگەی چۆنە نیشانم بدرێت. وە ئەگەر مەئموورێکی پادشا خەتای کرد، خۆشبوون وەیا جەزا سەندن وەیا حەپسی کامیان لازمە. حەکیم وتی: پادشاهان، لازمە دەرگای عەفوو و مەرحەمەتیان کراوە بێ. وە ئەگەر پادشاه لەسەر خەتایەکی کەم مەئموور بخاتە ژێر داری سیاسەتەوە مەئمووران ئومێدی ئیسراحەت ناکەن، وردە وردە رێگەی فیرار ئەگرنە پێش. لە پاش بڵاوبوونەوەی مەئمووران پادشاه تووشی دوو دەرد ئەبێ. یەکێکی ئەوەیە کاری پادشاه بە ئەمانی مەئموور موعەتتەل ئەبێت. دووەم ئەوانە کە گوناه ئەکەن لە لەززەتی عەفو بێ بەش ئەبن. یەکێ لە ئومەرای پادشاه وتی: ئەگەر بیبیانزانیبیا خۆشیی خەتا خۆشبوون چۆنە، لە خەیانەت و خەتا زیاتر دیاری نەئەبرا. وە ئەگەر پادشاهان زوبانی عەفوو بەخشینی بەسەر میللەتدا نەبێ، لە جێگەی گوناه ئازار بدات، ئاخری موڵکی بەدەستەوە نامێنێت. موقابیل بەو مەسەلانە قسەی شێر و چەقەڵە. دابیشلیم پرسی چۆن بووە؟

**حیکایەت**

برەهمەنی حەکیم وتی: لە زەمینی هیندستان چەقەڵێ ناوی (فیرپرسە)بوو، تەرکی

دونیای کردبوو، گۆشتی هەموو ڕۆح لە بەرێکی لەخۆی حەرام کردبوو. ڕەفیقانی دەستیان کرد بە لۆمە کردنی، وتیان: حەیفە تۆ خۆت بە جنسی ئێمە حیساب نەکەیت، وە ئەگەر ئارەزووی ڕەوشتی ئێمە ناکەیت لەئێمە دوور کەوەو ژیانی ڕەزالەت بەکاری چی دێت؟ وە نەفس حەپس کردن بەو ڕەزالەتە لە ڕێگەی عاقڵان دوورە. فیرریسە جوابی دانەوە، وتی: هەرکەس حاکمی نەفسی خۆیەتی و لەززەتی دونیا پرسینەوەی هەیە و ڕیازەتی خۆم بە قسەی ئێوە ناشکێنم، وە ئارەزووی ڕەفاقەتم ناکەن دوعاتان نەخوازم. وەختێ ڕەفیقەکانی زانییان فیرریسە فکری ڕۆیشتن نەکات، دڵخۆشییان دایەوە. ئاخری ناوی عابیدیی فیرریسە بڵاو بووەوە. لەو نزیکانە باغێ بوو لەبەر ئاو و میوەهاتی لە هەموو جۆرە دڕندەیەک هێلانەیان تیا دروست کردبوو. وە شێرێکیان کرد بە پادشای خۆیان. زۆر ساحێب قووەت بوو. ناوی شێرەکە (کامجۆی)بوو، شۆرەتی حوکمداریی شێر بە هەموو لایەکا ڕۆیشتبوو. ڕۆژێ کامجۆی و دڕندەکان مەجلیسیان گرتبوو، قسەی فیرریسە کەوتە ناوەوە. زۆریان تەعریفی عیبادەتی فیرریسە کرد. کامجۆی ئارەزووی چاو پێکەوتنی فیرریسەی کرد، یەکێکی نارد بە شوێنیا. لەگەڵ ئەمری پادشا گەیشتە لای فیرریسە هەڵسا چووە خزمەت شێر. کامجۆی بە تەواوی حورمەتی فیرریسەی گرت و لە دیانەت و عەقڵی فیرریسە گەیشت. خەڵوەتی لەگەڵ فیرریسە گرت. کامجۆی وتی: ئەی فیرریسە ناوی عیبادەتی تۆم بیستبوو، وە ئێستایش کە ناردوومە بە شوێن تۆ دا و لەعەقڵ و دیانەت گەیشتم بۆم مەعلووم کرا زۆر ڕاستیت، وە ئارەزوو نەکەم تۆ بکەم بەوەزیر و ئوموووراتی میللەت تەسلیم بەتۆ بکەم فیرریسە وتی: ئەی پادشا، ئوموووراتی پادشایی لایقی ئەوانەیە کە لەمەدرەسە دەرچوون، وە ئەگەر مەئموورێ بەئەمری جەنابت دابنرێت، هەر وەخت خەتایەکی کرد، گوناهی بە گەردنی جەنابت ئەبێ، چونکە بەندە لە ئوموووراتی پادشا شارەزا نیم، وە جەنابت ساحێب قووەتیت، لە هەموو جۆرە دڕندەیەک لەژێر حوکمتایە، وەهەرکەسێکیان شۆرەتی قووەت و عەقڵیان هەیە، ئەو بکە بە وەزیر، ئەتوانێ ئوموووراتی پادشا بەجێ بێنێت. کامجۆی وتی: لەبەرچی قوبووڵی وەزیریی ناکەیت و، هەر جۆرێ بێ دەست هەڵناگرم هەتا قوبووڵی قسەی من نەکەیت. ڕجا ئەکەم قسەم مەشکێنە. فیرریسە وتی: ئەی پادشا ئوموووراتی پادشاهی بە دوو تائیفە لایقە. ئەووەڵ: کەسێ بێ ساحێب تەمەع و بێ شەرم و زیرەک بێ، چونکە بە واسیتەی تەمەع ئوموووراتی پادشا بە جێ دێنێ. دووەم: کەسێ بێ بێ حەیاو زەعیف کەس ئەوێرێ دەستی لێدانی بۆ درێژ کات، ئەویش کەس ناتوانێ قسەی ڕەد کاتەوە، ئوموووراتی بۆ جێ بەجێ

ئەکرێت. بەندە لەو دوو تائیفە نیم و، لەپادشا مەعلووم بێ مووددەتی دوو ساڵە تەرکی خواردنی گۆشتم کردووە، لەگیا زیاتر هیچی کە ناخۆم، وە ئەگەر بەقسەی جەنابت ڕیازەت بشکێنم، ئەوەم بەسەر دێ بەسەر مێشەکان هات. کامجۆی وتی: چۆن بووە؟

حیکایەت

فیرڕیسە وتی: ئەگێڕنەوە پیاوێکی فەقیر بە ناو بازارا ئەسووڕایەوە. حەڵواچییەک چاوی بە فەقیر کەوت بانگی کردە سەر دووکانەکەی، جامێ هەنگوینی نایە بەردەم فەقیرەکە. مێش هوجوومی کردە ناو جامەکەوە. حەڵواچییەکە باوەشێنی جامەکەی کرد لەبەر ئەوەی مێشەکان لاچن. ئەو مێشانە لە قەراغ جامەکە نیشتبوون، ڕۆیشتن. ئەوانەی لەناو جامەکەدا بوون کەوتنە هەنگوینەکەوە. هەرچەندیان کرد دەرچوونیان نەبوو. فەقیرەکە ورد بووەوە، بێهۆش بوو، دەستی کرد بە گریان و هاوار کردن. حەڵواچییەکە وتی: هاوار مەکە لە هەموو جۆرە شیرینییەک حازرە، ئازاری دڵی خۆت مەدە، ئارەزووی چی ئەکەیت بهێنمە پێش دەست. فەقیر وتی: ئەی وەستا، جامەکە وەک دونیا، هەنگوینەکە وەک نیعمەتی دونیا هاتە پێش چاوم، ئەو مێشانە خواردن خۆری دونیایییە، نیشانە بوو خودا هێنایە پێش چاوم. ئەو کەسانە بێ تەماع بوو لە قەراغ جامەکە بەکەم قەناعەت ئەکەن. ئەوانە تەماعیان زۆرە لەناو خواردنا خۆیان بە هیلاکەت ئەبەن. لازمە (الرزق مقسوم) لەفکری خۆمان نەبەینەوە. فیرڕیسە وتی: ئەی کامجۆی، بۆت مەعلووم بێ هەتا لە دونیا دوور بم سەلامەتترم. ڕجا ئەکەم وەک مێشەکان لەناو شیرینیی دونیادا بە هیلاکەتم مەدە. ئەگەر چاکەم لەگەڵ ئەکەیت، ئیزنم بدە بڕۆم لەسەر حالاتی خۆم بژیم و ڕێگەی ئاخیرەتم بە ئاسانی دەست کەوێت. کامجۆی وتی: کەسێ ڕێگەی ڕاست بگرێ و مەزڵووم لە دەست زاڵم نەجات بدات، دڵخۆشیی فەقیران بە زوبانی خۆش بداتەوە و ڕێگەی خێر بگرێت، بناغەی شۆرەت دروست ئەکاو لە دونیا و ئاخیرەت بە چاک ناو ئەبرێت. فیرڕیسە وتی: ئومووراتی پادشاه ئەبێ لە ڕێگەی قانوونەوە ئومووراتی بەجێبێنێ، چونکە وەزیفەکەی بەبێ ڕەحمی مومکین نەبێ و مەعلوومە کەسێ نزیک بە حاکم بۆوە بە ڕوتبە دوشمنی زۆری بۆ پەیدا ئەبێ و خەڵقی قسەی خراپی بۆ هەڵئەبەستێ، ئەگەرچی لای حاکم زۆر خۆشەویستیش بێ، ئاخری بە سەلامەتی ئەجاتی نابێ، وە ڕجا ئەکەم هەتا ئێستا لە کونجی قەناعەت دانیشتووم ناوونیشانم نەبووە، جەنابت ناوم بە خراپە بڵاو مەکەوە و دوشمنم بۆ پەیدا مەکە، قووەتی کەسم نییە. کامجۆی وتی: کەمن لە تۆ ڕازی بووم

هەرکەس بە چاوی خراپە تەماشای تۆی کرد بەداری سیاسەت ئەیکوژم، وەمن کلیلی خەزێنە و ڕوتبەی وەزیری بە تۆ ئەدەم. ئەو وەختە هەموو مەئموورران چاوەڕوانی دەستی تۆ ئەکەن و کەس ناتوانێ دوشمنی لەگەڵ تۆ بکات مادام خۆشەویستی من بی. فیرڕیسە وتی: ئەگەر جەنابت مەرحەمەت لەگەڵ من ئەکەیت ئیزنم بدە بڕۆم بەگیای سەحرا بژیم، لە زوبانی فیتنە دوور بم. خواردنێکی کەم لە نیعمەتێکی بەخۆف چاکترە. کامجۆی وتی: ترس بۆ تۆ دوورە. کە لەژێر حیمایەتی پادشایەکی وەک من بی کەس ناتوانێ دوشمنیی تۆ بکات، وە ئەمین بە ئیزنت نادەم بڕۆیت، ئیتر قسەی زۆر کردن جوان نییە. فیرڕیسە وتی: مادام ئارەزووی جەنابت لەسەر ئەوەیە، شەرت و موقاوەلە ئەوە بێ بەقسەی فیتنە و دووزوبان بەندە ئازار نەدەیت. ئەگەر دوشمن بۆم پەیدا بوو، بەزوبانی منەوە قسەیان کرد تەحقیق کردنی لە تەرەف جەنابتەوە لازم بێ. کامجۆی قسە و شورووتی فیرڕیسەی قوبووڵ کرد، کردی بە وەزیر و کلیلی خەزێنەی دایە دەستی. هەموو وەخت بۆ تەدبیری ئوموورات خەڵوەتیان ئەکرد. شەو و ڕۆژ لە یەک جیا نەئەبوونەوە. مەئموورران بەخالەتیان پێ بردن. هەموویان فکریان کرد فیرڕیسە لەناو بەرن. وایان بە چاک زانی بە خائین دەری کەن چونکە کامجۆی ڕەحمی دەرحەق بە خائین نەئەکرد. ڕۆژێ تەدبیریان کرد ئەو میقدارە گۆشتە کە بۆ خواردنی پادشاه دانرابوو بینێرن لە جێگەی فیرڕیسە بشارنەوە. تەسادوف ڕۆژی فیرڕیسە بە ئیشی پادشاه ڕۆیشتبوو، مەئموورران یەکێکیان نارد مووچە گۆشتەکەی پادشای دزی، بردی لە جێگەی فیرڕیسە شاردیەوە. وەختی قاوەڵتیی شێر هات، برسییەتی زۆری بۆ شێر هێنا، داوای خواردنی کرد، جوابیان بۆ برد گۆشتەکەی جەنابت دزراوە. یەکێ لە مەئموورران وتی: بزانن ناحەزی پادشا کامەیە،ماڵیان باسخوون بکەن. شێر لەو قسەیە دڵی خراپ کرد، وتی: ئێوە مومکینە بزانن ناحەزی من کێیە. ئەویش وتی: بیستوومە گۆشتەکەی جەنابت فیرڕیسە دزیویەتی و لەجێگای خۆی شاردوویەتیەوە. یەکێکی کە وتی: فیرڕیسە تەرکی خواردنی گۆشتی کردووە، باوەڕ ناکەم بێ ئەدەبیی وا بکات دزی لە پادشاه بکات، بەڵکی بەدرۆ قسەیان کردبێ. یەکێکی کەیان وتی: ئێوە ئەڵێن فیرڕیسە خائینە، باوەڕ ناکەم ئیشی خیانەت بزانێ. یەکێ لە فیتنەکان وتی: قسەکردن باش نییە. ئەگەر گۆشتەکە لە جێگەی فیرڕیسە دۆزرایەوە لایقی داری سیاسەتە چونکە خیانەتی لە پادشاه کردووە. کامجۆی وتی: ناوی خیانەت و خراپیی فیرڕیسە لەبێشە دا بڵاوبۆتەوە. جێگەی باوەڕ نییە گۆشتی لە خۆی حەرام کردبێ. فلان و فلانم شاهیدە، ئەووەڵ ڕۆژ کە چاوم بەچاوی کەوت وتم: بەدرۆ خۆی کردووە بەعابید، ئاخری

فیتنەیەک هەڵئەگیرسێنێ، وە ئێستایش خیانەت لەوە خراپتر نەبێ کە گۆشتی جەنابت بدزێ؟ مومکینە چەند ڕۆژێکی کە دەستدرێژی بۆ ئێمەش بکات. کامجۆی ڕقی هەڵسا، ناردی بە شوێن فیرڕیسە دا. فیرڕیسە لەو تەدبیرە بێ خەبەر بوو، بە ڕوویەکی خۆشەوە چووە لای شێر. کامجۆی وتی: دوێنێ گۆشتەکەت بۆ کوێ برد؟ فیرڕیسە وتی: دامە دەست چێشتکەری جەنابت بیکەن بە قاوەڵتی بۆ تۆ. چێشتکەرەکان تەبەعەی فیتنەکان بوون، بانگ کران. وتیان: گۆشت نەدراوەتە دەست ئێمە. کامجۆی ناردی گۆشتەکەیان لە شوێنی فیرڕیسە دۆزیەوە. فیرڕیسە بۆی مەعلووم بوو دەرگای بەڵای بۆ کراوەتەوە. بەخۆی وت: دەمێکە بە عەقڵ ئەمزانی تووشی بەڵا دێم، ئاخری پێش دەمی گرتم. یەکێ لە ڕەفیقانی فیرڕیسە کە لافی خۆشەویستیی فیرڕیسەی لێ ئەدا، چووە پێش دەمی کامجۆی وتی: ئەو درۆزنەی ڕووڕەشە خیانەتێکی وا گەورەی کرد هەتا زوو بکوژرێت درەنگە، لەبەر ئەوە جارێکی کە کەس نەتوانێ خیانەتی وا لەپادشا بکات. شێر ئەمری کرد فیرڕیسە حەپس بکرێ و فەرمانی خنکاندنی بنووسرێت. سیاگۆش چووە پێش دەمی کامجۆی وتی: ئەگەر ئەمر هەیە چەند قسەیەک بۆ جەنابت بەیان بکەم. شێر وتی: بیکە. سیاگۆش وتی: پێشوونان فەرموویانە: هەر پادشاهێ ڕێگە و سیاسەتی ڕاست بێ، دەوامی پادشاهیی زۆر ئەبێ. ئێستا وا چاکە ئەمر نەکەیت فیرڕیسە بکوژرێت «من صبر ظفر»، وەهەر کەس ئارەزووی بەرز بوونەوەی پادشاه بکات خوێن ڕشتن بە چاک نازانێت، وە ئەگەرچی دڵت ئارەزووی نییە فیرڕیسە عەفو کات، ئەمما بۆ مەسڵەحەت، هەروەک پادشاکەی بەغدا خۆشەویستەکەی خۆی بۆ مەسڵەحەت لەناو برد.

کامجۆی پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

سیاگۆش وتی: ئەگێڕنەوە لە شاری چین پادشایەک بوو ناوی عەدالەت و حوکمداریی بڵاو بوویەوە و کوڕێکی تازە پێگەیشتووی بوو ڕووی وەک ڕۆژ شوعلەی ئەدا. کوڕە پادشاە ڕووی کرد بۆ ڕێگەی حەج. ئیزنی لە دایک و باوکی خواست لەگەڵ چەند کەسانێ و چەند گورجییەک کەوتە ڕێگە. وەختێ داخڵ بە پاییز بوو چەند ڕۆژێ بەناو ئاوا ڕۆیشت. داخڵی حوودوودی مەککەی موعەظظەمە بوون. لەپاش حەج کردن، زیارەتی (محمد المصطفى صلى الله تعالى عليه وسلم) کرد و گەڕانەوە. لەگەڵ کاروانی خوراسان ڕوویان کرد بۆ شاری بەغداد. مەلیکی بەغداد خەبەری کوڕە پادشای زانی، چوو بە

ئیستیقبالیەوە، بردیە مالّی خۆی، بەئوسوولّی شاهانە خزمەتی کردن. بۆ ئیسراحەت هەشت ڕۆژ لە بەغداد مانەوە. لەپاش هەشت ڕۆژە دوعا خوازیی لە پادشای بەغداد کرد، کەوتنە ڕێگە. بە ڕەسمی دیاری کچە گورجییەکی بۆ پادشای بەغداد دانا. وەختێ پادشا لە ڕەوانە کردنی میوانەکان نەجاتی بوو، ڕووی کردە ئۆدەی حەرەم، تەماشای کرد گورجییەکە بە لەنجەولار وەک تاوس چەتری هەلّداوە. نزیک بوو بێهۆش بکەوێ، دەماری عیشقی کەوتە جوولاّنن، وتی:

شیعر

ڕزحەکەم، بەخوا لە دووریی تۆ هەمیشە شین ئەکەم
بولبول ئاسا بۆ گولّی ڕووت گریەو و نالّین ئەکەم
من بە یادی پەرچەم و ڕووی تۆیە بە خوا جار بە جار
دەچمە ناو باغ و تەماشای لالەو و نەسرین ئەکەم
گەر بکەم تەشبیهی تۆ جانا لەگەلّ خورشید و مانگ
توهمەتێکی مەحزە، تەشبیهی بەپێی تەخمین ئەکەم
سابیتە جانا، وەکوو ڕەنگی خەنە ناچێتەوە
جەژنە، سوبحەینێ، بەخوێنم دەست و پێت ڕەنگین ئەکەم
گەر سلێمانی ببێتە جەننەت و پڕ بێ لەحوور
بەشمە لام هەر مەیلی وەسلّی یارەکەی پێنجوین ئەکەم
چاوەڕوانم زولّفی لادا، تاببینم ڕوومەتی
هێندە بێ عەقلّم لە کافر من ئومێدی دین ئەکەم
هەر لە شەوقی لێوی شەککەر باری ئەو دلّدارەیە
من وەکوو تووتی (کەریم) ئەمڕۆ قسەی شیرین ئەکەم

ئاخری پادشاە لەگەلّ مەحبووبەی شەو و ڕۆژ خەریک بوو. مەملەکەت و میللەتی لەفکر نەما. لەبەر دەنگی عوودو دەف و کەمانچە هاواری مەزلوومانی گوێ لێ نەبوو. لە خۆشەویستی و جوانیی گورجییەکە شەو و ڕۆژی بۆ فەرق نەئەکرا. چەند ڕۆژێ بەو جۆرە ڕایبوارد. نزیک بوو شارەکە هەرایەکی تیا بقەومێ. ئومەرا، وزەرا زۆر لەخوا پاڕانەوە، دوعایان گیرا بوو. شەوێک پادشاە خەوی بینی، لە خەویا بانگیان کرد: ئەی پادشا، تۆ شوانی میللەتیت، لەبەر خۆشەویستەکەت فکری میللەتت نەما و خەبەرت لە مەزلوومان

نیبه. مژده بێ نزیکه پادشاهی له دەستت دەرچێت. له خەوفی غەفڵەت ڕاست بەرەوە، برۆ بەلای میللەتەوە. پادشا له ترسا خەبەری بووەوە. فکری کرد وتی لەبەر مەحبووبەیەک ئەوەم بەسەرهات. ڕۆیشت غوسڵی کرد، تۆبەی کرد، ئەمری کرد جارێکی که گورجییەکە داخڵ به خزمەتی پادشاه نەبێ. ئەگەرچی له دەرەجەی نیهایەت لای خۆشەویست بوو لەبەر ئومووراتی پادشایی مەجبوور بوو تەرکی گورجییەکە بکات. دوو سێ ڕۆژ بوو پادشا له گورجی دوور کەوتەوە. گورجی به عەقڵ زانیی کاری چییە، خۆی وەک تاوسی ڕەنگا و ڕەنگ ڕازاندەوە، بەپێش دەمی پادشادا ڕۆیشت. وەختێ پادشاه چاوی به گورجی کەوت، تەخت و سەڵتەنەتی لەفکر نەما دەستی کردەوە به کەیف کردن لەگەڵ گورجییەکە. دووەم دەفعە له غەیبەوە بانگ کرا، ترس و خۆفی پادشاه زیاد بوو، فکری کرد وتی: هەتا ئەو گورجییە باقی بێ من پادشاهیم بۆ ناکرێ، بانگی دەرگاوانەکەی کرد وتی: لازمە هەر ئێستا ئەو گورجییە ئەبەیت، بیخەرە ناو شەتی فوراتەوە چونکە بەبێ ئەمر داخڵ به حوجرە بووە. دەرگاوان دەستی گورجییەکەی گرت، بردیە دەرەوە. له ڕێگە فکری کرد وتی: ئەمە خۆشەویستی پادشایە و ئێستا ڕقی هەڵساوە، ئەمری به کوشتنی کردووە، مومکینە سویحەینێ پەشیمان ببێتەوە، وەختێ پەشیمان بووەوە داوای لەمن بکات، وە ئەگەر نەبوو من بکوژێ. چاک وایە بیبەم له ماڵەوە داینێم بیشارمەوە. دەرگاوان فکری خۆی مەحکەم کرد. پادشاه وەختێ داخڵ به حەرەم بوو، جێگەی گورجییەکەی به خاڵی دی، دڵی گڕی سەند، دەستی کرد به گریان، له ئەمر کردنی پەشیمان بووەوە. بانگی دەرگاوانەکەی کرد، وتی: هەر ئێستا گورجییەکەم له تۆ ئەوێت. دەرگاوان وتی: شاهم، خۆت ئەمرت کردووە، گوناه له من نییە. پادشاه وتی: جەللاب بانگ کەن له گەردنی دەرگاوان بدات. دەرگاوان دەستی کرد به پاڕانەوە. پادشاه وتی: ئەگەر گورجییەکە نەبێ، به داری سیاسەت ئەتکوژم. دەرگاوان بۆی مەعلووم بوو گورجییەکە حازر نەکات ئەکوژرێت، ڕۆیشت گورجییەکەی بردەوە خزمەت پادشاه. چەند ڕۆژێ به کەیف کردن خەریک بوون. لەپاشا ئەمری کردەوە به دەرگاوان گورجییەکە بکوژێت. دوو سێ جار بەو جۆرە دەرگاوان کەوتە کێشمەوە. ڕۆژێ پادشاه فکری کرد، بۆی مەعلووم بوو کەس ناتوانێت خۆشەویستی پادشاه لەناو بەرێت، وەهەتا گورجییەکە باقی بێت پادشاهیی بۆ ناکرێ. وتی: چاک وایە به دەستی خۆم لەناوی بەرم. ڕۆژێ لەسەر بانی قەسرەوە تەماشای شەتیان ئەکرد، ڕووی کردە گورجییەکە وتی: تەماشا کە ئەو پاپۆڕە چەند لایقە، گورجییەکە سەری شۆڕ کردەوە، پادشاه دەستی به پشتییەوە نا، کەوتە ناو شەتەوە، خنکا. پادشاه هاواری کرد:

گورجییەکە بگرنەوە. وەختێ گەیشتنە سەر گورجییەکە گرتیانەوە مردبوو. دەریان هێنا، کفن و دفنیان کرد. پادشاه لەبەر غافڵ بوونی میللەتەکەی خۆشەویستی خۆی بە دەستی خۆی لەناوبرد، بەلایەوە بە چاک زانرا.

سیاەگۆش وتی: بۆیە ئەم میسالەم هێنایەوە تا لەپادشاه ئاشکرا بێ بۆ مەسلەحەتی میللەت لازمە لە گوناهی فیرڕیسە ببووریت و خائینیی فیرڕیسە تەحقیق بکەیت. کامجۆی بەقسەی سیاەگۆش گڕی دڵی دامردەوە. ناردی فیرڕیسەیان بردە خزمەتی. فیرڕیسە چونکە لە گوناه بێ خەبەر بوو، دەستی کرد بە زوبان درێژی و فیتنەکان تەعفەی زۆریان دا. کامجۆی ڕقی هەڵسا حوکمی کرد فیرڕیسە بکوژرێت. دایکی شێر خەبەری زانی، چووە لای کامجۆی، وتی: لەسەر چی ئەمرت بە کوشتنی فیرڕیسە کردووە؟ کامجۆی قیسسەی ئەووەڵ و ئاخری بۆ دایکی گێڕایەوە. دایکی وتی: هەشت کار هەیە بە هەشت کارەوە بەستراوە" خزمەتی ژن بەمێردەوە. خۆشەویستی ئەولاد بە باوکەوە. فێربوونی شاگرد لەوەستایەوە. قووەتی پاشا بەلەشکرەوە. شۆرەتی پیاوچاکان بەتاعەتەوە. ئیسراحەتی میللەت بە پادشاوە. دروست بوونی کاری پادشاه بە ڕاستییەوە. دەوام کردنی پادشایی بە عەقڵ و تەدبیرەوە. وە لەکوشتنی فیرڕیسە دوو ڕێگەی خەتەر دەرئەکەوێت. ئەووەڵ ئومەرا هەریەکە بۆ جێگەیەک ڕێگەی فیراری لەترسا ئەگرنە پێش. دووەم گوناهی کوشتنی ناحەق لەسەر تۆ دائەنرێت، چونکە بە عەقڵ ئەزانم دوشمن ئەو نیشەی بۆ فیرڕیسە دروست کردووەو، ئاشکرایە ئومەرا ڕقیان لەیەکە و ئارەزووی بەرزیی یەک ناکەن و تۆیش بەقسەی ئومەرا ئومەرا لەناوبەریت بە مووددەتێکی کەم بێشەکە بە چۆڵی ئەمێنێتەوە. کامجۆی وتی: من بە قسەی ئومەرا ئەمرم بە کوشتنی فیرڕیسە نەکردووە و لەسەر خیانەت ئەمرم بە کوشتنی کردووە. دایکی وتی: من ئەیزانم دڵت بەقسەی ئومەرا خراپ کردووە، وە لە من مەعلوومە فیرڕیسە مووددەتێکە تەرکی خواردنی گۆشتی کودووە و هەتا ئێستا ڕیازەتی ئەشکاوە و جەنابت ڕوتبەی وەزارەتت پێ بەخشیوە. مومکینە حەسوودان بەخاڵەتیان پێ بردبێ و گۆشتەکەیان بردووە لە جێگەی فیرڕیسە شاراوەتەوەو، دوشمن هەموو جۆرە فێڵێ دروست ئەکەن و، تۆ لە مەسئەلەی حەسوودەکە بێ خەبەری بۆ ئازاری دراوسێیەکەی خۆی بە کوشت دا.

کامجۆی پرسیی: چۆن بووە؟

دایکی وتی: ئەگێڕنەوە لە شاری بەغداد کابرایەکی حەسوود دراوسێی عابیدێ بوو. عابیدەکە شۆرەتی عیبادەتی بڵاو بووبۆوە، لە هەموو لایەکەوە بۆ زیارەتی ئەهاتن، دیاریی چاک چاکیان بۆ ئەهێنا. کابرا حەسوودەکە بەخالەتی پێ برد، درۆی زۆری بۆ عابیدەکە هەڵئەبەست، باوەڕیان پێ نەئەکرد. ئاخری مەجبوور بوو عەبدێکی کڕی، خزمەتی عەبدەکەی کرد، ڕۆژێ بە عەبدەکەی وت: ئەزانی بۆچی ئەوەندە خزمەتت ئەکەم؟ کارێکم پێتە، ئەبێ جێ بەجێی بکەیت. عەبدەکە وتی: بەسەر سەر. کارەکە چییە؟ بەیانی بفەرموو. حەسوودەکە وتی: ئەو عابیدە دراوسێمە. هەر چەند درۆ و بوهتانم بۆ هەڵبەستووە کەس باوەڕم پێ ناکات. وا ئێستا وا بەچاک ئەزانم ئیمشەو بچین لە سەربانی عابیدەکە من سەر ببڕیت و ماڵەکەم بۆ خۆت بەریت، ڕوو بکەیت بۆ شارێکی کە، بەڵکی حوکوومەت لە جێگەی خوێنی من عابید بگریت و ناوی چاکەی بکوژێتەوە. عەبدەکە وتی: ئاغا، لەسەر ئەو فکرە لاچۆ، وە ئەگەر تۆ مردیت لە پاش تۆ هەرچی لەعابید بکرێت قانزاجی بۆ تۆ نابێ، وە ئەگەر زۆر لە عابید بێزار بوویت من خەریکی کوشتنی ئەبم و دڵی تۆ لە ئازار نەجات ئەدەم. حەسوودەکە وتی: خەریکە پەردەی دڵم بپچڕێ، چاک وایە قسەم نەشکێنی. هەڵسە بڕۆین، وەخت درەنگە. شەوێ هەردوکیان چوونە سەربانی عابیدەکە. عەبدەکە سەری ئاغای بڕی، گەڕایەوە، چووە ماڵەوە، ئەوی بە وەزن سووک و بەقیمەت گران بوو هەڵیگرت و ڕووی کرد بۆ شاری ئەسفەهان. بۆ سوبحەینێ ڕۆژ بووەوە، لاشەی حەسوودەکەیان لە سەربانی عابید دۆزیەوە. عابیدەکەیان برد بۆ موحاکەمە. موددەتێ بە حەپسی مایەوە. تەسادوف توجارێ لەبەغداوە ڕووی کرد بۆ ئەسفەهان. وەختێ گەیشتە ئەسفەهان عەبدەکەی حەسوود چاوی بە توجار کەوت، خۆشی و چۆنیان لەیەک کرد، قیسسەی ئاغای هاتە ناوەوە. توجار وتی: ئێستا عابید لەسەر ئاغات حەپس کراوە. عەبدەکە وتی: بە زوڵم حەپسیان کردووە.. قیسسەی ئەووەڵ و ئاخری ئاغای بۆ توجار گێڕایەوە. توجارەکە دوو سێ کەسی بانگ کرد شاهیدییان لەدەم عەبدەکە وەرگرت. وەختێ گەڕایەوە شاهیدەکانی بردە لای قازی شەهادەتیان دا و عابیدەکە نەجاتی بوو وە تف و لەعنەت بۆ ڕۆحی حەسوودەکە ڕەوانە کرا.

دایکی وتی: بۆیە ئەم میسالەم بۆ هێنایەوە تا لە جەنابت مەعلووم بێ حەسوود هەموو جۆرە کارێ دروست ئەکات، وە ئێستا چاک وایە دەست لە کوشتنی فیرپیسە هەڵگریت.

ئەگەر خەتابار نەبووبێ دڵی جەنابت ئازاری نامێنێ، وە ئەگەر خەتاباریش بووبێ عەفو کردنی تۆ شۆرەت پەیدا ئەکات. کامجۆی بە ئامۆژگاریی دایکی دڵی چاک بوو، ناردی بە شوێن فیرپیسە دا. وەختێ فیرپیسە گەیشتە لای کامجۆی، ڕەسمی ئەدەبی بەجێهێنا، وتی: ئەی پادشا ئەو دزییە لە من دوورە، چونکە گوێشتم لەخۆم حەرام کردووە، وە جەنابت تەحقیقی بکەیت ئاشکرا ئەبێ دز کێیە؟ کامجۆی یەکە یەکە ئومەرای بانگ کرد، وەعدەی خەلاتی بە بەعزێکیان دا، وە لە بەعزێکیان توند بوو. ئاخری ڕاستی قسەیان ئاشکرا کرد. مەعلووم بوو فیرپیسە دزیی نەکردووە. دایکی شێر وتی: کوڕم لازمە لەمەو دوا بە پەلە پەل دەست بۆ کار درێژ نەکەیت. بەقسەی حەسوود ئازارت بۆ کەس نەبێ. کامجۆی وتی: ئامۆژگاریی تۆ لەقەتڵی ناحەق دووری کردم. فیرپیسە وتی: ئومێدی ئەجاتم لە خزمەت جەنابت بەیان ئەکەم. کامجۆی وتی: جارێکی کە ترس و خۆفت ئەبێ، ڕاستیی تۆ بۆم ئاشکرا بوو. فیرپیسە وتی: لە ئەووەڵەوە ڕاستی منت مەعلووم کردبوو. بەقسەی حەسوود تووشی بەڵا هاتم و، جارێکی کە تووشی ببم ڕێگەی ئەجاتم دەست ناکەوێت، وەهەتا من لە خزمەت جەنابت باقی بم دوشمن هەر باقییمو، دزی لەسەر من ئیسپات نەبوبوو ئەمرت بە کوشتنم کرد. بۆم مەعلووم کراوە گوناهێ بکەم عەفوکردن لە تۆ نابینرێت، هەروەک پادشاکە قەڵەمی عەفوی بەسەر گوناهی دەرگاوانەکە دا کێشا.
کامجۆی پرسیی: چۆن بووە؟

حیکایەت

فیرپیسە وتی: ئەگێڕنەوە لە شاری یەمەن پادشایەک بوو دونیای بە شوعلەی عەدالەتی ڕوون کردبووەوە. ڕۆژێ ڕقی لە دەرگاوانەکە هەڵسا، دەری کرد. دەرگاوان چەند ساڵ مایەوە، فەقیر بوو، هەرچی ناو ماڵی بوو فرۆشتی. زۆر موحتاج بوو. ئاخری فکری کرد خۆی نیشانی پادشا بدات. ڕۆژێ پادشا میوانێکی زۆری هاتبوو، بۆ کەس مومکین نەئەبوو بچێتە ژوورەوە. دەرگاوانەکە ئولاغێک و دەستێ ئەلبیسەی بە ئەمانەت خواست، ڕووی کرد بۆ ماڵی پادشا. قاپیوانەکان وایانزانی پادشاە ناردوویە بە شوێنیا، مەنعیان نەکرد. دەرگاوانەکە چووە مەجلیس، سەلامی کرد و دانیشت. وەختێ پادشاە چاوی بەدەرگاوان کەوت ئاگری غەزەبی داگیرسا، فکری کرد بانگی جەللاب بکات لە گەردنی بدات. تەکرار فکری کرد وتی: وەختی دانیشتنی میوان تووڕەبوون جوان نییە. بە ئاوی حیلم ئاگری غەزەبی کوژاندەوە، ناوچەوانی ڕوون بووەوە. دەرگاوان هەڵسا، دەستی کرد بە

خزمەت کردنی میوانەکان. لەوەختی فرسەتدا سینییەکی ئالتون وەزنی هەشتا مسقاڵ ئالتون بوو لە ژێر عەباکەیدا شاردیەوە. پادشاه چاوی لێ بوو، دەنگی نەکرد. زانیی فەقیرە و لەبەر موحتاجی ئیختیاری دزی دەکات. میوانەکان ڕۆیشتن. دەرگاوانەکەش ڕۆیشت. وەختێ حاجەت کۆ کرایەوە، دەنگە دەنگ لە خزمەتکارەکان بەرز بووەوە. پادشا وتی: ئەوە چییە؟ وتیان: قوربان سینیە ئالتونەکە دزراوە. پادشا وتی: ئەو کەسەی سینییەکەی بردووە لازمی بووە، وە ئەو کەسە چاوی لێ بووە قسە ناکات، واز بێنن، بۆ سینییەکە مەگەڕێن. دەرگاوانەکە سینییەکەی فرۆشت، تا یەک ساڵ خەرجی کرد بۆ ماڵ و منالی. دوای ساڵێ خۆی گەیاندەوە ماڵی پادشاه. پادشاه بانگی کردە پێشەوە، سەری نایە بن گوێی وتی: پارەی سینییەکەت تەواو کرد؟ دەرگاوان دەستی کرد بە گریان، وتی: ئەی پادشاه، موحتاجی پێی کردم. عاقڵان وتوویانە: خانووی دۆست برووخێنە، لە دەرگای دوشمن مەدە، وە لەزاتی پادشاه مەعلووم بێ لە ڕۆحی خۆم بێزار بووبووم، بۆیە بە دزیەوە بردم، کەس نەزانێ تا نابرووم نەچێت، وئومێد دەکەم قەڵەمی عەفو بەسەر گوناهما بکێشرێت. پادشاه عەفوی کرد و لە جێگەی خۆی بە دەرگاوانی دانیایەوە و مەعاشی زیادی بۆ بڕییەوە.

فیرپسە وتی: بۆیە ئەم میسالەم بۆ جەنابت هێنایەوە، تا جەنابت منیش عەفو کەیت ئیزنم بدەیت بڕۆم بەگیای دەرو دەشت خۆم بژێنم.

کامجۆی وتی: ئامۆژگارییەک بەجێ بێڵە. فیرپسە وتی: دڵی پادشاه لازمە وەک بەحر وا بێ بە نەختێ خۆڵ لیل نەبێ، وە حیلمی پادشا لازمە وەک کێو قایم بێ، بە بایەکی بەقووەت نەبزوێت. چاکترینی هەموو کارێک حیلم و سەبرە. کەسێ حەلیم بێ لە مسیبەتی دونیا دوورە. بە توندی و تیژی کار دروست نابێ. بە زوبانی شیرین هەموو کارێ ئاسان ئەبێ.

**نەسیحەتی دەهەم**

جەزا وەرگرتن بە ڕێگەی خۆی دروستە

دابیشلیم ڕووی کردە برەهمەن، وتی: لە عەفوکردنی خەتا تێگەیشتم و ئومێد دەکەم بەیانی جەزا وەرگرتن بە ڕێگەی خۆی بەیان بفەرموویت. برەهمەن وتی: جەزا وەرگرتن بە ڕێگەی خۆی وەک حیکایەتی شێرەچنگ تیژەکە و کابرا تیر هاوێژەکە وایە.

دابیشلیم پرسیی: چۆن بووە؟

حەکیم وتی: ئەگێڕنەوە لە ئەترافی سلێمانی کێوێ هەیە ناوی (پیرەمەگروون)ە. سەری کێوەکە بۆ ئاسمان بەرز بووبووەوە، ئاوی لە هەموو لایەکەوە تافەتاف ئەچوە خوارەوە. داری ساحێب میوەی لە حیساب نەئەهات. شێرێکی مێیی لەو کێوەدا پێگەیشتبوو، دەنگی وەک ڕەعد، هەڵمەتی وەک بەرق وابوو. دایم خەریکی خوێن ڕژاندن بوو، پەنجەی لە خوێن وشک نەئەبووەوە. سیاگۆشێ لەژێر حوکمی شێرەکە دا بوو، کە چاوی بەو خوێن ڕشتنە ئەکەوت فکری ئەوەی کردەوە کەسێ یارمەتی زاڵمێ بدات، ئەویش شەریکە. لەبەر ئەو ڕووی کردە ڕێگە، شێرەکەی جێهێشت، تەماشای کرد مشکێ خەریکی ڕەگ بڕینی دارێکە، دارەکە بە زوبانی حاڵ بانگی کرد وتی: ئەی زاڵم، لەبەر چی خەریکی ڕەگ بڕینی حەیاتم ئەکەیت و خەڵقی لە خواردنی میوەی من بێ بەش ئەکەیت؟ خراپە مەکە، جەزای خراپە خراپەیە. مشک گوێی نەدایە. تەسادوف مارێ پەیدا بوو، دەمی داپچڕی، مشکەکەی قووت دا. ژیژکێ پەیدابوو، مارەکەی خوارد. تەسادوف ڕێوی پەیدابوو، پەلاماری ژیژکی دا. خستیە سەرپشتی، میزی کردە سەر سکی. ژیژک وایزانی باران ئەبارێ. سەری دەرهێنا، ڕێوی پەلاماری دا، گرتی، سەری هەڵکەند و دڕکەکانی داماڵی خواردی. ئێستا لە خواردن نەبووبووەوە سەگێ وەک گورگی هار پەلاماری ڕێوی دا و خواردی. تەسادوف پڵنگێ پەیدا بوو، پەلاماری سەگی دا، پارچە پارچەی کرد. بەینی چوار دەقیقەی پێ چوو ڕاوچییەک پەیدا بوو تیری بۆ پڵنگ هاوێشت، دای لەپەراسووی ڕاستی لەپەراسووی چەپی دەرچوو، پڵنگ مرد. ڕاوچییەکە پێستی پڵنگەکەی گرتەوە. سوارێ پەیدابوو تەماشای پێستە پڵنگەکەی کرد، ئارەزووی سەندنی کرد، بوو بە شەڕیان لەگەڵ کابرا ڕاوچییەکە. سوار شمشێری داهێنایەوە دای لەسەری ڕاوچی کردی بە دوو کەرتەوە، پێستەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت. میقداری نیو سەعات نەڕۆیشتبوو، قاچی ئولاغەکەی چوو بە کونەمشکدا، سوارەکە گلا، ڕۆحی دەرچوو. سیاگۆش ئەو عەجایبانەی چاو پێکەوت، گەڕایەوە بۆ لای شێر و دوعاخوازیی لە شێر کرد . شێر وتی: ڕۆیشتنی تۆ لەبەر چییە؟ خواردنێکی زۆر لەبەر من ئەمێنێتەوە بە ڕەحەتی ئەیخۆیت. سیاگۆش وتی: ئەی پادشا، قسەیەک لە دڵمایە، ئاشکراکردنی بۆنی مردنی لێ دێت، وە ئەگەر جەنابت دڵم ئەمین ئەکەیت ئەتوانم ئاشکرای بکەم. شێر دڵی ئەمین کرد. سیاگۆش وتی: ئەی پادشا تەماشا ئەکەم دایم خەریکی خوێن ڕژاندنی و، لە ئاخر ڕۆژت زۆر ئەترسم. شێر وتی: زوڵم لە تۆ ئەکراوە و من ئازارم بە تۆ نەگەیاندووە. ڕۆیشتنت لەبەر چییە؟

سیاگۆش وتی: لەبەر دوو ڕێگەیە. ئەووەڵ ئەو کەسەی ساحیب مروەت بێ تاقەتی چاو پێکەوتنی زوڵم ناکات و، نیقتیداری ناڵەی مەزڵوومی نییە. دووەم لەوە ئەترسم جەزای خراپەی تۆ لە تۆ تێپەڕ بکات، پرشنگی من بسووتێنێ و، هەرکەس نزیک بە کوورە بوو پرشنگی بۆ دێت. شێر وتی:تۆ بۆنی خراپەت لەکوێ کردووە؟ ڕێگەی کاری چاکە چۆن ئەزانی؟ سیاگۆش وتی: ئەی پادشاه، ئاشکرایە هەرکەس چاک بکا چاک دێتە ڕێگەی و هەرکەس خراپ بکات خراپ دێتە ڕێگەی. دونیا لە جێگەی خۆی وەک شاخ و کێو وایە، هەر دەنگێ بێت دەنگ ئەداتەوەو،ئیمڕۆ من شتێکی غەریبم دیوە. مەسئەلەی لە ئەووەڵ تا ئاخر بۆ شێر گێڕایەوە. بە ئامۆژگاری وتی: ئەی پادشاه، مشک ڕەگی دارەکەی بڕی، بوو بە خۆراکی مار. مار ئازاری بە مشک گەیاند، بوو بە خۆراکی ژیژک. ژیژک مارەکەی خوارد، بوو بە خۆراکی ڕێویی فێڵزان. ڕێوی ژیژکی خوارد، بە دەست سەگەوە پارچە پارچە کرا. سەگ ڕێویی خوارد، بەچنگ پڵنگەوە سکی هەڵدڕا. پڵنگ سەگەکەی کوشت، بەتیری ڕاوچی کوژرا. ڕاوچی پێستی پڵنگی داماڵی، بە شمشێری سوار دوو لەت کرا. سوار قەتڵی ناحەقی کرد ئولاغەکەی گلا ئەستۆی شکا. هەموویان لەبەر زوڵم کردن بە جەزای خۆیان گەیشتن. لە خراپە دوور بوون ڕێگەی سەلامەتییە. شێر لەبەر مەغرووری قسەی سیاگۆشی بە هیچ زانی. لە جێگەی ئەو هەموو ئامۆژگارییە دەستی زوڵمی زیاتر درێژ کرد. سیاگۆش بۆی مەعلووم بوو ئامۆژگاری تەئسیر ناکات، شێرەکەی جێهێشت. شێر ڕقی هەڵسا، شوێن سیاگۆش کەوت. سیاگۆش لە ترسا خۆی شاردەوە. شێر لە سیاگۆش ڕەت بوو تەماشای کرد دوو بێچووە ئاسک بە گیا خواردن خەریکن، دایکیان بە دیارەوە وەستاوە. شێر فکری خواردنی بێچووە ئاسکەکانی کرد، دایکی ئاسکەکان هاواری کرد: ئەی پادشا، دەست لە خواردنی بێچووەکانم هەڵگرە، تۆیش بێچووت هەیە. جگەرم بە ئاگری زوڵم مەسووتێنە. دەرزی بکە بە خۆتا، ئەنجا سووژن بکە بە خەڵقدا. شێر هەردوو بێچووە ئاسکەکەی خوارد. وە شێرەکە دوو بێچووی بوو. تەسادوف ڕاوچییەک ڕێگەی کەوتە ئەوێ، هەردوو بێچووە شێرەکەی کوشت و پێستی داماڵی بردی. ئاسک بە گریان ڕۆیشت، تووشی سیاگۆش بوو، بەیانی خواردنی بێچووەکانی بۆ سیاگۆش گێڕایەوە. سیاگۆش وتی: نزیکە بە جەزای خۆی بگات. وەختێ کە شێر ڕۆیشتەوە تەماشای کرد هەردوو بێچووەکەی کوژراوە و پێستیان لەبەر داماڵاوە، بە نەڕەنەڕ ئەو کێوەی هێنایە لەرزە. چەقەڵێ دراوسێی بوو چوو بە تەعزیەوە، وتی: گریان و هاوار بۆ ئەکەیت؟ شێر وتی:وەرە بزانە چییە، ئەو وەختە گریانم بپرسە. چەقەڵ وتی:

سەبر لازمە. هەرچی داخلی بە دونیا ببێ مردنی بۆ دانراوە. ئەختێ بێ دەنگ بە سێ ئامۆژگاری هەیە بۆت بگێڕمەوە: هەر ئەووەڵێ ئاخرێکی هەیە، هەر تەنگانەیەک فەرەحییەکی لە شوێنەو، هەر ڕۆح لەبەرێ مردنی هەیە. لازمە سەبر بکەیت، گریان و هاوار چارت ناکات. شێر وتی: نازانم لە کوێ ئەو بەلایە بۆ بێچووەکانم هاتووە؟ چەقەڵ وتی: خۆت ئەو بەلایەت بسەر خۆت هێناوە. قسەی تۆ وەک قیسسەی دار فرۆشە زالمەکە وایە، ئاگر لە دارەکانی بەربووبوو، ئەیوت: ئەو ئاگرە چۆن لە دارەکە بەربووە؟ شێر پرسیی چۆن بووە

**حیکایەت**

چەقەڵ وتی: ئەگێڕنەوە کابرایەکی دارفرۆش بوو داری لە فەقیران ئەکڕی و نیوەی پارەکەی نەئەدا و لەزستانا ئەیفرۆشت بەقازانجێکی زۆر لەبەر زوڵم کردنی فەقیران کەوتبوونە هاوار. ڕۆژێ بارێ داری لە فەقیرێ کڕی، چواریەکی پارەکەی نەدا. فەقیرەکە ڕووی کردە ئاسمان، هەناسەی هەڵکێشا، هەناسەکەی لوول بوو، دەرگای ئاسمانی کردەوە. پیاوچاکێ بەلایانا ڕابوورد، وتی: زالم، لە هەناسەی فەقیران بترسە. بەیەک هەناسە دونیایەک خراپ ئەکەن. زالمەکە وتی: بڕۆ بەلای خۆتەوە. شیخ ڕووی کردە جێگەی خۆی. تەسادوف ئەو شەوە ئاگر لە ماڵی زالمەکە بەربوو، هەرچی دار و ماڵی بوو سووتا. بۆ ڕۆژەوە بوون شێخەکە بەلای خانووی زالمەکە دا ڕۆیشت، گوێی لێ بوو زالمەکە بە ڕەفیقێکی وت: نازانم ئەو ئاگرە چۆن بەربۆتەوە؟ شێخ جوابی دایەوە، وتی: ئەوە دووکەڵی دڵی فەقیران بوو ئاگری لە عومری نا موبارەکت بەردا. زالمەکە سەری خەجاڵەتی بە زەوییا شۆڕ کردەوە، بۆی مەعلووم کرا لەبەر زوڵم بەجەزای خۆی گەیشت. کەوتە غەم و مەراقەوە هەتا مرد.

چەقەڵ وتی: بۆیە ئەم میسالەم بۆ تۆ هێنایەوە، تۆیش جگەری چەند ڕۆح لەبەرێکت سووتاندووە و جەزای خۆت وەرگرت. وەک جگەر سووتاوەکان سەبریان کردووە تۆیش سەبرکە. شێر وتی: بەم ئامۆژگارییانە سەبووریی دڵم هات. وە ئێستا چارم چییە؟ چەقەڵ وتی: عومرت چەندە؟ شێر وتی: عومرم چل ساڵە. چەقەڵ وتی: ئەوە چل ساڵە بە چی ژیاویت؟ شێر وتی: بە گۆشتی حەیوانات و بەنی ئادەم. چەقەڵ وتی: ئەوانەی تۆ گۆشتت خواردوون هەموو دایک و باوکیان بووە و بە ئازاری تۆوە تلاونەتەوە. ئەگەر ئەووەڵ ڕۆژ دەستی زوڵمت درێژ نەکردایە ئێستا تووشی جگەر سووتانێ نەئەبوویت و، هەتا ئارەزووی

ئازار بوونت بێ ئیسراحەت ناکەیت. تەرکی ئازار گەیاندن بکەیت ڕۆح بە سەلامەت دەرنەکەیت. شێر تۆبەی کرد هەتا بە ڕۆح زیندوو بێ لەگیا و میوە زیاتر نەخوات. لەسەر ئەو فکرە موددەتێ مایەوە. وەختێ چەقەڵ تەماشای کرد ئەوەی خواردنی ساڵێکی چەقەڵ بێ، بە یەک ڕۆژ ئەیخوارد، تەکرار چووە لای شێر، وتی: ئەی پادشا، بە چی خەریکیت؟ شێر وتی: بەگیا خواردن خەریکم و ئازارم بۆ کەس نییە. چەقەڵ وتی: ئازاری ئێستات لە جاران زیاترە. شێر وتی: لەبەرچی؟ ئەپەنجە بە پێستی کەس خوێناوی ئەکەم و، ئەدەم بەگۆشتی کەس چەور ئەکەم. چەقەڵ وتی: تۆ دەستت لە خواردنی خۆت هەڵگرتووە، دەمت بۆ خواردنی هەموو حەیوانات درێژ کردووە، چونکە گیا و میوەی ئەم کێوە کیفایەتی دە ڕۆژی تۆ ناکات. ئەوانەی بە خواردنی ئەم کێوە ئەژین بەموددەی حەفتەیەکی کە هەموو ئەمرن، گوناهیان بە گەردنی تۆ ئەبێ. مومکینە جەزای لە دونیا بدەیتەوە، هەروەک بەرازەکە میوەی مەیموونەکەی زەوت کرد لە دونیادا بە جەزای خۆی گەیشت، لەدارەکە کەوتە خوارەوە، مرد. شێر پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

چەقەڵ وتی: ئەگێڕنەوە مەیموونێ لە هەنجیرستانێ بە تەنها موداراى ئەکرد. ڕۆژێ مەیموون فکری کرد مەعلوومە ژیان بە خواردن مومکین ئەبێ، وە مەعلوومە ئەم باغە لە هەنجیر زیاتر میوەی تری نییە. چاک وایە میقدارێکی بۆ زستان هەڵگرم. ڕۆژ بە ڕۆژ میقدارێ هەنجیری ئەخوارد وە میقدارێکی بۆ زستان وشک ئەکردەوە. ڕۆژێ بەرازێ لە دەست ڕاوچی ڕایکردبوو، ڕێگەی کەوتە ئەو باغە تەماشای کرد میوە بە هیچ دارێکەوە نەماوە، ڕووی کردە دار هەنجیرەکە. مەیموون لە ترسا بەسەر دارەکەوە وشک بوو. بەراز وتی: ئەی مەیموون، میوان ڕائەگری؟ مەیموون جوابی دایەوە وتی: غائیبانە گەیشتیت. ئەگەر لەپێشەوە خەبەرت ئەنارد خواردنم بۆ حازر ئەکردیت. بەراز وتی: ئێستا چی حازرە بیهێنە، برسییەتی هیلاکی کردووم. مەیموون لقێکی هەنجیرەکەی ڕاوشاند، هەر هەنجیرێ ئەکەوتە خوارەوە ئەیخوارد. بەراز وتی: ساحێب ماڵ تێرم کە. مەیموون لقێکی کەی بۆ ڕاوشاند، ئەویشی خوارد. تەکرار وتی: تێرم کە. مەیموون وتی: ئەی میوان، ئەوەی تۆ خواردت کیفایەتی یەک مانگی من بوو. تۆ بەمن تێر ناکرێیت. بەراز ڕقی هەڵسا وتی: ئەم باغە موددەتێکە بە دەست تۆوەیە، لەمەودوا لازمە بۆ من بێ. مەیموون وتی: زەوت کردنی ماڵ جوان نییە. واز لە تەمەع بێنە، ڕێگەی خۆت بگرە، برۆ، ئازارت نەبێ. بەراز

زیاتر ڕقی هەڵسا، وتی: ئێستا لە دارەکە ئەتخەمە خوارەوە، فێری ئەدەبت ئەکەم. بەراز بە دارەکە دا سەرکەوت، گەیشتە سەر لقێکی، دارەکە شکا. بەراز سەر و خوار کەوتە خوارەوە، ڕۆحی دەرچوو.

چەقەڵ وتی: ئەم میسالەم بۆ هێنایتەوە، لە تۆ مەعلووم بێ میوەی ئەم کێوە کیفایەتی تۆ ناکات، وە ئێستا ناوی عابیدیی تۆ- ڕاستە وەیا درۆیە- بڵاوبۆتەوە. چاک وایە قسەی دۆست و دوشمن لەسەر خۆت بار نەکەیت. شێر ئەو قسەی لە چەقەڵ بیست، تەرکی میوە خواردنی کرد، بە گیای تەڕو وشک موداراى کرد. وەهەرکەس تێگەیشتنی بێت لەم حیکایەتانە ورد بێتەوە، عەقڵ وەرئەگرێت و ژیانی ئیسراحەتی دەست ئەکەوێت.

**نەسیحەتی یازدەهەم**

لە ئەندازە زیاد تەڵەب کردن پەشیمانی لە شوێن دێ

دابیشلیم وتی: لە جەزا وەرگرتن بە ڕێگەی خۆی بە زوبانی جەنابت بەیان کرا، تێگەیشتم. ئومێد دەکەم لە ئەندازە زیاد تەڵەب کردن پەشیمانیی لە شوێن بێت، چۆنە؟

برەهمەن وتی: ڕۆژی ئەزەل کە خودا مەخلووقی دروست کرد ڕزقی بۆ دانا. زیاد و کەمی بە دەست کەس نییە، هەمووی بە ئیرادەی خوداوە بڕاوەتەوە، وە هەرکەس بە واسیتەیەک خودا ڕزقی بۆ ئەنێرێت، وەهەرکەس لە ئەندازەی خۆی زیادی تەڵەب کرد، بە دەرد و مەراقەوە مرد، هەر وەک کابرای فەرەنگستانییەکە تەڵەبی فێر بوونی زوبانی عیبریی لە عابیدەکە کرد.

دابیشلیم پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

برەهمەن وتی: لە زەمینی قونووج عابیدێ بوو زۆر لە خواترس و ساحێب خێرات بوو، ناوی عیبادەتی بە هەموو ئەترافا بڵاو بووبۆوە، لە هەموو لایەکەوە دیاری بۆ ئەهات. شەو و ڕۆژ بە خزمەت کردنی میوان خەریک بوو. ڕۆژێ میوانێکی هات، لە پاش نان خواردن لە میوانی پرسی: خەڵقی کام شاری؟ میوان وتی: ئەگەر تاقەتی گوێ گرتنت هەیە، قیسسەی من دوور و درێژە. عابید وتی: بیگێڕەوە، بزانم. میوان وتی: من خەڵکی شاری فەرەنگم، کاری من نانەوایی بوو، وە لەگەڵ فەللاحێک موعامەلەمان بوو. فەللاح گەنمی بۆ ئەناردم، منیش بە حەفتە پارەم ئەدایێ. ڕۆژێ فەللاحەکە زیافەتی بۆ کردم، بانگی کردمە ناو باغێکەوە. لەنان خواردن بووینەوە، دەستمان کرد بە قسەکردن. سوئالی

لە من کرد، وتی: موعامەلە و قانزاجت چۆنە؟ من جوابم دایەوە: دەستمایەی دووکان بیست حۆقە گەنە. قانزاجی ئەوەیە ڕۆژ بە ڕۆژ بۆ ماڵ و منداڵ خەرج ئەکرێت. فەللاحەکە وتی: زیادیی ئەوەندە نییە خانوێکی پێ دروست بکەیت؟ من وتم: بە هەزار کێشمە کێشم خەرجی دەردێنێ. منیش وتم: مایە و قانزاجی تۆ چۆنە؟ جوابی دامەوە وتی: مایەی من کەمە و قانزاجی زۆرە. یەک بەدە گەنم زیادی ئەبێ. منیش وتم: یەک بەدە قانزاج زۆر زەحمەتە. فەللاح وتی: لەوە زیاتر قانزاج دەست ئەکەوێت. یەک دەنک خەشخاش بروێنی لەگەڵ سەوز ئەبێ میقداری بیست چڵ دەرئەکات، هەر چڵێکی خاشخاشێ ئەگرێت، هەر خاشخاشێ دە هەزار دەنک زیاترە. ئەی وەستا، «زرع» کە خوا بیدات لە کیمیا چاکترە. حوکەما «ز»، «ر»بە ئالتوون ناو ئەبەن، «ع» بە سەرچاوەی ئالتوون ناو ئەبەن. منیش کە ئەو قسانەم لە فەللاح بیست، فکری زەراعەت کردنم کەوتە سەر و دەرگای دووکانم داخست، خەریکی ئەسباب زەراعەت کڕین بووم دراوسێیەکم خەبەری زانی دەرگای دووکانم داخستووە، فکرێ کەم هەیە، بانگی کردم، دەستی کرد بە ئامۆژگاریم. وتی: ئەی وەستا، دەست لە کاری خۆت هەڵمەگرە و زیاد لە ئەندازە داوا مەکە. کەسێ قانیع بێ پادشای وەخت و زەمانە. کەسێ تەمەعکار بێ موفلیس و سەرگەردانە. منیش وتم: سۆفی، نانەوایی قانزاجی نییە، فکرم هەیە فەلاحەت بکەم بەڵکی قانزاجی زیادم دەست کەوێت، خانوێک دروست بکەم. سۆفی وتی: موددەتێکە ژینی تۆ لەسەر نانەوایی دەوامی کردووە. مومکینە ئەو فکرەی تۆ کردووتە قووەتت بەسەریا ئەشکێ، ئەوەت بەسەر بێ بەسەر قولنگەکە هات. وتم: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

سۆفی وتی: ئەگێڕنەوە کابرایەکی گازر هەموو ڕۆژ لە قەراغ جۆگە ناوێ جاوی گازر ئەکرد. تەماشای ئەکرد یەک قولنگ ڕۆژی چەند سەعاتێ لە نزیک کابرای گازر ئەنیشتەوە، ئەگەڕا پەپوولە و کرم و مێشی ئەخوارد بەسەر سەوزایی و گوڵەوە. تەسادوف سوێسکەیەک بۆ ئاو خواردن نیشتەوە، واشە بۆی هاتە خوارەوە، پەلاماری دا، خواردی. قۆلنگ ئەوەی چاو پێ کەوت تەرکی خواردنی خۆی کرد، لاسایی واشەی کردەوە. کۆترێ نیشتەوە، قولنگ فکری بوو بیگرێت. نزیک بە کۆتر بوو، قاچی لە قوڕ چەقی. هەرچەند قووەتی کرد نەجاتی بێ نەجاتی نەبوو. کابرای گازرکە چوو گرتی. ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە، لە ڕێگە تووشی ڕەفیقێکی بوو، وتی: ئەو تەیرە چییە؟ گازر وتی: ئەوە قولنگە لاسایی

واشەی کردەوە، لەقوڕ چەقی، منیش گرتوومە. سەری ئەبڕم. سۆفی وتی: هەر کەسێ لە ئەندازەی خۆی زیادی داواکرد پەشیمان ئەبێتەوە. میوانەکەم وتی: قسەی عابیدەکەم بە گەمە زانی. ئەوی لە دووکانەکەم بوو فرۆشتم و ئەسبابی ئەلاحەتم ڕێکخست و میقدارێ تۆوم داچەند. لە پاش یەک حەفتە خۆم و منالم موحتاج بووین بە نانێ، چونکە ڕۆژ بە ڕۆژ بە دووکانەکە ئەژیام. فکرم کرد هەتا سالێ بەم جۆرە ژیانمان نابێ، کاشکێ بەقسەی سۆفییەکەم بکردایە. چاک وایە دووکانەکەم بکەمەوە، چوومە لای ئاشنایەک چەند درهەمێکم قەرز کرد، میقدارێ گەنم و ئەسبابم کڕی، دووکانم دانایەوە، شاگردێکم بەسەر دەغڵەوە دانا. جارجار سەری دەغڵەکەم ئەدا. بەو جۆرە چوار مانگ دەوامم کرد. شاگردەکە دەستی کرد بە دزی لێم و مایەی دووکانەکەم فەوتا و ئافات بۆ دەغڵەکە پەیدابوو، ئەویش نەما. ژیانم پێی تاڵ بوو، چوومەوە لای سۆفییەکە، بەیانی ئەحوالاتی خۆم بۆ کرد. سۆفی وتی: مەسئەلەی تۆ وەک کابرا ڕیش ماش و برنجەکە وایە کە دوو ژنی بوو. منیش وتم: چۆنە؟

**حیکایەت**

سۆفی وتی: ئەگێڕنەوە کابرایەک بوو ڕیشی ماش و برنج بوو، دوو ژنی بوو، یەکێکی گەنج و یەکێکی پیر. کابرا هەر شەوێ لای یەکێکیان ئەنووست. ڕۆژێ لای ژنە پیرەکە خەوی لێ کەوتبوو. ژنەکە تەماشای کرد نیوەی ڕیشی ڕەشە، فکری کرد وا چاکە هەر هەموو موویەکی ڕەش بێ هەڵی کەنم بەڵکێ هەوێکە تەلاقی بە زوو بسێنێ و عومری لەگەڵ من ڕابوێرێت. بەو فکرە هەر موویەکی ڕەش بوو هەڵی کەند. بۆ سبحەینێ نۆبەی مالی ژنە گەنجەکە بوو. کابرا چووە ئەوێ، خەوی لێ کەوت. ژنە گەنجەکە تەماشای کرد مووی ڕەش بە ڕیشی مێردەکەیەوە نەماوە. فکری کرد: وا چاکە مووە سپییەکان هەڵکەنم بێ بە کوڕی چواردە ساڵ، بەعەیبی بزانێ بچێتە لای ژنە پیرەکەی و عومری لەگەڵ من ڕابوێرێت. بەو فکرە هەموو مووەکانی هەڵکەند. کابرا بەبێ ڕیش مایەوە. ڕیشی بە دەست ژنەوە بێ بۆ هەڵکەندنێ چاکە. سۆفی وتی: ئەی وەستا، تۆیش نیوەی مایەکەت شاگرد دزی و نیوەی مایەکەت دەغڵ بوو فەوتا. وە لە ئەووەڵەوە ئامۆژگاریم کردیت بە قسەت نەکردم، وە بزانە هەرکەس لە ئەندازەی خۆی زیاد داوا بکات پەشیمانیی لە شوێن دێت. میوان وتی: لەتاو قەرزداری تەرکی وەتەنم کرد، هەر شەوێ لە شارێ بە سوال کردن ئەژیام. لەپاش موددەتێ بیستم منالەکانم لەبرسا مردن و ناومال، قەرزدار لە جیاتی قەرز

فرۆشتوویەتی و شار بە شار نەگەڕێم تا داخڵ بە خزمەتی تۆ بووم. عابید وتی: قسەکانت خۆش بوو، وە ئێستا ئەگەر تاقەت ئەگریت بەیەکەوە ڕائەبوێرین، وە ئازاری سەفەر و فەقیری مەکێشە. عابیدەکە بەنی ئیسرائیلی بوو، لەگەڵ قەومی خۆیا بە زوبانی عیبری قسەی ئەکرد. ڕۆژێ میوان وتی: ڕجا ئەکەم فێری زوبانی عیبریم بکە، بەڵکی لە دیانەت چاکتر شارەزا بیم. عابید وتی: من بە زەحمەتی نازانم و بۆ تۆ زۆر زەحمەتە چونکە حورووفاتی عیبری و فەرنگسزی زۆریان تەفاوتە، مومکینە تۆ فێر نەبی و منیش عیبادەتم بفەوتێ. میوان وتی: هەرکەس ئارەزووی کارێ بکات گرانی بە ئاسان ئەزانێ. بیستومە هەر زەحمەتێک بۆ دیانەت بکێشرێت خێری زۆرە، هەروەک ماسیگرەکە بەفێر بوونی تۆزە عیلمێ دەوڵەمەند بوو، وە بەنیعمەتی پادشاه گەیشت.

عابید پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

میوان وتی: ئەگێڕنەوە فەقیرێ بوو موداوای بە ماسی گرتن و تەیر گرتن ئەکرد. ڕۆژێ داوی بۆ تەیر ئابوەوە لەجێگەیەک خۆی شاردەوە. لەپڕ دوو مەلا بە موجادەلە کردن پەیدا بوون. کابرا چوو بەلای مەلاکانەوە، وتی: ڕجا ئەکەم دوور بکەونەوە چونکە داوم بۆ تەیران ناوەتەوە. مەلاکان وتیان: ئەگەر ئێمە ئەکەیت بە شەریک و هەریەکە تەیرێکمان نەدەیتێ بەبێ دەنگی دوور ئەکەوینەوە. کابرا وتی: پیاوی چاک بن تەمەع مەکەنە من. فەقیر و ساحێب عەیالم. ئێوە بڕۆن بەلای کاری خۆتانەوە. مەلاکان وتیان: تۆ هەموو ڕۆژێ ئەمە کارتە، وە ئەگەر ئیمڕۆ یەکی تەیرێکمان بدەیتێ دونیا خراپ ئەبێ؟ ئێمەش بە دیاری بیبەین بۆ موعەللیم. کابرا وتی: چۆن مومکینە ئەبێ ڕزقی ئیمڕۆم لەگەڵ ئێوە بکەم بە سێ بەش، ئێوە دوو بەشی بەرن بۆ موعەللیم. نە ئەم زەوییە موڵکی موعەللیمە و، ئەمن نانخۆری موعەللیمم. خودا قووبوڵ ناکات. تەمەعتان لە ڕزقی من نەبێ. مەلاکان وتیان. ئەگەر قوبووڵ ناکەیت ئێمەیش هەر تەیرێ هات دەری ئەکەین. ناچار کابرا قوبووڵی قسەی مەلاکانی کرد. مەلاکان دوورکەوتنەوە. تەسادوف سێ تەیر بوو بە داوەکەوە. مەلاکان پەیدا بوون، داوای حەقی خۆیان کرد. کابرا دەستی کرد بەپاڕانەوە، ئەوانیش وتیان شەرت کردن وەفای لازمە. بەزۆر دوو تەیریان وەرگرت. کابرا وتی: وەک ئێوە بوون بە شەریکم، لازمە منیش بیم بە شەریکتان، قسە و موجادەلەتان چی بوو بامنیش بزانم. مەلاکان وتیان: ئێمە هەردوکمان موجادەلەمان لەسەر سێ قسە بوو بۆ

تەقسیماتی میرات لە(مذکر) و لە (أنثی) و لە (خنثی). کابرا وتی: (مذکر) و(مؤنث) یەعنی (نێر)و(مێ). (خنثی) چییە؟ مەلاکان وتیان: (خنثی) نەنێرە نە مێ یە. کابرا «نەنێرە نەمێ یە» کردی بە ویردی زوبان. ڕووی کردەوە ماڵ، چوو تەیرەکەی فرۆشت. هەر جۆرێ بوو ئەو شەوە ڕایانبوارد. بۆ سوبحەینێ ڕۆژ بووەوە. تۆڕی هەڵگرت، ڕۆیشت بۆ ماسی گرتن. وەختێ تۆڕی خستە ناو ئاوەوە، یەک ماسیی ڕەنگا ورەنگ بە تۆڕەکەوە بوو. وەختێ کابرا چاوی بە ماسییەکە کەوت زۆر جوان بوو، فکری کرد بە زیندوویەتی بیباتە خزمەت پادشاە، پارەکەی ئەوەندە ئەبێ شەو و ڕۆژێ ئیدارەی پێ بکات. بەو فکرە ماسییەکەی خستە ناو زەرفێکی ئاوەوە بە زیندوویەتی بردی بۆ خزمەت پادشاە. وە پادشاە قەسرێکی دروست کردبوو لەناو قەسرەکەدا حەوزیان دروست کردبوو، لە هەموو جۆرە ماسییەکیان بۆ حەوزەکە هێنابوو. پادشاە هەموو ڕۆژێ بۆ تەماشا کردنی ماسییەکان ئەچوو. تەسادوف ئەو وەختە کە ماسی فرۆش گەیشتە خزمەت پادشاە، پاشاە لە تەماشا کردنی ماسییەکانا بوو. ماسی فرۆش چووە پێش دەمی پادشا، ڕەسمی ئەدەبی بەجێهێنا، ماسییەکەی دانا. وەختێ پادشا چاوی بە ماسی کەوت زۆر پێ خۆشحاڵ بوو، ئەمری کرد هەزار دینار بدەن بەماسی فرۆش. وەزیر چووە پێش دەمی پادشاە، زوبانی ئامۆژگاریی کردەوە وتی: ئەی پادشاە، ماسی فرۆش زۆرە، وەماسی لە بەحر تەواو نابێ، وەهەرکەس یەک ماسی بێنێتە خزمەتت و ئەمر بکەی هەزار دیناری بدرێتێ، بە چەند ڕۆژێ دینار و درهەم لە خەزێنە تەواو ئەبێ. پادشاە وتی: ئەمر چۆن ڕەد ئەبێتەوە؟ وەزیر وتی: من بەیەک قسە ئەمری جەنابت بەجێ دێنم و دڵی ڕاوچییەکەش خۆش ئەکەم. جەنابت سوئال بکە، بفەرموو: ئەی ڕاوچی، ماسییەکە نێرە وەیا مێیە؟ ئەگەر وتی: نێرە من ئەڵێم: بچۆ مێیەکەی بێنە و هەزار دینارەکە وەرگرە. وە ئەگەر وتی: مێیە، من ئەڵێم: نێرەکەی بێنە و هەزار دینارەکە وەرگرە، وە مەعلوومە ئەویش بۆی مومکین نابێ و هەرچەند وەرگرێ زۆر دڵخۆش ئەبێت و یەک درهەم بە زۆر ئەزانێ. پادشاە ڕووی کردە ماسی فرۆش وتی: کابرا ماسییەکە نێرە یا مێیە؟ کابرا بۆی مەعلووم بووبوو پادشا و وەزیرەکە تەدبیری چۆنیان کردبوو، جوابی دایەوە، وتی: شاهم، ئەو ماسییە خونسایە، یەعنی نەنێرە نەمێیە. پادشا قسەکەی لا جوان بوو، دەستی کرد بە پێکەنین، ئەمری کرد یەک هەزار دینار حەقی ماسیەکەو، یەک هەزار دینار حەقی قسەکەی بدەنێ. ماسی فرۆش لەخۆشیا دوو هەزار دیناری وەرگرت، بوو بەیەکێ لە خۆشەویستانی پادشاە. میوان وتی: ئەی عابید، بۆیە ئەم میسالەم بۆ هێنایتەوە تا لە تۆیش ئاشکرا بێ ڕاوچییەکە بە دوو تەیر کە بە مەلاکانی دا

فێری دوو کەلیمەی ئێر و مێ بوو دوو هەزار دیناری لە پادشاه وەرگرت، ڕجا ئەکەم جەنابت منیش فێری قسەی عیبری بکە. عابید وتی: تۆ ئارەزووی فێربوون ئەکەیت. منیش قوسوور ناکەم. عابید موددەتێکی زۆر لەگەڵ کابرای میوان خەریک بوو، زوبانی عیبری فێر نەئەبوو. ڕۆژێ عابید بە میوانەکەی وت: زوبانی فەرەنگی و زوبانی عیبری زۆریان بەینە و هەتا مردن فێر نابی. ڕجا ئەکەم لەسەر ئەو خەیاڵە لاچۆ. زوبانی ئەجدادت مەگۆڕە. میوانەکە وتی: لەسەر ڕەوشتی ئەجدادم ناڕۆم چونکە زۆر کەم عەقڵ بوون. وتوویانە: «إنا وجدنا آباءنا علي أمة» و من لەسەر ئەو ڕەوشتەم کە خودا فەرموویەتی : «يهدي الله بنوره من يشاء». عابید وتی: ئەوەی ڕێگەی چاکە بوو من بەجێم هێنا، وە ئەیزانم ئاخری زۆر پەشیمان ئەبیتەوە. ئەفێری زوبانی عیبری ئەبیت و، ئەزوبانەکەی خۆت فکر ئەمێنێت. هەروەک قەل ئارەزووی فێر بوونی لەنجەی کەوی کرد، ڕۆیشتنی خۆی فکر چۆوە.

میوان پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

عابید وتی: ئەگێڕنەوە ڕۆژێ قەلێ بە ئاسمانەوە چاوی بە کەوێ کەوت بە لەنجەولاز بە زەوییا ئەڕوات. قەل نیشتەوە، بوو بە خزمەتکاری کەو، شەو و ڕۆژ لە کەو جیا نەئەبووەوە. موددەتێ بە ڕەفیقیی کەو مودارای کرد و ئارەزووی لەنجەولاری کەوی کرد. ڕۆژێ کەوەکە وتی: ئەی ڕووڕەشی ناشیرین، تەماشا ئەکەم لاسایی من ئەکەیتەوە. قەل وتی: ئەی لەنجە شیرین، ئارەزووی فێربوونی لەنجەی تۆ ئەکەم. کەو دەستی کرد بە قاقاه، وتی: ڕووڕەش، خودا بە ڕووڕەشی تۆی خەلق کردووە و هەردوو پێت پێوەند کراوە، وە خودا منی لەسەر ڕۆیشتنی لەنجەولار فێر کردووە، وەتۆ زەحمەتی خۆت مەدە، فێری لەنجەی من نابی. قەل وتی: ڕێگەیێ گرتوومە بە قسەی تۆ تەرکی ناکەم و تا لەنجەی تۆ فێر نەبم لە تۆ دوور ناکەومەوە. موددەتێ قەل لەدوای کەوەکەوە ڕۆیشت، فێری لەنجەی کەو نەبوو، وە هەڵقون هەڵقونەکەی خۆشی فکر چووەوە. عابید وتی: بۆیە ئەم میسالەم بۆ هێنایەوە هەتا تۆیش زەحمەتی خۆت نەدەیت. فێری زوبانی عیبری نابی. عاقلان وتوویانە: ئەزان ئەوەیە ئارەزووی کارێ ئەکا لایقی ئەحواڵی نەبێ. بۆم مەعلووم بوو تۆ جاهیلی. دووکانی نانەواییت بەجێهێشت، چوویتە سەر فەلاحەت، ئەویشت بۆ هەڵنەسووڕا لەتاو فەقیری تەرکی وەتەنت کرد، گەیشتوویتە ئێرە، ئارەزووی فێربوونی

زوبانی عیبری نەکەیت. موددەتێ عابید ئامۆژگاریی کرد. ئاخری زوبانی عیبری فێر نەبوو، زوبانەکەی خۆشی فکر چووەوە. هەر جۆرێ زیاد لە ئەندازە تەڵەب کرێت پەشیمانی لە شوێن دێت. کەسێ عاقڵ بێ تەماشای لەخۆ بەرەو ژوورتر ناکات و ئازاری دڵی خۆی نادات.

**نەسیحەتی دوازدە**

گەورەییی حیلم و سەبر کردن بۆ پادشاهان

دابیشلیم وتی: لە ئەندازە زیاد داوا کردن و پەشیمان بوونەوەی بە زوبانی جەنابت بەیان کرا، تێگەیشتم. ئومێد دەکەم بەیانی گەورەییی حیلم و سەبر کردن بۆ پادشاهان بە ڕێگەی ڕاستی بەیان بفەرموویت. برەهمەن وتی: ئەی پادشاه، لە هەموو قانوونێ چاکتر حیلمە. ڕەوشتێ بۆ پادشاهان بەکار بێ، حیلمە. خودا ئیلهامی ناردە سەر محمد (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: « ولو كنت فظا غليظ القلب لانفضوا من حولك». کەوا بوو ئاسانیی دونیا و قیامەت بە حیلم مومکین نەبێ. وە لە حەدیثایە «من سعادة المرء حسن الخلق» و«كاد الحليم ان يكون نبيا».سێ ڕەوشت بۆ پادشاهان پێویستە: حیلم و، سەخاوەت و، شەجاعەت. وەحیلم لە هەموو کارێ چاکترە. شەجاعەت وەختێ خۆی هەیە. سەخاوەت جێگەی خۆی هەیە. حیلم هەموو وەخت پێویستە چونکە پادشاه و میللەت موحتاج بە حیلم ئەبن. پیاوێکی عاقڵ وتی: یەک تاڵ موو لە ما بەینی من و هەموو عالەمدا بێ، ئارەزووی پچڕاندنی بکەن ناپچڕێت، چونکە حیلمم وایە سەری مووەکە نەرم بگرن من ڕاینەکێشم و، ئەوان ڕایانکێشا من بە نەرمی بۆیان دائەنێم، وە ژیانم لەگەڵ هەموو جۆرە بەنی ئادەمێ دروست ئەبێ، وە قانزاجی حیلم بۆ پادشاهان زۆر پێویستە چونکە موحاکەمەی کوشتن و دزی و شەڕ و شۆڕ ئەبرێتە پێش دەمی پادشاه. لازمە پادشاه سەبر و حیلمی زۆر بێ. ئەگەر پادشاه حەلیم نەبێ مومکینە بەقەهری دونیایەک ژێر و ژوور بکات. وەختێ پادشاه بە ناوی سەخاوەت خۆڵی دونیا بشوات، بە ئاگری شەجاعەت خەرمانی خەتاکار بسووتێنێت و ڕێگەی حیلم لەخۆی گوم بکات، بەیەک نەعرە ڕۆح لە بەدەنی هەزار کەس دەرئەکات، ناوی سەخاوەت و شەجاعەت گوم ئەبێ. سەخاوەت و شەجاعەت بەحیلم دروست ئەبێت. حیلم ڕەوشتی پێغەمبەرانە. قەهر و غەزەب ڕێگەی نەفس و شەیتانە. لە پیاوچاکێکیان پرسیی: ڕەوشتی چاکە چییە؟ ڕەوشتی خراپە چییە؟ جوابی دایەوە: سەرچاوەی ڕەوشتی چاکە حیلمە. سەرچاوەی ڕەوشتی خراپە قەهر و

غەزەبە. وەلەزاتی پادشاە ئاشکرا بێ ئومووراتی حوکوومەتی بە وەزیری عاقڵەوە دروست نەبێ. هەروەخت پادشا ڕقی هەڵساو ئاگری غەزەبی داگیرسا، وەزیر بە تەدبیر کردن بە ئاوی حیلم ئاگرەکە بکوژێنێتەوە، هەروەک پادشای هیند ڕقی لە میللەت هەڵسا بەتەدبیری وەزیرەکە دڵی چاک بووەوە.

دابیشلیم پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

بەرەهمەن وتی: ئەگێرنەوە لە هیندستان پادشاهێک بوو ناوی سالار بوو، خەزێنە و ماڵی لەحیساب نەئەهات. ئەو پادشایە دوو کوڕی زۆر جوان و لایقی بوو، یەکێکی (سوهەیلی یەمەنی)و یەکێکی (ماە خوتەنی) ناو بوون. دایکی کوڕەکان (ئێران دوخت) ناوبوو، جوانیی وەک ڕۆژ شوعلەی ئەدا. وەزیری پادشاە ناوی (بەلار)بوو، بە هیندی یەعنی موبارەک. زۆر بەفکر و تەدبیر بوو. بەیەک تەدبیر دەرگای هەزار گرانی ئەکردەوە. کاتبی پادشاە ناوی (کەمال) بوو، بەنووکی قەڵەم خەریتەی شار و لەشکری ئەکێشا. پادشاە بۆ سوار بوونی خۆی دوو فیلی گەورەی هەبوو، لە ڕۆژی شەڕدا بە خورتووم بناغەی قەلعەیان دەرئەهێنا. ڕوویان بۆ هەر سەفێکی دوژمن بکردایە یەکێکیان بەزیندویتی دەرنەئەکرد. دوو حوشتری بوختی بۆ سوار بوونی پادشاە لە تەویلەدا خزمەت ئەکران. سێ ڕۆژ ڕێگەی بە ڕۆژێ ئەیانبڕی، وە ئەسپێکی تیژڕەوی بوو، ئاوزەنگیی لێ توند بکرایە وەک برووسکە دەرئەچوو. وە شمشێرێکی بوو مشتووی بە یاقووت و زمڕووت نەقش کرابوو، وەکالانی شمشێرەکە بە ئەڵماس و پیرۆزەوە نووسرابوو. پادشا زۆر ئەوانەی خۆش ئەویست، وەک(سوهەیلی یەمەنی) و(ماە خوتەنی) و(ئێران دوخت) و(بەلار) و(کەمال) و (دوو فیلەکە) و(دوو حوشترە بوختییەکە) و(ئەسپەکە) و(شمشێرەکە). لەبەر ئەو ئەسبابانە فەخری بەسەر هەموو پادشاهانا ئەکرد. لە داخلی مولکی خۆیدا میقدارێ بەرمەکی پەیدابووبوون لە دینی موسوڵمانی ئینکاریان ئەکرد، وەزۆر کەسیان بردبوە سەر مەزهەبی بەرمەکی. پادشا (بەلار)ی وەزیری ناردە بۆ ئامۆژگارییان، وجوودی وەزیر و قسەی پادشایان نەزانی. ئەمر کرا بە کوشتن و تالانیان. میقداری دوازدە هەزار کەس کوژرا، وە چوار سەد کەسیان دەرچوون و ماڵیان تالان کرا. ئەو چوار سەد کەسە زۆرزان و فێڵزان بوون، بەدرۆ دەخالەتیان کرد و موسڵمان بوون. تەسادوف شەوێک پادشا لە خەویا حەوت دەنگی گەورەی بەگوێدا چوو، لەترسا خەبەری بووەوە. دیسان خەوی پیاکەوت، چاوی بە

دوو ماسیی سوور کەوت. ماسییەکان لەسەر کلک وەستان، مەرحەبایان لە پادشاه کرد. دیسان خەبەری بووەوە، کەوتە فکری دوور و درێژەوە، خەوی پیاکەوت، چاوی کەوت بە دوو مراویی رەنگا و رەنگ لەگەڵ قازێ لەپشتییەوە هەڵفرین، چوونە پێش دەمی دوعاخوازییان لە پادشا کرد. مارێکی سەوز گەردنی خاڵی زەرد و سپیی پێوەبوو، ئاڵا لە قاچی پادشاوە. لەترسا خەبەری بووەوە. دیسان خەوی پیاکەوت، لەخەویا سەراپای لە خوێنا سوور بوو. خەبەری بووەوە، دیسان خەوی پیاکەوت، لە خەویا سواری ئێستر بووبوو. رووی کرد بۆ مەشرق. لە دوو خزمەتکار زیاتر کەس لە پشتیەوە نەبوو. خەبەری بووەوە. دیسان خەوی پیاکەوت. لەخەویا ئاگرێ لەسەرسەری کرابووەوە، دونیای رووناک کردبوو. لەترسی ئاگرەکە خەبری بووەوە. دیسان خەوی پیاکەوت، لە خەویا بێهۆش بوو. تەیرێ لەسەر سەری پادشا نیشتەوە، دەنووکی بەسەریا ئەکێشا. بەدەم هاوارکردنەوە خەبەری بووەوە. خزمەتکار بە هاواری پادشاوە چوون. پادشا وتی: هیچ نییە، خزمەتکارانی نیزن دا. پادشا وەک مارەنگاز بەودیو بەودیوی خۆیا ئەکەوت، فکری گۆڕرا، وتی: ئەم خەوە عەجائیبانە بۆ چ عاقڵێ بگێڕمەوە؟ وەختێ رۆژ بووەوە میقدارێکی لە بەرمەکییەکان بانگ کرد. لە پاشە رۆژی ترسی نەبوو، یەکە یەکە خەوەکانی بۆ بەرمەکییەکان گێڕایەوە. بەرمەکییەکان تەماشای رووی پادشایان کرد گرژ بووەوە، زانییان پادشا لە خەوەکانی ترسی پەیدا کردووە، وتیان: ئەی پادشا، تا ئێستا کەس خەوی وای نەبینیوە، لازمە ئێمە فکری بۆ بکەین و تەماشای تەعبیر بکەین. پادشاه قوبووڵی کرد. چوونە دەرەوە، لە ژوورێ کۆمەڵیان بەست. بەتەدبیر کردن خەریک بوون، وتیان لە فکرمان نەچۆتەوە ئەو زاڵمە دوازدە هەزار کەسی لە ئێمە کوشتووە و ماڵ و دەوڵەمانی بە تالان بردووە. ئیمرۆ ئەتوانین بە دەست و زوبان خوێنی خۆمان وەرگرین و ئێمە جوابی پادشا بدەینەوە و بڵێین مەعنای خەوەکانت حەوت خەتەری گەورەی ئەبێ و دەرمانی بە حەوت لە خاسانی خۆت ئەکرێت. لازمە سوهەیلی یەمەنی و ماهی خوتەنی و ئیران دوخت و بەلاری وەزیر و کەماڵی کاتب و دوو فیلەکە و دوو حوشترە بوختییەکە و ئەسپە بەحرییەکە بە شمشێرەکە سەرببڕن و خوێنەکەیان بکرێتە تەشتەوەو پادشاه لە ناو تەشتەکەدا دانیشێت و ئێمە ئەفسوون بەسەر پادشاه ئەخوێنین لە خەتەرەکان دوور ئەبێت. بەو تەدبیرە پادشاه بە تەنها ئەمێنێتەوە و ئێمە حوقووقی خۆمان بە تەواوی دەست ئەکەوێت. بەو فکرە چوونە خزمەت پادشا، وتیان: ئەی پادشاه، ئێمە تەماشای خەونامەمان کرد و بۆمان مەعلووم کرا بە خەوی جەنابتا وا دەرئەکەوێت لەم نزیکانەدا

تووشی هیلاکەت ببی، وەئەگەر جەنابت ئارەزوو ئەکەیت ئێمە دەرمانێ ئەدۆزینەوە دەفعی هیلاکەتی جەنابت بکات. پادشاە لە ترسی قسەکردنیان ترسی پەیداکرد، کەوتە فکری دوور و درێژەوە. لەپاشا سەری بەرز کردەوە، وتی: لازمە تەعبیری خەوەکان یەکەیەکە بەیان بکەن تا لە من ئاشکرا ببێ. وتیان: ئەی پادشاە، حەوت دەنگەکە حەوت بەڵایە بۆ جەنابت هاتۆتە خوارەوەو، دوو ماسییە سوورەکان هەردوو کوڕی پادشایەو، مارەکە لە قاچت ئاڵا ئێران دوختە. دوو مراوییە ڕەنگاو ڕەنگەکە دوو فیلی جەنابتە. قازەکە ئەسپەکەیە. ئێسترە خێراکە شمشێرەکەیە، دوو پیاوەکە حوشترە بوختییەکانە، ئاگرەکە بەلاری وەزیرە، تەیرەکە دەنووکی بەسەرتا کێشا کەمالی کاتبە. ئێمە وامان بۆ مەعلووم کراوە ئەوانەی بەیان کرا هەموویان بە شمشێرەکە سەرببڕێت و هەر یەکە میقداری خوێنیان بگیرێ بکرێتە ناو تەشتەوە، پادشاە میقداری دوو سەعات لەناویا دانیشێت، لەپاشا بە ئاوی بەحر بەدەنی بشۆرێت و بەڕۆنی زەیت چەور بکرێت و شمشێرەکە بشکێت، لەگەڵ لاشەی ئەوانەی بەیان کرا دەفن بکرێت، پادشا لەو بەڵایانە نەجاتی نەبێت. تەعبیری خەوەکە ئەوەیە بەیان کرا. وەختێ پادشاە ئەو قسانەی بیست، وتی:ئەی دوشمنانی دۆست ڕوو، ئەی بەنی ئادەمی شەیتان خوو، مردن لە تەدبیری ئێوە چاکترە، چونکە سوهەیلی یەمەنی و ماهی خوتەنی ڕووناکیی چاوی منەو، ئێران دوخت خۆشەویستی منە، بەلاری وەزیر و کەمالی کاتب کلیلی دەرگای سەڵتەنەتی منە. فیل و حوشتر و ئەسپ و شمشێر بناغەی سەڵتەنەتی منە و زینەتی دونیایە، وە ئەگەر من بەقسەی ئێوە بکەم، خۆشەویستانم لەناو بەرم، لەدوای ئەوان ژیانم بۆچی چاکە؟ ئێوە حیکایەتی حەزرەتی سولەیمان و حەیواناتەکان بە گوێتانا نەهاتووە؟

بەرمەکییەکان وتیان: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

پادشاە وتی: ئەگێڕنەوە سولەیمان پێغەمبەر (علیه السلام) پادشا بوو بەسەر بەنی ئادەم و جیـن و حەیوانات و درندە و تەیرەوە، وە تەمەننای لە خودا کرد «رب هب لي ملكاً لاينبغي لأحد من بعدي» یەعنی خودایە عەتا بفەرموو بەمن پادشاهییەک بۆ کەس لە دوای من مومکین نەبێت. ڕۆیشتنی سولەیمان بەسەر پشتی باوە بوو، بە ڕۆژێ یەک مانگ ڕێگە ئەڕۆیشت. ڕۆژێ مەجلیس لە هەموو جۆرە ڕۆح لەبەرێ بەسترابوو، مەلائیکەتێ بە پیاڵەیەک ئاوی حەیاتەوە داخڵ بە مەجلیس بوو، پیاڵە ئاوەکەی لەپێش

دەمی سولەیمان دانا ، وتی: ئەوە ئاوی حەیاتە ، خودا بۆ تۆی ڕەوانە فەرمووە ، ئارەزوو بەدەست خۆتە ، ئەیخۆیتەوە یا نایخۆیتەوە ، وە لەشەریەتی (كل نفس ذائقة الموت) کەس دەرنەچوە. سولەیمان کەوتە فکرەوە ، بە دڵ وتی: عومری درێژ هەتا سەر بۆ کەس مومکین نەبوە ، وە بۆ من لازمە ژیان ئیختیار بکەم ، وە بە عیبادەت کردن بچمە حزووری خودا.
تەکرار فکری کرد: تەدبیر بۆ ئەم مەسئەلە لازمە ، وە هەرچی لە ژێر حوکمی منا بن تەدبیریان پێ بکەم ، بۆ ژیان و مردن ڕەئیسی هەرلایەکیان زۆر بوو ئەوە چاکە. سولەیمان بۆ خواردنەوەی ئاوی حەیات پرسی هەر ڕۆح لەبەرێکی کرد جوابی خواردنەوەیان نەدا.
سولەیمان فەرمووی هەموومیللەت حازرە؟ وتیان: بزن مژ حازر نییە. سولەیمان ئەسپی نارد بە شوێن بزنمژەدا ، بزنمژە نەچوو. سەگی نارد بە شوێن یا ، بزن مژ لەگەڵ سەگ چووە خزمەت سولەیمان ، ڕەسمی ئەدەبی بەجێ هێنا . سولەیمان فەرمووی: موشاوەرەم بە تۆ هەیە ، وە لەپێش قسەی موشاوەرە گرێی دڵی دڵم بکەرەوە. بزن مژ دەستی پاڕانەوەی درێژ کرد ، وتی: بەندە و جوودم نییە گرێ جەنابت بکەمەوە ، بەقەدەر ئیقتیدارم جوابم هەیە ، ئەمرت چییە ، ئاشکرای بفەرموو. سولەیمان فەرمووی: بەشەرەفترینی هەموو حەیواناتێ ئەسپە ، لەبەرچی بەقسەی ئەسپ نەهاتیت؟ وەپیس ترینی هەموو حەیواناتێ سەگە ، بەقسەی سەگ هاتیت؟ بزن مژ وتی: چاک ئەفەرموویت بەشەرەفترینی هەموو حەیوانێ ئەسپە ، ئەما لەمێترغوزاری وەفادا ئەلەوەڕاوە ، لەسەرچاوەی ساحێب ناسینا ئاوی نەخواردووەتەوە ، چونکە ئەسپ و ژن و شمشێر وەفایان بۆ کەس نەبوە ، وە هەرچەند سەگ پیس و گلاوە مەعلوومە لوقمەی وەفای خواردووە. بەڕەسمی حەق بەجێهێنان بەشەو پاسەوانە ، خەوی لەخۆی حەرام کردووە ، مەشهوورە لوقمە نانی کەس فەرامۆش ناکات. من بەقسەی بێ وەفا ئەمری جەنابتم قوبووڵ نەکردو ، بەقسەی بە وەفا بە خزمەت گەیشتم. سولەیمان قسەی بزن مژی پێ خۆش بوو ، وەمەسئەلەی ئاوی حەیات بەیان کرا. بزن مژ وتی: ئەی خۆشەویستی خودا ، ئاوی حەیات تۆ بەتەنها ئەیخۆیتەوە ، وەیا لەگەڵ ئەولاد و خۆشەویستانت ئەخورێتەوە؟ سولەیمان وتی: تەنها بۆ من ئەمر کراوە ، بۆ ئەولاد و خۆشەویستانم دروست نییە. بزن مژ وتی: ئەی خۆشەویستی خودا ، ئەوە چ ژیانێکە تۆ زیندوو بیت و ئەولاد و خۆشەویستانت یەکەیەکە بە مردوی لەپێش دەمت هەڵگیرێت ، لەژێر خاک دفن کرێت؟ باوەڕ ناکەم ئەو ژیانە لەزەتی بێت. ژیانێ کە بەمەراق بێ ئەبوونی چاکە. سولەیمان زۆر قسەی بزن مژی لا خۆش بوو ، تەرکی خواردنەوەی ئاوی حەیاتی کرد لەبەر دوور بوونی خۆشەویستانی ، هەروەک شاعیر ئەڵێت:

وا لەنەزعـا ، خـەڵقـە گـوێ بگرن لە گـوفـتـاری وەتەن
بۆم بکەن ئەم دەفـعـەیە ئێـوەو خـودا چاری وەتەن
ئەی تەبیب ئینکاری عـیلم و فـەننی تۆ خـۆ ناکـرێ
هەر بەیەک دەم بۆچی ناکـەی مـەنعی ئازاری وەتەن
رەببی مـووسـایێ بنێـری جـەننەتێ بۆ وەک ئیـرەم
دۆزەخی فـیـرعـەونە ئێـسـتـا سەحنی گـوڵزاری وەتەن
کـوانێ فـارووقی نەژادێ ئیـرسی خـۆی بێنێـتـە جێ
تا لەچنگ بوو جـەهلی دەرکـا دیـن و دیناری وەتەن
خـوێنی ئەولادی سـولەیمان و غـوباری پاکی جـەد
ئەو قـــوڕ و ئاوەی کـــرایە ســەرفی دیواری وەتەن

پادشـا وتی: بۆیە ئەم میـسـالەم بۆتان هێنایەوە تا بزانن ژیانی من بەوانەوە مومکین نەبێ کە ئێوە ئارەزووی نەبوونیـان نەکەن. چۆن نەتوانم دەست بۆ نەمانی خۆشەویسـتانم درێژ بکەم. ئێـوە ئەگـەر نەتوانن مـەعنای خـەوەکـانم بە جـۆرێکی کـە لێک بدەنەوە. بەرمەکییەکـان وتیان: عـومری پادشاە بەرقـەرار بێ، ئاشکرایە قسەی ڕاست ناخۆشە. ئامۆژگاریی بێ خیانەت لەبەر دڵ گرانە. ئێمە زۆر لامان عەجائیبە جەنابت ژیانی غەیری لە ژیانی خۆت زیاتر ئەوێ. ئامـۆژگـاریی خێـر بە ئاسـان تەمـاشـا مەکـە. مـەعلوومـە بەواسیتەی زەحمەتیوە ئیسراحەت دەست نەکەوێت، وە پادشاهان بە خوێنی جگەر ڕێگەی ژیان و ئیـسـتـیقلال ئەدۆزنەوە، وە ئێـسـتـا تەرکی ژیان و دەست لە ڕۆح شتێ لە عەقڵی عـەقڵـدار دوورە، وەتا جەنابت باقی بێت ئەولاد و ژن و ژینت کەم نابێ. وەختێ پادشا بۆی مەعلووم بوو قسەی ئەووەڵ و ئاخریان هەر یەکە، زۆر بە عاجزی لەبارەگاە و مەجلیس هەڵسا، ڕووی کرد بۆ ئۆدەی حەرەم، کەوتە بەحری مەراقەوە. فکری ئەکرد چۆن دوو کوڕم هەیە لەنووری چاو شیـرینتـرە، ئەتوانم بییـانکوژم و، ئێـران دوخت سـەرچاوەی ژیانمەو، بەلاری وەزیر کلیلی دەرگـای عەقڵمـە، ئەوانە لەناو بەرم. بەو فکرانە دوو ڕۆژ لە حەرەم نەچووە دەرەوە. بەلاری وەزیر بە عـەقڵ بۆی مـەعلووم بوو پادشـاە تووشی مـەراق و بەلا بووە، ڕووی کـرد بۆ ئۆدەی حـەرەم. وەخـتێ داخڵ بە حـەرەم بوو چووە پێش دەمی ئێـران دوخت ڕەسمی ئەدەبی بەجێهێنا، وتی: ئێـسـتـا لە تۆ ئاشکرا بێ من کـە وەزیری پادشام هەمـوو تەدبیر و سیرێکی لە ژێر دەستی منا بووەو مەحرەمی سیڕی لەمن زیاتر نەبووە،

دوو ڕۆژە لەحەرەم نەهاتووەتە دەرەوە، مومکینە کاریّ رووی دابیّ، چونکە دوو ڕۆژ لەمە پێش لەگەڵ بەرمەکیەکان بەقسەکردن خەریک بوو، بۆم مەعلووم نەبوو تەدبیر و قسەیان چی بووە، وەمن قووەتی سوئالم نەبوو، ئێستا تۆ لە واسیتەی ڕەفاقەتەوە حوکمت بەسەر پادشا دا جارجار مومکین نەبیّ. سوئال لە پادشا بکە قسەی خۆی بۆ تۆ تەواو بەیان ئەکات، لەپێش ئەوەی دوشمن زەفەر بە پادشا ببەن ئێمە دەرمانی دەردیان بدۆزینەوە. ئێران دوخت وتی: ئەی وەزیر، ئێستا شەرم ئەکەم بچمە خزمەت پادشاه سوئالی قیسسە بکەم، چونکە کەمیّ عاجزی لەبەینمانا ڕوویداوە. وەزیر وتی: «العتاب هدية الأحباب»، لۆمەی دۆست دیاریی دۆستە. ئێستا وەختی عاجزیی تۆ و پادشاه نییە. لازمە زۆر سەعی بکەیت خەتەری پادشا دەفع کرێت، چونکە هیچ مەئمووریّ قووەتی داخڵ بوونی حەرەمی نییە، وە لەتۆ زیاتر کەس قووەتی سوئال کردنی لەگەڵ پادشا نییە. زۆر جار لە پادشاهم بیستووە فەرموویەتی: هەرچەند دڵم عاجز ببیّ و نازاریّ بە دڵم بکات، بەچاو پێکەوتنی ئێران دوخت عیجز و نازارەکە چاک ئەبیّ، وە ڕجا ئەکەم منەتێکی گەورە بخەیتە سەر شانی مەئمووران و خەتەرەی دڵی پادشاه ئاشکرا بکەیت. ئێران دوخت هەڵسا چووە خزمەت پادشا، ڕەسمی ئەدەبی بەجێهێنا، لەتەنیشت پادشاوە دانیشت، وتی: دوو ڕۆژە زۆر تێکچوویت و، خەریکی چ فکرێکیت؟ بەیانی بفەرموو. وە ئەگەر شتێک ڕوویداوە لەناو مەئمووران بەتەدبیر دروست ئەبیّ. پادشا فەرمووی: سوئال لە شتێک زەحمەت بە ئێوە بدات، ناشیرینە. ئێران دوخت وتی: کاریّ سەلامەتیی جەنابتی تیا دەست کەوێت زەحمەت بۆ ئێمە مەتلەب نییە. سەلامەتیی دونیا سەلامەتیی سەری پادشایە، وە ئەگەر قەدەریّ رووی داوە، سەبر لازمە. تەدبیر لە مەراق کردن چاکترە، چونکە عاجزی دڵ زەعیف ئەکات. وەختیّ دڵ زەعیف بوو، ڕێگەی عەقڵ گوم ئەکات. ئاشکرایە عەقڵ موحتاجی تەدبیرە. «وشاورهم في الأمر». پادشا وتی: لەم شەوانە دا چەند خەوێکی عەجائیبم دیوە، مەعنای خەوەکانم لەبەرمەکیەکان پرسیوە، بەجۆریّ مەعنایان بۆ بەیان کردووم بۆ کەمێ بەیان بکەن پارچەپارچە ئەبیّ، وە ئەگەر بۆ ڕۆژ بەیان بکرێت ڕووناکیی تاریک ئەبیّ. ڕجا ئەکەم سوئال لە عاجزیی من مەکە، ئەمن قووەتی گێڕانەوەم هەیە ئەتۆ تاقەتی بیستنت ئەبیّ. ئێران دوخت زۆری ڕجا کرد خەونەکانی بەیان بکات. پادشا مەجبوور بوو وتی: بەرمەکیەکان مەعنای خەوەکانیان وا لێداوەتەوە هەردوو کوڕەکەم و تۆ و بەلاری وەزیری دڵ ڕووناک و کەمالی کاتبی نوفووس پاک و فیلی لەشکر شکێن و حوشترە بوختییەکان لەگەڵ ئەسپەکە بە شمشێری گەوهەر نیگار سەربیڕم، زەرەری خەوەکە

دەفع نەبێت. لە گێڕانەوەی مەعنای خەوەکە نزیک بوو ئێران دوخت لەهۆش بچێت، وە لەبەر عەقڵداری و زیرەکی خۆی تێک نەدا. وتی: ئەی پادشا، هەزار کەسی وەک من و مناڵ و وەزیر بە فیدای سەری جەنابت بێ. هەتا سەری جەنابت باقی بێت ژن و مناڵ و ئەسباب کەم نابێ. ڕۆحێ بۆ تۆ نەبێت بەکاری چی دێت. ئەمما لازمە بەقسەی ئەو غەددارانە باوەڕ نەکەیت. مەعلومە دوشمنی کۆن بە دۆستی تازە نابێت. ئەو مەعنایەی ئەو مەلعوونانە وتوویانە تەدبیرە دروستیان کردووە چونکە کوشتنی بێ گوناه پەشیمانیی زۆرە. ئەوی لە دەست چوو دەست ناکەوێتەوە. ئەوی مرد زیندوو نابێتەوە، وە لەجەنابت مەعلومە بەرمەکییەکان کۆنە دوشمنن، فکریان وا کردووە تۆ بە تەنها بمێنیتەوەو، لە جەنابت مەعلومە تەنها بە ئاسان دەست نەکەوێت. هەتا مومکین نەبێ لە فێڵ و مەکری دوشمن ئەمین مەبە. دیسان لە جەنابت مەعلومە پێستی سەگ و بەراز دەباغی نابەت، وە لە جەنابت مەعلووم بێ عەقڵ تەشبیە بەتێغ کراوە و هەموو کەسی پێ نەکوژرێت، وە حیلم سەددە بۆ نەفس و هەواو، لازمە جەنابت خەوەکان لە (کاریدوون)ی حەکیم بپرسیت، زۆر عابیدێکی بە تاعەتە، جێگەی لە کەژی سەوزە، لەغارێک شەو و ڕۆژ بە عیبادەت خەریکە، قسەی زۆر ڕاستە و لە مەعنای خەو زۆر شارەزایە. هەر وەخت کاریدوون مەعنای خەوەکانی بەیان کرد، دوشمنیی بەرمەکییەکان ئاشکرا ئەبێ. پادشا ئامۆژگاریی ئێران دوختی بە جوان زانی. ئەمری کرد ئولاغ زین کرا، سوار بوو، ڕووی کرد بۆ کەژی سەوز. وەختێ گەیشتە پێش دەمی غارەکە، چووە لای عابید سەلامی کرد. کاریدوون جوابی سەلامی دایەوە، بە ڕووی خۆشەوە بەخێرهاتنی کرد، وتی: شاهم، مومکینە بەکارێ تەشریفت هاتووە. ئەگەر ئەمرت بکردایە بە خزمەتت ئەگەیشتم. فەرموو ئەمرت چییە؟ پادشاه خەوەکانی یەکە یەکە بەیان کرد و، مەعنای بەرمەکییەکانیشی گێڕایەوە. کاریدوون ئەمووستی بە دەما برد. وتی: ئەی پادشاه، زۆر سەهو بوویت قسەی دڵی خۆت بۆ دوشمن ئاشکرا کردووە. مەعنای ئەو خەوانە بۆ ئەو کافرانە دروست نییە، وە لازمە جەنابت بەو خەوانە زۆر شوکرانە بکەیت. بە خەوەکانتا وا دیارە زۆر بە ئارەزوو تا مردن لەسەر تەختی سەڵتەنەت پادشاه ئەبیت. مەعنای خەوەکانت ئەوەیە بەیان ئەکرێت. ئەووەڵ ئەو دوو ماسییەکە لەسەر کلک وەستان عیبارەتە لە ڕەوانەکراوێک لە تەرەف سەرەندیب، دوو فیلی گەورە و چوار سەد ڕەتڵ یاقووتی ڕوممانی بە هەدییە دێت بۆ جەنابت. دووەم دوو مراوی و قازەکە عیبارەتە لە دوو ئەسپ و ئێسترێ لە تەرەف پادشای دیهلی بە دیاری دێت بۆ جەنابت. سێیەم ئەو مارە لە قاچت ئاڵا عیبارەتە لە شمشێرێ مشتووی یەک ڕیز

یاقووت و یەک ڕیز پیرۆزە و یەک گەوهەری بۆ دروست کراوە لە تەرەف جزیرەوە بە دیاری دێت بۆ خزمەت جەنابت. چوارەم خوێنەکە بە سەرتا ڕژا عیبارەتە لە خەرقەیەک ئەرغەوانی بە جەواهێرات نەقش کراوە لەتەرەف پادشای خەزنەوە بە دیاری بۆ جەنابت دێت. پێنجەم ئەو ئێسترە کە سواری بوویت عیبارەتە لە فیلێکی سپی لەتەرەف پادشای بێجانگرەوە بە دیاری بۆ جەنابت دێت. شەشەم ئەو ئاگرە لەسەر سەرت کرابوەوە عیبارەتە لە تاجێ بریسکەی دوو ڕۆژ ڕێگە ئەڕوات، لەتەرەف پادشای سیلانەوە بە دیاری دێت. حەوتەم ئەو تەیرە کە دەنووکی بەسەرتا کێشا عیبارەتە لە ئەختە عاجزێ لەگەڵ خۆشەویستت تا سێ ڕۆژ. کاریدوون وتی: مەعنای خەوەکانت ئەوەیە. ئەی پادشاه لازمە بۆ جەنابت سرِی خۆت لای هەموو کەس ئاشکرا نەکەیت و، لەسفلەو کەم غیرەت دوور بە. بێ تەجرەبە کەس بە چاک مەزانە. پادشاه وەختێ ئەو مژدەی لە عابید بیست وەک گوڵ گەشایەوە. دوعا خوازیی کرد، سواربوو گەڕایەوە بۆ جێگەی خۆی. حەوت ڕۆژ دوا بە دوای یەک دیارییەکان وەک عابید بەیانی کردبوو یەکەیەکە گەیشت. لەپاش دیارییەکان پادشا کورەکانی و ئێران دوخت و بەلاری وەزیر و کەمالی کاتب هەموو بانگ کردن، وتی: سەهوێکی خراپم کرد خەوەکانم بۆ دوشمن گێڕایەوە. ئەگەر لوتفی خودا نەئەبوو و، ئامۆژگاریی ئێران دوخت ئاگری دڵمی نەکوژاندایەوە، بە تەدبیری بەرمەکییەکان خۆم و ئەتباعم بە هیلاک ئەچووین و، هەرکەس ئامۆژگاریی خۆشەویستی بە چاک زانی لەفیتنەی دونیا دوورەو، فکرم وایە دیارییەکان بەسەر ئێوەدا تەقسیم بکەم. وەزیر وتی: خزمەتکار سوبەری سەری پادشایە، وە هەرکەس حوقوق بزانێ ڕۆح و مالی فیدای گەورەی ئەکات. ئەمما ئێران دوخت مەلەکەی پادشایە، تاجی مورەسسەعی وەیا خەرقەی ئەرغەوانی یەکێکیان بۆ تەبەڕوک هەڵگرێت قابیلە چونکە منەتی زۆرە بەسەر ئێمەوە. پادشاه ئەمری کرد تاج و خەرقەکە بەرنە ئۆدەی حەرەم، وە لەگەڵ وەزیر ڕۆیشتن بۆ حەرەم. پادشا گورجییەکی بوو لە جوانی یا بێ ئەمسال بوو، زۆری خۆش ئەویست. پادشاو بەلار هەردوکیان چوونە ئۆدەی حەرەم. ئێران دوخت و گورجییەکە بەیەکەوە دانشتبوون، تاج و خەرقەکە لەبەر دەمیانا بوو. پادشا ئەمری کرد بە ژنەکان هەریەکە یەکێکی هەڵگرن. ئێران دوخت تەماشای وەزیری کرد: ئایا کامیان هەڵگرێت؟ وەزیر بە چاو ئیشارەتی کرد خەرقەکە هەڵگرێت. لەو وەختەدا پادشا چاوی لە چاو داگرتنی وەزیر بوو. ئێران دوخت لەبەر ئەوە پادشا بە ئیشارەتەکە ئەگات تاجەکەی هەڵگرت. وەزیر لەبەر ئەوەی پادشا بە ئیشارەتەکە ئەزانێ چاوی خۆی خوار کرد. هەتا چل ساڵ وەزیر بوو، هەر چەند داخڵ ئەبوو

به خزمەت پادشاە بەو جۆرە چاوی خوار نەکرد. ئەگەر عەقڵ ڕێگەی نیشان بە هەردووکیان نەئەدا بە قـەهری پادشـاە لەناو ئەچوون. وەختـێ نێـران دوخت تاجـەکـەی هەڵگرت و گورجییەکە کەناوی (بەزم ئەفرۆز) بوو خەرقەکەی هەڵگرت، هەریەکە گەڕانەوە جێگەی خۆیان. وەزیر دوعـا خـوازیی لە پادشا کرد، ڕۆیشت. وە پادشـا هەر شـەوێ لای ژنێکی ئەنووست. شـەوێک پادشا ڕووی کرد بۆ ئۆدەی نێران دوخت. لەو وەختـەدا نێران دوخت سینییێ برنج و خواردنی بە دەستەوە بوو. پادشا لەبەر ئۆدەکە بەقسـەکردن لەگەڵ نێران دوخت خەریک بوو، مەیلی برنج خواردنی کرد و ماچ کردنی نێران دوخت بوو بە پێخۆر. تەسادوف بەزم ئەفرۆز بەلایانا ڕابوورد. پادشا چاوی بە لەنجەونازی بەزم ئەفرۆز کەوت، مەیلی وەسڵی کرد. ڕووی کردە بەزم ئەفرۆز وتی: مەرحەبا ئەی حۆریی جەننەت لیقا. ئەو تاجەی نێران دوخت هەڵیگرت قابیلی تۆ بوو. نێران دوخت ئاگری عیشقی داگیرسا، بەبێ ئیختیـار سینییەکەی بەسەر پادشادا ڕژاند، دەموچاوی پادشا چێشتاوی بوو، وە تەعبیری خەوەکەی ئاشکرا بوو کـە لەگەڵ خۆشەویستی دوو سێ ڕۆژ عـاجز ئەبێ. لەو وەختـەدا ئاگری قەهری پادشا داگیرسا، ئەمری کرد بەلاری وەزیری بانگ کرا. ڕووی کردە وەزیر: هەر ئێستـا نێران دوخت ئەبەیت سەری لەبەدەن جیا ئەکەیتەوە تا جارێکی کە کەس ئەو جۆرە بێ ئەدەبییانە نەکات. وەزیر نێران دوختی هەڵگرت، لە حەرەم بردیە دەرەوە. فکری کرد: ئێستا نێران دوخت خۆشەویستی پادشایە و من بیکوژم مەعلوومە پادشا پەشیمان ئەبێتەوە و لە جێگەی نێران دوخت من ئەکوژێتەوە. چاک وایە پەلە نەکەم، چونکە نێران دوخت لە عەقڵدا بێ ئەمسـاڵە. هەر وەخت پادشا بە موددەی سێ ڕۆژ پەشیمان بووەوە، ئەبێتە تەدبیرێکی جوان. وە ئەگەر پەشیـمان نەبووەوە، کوشتنی سەهلە. بەو فکرە نێران دوختی بردە ماڵەوە شاردیەوە، ئەمری کرد بە خزمەتی بەدزییەوە بکرێ. وەزیر ڕۆیشتەوە خزمەت پادشا، تەمەنای بۆ کرد: شاهم، نێران دوخت سەربڕا و لاشەکەی دفن کرا. پادشا قەهر و غەزەبی نیشتبووەوە، لەگەڵ ئەو قسەی لە وەزیر بیست وەک مار پێچی خوارد و گرژ بوو، بە عەیبی زانی پەشیـمانی بەیان بکات، هەناسەی هەڵکێشا، وتی: حەیف بەیەک بێ ئەدەبی عەقڵ و ئامۆژگاریی نێران دوختم فکر نەما و پەلەم لە کوشتنی کرد. وەزیر وتی: ئەی پادشـاە، تیـر لە کـەوان، قسـە لە زوبان کە دەرچوو هاتنەوەی مـومکین نابێ. غەم و مەراق لازم ناکات چونکە مەراق خواردنی جەنابت بۆ دۆست ناخۆشە، وەبۆ دوشمن بە جەژن تەماشا ئەکرێت. وە ئەم مەسئەلە ئاشکرا نەکەیت، چونکە ئەڵێن پادشاە ئەمرێکی کرد و ئانەن پەشیـمان بووەوە، وە لازم بوو جەنابت سەبرت بکردایە وە ئاگری

غەزەبت بە ناوی حیلم بکوژانایەوە، هەروەک پادشای (ذو الرقاع) بەسێ وەرەقە ئاگری غەزەبی ئەکوژایەوە. پادشا پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

وەزیر وتی: ئەگێرنەوە لە شاری یەمەن پادشایەک بوو، زۆر حوکمدار و عادل بوو. ئەو پادشایە رووی کرد بۆ سەحرا بۆ راوکردن. ئولاغی بە دوای نێچیرا توند کرد. تەسادوف کابرایەکی درک فرۆش لە موحتاجییا پێستی حەیوانە کێوییەکی کردبوو بە خەرقە، لەبەریابوو. ئەو رۆژە دونیا سارد بوو. لە درک هەڵکەندن بووبووەوە، لەپەڕوو خۆی دابوو بەسەر بەردێکا خەوی لێ کەوتبوو. پادشا کە چاوی پێی کەوت وایزانی حەیوانە کێوییە، تیری بۆ هاوێشت، دای لەکابرا، بریندار بوو. وەختێ پادشا گەیشتە سەری تەماشای کرد پیاوێکی فەقیرە لەناو خوێنا گوم بووە. پادشا لە پەلەکردن و تێ نەفکرین پەشیمان بووەوە، دڵخۆشیی کابراکەی دایەوە، هەزار دیناری پێ بەخشی بۆ حەکیم و دەرمان، گەردەنی خۆی بێ نازاکرد. پادشا جڵەوی ئولاغی گێرایەوە، رووی کردەوە داروسەڵتەنەت. عابیدێ لە ئەترافی یەمەن بە پیاوچاک مەشهوور بوو. پادشا رووی کرد بۆ لای عابید. وەختێ گەیشتە لای عابید خۆشی چۆنییان لەیەک کرد. میقدارێ بەیەکەوە دانیشتن. پادشاه وتی: هاتووم چەند ئامۆژگارییەکم بکەیت بۆ دونیا و ئاخیرەت بەکار بێ. عابید وتی: ئەی پادشا، ئامۆژگارییێ کە بەکار بێ حیلمە. لە وەختی رق هەڵسان و غەزەب گرتن سەبر و حیلم بەکاردێت. پادشا وتی: ئەزانم رق خواردنەوە لە هەموو رەوشتێ چاکترە. حیلم حوکمی بەسەر نەفسدا زۆرە. عابید وتی: سێ وەرەقە بۆ تۆ ئەنووسم و تۆیش تەسلیمی ئەمینداری بکە. هەر وەخت زانییان ئاگری غەزەبت داگیرساوە یەکەیەکە وەرەقەکان نیشان بە تۆ بدەن، نەفست قووەتی بەسەر حیلمدا نامێنێت. پادشاه بەو قسەیە دڵی کرایەوە. عابید کاغەزەکانی بۆ نووسی. ئەووەڵ کاغەز نووسرابوو: لە جێگەی ئیقتیدار جڵەوی ئیختیار بە دەستی نەفس مەدە ئەتخاتە بەحری هیلاکەتەوە. دووەم نووسرابوو: لەوەختی رق هەڵسان لەگەڵ خزمەتکاران بەرەحم بە، تا رۆژی ئاخرەت لەبەر رەحمی خوێت رەحم بە تۆ بکرێت. سێهەم نووسرابوو: لەحوکم کردن لە رێگەی ئینساف و راستەوە موعامەلە بکە تا بناغەی ژیانت بە بەلاییێک نەچێ. کاغەزەکانی وەرگرت، دوعا خوازیی لە عابید کرد، رووی کردەوە دار و سەڵتەنەت. هەر وەخت رقی هەڵئەسا بەو سێ کاغەزە ئاگری غەزەبی ئەکوژایەوە. لەبەر ئەوە ناونرا مەلیک (ذو

الرقاع). مەلیک ذو الرقاع جاریەیەکی بوو لە دەرەجەی حوسن و جەمالا بوو. دڵی پادشا دایما مەیلی جاریەکەی ئەکرد. ژنی پادشا لەو مەسئەلەیە زۆر تێکچوو، ئارەزووی کوشتنی پادشاو جاریەکەی کرد. دەردی دڵی بۆ مەششاتەیەک بەیان کرد. (مەششاتە بەوانە ئەڵێن خاڵی ژنان ئەکوتن) مەششاتە وتی: ئەی خانم، پادشا ئارەزووی ماچ کردنی چ جێگەیەکی ئەکات؟ خانم وتی: پادشا ئارەزووی ماچ کردنی چاڵی چەناگەی ئەکات. لەگەڵ پادشا دەم بە چاڵی چەناگەی جاریەکەوە ئەنێ ئەیژێت، وا ئەزانی ئاوی حەیاتە هەتا خەوی لێ ئەکەویت چەناگەی ئەمژێت. مەششاتە وتی: خانم، دڵت ئازار مەدە، دەردیان دەرمان ئەکەم. میقدارێ زەهری هەلاهەل و لەگەڵ نیل کە ئاوی گیایەکە. چاڵی چەناگەی جاریەکە ئەکوتم. هەروەخت پادشا دەم بنێت بە چەناگەیەوە ڕوحی دەرئەچێت. مەششاتە میقدارێ زەهر و نیلی تیکەڵ کرد، بە ئەفسوون خوێندنی هارووت و مارووت ڕووی کرد بۆ لای جاریەکە، چەشم بەندی لە جاریە کرد، خەوی لێ کەوت. مەششاتە بە دەرزی چاڵەکەی کوتاو دەرمانەکەی تێ ڕژاند. تەسادوف غولامێکی سیرڕیی پادشا لەو مەسئەلە خەبەردار بوو، فکری بوو پادشا لەو مەسئەلە خەبەردار بکات، مومکین نەبوو. تەسادوف پادشا چووە لای جاریەکە، لە ڕێگەوە خەوی پیا کەوت، چونکە سەرخۆش بوو. غولامەکە حەقی نیعمەتی بەجێهێنا، چووە ژوور سەری جاریەکە، بە لکی دەستەسڕ دەرمانەکەی لە چەناگەی جاریەکە پاک ئەکردەوە. لەو وەختە پادشا هاتەوە هۆش خۆی، چاوی لێوە بوو غولام دەست بۆ چەناگەی جاریەکە درێژ ئەکات، ئاگری قەهری داگیرسا. دەستی برد شمشێری هەڵگرت، بە قەسدی کوشتن پەلاماری غولامەکەی دا. غولام فیراری کرد، پادشا شوێنی کەوت، ئەمیندار لە ڕێگە تووشی پادشا بوو، زانیی ئاگری قەهری داگیرساوە، یەک وەرەقەی نیشان دا فائیدەی نەبوو. دووەم کاغەزی نیشان دا فائیدەی نەبوو. سێهەم وەرەقەی نیشان دا، پادشابە ئاوی حیلم ئاگری غەزەبی کوژایەوە. بە زوبانی شیرین بانگی غولامەکەی کرد وتی: چۆن زاتت کرد دەستت بۆ چەناگەی مەحبووبەی من درێژ کرد؟ غولام ئەووەڵ و ئاخری قیسسەی خانم و مەششاتەکەی بۆ پادشا بەیان کرد. پادشا بانگی خانمی کرد، خانم لە قسەی غولام ئینکاری کرد، وتی: درۆ ئەکات. چەند جار بە چاو دیومە نیشی خراپەی لەگەڵ جاریەکەت کردووە، وە ئێستا پادشا بە چاوی خۆشی چاوی پێ کەوت و جەزای خائین و درۆزن کوشتنە. غولام تەماشای کرد پادشا فکری خەریکە بگۆڕێت. غولام وتی: ئەی پادشا بۆ درۆی من ئاشکرایە. دەرمانەکە لای مەششاتە ماوە. ئەمر بفەرموو بە حازر بوونی. پادشاه ئەمری کرد

مەششاتەکە حازر کرا و باقیی دەرمانەکە دەرخواردی مەششاتە درا، ئانەن ڕۆحی دەرچوو. پادشا ئەمری کرد بە حەپس کردنی خانم و خەلاتی غولامەکەی کرد. پادشای (ذو الرقاع) سەبر و حیلمی بە واسیتەی کاغەزەکانی عابیدەوە دەست کەوت. وەزیر وتی: بۆیە ئەم میسالەم بۆ جەنابت هێنایەوە تا بۆت مەعلووم بێ لەسەبر و حیلم چاکتر لە دونیا دا دەست ناکەوێت. پادشا وتی: ئەوەی ئامۆژگاریی عاقلان بوو تۆ گێڕاتەوە، عەجەب بۆ دڵی تۆ کە قوبووڵت کرد، بێ ئەمسالێکی وەک ئێران دوختت کوشت. وەزیر وتی: گوناه لەمن نەبوە، وە ئەمری جەنابت بەجێ هێنراوە. ئێستایش لازم ناکات ئەوەندە بۆ ژنێ خۆی عاجز بکات، بۆ ڕەفاقەتی باقیی دۆستانی دەست درێژ نەکات. پادشاە بەتەواوی بۆی مەعلووم بوو ئێران دوخت کوژراوە، دیسان هەناسەی هەڵکێشا، وتی: داغی ئێران دوخت چاک نابێتەوە. وەزیر جوابی دایەوە: سێ کار نەسیری دەرد و بەلایە، ئەووەڵ ڕەنج دان لەگەڵ ئینسانی بەد. دووەم لە وەختی دەست ڕۆیشتندا چاکە نەکردن. سێهەم پەلەپەل کردن لە کار، وە دیسان سێ کار هەیە پەشیمانیی لە شوێن دێت: بە لیباسی سپییەوە شیشەکەری و، بە جلەوە گازری کردن لە ناو ئاودا و، بازرگانێ ژنی جوانی بێ ڕوو بۆ سەفەر بکات، دەرەنگ بێتەوە. وە لە زاتی پادشا ئاشکرا بێ من لە کوشتنی ئێران دوخت پەلەم نەکرد و ئەمری پادشام بەجێهێناوە. پادشا وتی: چاری دەردی من بکە لە دووریی ئێران دوخت ئارامم نەماوە. وەزیر وتی: چاری دەردی تۆ بە من ناکرێت، وە هەرکەس پەلەی کرد و تێ نەفکری، ئەوەی بەسەر دێت بەسەر کۆترەکە هات.

پادشا پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

وەزیر وتی: ئەگێڕنەوە دوو کۆتر جووتیان گرتبوو، وە میقداری دانیان لە هاوینا بۆ زستان کۆ کردبووەوە. دانەکە کەمێک شێی تەڕیی بوو، وەختی دنیا گەرم بوو، دانەکە وشک بووەوە. میقدارەکە کەمی کرد. وەختێ کۆترە نێرەکە ڕۆیشتەوە تەماشای کرد دانەکە کەم بووەتەوە، وایزانی ژنەکەی خواردوویەتی . وتی: ڕەفیق، شەرم ناکەیت خیانەت لەمن ئەکەیت؟ زەخیرەیەک بۆ زستان دانرابوو لە ئێستاوە دەستت کردووە بە خواردنی، وە ئێستا خواردن لە هەموو شوێنێ دەست نەکەوێت. زستان کە بەفر باری، دان لە کوێ دەست خۆمان بخەین؟ مێیەکە هەرچەند سوێندی خوارد، نێرەکە باوەڕی نەکرد، دەستی کرد بەلێدانی. ئەوەندە دەنووکی پیا کێشا هەتا مێیەکە ڕۆحی دەرچوو. وەختێ گەیشتە زستان

تەماشای کرد دانەکە زیاد بووە، بۆی مەعلووم بوو ژنەکەی خیانەتی نەکردووە. دەستی کرد بە گریان. زۆر پەشیمان بووەوە بۆ مردنی. وەزیر وتی: کەسێ عاقڵ بێ پەلە ناکات و سەبر کردن دەرگای کراوەیە. پادشا وتی: کە من ڕقم هەڵساو پەلەم کرد، تۆ بۆچ لەکوشتنی نێران دوخت پەلەت کرد و جگەری منت سووتاند؟ وەزیر وتی: سێ تائیفە دوچاری مەراق نەبن. ئەووەڵ ئەو کەسەی ڕۆژی موحارەبە لە خۆی غافڵە. دووەم ئەو کەسە واریس نییە ماڵی مردوو بە حەرام داگیر نەکات و نەیخوات. سێهەم ئەو کەسە کە پیر بووە و ژنی گەنج نەخوازێ، هەموو ڕۆژ ژنەکە مەرگی لە خودا تەڵەب نەکات. پادشا وتی: گوناهی کوشتنی نێران دوخت بە تۆ نەناسرێت. وەزیر وتی: گوناهی لەسەر من نییە چونکە تۆ ئەمرت بە من کردووە. من بە تەنها بێ گوناهم نەکوشتووەو نیتاعەتی ئەمری جەنابتم کردووە. پادشا وتی: بۆ نێران دوخت جگەرم کون کون بووە. وەزیر وتی: بۆ پێنج تائیفە جگەر کون بوون لایقە: یەکێ خوڵقی سەخی بێ و ڕەوشت و جەماڵ جوان بێ. دووەم عاقڵ و زیرەک و یەک دڵ بێ. سێهەم لە هەموو ڕێگەی ئامۆژگاری شارەزا بێ، لە دوور و نزیک خۆشەویست بێ. چوارەم لەتەنگانە و فەرەحی ڕۆحی لەگەڵ ڕۆح بێ. پێنجەم قودووم مبارەک و نوفووس پاک بێ، وە نێران دوخت داخڵی ئەم پێنج ڕەوشتە بوو، هەر جۆرێ مەراق بخۆیت مەنعت ناکەم. پادشاه وتی: ئەی بەلار قسە زۆر گران نەکەیت، لە ئەدەب چوویتە دەرەوە. فکرم وایە تۆ لە خۆم دوور بخەمەوە. وەزیر وتی: لە دوو تائیفە دووری لازمە، ئەووەڵ کەسێ وەفای نەبێ چاک و خراپ بەیەک بزانێ، چاکەی دونیا نەگەیەنێتە ئاخیرەت. دووەم کەسێ زاهیر و باتین و گەمە و ڕاست فەرق نەکات. پادشا وتی: وا دیارە لەبەر چاوت سامم نەماوە بەو جۆرە قسانەتا کە ئەیکەیت. وەزیر وتی: سام و ترس بۆ سێ تائیفە نییە: ئەووەڵ کەسێ شەو و ڕۆژ لە نان خواردن و نووستن جیا بوونەوەی مومکین نەبێ و قسەی لەهوو لەعەب لەبەینیانا ڕابووردبێ. دووەم کەسێ دەستی بۆ ماڵی ئاغای درێژ کردبێ، سەروەت و ماڵی بەرامبەر سەروەت و ماڵی ئاغای بێ و مومکینە لە ئاغای خۆی بە گەورەتر تەماشا بکات. سێهەم خزمەتکاری بێ تەجرەبە بەئەمیندار دانرابێ و لەسەری ئاغای شارەزا بێ: ئەو جۆرە کەسانە هەموو وەخت بێ باک قسە لەگەڵ ئاغایان نەکەن. پادشا وتی: من تۆم تەجرەبە. وەزیر وتی: هەشت تایفە بە هەشت جێگە نەبێت تەجرەبە ناکرێت: پیاوی ڕەشید لە وەختی شەڕدا، فەللاح لە وەختی زەراعەت کردندا، گەورە لە وەختی غەزەب داگیرساندا، بازرگان لە وەختی حیسابدا، ڕەفیق لە وەختی موحتاجیدا، وەجاخزادە لە وەختی لێقەوماندا، عابید لە وەختی

عیبادەت کردندا، مەلا لە وەختی قسەکردن و وەعز داندا. پادشا هەر سوئالێکی لە وەزیر نەکرد، جوابی ناخۆشی نەبیست و سەبر و حیلمی لەسەر جوابی وەزیر زۆر بوو. ئاخری بەلار زوبانی بە مەدح و سەنای پادشا کردەوە، وتی: عوزر قوبووڵە، من بە گوناهی خۆم ئیعتراف ئەکەم چونکە بێ ئەمریی جەنابێتم ئەکردووە. لەسەر ئەمری جەنابت ئانەن ئێران دوختم ئەکوشتووە و ئێستایش ئەمر ئەمری جەنابتە. عەفوی ئەکەیت وەیا ئەمر بە کوشتنی ئەکەیت. پادشا لە خۆشییا سوجدەی شوکری برد، حەمد و سەنای خوای بەجێهێنا. وتی: ئەی وەزیر من لە فکر و عەقڵی تۆ شارەزا بووم، لەوە عەجائیب ماوم موددەتێکە هەرچەند قسە ئەکەیت وا دەرئەکەوت ئێران دوختت کوشتووە، چونکە جوابەکانت ناخۆش بوو. وەزیر وتی: ئەی پادشا، بۆیە جوابم ناخۆش بوو ئارەزووم کرد بۆم مەعلووم بێ لە کوشتنی ئێران دوخت پەشیمان بوویتەوە یا نە،؟ هەر وەخت بۆم مەعلووم ببوایە کوشتنی ئاسان بوو. ئێستا ئەلحەمدولیللا سەلامەتە، ئەمر ئەفەرموویت بیهێنمە خزمەتت. پادشاه وتی: ئەی وەزیر برۆ دڵی بێنەرەوە جێگەی خۆی. من سەلامەتیی ئەوم مەتڵەبە. وەزیر ڕۆیشت ئێران دوختی بردە خزمەت پادشا. ئێران دوخت ڕەسمی ئەدەبی بەجێهێنا. پادشا وتی: ئەی ئێران دوخت، ئەو ژیانە لە بەلار بناسە. بە واسیتەی تەدبیر و زیرەکی بەلار ئەجاتت بوو. وەزیر وتی: هەموو لەسایەی جەنابتەوە دەست کەوتووە. بەندە وجوودم چییە ژیانی مەلەکە لە من بناسرێت؟ پادشا وتی: لەمەودوا تەسەڕوفاتی شارەکە عائیدی تۆیە، وە هەرچی چاک و خراپ بێ حوکمی بەزوبانی تۆ لازمە. ئەمری تۆ موافیقی ئەمری منە. وەزیر جوابی دایەوە: ژیانم لە واسیتەی نوفووسی جەنابتەوە مومکین ئەبێ، وە هەتا ژیانم بێ شوکری نیعمەتت ئەکەم، وە ئیحتیاجی بەندەیەک ڕجایە: لە عەجەلەکردن حیلم لازمە. هەروەخت ئاگری غەزەبت داگیرسا بە ئاوی حیلم بیکوژێنەوە، وە بۆ هەموو ئوموورات تەدبیر لازمە. پادشا وتی: لەمەودووا بێ تەدبیری تۆ دەست بۆ ئومووران درێژ ناکەم. لە قسەکردن بوونەوە. وەزیر دوعا خوازیی کرد. پادشا خەلاتی لائیقانەی بە وەزیر عەتاکرد. ئەو شەوە خەوی ئیسراحەتی لەگەڵ ئێران دوخت کرد. بۆ ڕۆژ بوونەوە ڕووی کردە داروسەڵتەنەت، ئەمری بە حازر بوونی هەموو ئومەرا کرد. مەجلیس گیرا، بەرمەکییەکانی حازر کرد. بەو جۆرە کە خەوی دیبوو لەناو مەجلیسدا گێڕایەوە، وە مەعنایکەشی کە بەرمەکییەکان وتبوویان بەیان کرا، وە کاریدوونی حەکیم داخڵ بە مەجلیس بوو. پادشاه جەزای بەرمەکییەکانی لە کاریدوون تەڵەب کرد. کاریدوون ئەمری کرد نیوەیان بکرێت بەداری سیاسەتدا، وە لەبەر ڕێگە لە ڕێ گوزەرا بۆ عیبرەت تەماشا

بکرێن و، نیوەیان دەست و پێ ببەسترێت و لەژێر پێی فیلان ڕۆحیان دەرچێت. جەزای خائین هەر جۆرێ خراپ بێ ئەوە لازمە. بەو جۆرە هەموویان کوژران. پادشا و ئێران دوخت و کوڕەکان و ئەساسی تا سەر بەخۆشی ڕایانبوارد. فائیدەی ئامۆژگاری ئەوەیە هەرکەس تەماشای ئەم حیکایەتانە بکات بۆی ئاشکرا ئەبێ گەورەیی حیلم چۆنە. حەلیم دایم سەلامەتە.

**ئەسیحەتی سیازدەهەم**

تەجرەبەکردن و ناسینی چاک و خراپ

دابیشلیم ڕووی کردە برەهمەن، وتی: لە گەورەیی حیلم و سەبر تێگەیشتم. ڕجا ئەکەم بە تەواوی خۆپاراستن لەقسەی خائین و کەسێ غەددار بێ، چۆنە، نیشانم بدرێت. برەهمەن وتی: بۆ پادشا لازمە هەموو ئومەرا هەر یەکە بە وەزیفەی خۆی ئیمتیحان بکات. ڕەوشت و دیانەتی ئومەرا تەحقیقی لازمە، وەهەتا ڕەوشت و ڕاستیی ئومەرا لە پادشا ئاشکرا نەبێ قابیلی ئوموورات نییە، چونکە بناغەی دەوام لەسەر ڕاستی بەندە. تا ئەسڵ و خائین هاتو چۆی پادشا بکات، حوکمداریی پادشا بە موددەتێکی کەم ئامێنێت. خزمەتچیی پادشا لازمە سێ ڕەوشتی بێ. ئەووەڵ قسەی ڕاست و ئەمین بێت. کەسێ کە ڕاست بوو خۆشەویستی خودایە و لایقی سیپری پادشایە. دووەم کەسێ بێ جەسوور و ساحێب ئیقتیداربێ، بۆ تەمەع درۆ لە زوبانی جاری نەبێ. سێهەم خانەدان و ئەسک بێ. کەسێ ئەهلی خانەدان بێ ئارەزووی خراپە ناکات و حەقی وەلی نیعمەتی تا مردن گوم ناکات. بۆ پادشا لازمە لە قووەت و پارە زۆریی کەس تێ نەفکرێ. پادشا لازمە تەبیب بێ، تەماشای هەرکەس بکات و قسەی وەرگرت، لە دەردەکەی بزانێت، وەک تەبیب پارێز و دەرمانی بۆ بکات بە میعاد، وە بزانێ هەر کەسە قابیلی ئوموورانێکە، وەتەجرەبەی بکات قابیلی سیپری پادشا کێیە. خزمەتچیی خاسەی پادشاه ئەبێ خانەدان و قسە ڕاست و ئەمین بێ، غەرەزی لە میللەت نەبێ. وە خزمەتچیی پادشا ئەگەر خائین بوو مومکینە بێ گوناه دوچاری عەزاب بکات و ناوی خراپەی پادشا بڵاو ئەبێتەوە، هەروەک پادشاکە بەقسەی زەڕنگەر خۆی خراپ کرد.

دابیشلیم پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

برەهمەن وتی: ئەگێڕنەوە لە شاری حەڵەب پادشاهێ بوو وە چەند پادشاهانێ بەر

حوکمی بوون. ئەو پادشایە کچێکی بوو لە جوانییا بێ ئەمسال بوو، وەلای پادشاه زۆر خۆشەویست بوو. ڕۆژێ پادشاه کراسێکی بۆ کچەکە بە دروست کردن دا، بۆ وەستایەکی نەققاش کە زەڕنگەر بێ نەقشی ئاڵتوون لەسەر کراسەکە دروست کات ئەگەڕان. لەشاری حەلەب زەڕنگەرێ بوو لە زوبان لووسی و عەیاریدا بێ ئەمسال بوو. شۆرەتی گەیشتە خزمەت پادشاه. لە هەموو جۆرە جەواهێراتێ نرایە پێش دەمی پادشا. پادشاه لە چاوپێکەوتنی ئەو جەواهێراتە تەحەییور ما. پادشا وتی: فکرم وایە کراسێ بۆ کچەکەم دروست بکەم لە دونیا دا بێ ئەمسال بێ. زەڕنگەر وتی: هەرچی زانستیم بێ لە نەقشی کراسەکە دا سەرفی ئەکەم و، بە زوبان لووسی دەستی کرد بە مەدح کردنی پادشاه. پادشاه وتی: لازمە هەموو ڕۆژێ یەک دەفعە چاوم پێت بکەوێت. وردە وردە زەڕنگەر بوو بە مەحرەمی ئۆدەی حەرەم. وەزیری پادشا زیرەک و ساحێب فکر بوو، بەو مەسئەلەی زانی، فکری کرد: پادشاه چۆن ڕێگەی بێگانەی داوە بۆ حەرەم و، بە چ فێڵێ دڵی پادشا ئەمین بووە؟ وەزیر ڕۆیشتە خزمەت پادشا، وتی: شاهم چەند قسەیێ هەیە ئەمر ئەفەرموویت بەیانی بکەم. پادشا وتی: مەئزوونی. وەزیر وتی: قابیل نییە بۆ بێگانە هاتوچۆی حەرەم بکات، وە ئێستا بۆم مەعلووم بووە وەستا هاتووچۆی حەرەم ئەکات. لازم بوو حەقیقەتی ئەحواڵی زەڕنگەر بزانرایە، ئەو وەختە بۆ حەرەم بڕۆیشتایە، بە نوقسان تەماشا نەئەکرا، وە فکرم وایە پیاوێکی حەرامزادەیە، بەناوچەوانیا زۆر خائین و بەدئەتوارە. پادشا وتی: بە زوبان و بەقسەکردندا پیاوێکی خانەدانە. شەرع زاهیر بینە. وەزیر وتی: لە مەکتەبی حیکمەت ئاڵتوون بە محەک ئەناسرێت. زۆر کەس بوون بە ئاشکرا پیاوی چاک بوون و لەژێرەوە خودا نەناس و بێ دین بوون. پادشاه وتی: ئەگەرچی لەئەووەڵەوە تەربیەتی نەبووبێ، ئومێد دەکەم بە واسیتەی هاتوچۆکردنی ئێمەوە تەربیەت وەرگرێت. وەزیر وتی: ئەی پادشاه، خەنجەرێ لە ئەووەڵەوە جەوهەری نەبووبێ، بە مشتوماڵ جەوهەر پەیدا ناکات. تەربیەتی نا ئەسڵ وەک گوێز هاویشتن بۆ سەر گومەزە. کەسێ لەئەووەڵەوە کەم تەربیەت بێ ئاخری تەربیەت وەرناگرێ. دووری نا ئەسڵ بە فرسەت بزانە، وە هەرکەسێ تەربیەتی نائەسڵ بکات ئەوەی بەسەر دێت بەسەر کوڕە پادشاکە و کەوشدروو هات.

پادشا پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

وەزیر وتی: ئەگێڕنەوە لە شاری فارس پادشایەکی ڕووخۆش و میللەت پەروەر بوو.

پادشا کوڕێکی بوو زۆر عاقڵ و جوان بوو. کوڕەکە سەرشانی میقداری لەپە دەستێ خاڵی ڕەشی پێوەبوو. پادشا زۆر عاجز بوو لەبەر خاڵەکەی کوڕەکەی. ئەمری کرد حوکەما و مونەجیمان کۆبوونەوە، سوئالی ئەو خاڵەی کرد. وتیان: ئەی پادشا، ئێمە لە کتێبی حیکمەتدا چاومان پێ کەوتووە هەرکەس ئەو جۆرە نیشانەی بەسەر شانەوە بوو تۆزە نازارێکی دێتە ڕێگە، وە لە ئاخریدا ئەبێتە ئیقلیم گیر، دونیا ئەگرێتە ژێر دەست. پادشا بەو مژدەیە زۆر خۆشحاڵ بوو، وە بەدیققەت خزمەتی کوڕەکەی ئەکرد. تەسادوف کابرایەکی کەوشدروو دراوسێی پادشابوو، لە حەرامزادەیی و ناپاکیدا ڕەفیقی نەبوو. پادشا لەبەر ئەجری دراوسێیەتی کردی بە خزمەتچیی کوڕەکەی. چەند وەخت بەو جۆرە لەگەڵ کوڕەکە هاتوچۆی ماڵی پادشای کرد. موددەتێ نانی ئیسراحەتی خوارد. وەختێ عومری کوڕەکە گەیشتە چواردە ساڵ، وەزیر وتی: ئەی پادشا، بەچاکی نازانم ڕێگەی وەلی عەهد بدرێ هاتوچۆی کەوشدروو بکات. لەوە ئەترسم ڕەوشتی پیسی کەوشدروو بگرێت. پادشا وتی: ئێستا منداڵە. وەختێ گەورە بوو ڕێگە نەدانی ئاسانە، چونکە هۆگری کەوشدروو بووە، ئێستا ڕێگەی نەدرێت عاجز ئەبێ. وەزیر قسەی نەکرد. پادشا کەوشدرووی بانگ کرد وتی: وەستا، هەتا مومکین ئەبێ خزمەتی کوڕەکە ئەکەیت و خەلاتت ڕوو لە زیادی ئەبێ. کەوشدروو دەستی نایە سەر چاوی وتی: قوربان، بەندە وجوودم نەبوە. ئێستا لە سایەی وەلی عەهدەوە ناوم پەیدا کردووە. ئومێد دەکەم خزمەتم بە جۆرێ بێ بە تەئریخ بگێرێتەوە. پادشا لەقسەی کەوشدروو ئومێدی پەیداکرد. ڕووی خۆشی بە کەوشدروو دا، بوو بە ئەمینداری پادشاه. تەسادوف سەفەرێ کەوتە بەر پادشاه. کەوشدرووی بانگ کرد، وتی: من ئەڕۆم بۆ سەفەر، وە ئەمانەتی تۆو وەلی عەهد. بۆ ئاگاداریی کوڕەکە ئامۆژگاریی کەوشدرووی کرد. پادشا ڕۆیشت بۆ سەفەر. لە ئەترافی شارەکە باغێکی زۆر خۆش بوو. کوڕە پادشا ئارەزووی سەیرانی کرا. ڕۆیشتە ماڵەوە، ئەلبیسەی تازەی بەقیمەتی لەبەرکردو تاجی جەواهیراتی لەسەرکرد. لەگەڵ کەوشدروو و میقدارێ خزمەتکار ڕووی کرد بۆ ناو باغەکە. کەوشدروو چاوی بە تاج و ئەلبیسەی کوڕەکە کەوت، نەفسی پیسی کەوتە جووڵان. فکری کرد فرسەتە، پادشا لە شار نییە، دایکی کوڕەکە لە من ئەمینە. چاک وایە تاج و لیباسی کوڕەکە بەرم، بیفرۆشم، پشتاوپشتم بیخوات کەم نابێتەوە. بەو فکرە پیسە کاری خۆی دروست کرد. میقدارێ دەرمانی بێهۆشی تێکەڵ خواردن کرد، دەرخواردی کوڕەکە و خزمەتکارەکانی دا بێهۆش بوون. کەوشدروو - غولامێکی بوو خەبەرداری کرد و کوڕە پادشای خستە ناو سندووقەوە، دەرگای مەحکەم

کرد، بەستی بەسەر ئولاغێکی خێرادا، خۆی سواری ئولاغ بوو، وە غولامەکەی سواری ئولاغێ بوو، قامچییان ڕاکێشا. شەو و ڕۆژێ ڕێگەی حەفتەیەک ڕۆیشتن. لەولاوە باغەوان تەماشای کرد خزمەتکار هەمووی بێهۆشە، میقدارێ سرکە و ڕۆن دای بە لووتیانە، هاتنەوە هۆش خۆیان. تەماشایان کرد شەهزادەو کەوشدروو نەبوون دیار، خەبەریان برد بۆ ژنی پادشا. ژنی پادشاه سواربوو ڕووی کردە باغ، هەرچەند گەڕان خەبەری کوڕە پادشایان نەزانی و، قاسیدیان بۆ ئەتراف ڕەوانەکرد، کەس خەبەری بۆ مەعلووم نەکرا. دایکی شەو و ڕۆژ بە گریان و هاوار خەریک بوو. خەبەر بۆ پادشا ڕەوانە کرا، پادشا لە سەفەر هاتەوە، جگەری کون کون بوو. شەو و ڕۆژ بە گریان و هاوار خەریک بوو. موددەتی دە ساڵ خەبەری کوڕەکە نەبوو. ئەمما کەوشدروو لەگەڵ وەلی عەهد و غولام گەیشتە حەڵەب. ئەسباب و تاجەکەی لە شاهزادە کردەوە بردیە بازاڕ فرۆشتی بە بازرگانێ.

کابرای بازرگان پیاوێکی عاقڵ و دنیا دیدە بوو. فکری کرد: ئەگەر پادشا خەبەری ئەم عەبدە بزانێ بە زۆر لێم ئەسێنێ. چاک وایە بە ڕەسمی دیاری بیبەم بۆ پادشای فارس، مومکینە دوو قیمەتی عەبدەکەم بداتێ. بازرگان شاهزادەی هەڵگرت، ڕووی کرد بۆ شاری فارس. وەختێ شاهزادە داخڵ بە ماڵی باوکی بۆوە، قەدەری زەمان و بێهۆشی لەفکری نەمابوو ماڵی باوکیەتی و، باوکیشی نەیناسییەوە. پادشا مەمنوونی بازرگان بوو و دوو قیمەتی بە بازرگان عەتا کرد. پادشاه ئەمری کرد تەسلیمی غولامی خاسسە بکرێت. کوڕەکە چونکە خانەدان و ئەسڵ بوو ڕەوشتی غولامانەی نەبوو، وە ڕەحمی باوکی کەوتە جوولان، هەموو ڕۆژێ گەوهەرێکی خەڵات ئەکرا. کوڕەکە گەوهەرەکەی تەسلیم بە خەزێنەوان نەکرد. ڕۆژێ خەزێنەوان وتی: تۆ ئەم هەموو چاکەیە لەگەڵ من ئەکەیت، چاک وایە ئەجرت بدەمەوە. ئامۆژگارییەکت ئەکەم لەقسەم دەرمەچۆ. ئەمووستیلەیەک لە ئەمووستی پادشایە هەرکەس بیکاتە دەستی ئەبێتە شەهەنشاه. ئەگەر بێتو ئەمووستیلەکە لە پادشاه بدزیت من نقێمەکەی دەردێنم و ئەیکەم بە ئەمووستیلە بیکەرە دەستت ئەبیت بە پادشا، وە تۆیش شەرت لەگەڵ من بکەیت کە بوویت بە پادشاه من بکەیت بە وەزیر. کوڕەکە قەبووڵی کرد. تەسادوف شەوێ نۆبەچیی سەری پادشا بوو، دەستی بۆ ئەمووستیلەکە درێژ کرد، پادشا خەبەری بۆوە، وتی: چۆن جورئەتت کرد دەست بۆ ئەمووستیلەی من درێژ ئەکەیت؟ کوڕەکە جوابی بۆ نەدرایەوە. پادشا ئاگری قەهری داگیرسا، بانگی کرد: جەللاب.. جەللاب بەشمشێرەوە حازر بوو. پادشاه ئەمری کرد:

لەبەر چاوم سەری ئەو بێ ئەدەبە لە بەدەن جودا بکەرەوە. جەللاب تەشتی هێنایە بەر گەردنی شاهزادە، کراسەکەی لەبەر شاهزادە دامالی، سەری خستە ناو تەشتەکەوە، خاڵە ڕەشەکەی سەرشانی دەرکەوت. وەختێ پادشا چاوی بەخاڵە ڕەشەکە کەوت هاواری کردو بێهۆش بوو. جەللاب وەستا تا پادشا هاتەوە هۆش خۆی. پادشاە ڕاست بووەوە شاهزادەی گرتە باوەش، ئەولاو ئەولای ماچ کرد، وتی: نووری چاوم، کەوشدرووی نانەسڵ منی بە دەردی تۆوە موبتەلا کرد. شاهزادە وتی: بابە، خەزێنەداری خائین منی بە دزی خەجاڵەت کرد. پادشا وتی: نووری چاوم لە ڕەفاقەتی نانەسڵان دوور بە. هەتا لە دونیا ژیانت مومکین نەبێ ڕەفیقیی نانەسڵ و فیتنە مەکە. پادشا ئەمری کرد لیباسی پادشاهانەیان لەبەر شاهزادە هەڵکێشا و خەزێنەداریان بەداری سیاسەت کوشت. وەزیر وتی: ئەی پادشا، بۆیە ئەم میسالەم بۆ جەنابت هێنایەوە لە جەنابت ئاشکرا بێ زەڕنگەر لەو کەسانە نییە لایقی هاتوچۆ کردنی حەرەم بێ. پادشا وتی: بەمستوومە لەپێشوونان وتوویانە هەرکەس ئێمە خۆشمان ویست سەری لە هەموو کەس بڵندتر نەبێ. لوتفی ئێمە بەسەرشۆرستانا ڕابوێرێت وەک باغی بەهەشت ئەڕازێتەوە. قەهری ئێمە بەسەر بەردە ئەستێدا ڕابوورێت وەک مێو و ڕۆن نەرم ئەبێ. وەزیر بۆی مەعلووم کرا پادشاە بەقسەی ناکات، درێژەی بەقسە نەدا. چەند ڕۆژێ بەو جۆرە خەریکی نەقشکردنی کراسی بوو، تەکەببور لووتی بەرز بووەوە دەستی زوڵمی بۆ ماڵی خەڵق درێژ کرد. تەسادوف موحتاج بوون بۆ گەوهەرێ لەسەر یەخەی کراسەکە دانرێ. نە لە خەزێنەی پادشا و نە لە دووکانی جەواهێر فرۆش دەس نەکەوت. کابرای زەڕنگەر خەبەری زانی کچە بازرگانێ هەموو جۆرە جەواهێرات و بەردی بەقیمەتی هەیە. زەڕنگەر جوابی نارد بۆ کچە بازرگانەکە میقدارێ جەواهێراتی بۆ بنێرێ. کچەکە وتبووی جەواهێراتم نییە. زەڕنگەر خەبەری بە کچی پادشا دا کچە بازرگان دوڕو جەواهێراتی نایابی هەیە ئەمر بفەرموو بیهێنن یا بەهیمەت یا بەقیمەت، ئەوەی قابیلی کراسەکەی بێ لێی ئەسێنین. کچی پادشاە ناردی کچە بازرگان و جەواهێراتەکانیان حازر کرد، هەرچەند گەڕان بۆ گەوهەرێ قابیلی کراسەکە بێ نەبوو. کچەکە سوێندی خوارد لەوە زیاتر نییمە. زەڕنگەر وتی: بە چاوی خۆم دیومە، درۆ ئەکات. ئەمر بفەرموو بە لێدان لێی بسێنن. نیهایەت ئەوەندە دارکارییان کرد کچەکە لەژێر دارا ڕۆحی دەرچوو. خەبەر و هاوار گەیشتە لای وەزیر. وەزیر مەسئەلەی لەسەر کاغەز نووسی بردیە پێش دەمی پادشا دایئا. پادشا لەو مەسئەلەیە زۆر عاجز بوو، ناردی بازرگانیان هێنا و خوێنی کچەکەی تەسلیم کرد و دڵخۆشیی بازرگانی دایەوە و کچەکەی خۆی لەبەر

چاو ناشیرین بوو، ئەمری کرد جارێکی کە نەیەتە پێش چاوم. زەڕنگەر لە ترسی پادشاە فیراری کرد. موددەتێکی پێ چوو دایکی کچەکە ڕووی کرد بۆ سەیران، جێگەیەک بوو ناوی (چوارباغ) بوو، ژنی پادشا و کچەکە ڕۆیشتن بۆ چوارباغ. تەسادوف زەڕنگەر خەبەری زانی کچی پادشا ڕووی کردووە بۆ چوارباغ، خۆی گەیاندە کچەکە. کچەکە وتی: ئەی پیسی گلاو، نزیکم مەکەوە. لە پیسی تۆوە لەخۆشەویستیی باوکم دوورکەوتەوە. زەڕنگەر ڕووی کردە چۆڵ، ڕۆیشت، شەوی بەسەراهات. چاڵێ بۆ گرتنی حەیوانات هەڵکەنرابوو، زەڕنگەر کەوتە ناوی. میقدارێ حەیوانات کەوتبوونە چاڵەکەوە، لەبەر نازاری خۆیان ئاگەهداری زەڕنگەر نەبوون، هەتا ڕۆژ هەموویان لەناو چاڵەکەدا مانەوە. تەسادوف ڕۆژ هەڵهاتبوو سەیاحێک ڕێگەی کەوتە سەر ئەو چاڵە، تەماشای کرد بەنی ئادەمێ و میقدارێ حەیوانات لەناو ئەو چاڵە دا حەپس کراون، فکری کرد بۆ ئەجری قیامەت ئەجاتیان بدات. گوریسی خستە ناو چاڵەکەوە، ئەووەڵ مەیموون سەرکەوت. دووەم بەبر سەرکەوت. سێهەم مار سەرکەوت. دوعایان بۆ سەیاح کەوت، وتیان بەم پەلەپەلە ئەجری تۆمان بۆ نادرێتەوە. مەیموون وتی: جێگەی من بەو شاخەوەیە کە پشت شار کەوتووە هەر وەخت تەشریفتان هات، ئەوی ئیقتیدارم بێ قوسوور ناکەم. بەبر وتی جێگەی من لەچوارباغە. هەر وەخت تەشریفتان هات، ئەوی ئیقتیدارم بێ قوسوور ناکەم. مار وتی: جێگەی من لەناو شارایە لەبن گوێسوانەی ماڵێک کە ماڵی پادشایە، هەر وەخت تەشریفت هات، ئەوی بزانم قابیلە پێشکەشی جەنابتی ئەکەم. مار وتی: ئێستا بۆ چاکە ئامۆژگاریت ئەکەم لەقسەم دەرمەچۆ، ئەو کابرایە کە لەناو چاڵەکە دایە، ئەجاتی مەدە. وەمن ڕەفاقەتم کردووە میقداری هەشت سەعات، بۆم مەعلووم بووە زۆر نائەسڵ و ڕەوشت خراپە، جەزای چاکە بە خراپ ئەداتەوە. ئەگەر ئەجاتی بدەیت پەشیمانیی لە شوێن دێت. حەیوانەکان دوعاخوازییان لە سەیاح کرد، هەریەکە چوونەوە جێگەی خۆیان. سەیاح بەقسەی مار قانیع نەبوو، گوریسی داهێشتە ناو چاڵەکەوە زەڕنگەری ئەجات دا. زەڕنگەر وتی: ئەی سەیاح ئەگەر تەشریفت زەحمەت بکێشێ بۆ ماڵی ئێمە هەتا مردن لە خزمەتت قوسوور ناکەم. ئەمما ئێستا ڕێگەم لەبەرە. دوو ڕۆژی کە ئەگەڕێمەوە. ئومێد ئەکەم بە خزمەتت بگەم. دوعا خوازییان لەیەک کرد. هەریەکە ڕوویان کردە ڕێگەیەک. لەولاوە چەند ئومەرایەک ڕجایان لە پادشا کرد لەگەڵ کچەکەی ئاشت بێتەوە، بێ فائیدە بوو. تەسادوف کابرای سەیاح چەند شارێ گەڕا، میقداری سێسەد درهەمی پەیدا کرد، گەڕایەوە بۆ شاری حەڵەب. لە ترسی پیاو خراپ شەو بە ڕێگەدا ئەڕۆیشت. لە ڕێگە

تووشی میقداری دز بوو. دزەکان سەیاحیان ڕووت کردەوە، دەست و قاچیان بەست، لەو سەحرایە دا جێیان هێشت. وەختێ ڕۆژ بووەوە دەستی کرد بە هاوار کردن. مەیموونەکە بۆ خواردن ئەگەڕا، دەنگی سەیاحی ناسی، ڕۆیشت بە هاواریەوە، وتی: ئەی ساحێب وەفا بۆچ دەست و پێت بەستراوە؟ سەیاح بەیانی ئەحوالی خۆی بۆ کرد. مەیموون وتی: خەفەت مەخۆ، من ئەشیاکانت بۆ ئەدۆزمەوە. وەرە لەگەڵ من. مەیموون سەیاحی برد، خانوێکی لە پووش و دار دروست کردبوو، سەیاحی دانا و خۆی ڕۆیشت. تەسادوف دوچاری دزەکان بوو، لەسەر کارێزێ خەویان لێ کەوتبوو. مەیموون لە ئەووەڵەوە ئەشیای دزەکانی کۆ

کردەوە، کیسە پارەکەی دۆزییەوە، دەریهێنا، بردی لە جێگەیەک شاردیەوە. بە دوو سێ جار هەرچی ئەسبابێ بوو لە دزەکانی دزی، شاردیەوە. مەیموون بۆ تەماشا کردن چووە سەر دارێ. وەختێ دزەکان خەبەر بوونەوە، وەک گورگی هار بەنەترافی خۆیانا بۆ ئەشیاکان ئەگەران، تەماشایان کرد شوێن قاچی بەنی ئادەم دیار نەبوو. وتیان: مومکینە ئێرە جێگەی شەیاتین بێ، وەستانمان لەم جێگەدا چاک نییە. دزەکان ڕۆیشتن. مەیموون ڕۆیشت سەیاحی بردە سەر ئەشیاکان، ئەوی ئەشیای خۆی بوو هەڵیگرت. ڕووی کرد بۆ حەڵەب. لەنزیک شار دوچاری بەبر بوو. سەیاح لەترسا وەستا. بەبر بانگی کرد: ساحێب وەفا، فەرموو چاکەت بدەمەوە. سەیاح ڕاوەستا. بەبر وتی: سەبر کە هەر ئێستا بە خزمەت ئەگەم، ڕووی کرد بۆ چواریاغ. تەسادوف کچەکەی پادشا کراسەکەی لەبەر کردبوو بەناو باغەکەدا ئەگەڕا. بەبر هەڵمەتی دایە، کچەکەی خنکاند و کراسەکەی داماڵی، بردی لەپێش دەمی سەیاح دایبنا. سەیاح لە تەماشاکردنی جەواهێراتی کراسەکە تەحەییور ما، فکری کرد: ئەم کراسە بەرمە لای ئەمینداری وردەوردە بیفرۆشێت و سەرفی ژیانی بکەم. بەو فکرە ڕووی کردە شار، ڕێگەی کەوتە ماڵی زەڕنگەر. لەولاشەوە خەبەری کوژراویی کچەکە گەیشتە دەم پادشاە. ئەمری کرد بۆ گەڕاندنی قاتیلی کچەکە، وە زەڕنگەر خەبەری کوژراویی کچە پادشای بیست. وەختێ سەیاح داخڵ بە ماڵی زەڕنگەر بوو بەخێرهاتنی سەیاح کرا. بەیەکەوە دانیشتن زەڕنگەر وتی: ساحێب وەفا، لەو وەختەوە بەخزمەت جەنابت گەیشتووم تا ئێستا ئەوەندەم دەست نەکەوتووە پێشکەشی جەنابت بکرێت. سەیاح وتی: خودا ئەوەندەی ناردووە هەردوکمان تا مردن بیخۆین نابڕێتەوە. کۆڵەکەی کردەوە. وەختێ زەڕنگەر چاوی بە کراس کەوت لە خۆشییا حەیاتی تازە بووەوە، وتی: ڕەفیق، قیمەتی ئەو کراسە تەواو نابێ. تۆ بە سەلامەتی لێرە دانیشە. ئێستا قیمەتی مەعلووم ئەکەم، دێمەوە. زەڕنگەر دڵی خۆش بوو. وتی: فرسەتە، پادشاە لەمن عاجز بووە، وە ئێستا کراسەکەی بۆ ئەبەم، دڵی لەگەڵ من ئاشت ئەبێتەوە. زەڕنگەر چووە خزمەت پادشا، وتی: شاهم، قاتیلی مەلەکەی مەرحووم لای من گیراوە و کراسەکەم هێناوەتە خزمەتت. ئەمر بفەرموو قاتیلەکە بێنن بە داری سیاسەت بکوژرێت. پادشا ناردی سەیاحیان لە ماڵی زەڕنگەر بردە دەرەوە و داخڵ بە خزمەت پادشا کرا. وەختێ سەیاح گەیشتە خزمەت پادشا، ڕووی کردە زەڕنگەر، وتی: قیمەتی کراسەکەت مەعلووم کرد و ئەجرت دامەوە؟ پادشا وایزانی گوناهکارە، ئەمری کرد بۆ سیاسەت بە ئەترافی شارا بیگێڕن و لە زیندان حەپس کرێ تا تەعزیەی کچەکەی تەواو ئەبێ بیکەن بە دارا، تیرە

باران کرێ. لەسەر ئەمری پادشا سەیاحیان بە ئەترافی شارا گێرا. تەسادوف مار چاوی پێ کەوت سەیاح بەدەست جەللابانەوە حەپسە. مار دوای کەوت تا داخڵ بە زیندان کرا. وەختێ سەیاح خرایە زیندانەوە، مار چووە لای وتی: ڕەفیق، ئەووەڵ ڕۆژ ئامۆژگاریم نەکردی: چاکە لەگەڵ ناتەسڵ مەکە، بەقسەت نەکردم؟ سەیاح وتی: سەد قات لەمە زیاتر سیاسەتم پێ بکرێت قابیلم چونکە قسەی ئامۆژگاریم شکاندووە و ئێستا چارەم نییە. مار وتی: حەقی چاکەت لای من هەیە، لازمە بیدەمەوە. دوێنێ داوەمە بە دایکی پادشاوە، هەموو حەکیمان عیلاجیان بۆ ناکرێ، دەرمانی بەو چڵەگیایە ئەکرێ ئەوا نامە پێش دەمت. دوعا خوازیی کرد ڕۆیشت، بەزوبانی حاڵ لەسەربانی پادشا بانگی کرد: دەرمانی دایکی پادشا لای سەیاحی بێ گوناهە کەلە زیندان حەپس کراوە. لەو وەختەدا پادشا لەژوور سەری دایکی دانیشتبوو، ئەمری کرد بزانن چییە، بچن سەیاح لە زیندان دەربێنن سەیاح برایە خزمەت پادشا، چڵەگیاکە و میقدارێ شیر دەرخوارد دایکی پادشا درا، چاک بووەوە. سەیاح قسەی ئەووەڵ و ئاخری بۆ پادشا بەیان کرد. وەختێ ڕۆژ بووەوە زەڕنگەر لەبن سێدارەکەدا وەستابوو چاوەڕێی خنکاندنی سەیاحی ئەکرد. لەتەرەف پادشاوە ئەمر کرا زەڕنگەر لە جێگەی سەیاح بەدارا بکرێت. جەللاب زەڕنگەری گرت، کردیان بە داری سیاسەتدا و تیرە باران کرا، دنیا لە ژیانی بەدنەتواری خاڵی کراو لاشەی فڕێ درا. زەڕنگەر لەسەر فەساد و خراپی بە جەزای خۆی گەیشت، کچی پادشا لەسەر زوڵمی خراپ بەچنگ بەبرەوە کوژرا. وە ئەگەر پادشا ساحێب حیلم نەئەبوو بە تەدبیری چاک کاری دروست نەئەبوو. بۆ هەموو کەس لازمە ڕێگەی ناتەسڵ و فیتنە نەدات و قسەی خۆی بۆ هەموو کەس بەیان نەکات.

**نەسیحەتی چواردەهەم**

ڕازی بوون بە قەزاوقەدەر و سەبرکردن لە ژێر بەڵادا

دابیشلیم وتی: لە مەعنای وەسیەتی سیازدەهەم گەیشتم. ئومێد دەکەم بەیانی وەسیەتی چواردەهەم، ئاخر فەرمودەی جەنابتە، بە درێژی بەیان بفەرموویت. زۆر تەسادوفی کردووە چەند عاقڵان بۆ نانێ موحتاج بوون و چەند کەم عاقڵان لەناز و نیعمەتدا غەرق بوون. مەعلوومە سیرڕی ئەو ئیشە لە خودا زیاتر بۆ کەس دەرک نەکراوە. برەهمەن فەرمووی: ئەسبابی ژیان ڕۆژی ئەزەل تەقدیر کراوە، هەرکەس بە واسیتەی سنعەتێکەوە نان پەیدا ئەکات و، هەرکەس بەواسیتەی تەمەعێکەوە تووشی بەڵا ئەبێت

و، هەرکەس بە واسیتەی نەخۆشییەکەوە تووشی مردن نەبێ. ئەگەر قەدەر نازڵ بوو نەقووەت نەدەوڵەت نەعەقڵ هیچیان بەکار نایەت. هەروەک کوڕە پادشا لە دەروازەی شاری نەستووری نووسی، هەتا ئێستا بۆ یادگار ماوە.

دابیشلیم پرسیی: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

برەهمەن وتی: ئەگێڕنەوە لە ڕۆم پادشایەکی گەورە بوو. ئەو پادشایە دوو کوڕی بوو، زۆر ساحێب عەقڵ و مەعریفەت بوون. وەختێ پادشا ئەمری خودای کرد کوڕە گەورە لەجێگەی دانیشت. کوڕە بچووکی لەبەر ئەوەی مەحرووم مایەوە، تەرکی وەتەنی کرد. لەڕێگە تووشی جوانێ بوو زۆر بەئەدەب و ساحێب جەماڵ بوو. شاهزادە فکری کرد لەگەڵ ئەو جوانە مەراقی غەریبی بەباد بدات. هەردوکیان بوون بە ڕەفیق. ڕۆیشتن، ڕێگەیان کەوتە شارێک. کوڕە بازرگانێ زۆر عەقڵدار و زیرەک بوو، بوو بە ڕەفیقیان. هەرسێکیان کەوتنە ڕێگە، چوونە دێیەک. کوڕە فەللاحێ ئارەزووی ڕەفاقەتیانی بوو، لەگەڵ ئەویش بوون بە ڕەفـیق. هەر چواریان ڕۆیشتن بە ڕێگەدا تا داخڵ بە شاری نەستـوور بوون. قەراریان دا تا موددەی یەک حەفتە نەچنە دەرەوە. لە ئەترافی شارەکە جێگەیەکیان دۆزییەوە کردیان بە مەسکەنی خۆیان بۆ نووستن. تەسادوف هیچیان پارەیان نەبوو سەرفی کەن. یەکێکیان وتی: ئەی ڕەفیقینە ئێمە خەرجیمان نییە سەرفی بکەین. لازمە بۆ خەرجی پەلەپەلێ بکەین تا لەبرسا نەمردووین. شاهزادە وتی: تەقسیماتی ڕزق بە دەست خودایە. ئەوەی بەنسیب بووبێ بۆمان ئەنێرێ. لازم بە پەلە ناکات. کوڕە جوانەکە وتی: کەسێ کە حوسن و جەمالی جوانی بێ ڕوو بۆ هەر جێگەیەک بکات دەست نانێن بە ڕوویەوە. کوڕە بازرگان وتی: سەرمایەی ژیان کەسابەتە. کەسێ کاسب بوو موحتاجی نایەتە ڕێگەی. فەللاح وتی: سەرچاوەی ئاڵتوون زەراعەتە. کەسێ فەللاح بێ موحتاجی نایەتە ڕێگەی. یەکێکیان وتی: لەم قسانە هیچ دەست ناکەوێت، چاک وایە هەریەکە بە کارێک خەریک بێن. وتیان: شاهزادە گەورەیە، هەرچی ئەمر بفەرمووێت کردنی چاکە. شاهزادە وتی: من لەسەر قسەی ئەووەڵم، وەئێوە ئەفەرموون بە جوانی وەیا بە بازرگانی وەیا فەللاحی نان پەیدا ئەبێت. ئینکار ناکەم. ئەگەر قەزای خودا هات پەردە بەسەر جوانییاو، زەرەر بەسەر بازرگانییا و، فەوتانن بەسەر فەلاحەتدا ئەدان. لازمە ئێمە بە قەزای خودا ڕازی بین، هەروەک کابرا فەللاحەکە بە قەزا ڕازی بوو مەتڵەبی دەست کەوت.

ڕەفیقەکانی پرسییان: چۆن بووە؟

**حیکایەت**

شاهزادە وتی: ئەگێڕنەوە لە شاری ئەندەلوس کابرایەکی فەللاح بوو، دیواخان و موسافیرخانەی بۆ میوان کردبۆوە، شۆرەتی ناندانی بڵاو بووبوەوە. فەلاحەتی ڕوو لەتەرەقی بوو. پارەی نەقدی گەیشتە سێسەد دینار ئاڵتوون. ڕۆژێ سەرحیسابی پارەکەی نەکرد، لەناکاو ڕەفیقێکی بانگی کرد. فەللاح پارەکەی خستە ناو گۆزەوە. لەگەڵ ڕەفیقەکەی ڕۆیشت. تەسادوف ژنەکەی گۆزەکەی هەڵگرت ڕۆیشت ئاو بێنێت. لە ڕێگە تووشی شوانێ بوو، وتی: ئەی شوان، ئەو گۆزەیە بەرە پڕی کە لە ئاو بۆم بێنەرەوە. شوانەکە گۆزەکەی وەرگرت، ڕۆیشت. لە ڕێگە گۆزەکەی لار کردەوە، کیسە پارەیەک کەوتە خوارەوە. شوان کیسەکەی هەڵگرت. لە خۆشییا گۆزەکەی فکر نەما، وتی: چاک وایە ڕوو بکەمە وەتەنی خۆم بە ئیسراحەت ئەو پارەیە بخۆم، بەو فکرە ڕۆیشت، کوڕێکی بوو هەڵیگرت، ڕوویان کردە ڕێگە. دیسان فکری کرد مومکینە لە ڕێگە دوچاری پیاو خراپ بیم پارەکەم بە زۆر لێ بسێنن. چاک وایە بچم گایەک بکڕم و پارەکە بهاوێژمە قوڕگیەوە. هەر وەخت گەیشتمە ماڵەوە گاکە سەرئەبڕم پارەکە دەردێنم. ڕۆیشت گایەکی سەند بە دوازدە درەم، پارەکەی بە زۆر ئاخنیە قوڕگیەوە. ڕوویان کردە ڕێگە، فکری چوو نان بکڕێت. بۆ نان کڕین گەڕایەوە، کوڕەکەی بە دیار گاکەوە جێهێشت. تەسادوف فەللاح چاوی بە گا کەوت، فکری کرد بۆ قوربانی چاکە و موعامەلەی لەگەڵ کوڕە شوان کرد. بە شازدە درهەم گای کڕی بردیە ماڵەوە. فەللاح فکری بوو پارەکە لە گۆزەکە دەرکات، لە جێگەیەکی کە قایمی کات، تەماشای کرد گۆزە نەبوو، لە ژنەکەی پرسی: گۆزەکە لە کوێیە؟ ژنەکە مەسئەلەی بۆ فەللاح گێڕایەوە. فەللاح هەناسەی هەڵکێشا و شوکرانەی خودای بەجێهێنا، ڕازی بوو بە قەزای خودا، ڕۆیشت گاکەی دا بە زەوییا، کردی بە قوربانی، گۆشتی گای پارچە پارچە کرد گەیشتە گەردەملی، پارەکەی دۆزییەوە، لە خوێن پاکی کردەوە، ژماردی سیازدە دەرەمی کەم بوو. شەرتی کرد جارێکی کە لەخۆی دوور نەخاتەوە. ژنەکەی وتی: عەیبە بەو جۆرە ماڵ خۆش ویستن. لە فکرت چووەوە لەقوڕگی گا هێناتە دەرەوە. بۆت مەعلووم بێ هەتا ماڵی تۆ بێ بۆ کەس ناخورێت. فەللاح وتی: مەعلوومە هەرکەس موحافەزەی ماڵ نەکات و پارەی خۆش نەوێت بە ساحێب پارە نابێ. ژنەکە بێ دەنگ بوو، فەللاح پارەکەی بەستە پشتی. ڕۆژێ فەللاح غوسلی کرد و

پارەکەی جێ ما، ڕۆیشت. لە دوای ئەو شوانێک گەیشتە سەر ئەو کارێزە حەیوانەکان ئاو بدات، تەماشای کرد کیسە پارەیەک کەوتووە، هەڵیگرت، حەمد و سەنای خودای بەجێهێنا، فکری کرد چاک وایە دەست بۆ ئەو پارەیە درێژ نەکەم و بۆ ڕۆژێکی لێقەومان بەکار دێت، بە شوانیی خۆم خەریک بم. لەولاوە فەللاح کە زانیی پارەکەی نەماوە، ڕای کردە سەر کارێزەکە، میقداری گەڕا، پارەی نەدۆزیەوە. بە ئانومێدی ڕووی کردەوە ماڵەوە قسەی بۆ ژنەکەی کرد. ژنەکە وتی: قسە لە قەزاوقەدەر ناکرێ. فەللاح ڕازی بوو بە قەزای خودا، شوکرانەی زۆری کرد، وتی: هەتا بە ڕۆح زیندووم ماڵ پاشەکەوت نەکەم. ماڵێ بەم جۆرە ساحێب مەراق بێ خواردنی لە هەموو شتێک چاکترە. تەسادوف ڕۆژێ کابرای شوان دوچاری میقداریَ سوار بوو، لە ترسا پارەکەی فڕێ دایە ناو بیرەوە، شوێن حەیوانەکانی کەوت، ڕۆیشت. لەدوای شوان کابرای فەللاح گەیشتە ئەوێ، مێزەرەکەی کەوتە ناو بیرەوە. فەللاح چووە ناو بیرەکەوە، پارەکەی دۆزیەوە، ڕۆیشتە ماڵەوە، خەبەری بە ژنەکەی دا. دەستی کرد بە سەرف کردن. میقداری دووسەد دیناری سەرف کرد. کابرای شوان بۆ سبحەینێ چووە سەر بیرەکە، هەرچەند گەڕا پارەکەی نەدۆزیەوە. وەک تەعزێدار دایم عاجز بوو. ڕۆژێ بۆ نان خواردن ڕێگەی کەوتە ماڵی فەللاح. لەپاش نان خواردن فەللاح سوئالی کرد: بۆچ ئەوەندە عاجزیت؟ کابرای شوان وتی: میقداری سێسەد دینارم بوو، ڕۆژێ لەترسی پیاو خراپ خستمە بیرەوە. بۆ سبحەینێ چووم پارەکە نەمابوو. فەللاح قسەی بۆ ژنەکەی کرد، وتی: ئەو سێسەد دینارە کە من دۆزیەوە بە ئێمە حەرام بوو، ماڵی ئەو شوانە بوو ئێمە خەرجمان کرد. هەرچی ماوە بیهێنە تەسلیم بە دەستی ساحێبی بکەینەوە. ژنەکە پارەکەی برد بە ڕەسمی هەدییە تەسلیمی کابرای شوانی کرد ، شوان ژماردی سەد دینارە، شوکرانەی خودای بەجێهێنا، فکری کرد چاک وایە داردەستەکەم کون بکەم و پارەکە بخەمە ناوی. بەو فکرە داردەستەکەی کون کرد و پارەکەی خستە ناو. تەسادوف شوانەکە لە قەراغ جۆگە ئاوێ خەوی پیا کەوتبوو، گۆچانەکەی کەوتە جۆگە ئاوەکەوە. ئەو جۆگە ئاوە بە بەر دەرگای فەللاحدا ئەڕۆیشت. فەللاح گۆچانەکەی گرتەوە، شکاندی بیکەنەوە بە ئاگر، زرەی پارە هات، ژماردی سەد دینارە، دیسان دەستی کرد بە سەرف کردنی لە ڕاهی خودا دا. ڕۆژێکی کە شوان ڕێگەی کەوتە ماڵی فەللاح، قیسسەی داردەستەکەی بۆ فەللاح گێڕایەوە. فەللاح وتی: ئەووەڵ جار ئەو سێسەد دینارەت چۆن دەست کەوت؟ شوان وتی: لەفڵان جێگە دۆزیمەوەو لەفلان بیرا قایم کرد. فەللاح وتی: ئەی شوان، ئەو سێسەد دینارە ماڵی من بوو، تۆ دۆزیتەوەو من لە بیرەکە دەرم هێنا،

وەختێ تۆ هاتیت قسمەت کرد سەد دیناری مابوو، بە ماڵی من بوو بە تۆ نەخورا.

شاهزادە وتی: هێنانەوەی ئەو میسالەم بۆ ئەوە بوو تا بزانن ئەوەی بە نسیب بووبێ ڕەززاق ئەیئێرێت، وە ئێمە لە دائیرەی تەوەککول نەچینە دەرەوە. ئەو ڕۆژە بەو قسانە ڕایانبوارد. بۆ سبحەینێ کوڕە جوانەکە وتی: خواردنی ئیمڕۆتان لەسەر من. هەڵسا ڕووی کرد بۆ شار. وەختێ داخڵ بە شار بوو، بەناو شارا ئەگەڕا، ژنێک چاوی بە کوڕ کەوت، عاشقی بوو، کارەکەری نارد بانگیان کرد، ژنەکە وتی: وا دیارە غەریبی. من عاشقی تۆ بووم، هەموو ڕۆژ وەرە سەعاتێ بەزم بگرین، دە درەم خەرجی وەرگرە. کوڕەکە قەبووڵی کرد، دە درەمی وەرگرت، ڕۆیشت خواردن و ئەسبابی کڕی. لە شار ڕۆیشتە دەرەوە. لە دەروازەی نووسی: حەقی جوانی ڕۆژی دە درهەمە. ئەو شەو بەخواردنی کوڕە جوانەکە ڕایانبوارد. بۆ سبحەینێ کوڕە فەللاح وتی: خواردنی ئیمڕۆتان لەسەر من. ڕۆیشت، ڕووی کرد بۆ شار. لە ڕێگە پرسیی: ئەوەی بە قیمەت بێ چییە؟ وتیان: دار پارەی چاک ئەکات. ڕۆیشت کۆڵێ داری کرد، بردیە ناو شار، فرۆشتی بەشەش درهەم، وە هەتا ئێوارە جۆماڵی کرد بە شەش درهەم. خواردن و ئەسبابی کڕی، لە شار چووە دەرەوە. لە دەروازەی شارەکەی نووسی: حەقی فەلاحەت ڕۆژی دوازدە درهەمە. ئەو شەوە بە خواردنی کوڕە فەللاح ڕایانبوارد. بۆ سبحەینێ کوڕە بازرگان وتی: خواردنی ئیمڕۆتان لەسەر من ڕۆیشت ڕووی کردە شار، تەماشای کرد پاپۆڕێ ئەسبابی بازرگانی هاتووە مەزات ئەکرێت. کوڕە بازرگان موعامەلەی کرد هەمووی کڕی و فرۆشتیەوە بە سەد دینار قازانج. خواردن و ئەسبابی کڕی، لە شار چووە دەرەوە لە دەروازەی نووسی: قازانجی بازرگانی ڕۆژی سەد دینارە. ڕۆیشتەوە لای ڕەفیقەکانی . ئەو شەوە بە خواردنی کوڕە بازرگان ڕیانبوارد بۆ سبحەینێ ڕوویان کردە شاهزادە: ئیمڕۆ نۆبەی تۆیە، بزانین ڕێگەی تەوەککول چۆنە؟ شاهزادە ڕێگەی شاری گرت. تەسادوف ئەو ڕۆژە پادشای شارەکە مردبوو، هاوار و گریان کەوتبوە ناو شار. شاهزادە ڕووی کرد بۆ ماڵی پادشاه، بە عاجزی لە کەنارێکەوە ڕاوەستا. دەرگاوان تەماشای کرد: غەریبە بە عاجزی وەستاوە، وایزانی جاسووسە. دەرگاوان شاهزادەی گرت، بردی لە زیندان حەپسی کرد. شاهزادە ئەو شەوە بە حەپسی مایەوە. ڕەفیقەکانی تەماشایان کرد شاهزادە نەبوو، فکریان کرد وتیان: مومکینە شاهزادە هیچی دەست نەکەوتبێ، ڕووی نەهاتووە بێتەوە. کاشکی نۆبەمان نەخستایە سەر، چونکە لە قسەی تەوەککول زیاتر هیچی کەی نەئەزانی. لەولاوە لە ناشتنی جەنازەی پادشا بوونەوە، مەجلیس گیرا بۆ ئەوە یەکێ لە جێگەی پادشا دانرێت. دەرگاوان وتی: بە هێواشی قسە

بکەن چونکە ئیمڕۆ جاسووسێکم گرتووە، وتیان بچۆ بزانێن جاسووسی کێیە بیهێنە. وەختێ دەرگاوان شاهزادەی داخڵ بە مەجلیس کرد. وزەرا و ئومەرا بە عەقڵ زانییان جاسووس نییە، سوئالیان کرد: تۆ غەریبی، لە چ شارێکەوە هاتوویت؟ شاهزادە لە ئەووەڵ تا ئاخر قسەی بۆ مەجلیس بەیان کرد. هەموویان بۆیان مەعلووم بوو شاهزادەیە و، چەند کەسانێ ناسییانەوە کوڕی پادشای ڕۆمە، بە ئیتتیفاقی هەموو ئومەرا لە جێگەی پادشای ئەستوور دانرا و، موبارەکبادییان کرد. عادەتی ئەو شارە وابوو هەر پادشایەک کە لەسەر تەخت دابنرایە سواری فیلی سپی ئەکرا بە ئەترافی شارەکە دا ئەیانگێڕا. بەو تەرتیبە شاهزادە سواری فیل کرا و ئومەرا و وزەرا ئەترافیان گرت، بەئەترافی شارەکە دا گێڕرا. وەختێ گەیشتە دەروازەی شار دەستخەتی ڕەفیقەکانی ناسییەوە. ئەمری کرد بنووسن: جوانی و فەلاحەت و ئیجارەت وەختێ بەکار دێت لە قەزا و قەدەری خودا دوور بێت، وە کەسێ ئەووەڵ ڕۆژ لە زیندان حەپس کرابێ دووەم ڕۆژ لەسەر تەختی پادشا حوکمدار بێ بۆ عیبرەت کافییە. گەڕایەوە جێگەی خۆی لەسەر تەخت دانیشت. ئەمری کرد ڕەفیقەکانی حازر کران. ڕووی کردە کوڕە جوانە وتی: هەرچەند دەوری ڕەفاقەت گرانە و مەعلووم بوو حوسن و جەمالی تۆ هەر ڕۆژە ژنێک گرفتار ئەکات و هەموو ڕۆژ موحاکەمەی تۆ بەمن

ناکریٚ، چاک وایه ڕوو بکەیتە وەتەنی خۆت، لەم شارە نەمێنیت. شاهزادە ئەمری کرد میقداریٚ پارەیان دایە و ڕەوانەی وەتەنی کردەوە. ڕووی کردە فەللاح وتی: تۆم کرد بە سەرکاری هەموو زراعەتی موڵکی خاسسەی حوکومەتی. ڕووی کردە کوڕە بازرگان، وتی: بۆم مەعلووم بووە ساحێب فکریت، تۆم کرد بە وەزیر. بەو جۆرە شاهزادە لەسەر تەختی سەڵتەنەت دانیشت و حوکمداریی شاری ئەستووری کرد. ڕۆژیٚ ئەمری کرد مەجلیس گیرا، ڕووی کردە مەئموووران، وتی: فەرموودەی خودایە «تعز من تشاء وتذل من تشاء». عەقڵ بە گەورەیی و بچووکی نییە. ئێوە بزانن من تەرکی وەتەنم کرد و لەگەڵ شەش کەس بووم بە ڕەفیق. هەرکەسە بە جۆریٚ قسەی مەعیشەتیان کرد. من وتم: لازمە ئینسان ڕێگەی تەوەککول بگرێت وە بە قەزاوقەدەری خودا ڕازی بیٚ. ئێوە قسەتان چییە بەیانی بفەرموون، چونکە من لە تەوەککول زیاتر هیچی کە نازانم. یەکیٚ لە جێگەی خۆی هەڵسا، ڕووی کردە پادشاە وتی: شاهم ئەوی جەنابت ئەفەرموویت گەوهەرێکە بە ئەڵماس دروست کراوە و خودا ژیانی ئێمەی تازە کردەوە جەنابتی بۆ ئێمە ڕەوانە فەرمووە و ئێمە قودورمی مویارەکت بە شوعلەی ڕۆژ تەماشا ئەکەین. پیاوێکی پیر هەڵسا وتی: ئەی پادشاە بەندە لە مەسئەلەی قەزاوقەدەر ڕابوردوویەک ئەزانم. ئەگەر ئەمر ئەفەرموویت بەیان بکرێت. پادشاە وتی: بیگێڕەوە، بزانم چۆنە؟

**حیکایەت**

پیرەکە وتی: من خزمەتچیی پیاوێکی گەورە بووم. لەگەڵ زانیم دونیا تا سەر بۆ کەس باقی نابیٚ، فکرم کرد دەست لە دونیا هەڵگرم و لە کونجیٚ بە عیبادەت خەریک بم. بەو فکرەوە دوعا خوازیم لە ئاغام کرد، ڕووم کرد بۆ بازاڕ، تەماشام کرد دوو تووتی بە دەست کابرایەکەوەیە ئەیفرۆشێت. تووتییەکان بە زوبانی خۆیان بۆ حەپسی خۆیان ئەگریان. منیش دڵم بۆیان سووتا، وتم چاک وایە بۆ جەزای ئاخیرەت هەردوکیان لە حەپسی ئەجات بدەم. موعامەلەم کرد داوای دوو درهەمیان ئەکرد وەمنیش لە دونیا دا لە دوو درهەم زیاتر نەمبوو. نەفس ڕێگەی نەئەدا. عەقڵ وتی: بۆ کاری خێر تەئخیر بوون ئافات پەیدا ئەکات. مەجبوور بووم دوو تووتییەکە بە دوو درهەم سەندم. ڕۆیشتم لە ئەتڕافی شار تووتییەکانم بەرەڵلا کرد. هەردوکیان چوونە سەر دیواریٚ، بانگیان کردم: وەک چاکەت لەگەڵ ئێمە کرد، ئێمەیش لازمە چاکەی تۆ بدەینەوە. ئەو دیوارە هەڵکەنە قوتوویەک پڕە لەجەوهەر ببە بۆ ئیحتیاجی خۆت سەرفی کە. منیش لەقسەی تووتییەکان سەرسام بووم.

وتم: مەعنای چییە قوتوویەک لەژێر دیوار لە نێوە دیارە، ئەمما چاوتان بە داو ناکەوێت خۆتان دوو چاری حەپس ئەکەن؟ تووتییەکان وتیان قەزاوقەدەر کە نازل بوو چاو کوێر ئەبێ و گوێچکە گران ئەکات، وە قسەی تووتییەکان موافیقی فەرموودەی پادشایە. منیش چووم دیوارەکەم هەڵکەند و قوتووەکە پڕ بوو لە جەوهەر دەرمهێنا وە ئێستاش حازرە لەترسا نەمفرۆشتییە، وە قابیلی خەزێنەی پادشایە، ئەمر ئەفەرمووێت بچم بیهێنم تەقدیمی خەزێنەدار بکرێت. پادشا فەرمووی حەڵاڵی خۆتە، حەقی خەزێنەی پادشای نییە. هەموو حازران موبارەکباد و ئافەرینیان لە زیرەکیی پادشا کرد، یەکەیەکە حەمد و سەنای خودایان بەجێهێنا و، شەهزادە تا موددەی ژیانی لە ڕێگەی ڕاستییەوە حوکمدار بوو بەسەر شارەکەدا.

وەختێ برەهمەن چواردە ئامۆژگارییەکەی بۆ دابیشلیم گێڕایەوە، دابیشلیم ڕووی کردە برەهمەن فەرمووی: ئەی حەکیمی دڵ ڕووناک، هەر مەقسەدێکم بوو لە واسیتەی نوفووسی جەنابتەوە دەست کەوت، وە ئومێد دەکەم دیاری یەک بۆ یادگار بۆ جەنابت بەجێ بێڵم قوبووڵی بفەرمووێت. برەهمەن وتی: ئەی پادشا، من دەستم لە دونیا هەڵگرتووە و ئارەزووی ئەفسم نەماوە و چاوم لە تەمەعی دونیا نییە، وە ئەگەر جەنابت مەرحەمەت لەگەڵ من ئەکەیت لە دوعای خێر غافڵم مەکە «دعاء الامام العادل لایرد». وە ڕجا ئەکەم ئەم ئامۆژگارییانە لەسەر کاغەز بنووسنەوە، وە لەسەر قانوونی ئەم کیتابە حوکمداری بکە. پادشاه قوبووڵی کرد و دوعا خوازییان لەیەک کرد. دابیشلیم داخڵ بە تەختی سەڵتەنەت بووەوە، ئەمری کرد بە نووسینەوەی. وەختێ کە نوسرایەوە لە خەزێنەی پادشا دانرا. (خجستەڕای) کە وەزیری همایوون فال بوو ئەووەڵ تا ئاخر قیسسەی بۆ همایوون فال گێڕایەوە. پادشا ڕۆحی زیندوو بووەوە و ئەمری کرد بە خەڵات کردنی خجستەڕای. وەزیر وتی: ئەی پادشا، ئەوەی بەندە گێڕامەوە لازمە بنووسرێتەوە، چونکە قیسسەی ئامۆژگاری وەک ڕۆژ شوعلە ئەدات. ڕۆژ بە پارچە هەورێ ڕووناکیی نامێنێت، وە ئەگەر جەنابت ئەم ئامۆژگارییانە ئەنووسیتەوە، بە موددەتێکی کەم ناوی نامێنێت. ئەمر کرا بە نووسینەوەی، ناونرا (کەلیلە و دمنە)، وە لەزەمانی سوڵتان حوسەین کوڕی ئەمیری ساحێبقران کوڕی تەیموری گورگانی تەرجەمە کرا بە فارسی، بە زوبانی مەلا حوسەینی کاشیفییەوە، ناو نرا (ئەنواری سوهەیلی) لە سەنەی ۹۱۰ی هیجریدا.

دیسان لە ساڵی ۱۹۳٤ لە زەمانی مەلیکولعیراق فەیسەلولئەووەڵ کوڕی مەلیک حوسەین شەریفی مەککەی موعەززەمە (زاد شرفها) تەرجەمە کرا بە کوردی، بە زوبانی

مەلا کەریم کوڕی حاجی سەعید کوڕی مەلا کەریم، وە ناو نرا (گەلاوێژی کوردستان)، لەسەنەی ١٣٥١ ، ٢٨ی (ذوالحجة) ڕۆژی جومعە. ڕجا ئەکەم لە بڕا خۆشەویستەکانم سەهو وەیا غەڵەتێ کە ئەبینن، قەڵەمی عەفوی بەسەرا بکێشن. ان الله هو ستار العیوب. عبدالکریم.

**ئامۆژگاری پازدەهەم**

زانینی ڕەوشتی چاکە، وە حەرام و حەڵاڵ

ئەگێڕنەوە لە شاری بەغداد کابرایەکی بازرگان زۆر زەنگین بوو، ئەمما ئەولادی نێرینەی نەبوو. لە خوسووسی ئەولاد نەبوونەوە زۆر عاجز بوو، فکری کرد وتی: بمرم ناوم کوێر ئەبێتەوە. بەو خەیاڵاتە دەستی پاڕانەوە و گریانی بۆ قاپی خودا درێژ کرد. بە نوێژ کردن شەوی ڕۆژ ئەکردەوە. بە ڕۆژ بە ڕۆژوو بوو. دائیما خەریکی زیارەت کردنی پیاوچاکان بوو. نەذری کرد لەسەر خۆی مەولوودی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و کراسی هەتیوان و دەستگیریی فەقیران. ئینتیها خودای تەعالا مەقسەدی حاسڵ کرد، وەختێ ژنەکەی حامله بوو. ئینتیهای حەملی هات، کوڕێکی ناوچەوان نوورانییان بوو. ڕۆژی حەوتەی تەواو بوو، بانگیان بە گوێدا دا، ناویان نا (ابو الحسن) و تەسلیم بە دایەن کرا. وەختێ عومری گەیشتە شەش ساڵ تەعلیمی خوێندنیان کرد. بەمووددەتی چەند ساڵ لە خوێندنی قورئانی مەجید و لە ئادابی شەرع و لە عیلمی حیساب و لەتیر ئەندازی و سواری کردن، ڕەفیقی دەست نەئەکەوت. ڕۆژێ ئەبولحەسەن لە خزمەت باوکی دانیشتبوو، باوکی ڕووی کردە ئەبولحەسەن وتی: ئەی ڕووناکی چاوم من دوو سێ ڕۆژ عومرم لەدنیادا ماوە، غەیرەز لیقای خودا زیاتر ئارەزووی کەم نییە، وە چەند ئامۆژگارییەکت ئەکەم لە فکری خۆتی مەبەرەوە. ئەی کوڕم ئەوەندە ماڵی دونیام بۆ پەیدا کردوویت لە ڕێگەی ڕاستەوە سەرفی کەیت هەتا ئەولادی ئەولادت ناپڕێتەوە، وە عەمەلی چاکە بکە. بە ئارەزووی نەفس و شەیتان موعامەلە مەکە، وە بەئیسراف ماڵ سەرف مەکە و ڕەفاقەتی نائەسڵ و دووڕوو مەکە. بە تەکەببور بە ڕێگەدا مەڕۆ، وە هەتا سوئاڵ نەکەن لە مەجلیسدا قسە مەکە و حورمەتی هەموو برای دینی بەفەخر بزانە و، ئازارت بۆ دراوسێ نەبێ و، لە غەیبەت و لە فیتنە دوور بە. تەسادوف چەند ڕۆژێکی بەین کەوت بازرگان نەخۆش کەوت و ئەمری خودای بەجێ هێنا. ئەبولحەسەن کفن و دفنی باوکی کرد و هەتا سێ ڕۆژ تەعزیەی بۆ گرت. لەپاش تەعزییە ڕەفیق و دراوسێ ڕوویان کردە ئەبولحەسەن، وتیان:

کەسێ ئەولادێکی وەک تۆی لێ بەجێ مابێ نەمردووە. ناوی بە زیندوویی باقی ماوە. تەعزییە گرتن بۆ ژن هاتووە. بۆ پیاو ناشیرینە. ئینتیها کوڕەکەیان بردە حەمام، لیباسی تەعزییەیان لەبەر داکەند، لیباسی جوانیان لەبەر کرد. ئەبولحەسەن وەسیەتی باوکی فەرامۆش کرد، بە مالی دونیا مەغروور بوو، وایزانی فەقیری نایەتە ڕێگەی، دەستی کرد بە خەرج کردنی پارەو بە بەخشینی. ئاخری مالی ئەما لە جاریەیەک زیاتر. ئەو جاریەیە لە جوانی و خوێندن ڕەفیقی دەست نەئەکەوت. وەختێ ئەبولحەسەن فەقیر بوو، لە موحتاجییا وای لێ هات تا سێ ڕۆژ نانیان دەست نەکەوت بیخۆن. جاریەکە ڕووی کردە ئاغای، وتی: من بەرە خزمەت هاروونورڕەشید، بمفرۆشە بە دە هەزار دینار ئالتوونی سوور. ئەگەر وتی: بەو قیمەتە گرانە، تۆ بلێ: ئەی خەلیفە قیمەتی ئەم جاریە تەواو نابێ. وە لەعیلم و فەن ئەزانێت، ئیمتیحانی بکە. ئەگەر قابیل بوو موبارەکە. ئەما هەزار جۆرە تەکلیف بکا لەو قیمەتە کەمتر ڕازی نەبیت. لەپاشا ئەبولحەسەن جاریەکەی برد و چووە خزمەتی خەلیفە. ئەوەی بەیان کرا عەرزی خەلیفە کرا. خەلیفە لە جاریەکەی پرسی: ناوت چییە؟ جاریەکە جوابی دایەوە ناوم (تەوەددود)ە. خەلیفە وتی: لە عیلم چی ئەزانیت؟ جوابی دایەوە: ئەی خەلیفە، عیلمی ئەحو، سەرف، فیقە، تەفسیر، لوغەت، مۆسیقا، عیلمی ستارە، حیساب، جەمع، تەرح، زەرب، تەقسیم، وە قورئان بە حەوت قیرائەت، وەعەدەدی سوورە، حیزب، ڕوبع، عەشەرە، سوجدە، ناسیخ و مەنسووخ و سەبەبی نازڵ بوونی، وە ئەحادیسی شەریف لە موسنەد و مورسەل و مووسەق، وە لە عولوومی ڕیازی و هەندەسە، فەلسەفە، حیکمەت، وە مەنتیق و مەعانی و بەیان شارەزام. شیعر خوێندنەوە، تار لێدان، بەستە وتن، ڕەقس کردن، عوموووم ئەزانم. ئەگەر خۆم ئارایشت بدەم ڕەقس بکەم ژن و پیاو، پیر و جوان وەک یەک سەرخۆش ئەکەم. لە هەموو فەن و سنعەت ئەوەندە شارەزام غەیرەز خودا نەبێت، بۆ کەس حیساب ناکریت. وەختێ خەلیفە ئەو قسە فەسیحانەی لە تەوەددود بیست، لە فەساحەت و بەلاغەتی تەعەججوب ما، ڕووی کردە ئەبولحەسەن، فەرمووی: من عالیمان و حەکیمان و شاعیران و قاری یان و مونەججیمان و فەلاسیفە حازر ئەکەم، هەر وەقت لە ئیمتیحان دەرچوو، ئەو قیمەتە بەتۆ عەتا ئەکەم، وە ئەگەر دەرنەچوو بۆ من بەکار نایەت، قابیلی خۆتە. لەپاشا خەلیفە کاغەزی بۆ عامیلی بەسرە نووسی کە ئیبراهیم کوڕی سەییار لە بەلاغەت و شیعر و ئەدەب بێ ئەمسال بوو ڕەوانەی بەغدادی بکات. بە موددەتی چەند ڕۆژێ ئەوی مەتلەب بوو لە بەغداد لە خزمەتی خەلیفە حازر بوون. کەسیان سەبەبی تەلەب کردنی

خەلیفەیان بۆ مەعلووم نەکرا بوو. لەپاشا خەلیفە ئەمری کرد بە حازربوونیان و بەحازربوونی تەوەددود و مەجلیس گیرا. وەختێ تەوەددود بەبێ حیجاب داخل بە مەجلیس بوو رووی وەک رۆژ شوعلەی ئەدا. حازران لە تەماشا کردنی سەرسام بوون. بە ئەمری خەلیفە کورسیی ئاڵتوونیان بۆ هێنا. دانیشت، دەستی کرد بەقسە کردن، وتی: ئەی خەلیفە ئەمر بفەرموو بەحازران یەکەیەکە سوئال بکەن و جوابیان وەرگرن. خەلیفە رووی کردە حازران، فەرمووی: ئارەزوو ئەکەم لەگەڵ ئەم جاریە سوئال و جواب بکەن. حازران عەرزیان کرد: ئەمر ئەمری جەنابتە. تەوەددود سەری بەرز کردەوە، وتی: کامتان لە عیلمی شەرع و دیانەت ئەزانن؟ یەکێکیان هەڵسا، وتی: من. تەوەددود وتی: هەرچی ئارەزوو ئەکەیت سوئال بفەرموو. مەلا وتی: تۆ قورئانت خوێندووە، لە ناسیخ و مەنسووخ ورد بوویتەوە؟ تەوەددود وتی: بەڵێ: مەلا وتی: خودای تۆ کێیە؟ پێغەمبەر و ئیمامی تۆ کێیە؟ قیبلە و برادەرانی تۆ کامەیە؟ تەوەددود وتی: ئەوەی عالەمی خەلق کردووە خودای منە و، (محمد المصطفى) صلى الله عليه وسلم پێغەمبەری منە. کەعبەی موعەظظەمە قیبلەی منە. موسوڵمانان برای دینی منە. خەلیفە و حازران لە فەساحەتی تەوەددود سەرسام مان. مەلا وتی: خودا چۆن ئەناسی؟ تەوەددود وتی: بە عەقڵ. مەلا وتی: عەقڵ چییە؟ تەوەددود وتی: عەقڵ دوو عەقڵە. یەکێکیان عەقڵی مەوهووب، یەکێکیان عەقڵی مەکسووب. عەقڵی مەوهووب ئەوەیە خودای تەعالا بە عەبدی خۆی عەتا ئەفەرموێت. بەو عەقڵە رێگەی راست ئەدۆزینەوە. عەقڵی مەکسووب ئەوەیە ئینسان بە مەعریفەتی خۆی کەسبی ئەکات. مەلا وتی: ئافەرین، راستە. ئەمما عەقڵ جێگەی کوێیە؟ تەوەددود وتی: عەقڵ لەناو دڵا خودا خەڵقی کردووە، شوعلەی بۆ مێشکی سەر بەرز ئەبێتەوە، لەوێ ئەوەستێ. مەلا وتی: خەبەرم بدەرێ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم چۆن ئەناسی؟ تەوەددود وتی: بە قورئان و بە دەلیلی موعجیزات ئەیناسم. مەلا وتی: لە فەرز و سوننەت خەبەرم بدەرێ. تەوەددود وتی: فەرز پێنجە (١) ئیقرار کردن بە تەنهایی خودا و تەسدیق کردنی محمد المصطفى صلى الله عليه وسلم. (٢) پێنج فەرزەی نوێژ. (٣) زەکات دان. (٤) رۆژووی مانگی رەمەزان. (٥) حەجی بەیتولحەرام. ئەمما سوننەت کەبووە و هەتا ئاخر ئەبێ چوارە: رووناکیی رۆژە و تاریکیی شەوەو هەڵهاتنی مانگ و رۆژە بۆ ئەوەی وەختی پێ بزانرێت. ئەمما مردن مەعلووم نییە. مەلا وتی: خەبەرم بدەرێ لە پێش نوێژ چەند شت لەسەر تۆ فەرز کراوە؟ تەوەددود وتی: تەهارەت، داپۆشینی عەورەت، لیباسی پیس لەخۆ دوور خستن، روو لە قیبلە کردن، نییەت دابەستن،

(الله اکبر) وتن لەسەر من فەرزە. مەلا وتی: خەبەرم بدەرێ چۆن بۆ مزگەوت ئەچیت؟ تەوەددود وتی: بە نییەتی عیبادەت. مەلا وتی: چۆن ئەچیتە دەرەوە؟ تەوەددود وتی: بە نییەتی خزمەت. مەلا وتی: خەبەرم بدەرێ ئەووەڵی دابەستنی نوێژ چۆنە و، تەحلیل و تەحریمی چۆنە؟ تەوەددود وتی: ئەووەڵی دابەستنی نوێژ دەستنوێژە و غوسلە و، تەحریمی نوێژ (الله اکبر)ە و، تەحلیلی سەلام دانەوەیە. مەلا وتی: ئەوەی نوێژ ناکات لایقی چییە؟ تەوەددود وتی: لە حەدیسسی سەحیح ڕیوایەت کراوە. هەرکەس بێ عوزری شەرعی بە عەمدەن تەرکی نوێژ بکا، لە موسوڵمانی بێ بەهرەیە. مەلا وتی: فائیدەی نوێژ چییە؟ تەوەددود وتی: نوێژ سەبەبی گەیاندنی ڕەحمەتی خودایە بە عەبدی. نوێژ کردن دە خەسڵەتی هەیە: (١) دڵ ڕووناک ئەکات و ڕووی ئینسان نوورانی ئەکات. ڕەحمەتی خودا زیاد ئەکات. ڕقی شەیتان هەڵئەستێنێ. بەڵا دوور ئەخاتەوە. عەبد بەخودا نزیک ئەکاتەوە لە شەڕی دوشمن مەحفووز ئەبێت. غەزەبی خودا دوور ئەخاتەوە. ئینسان لە کاری خراپ لائەدا. نوێژ واجبە. کۆڵەکەی دینی ئیسلامییەتە. مەلا وتی: کلیلی نوێژ چییە؟ تەوەددود وتی : کلیلی نوێژ دەست نوێژە. مەلا وتی: کلیلی دەست نوێژ چییە؟ تەوەددود وتی: ناوبردنی ناوی خودایە. مەلا وتی: کلیلی ناو بردنی خودا چییە؟ تەوەددود وتی: یەقینە. مەلا وتی: کلیلی یەقین چییە؟ تەوەددود وتی: تەوەککولە. مەلا وتی: کلیلی تەوەککول چییە؟ تەوەددود وتی: ئومێد بوونە. مەلا وتی: کلیلی ئومێد چییە؟ تەوەددود وتی: ئیتاعەت کردنە. مەلا وتی: کلیلی ئیتاعەت چییە؟ تەوەددود وتی: ئیعتیراف کردنە بە تەنهایی خودا. مەلا وتی: واجباتی دەست نوێژ چەندە؟ تەوەددود وتی: واجباتی دەست نوێژ بە مەزهەبی ئیمامی شافعی شەشە:(١) نییەت (٢)دەمو چاو شتن هەتا بنا گوێ (٣) هەردوو دەست شتن هەتا ئەنیشک (٤) مەسح کردنی لایەکی مووی سەر (٥) شتنی هەردوو پێی تا قوولە پێی (٦) یەک لەدوای یەک شتن شەرتە. مەلا وتی: سوننەتی دەست نوێژ چۆنە؟ تەوەددود وتی: سوننەتی دەست نوێژ دە جۆرە: (١) بسم الله وتن. (٢) دەست شتن. (٣) ئاو لەدەم وەردان. (٤) ئاو لە لووت وەردان. (٥) تەڕ کردنی هەردوو گوێ زاهیر و باتینی. (٦) ئاو داخڵ کردن بەناو ڕیشی پڕ. (٧) دەست هێنان بەبەینی ئەموستەکانیا. (٨) لای ڕاست شتن لەپێش لای چەپە. (٩) هەر ئەعزایەک سێ دەفعە شتن. (١٠) یەک لە دوای یەک شتن. مەلا وتی: فەرز و سوننەتی غوسل چۆنە؟ تەوەددود وتی: فەرزی غوسل نییەت هێنانە و بەدەن تەڕکردنە بە عوموم. وە سوننەتی غوسل ئەووەڵ دەستنوێژ شتنە و دەستی تەڕ هێنانە بە

بەدەناو گەیاندنی ئاوە بە ناو مـووەکـان. مەلا وتی: خەبەرم بدەری لەفەرز و سـوننەتی تەیەممووم. ئەوەددود وتی: فەرزی تەیەممووم چوارە: (١) نیـیـەت هێنانە. (٢) خاکـە. (٣) یەک دەست کێشـان بە خاکدا بۆ دەمو چاو هێنان. (٤) یەک دەست کێشـان بە هەردوو دەستی. وە سوننەتی تەیەممووم هێنانی ناوی خودایەو، پێش خستنی دەستی ڕاست لە دەستی چەپی. مـەلا وتی: شـەرایتی نوێژ و ئەرکـانی و سـوننەتی چۆنە، بەیانی بکە. ئەوەددود وتی: شـەرایتی نوێژ پێنجـە: (١) پاک بوونی بەدەن. (٢) داپۆشـینی عەورەت. (٣) ڕوو لە قیبلە کردن. (٤) لە جێگەی پاک ڕاوەسـتـان. (٥) بەجێ هێنانی وەقت. هەر نوێژەو وەختی خۆی کـردنی لازمـە. ئەرکـانی نوێژ ئەووەڵ نیـیـەتە و (الله اکبر)ە. بە پێوە وەستانە ئەگەر ئیقتیداری بوو. خوێندنی سوورەی فاتحەیە. ڕوکووعە و قەرار گرتنە لە ڕکووعدا. ڕاست بوونەوەیە لەگەڵ قەرار گرتندا. سەجدەی ئەووەڵە لەگەڵ قەرار گرتن. سەر بەرز کردنەوەیە بۆ دانیشتن لەبەینی هەردوو سەجدەدا. سەجدەی دووەمە لەگەڵ قەرار گرتن. دانیشتنە وەختی (التحیات). شەهادەت هێنانە بە تەنهایی خودا و ڕەوانە کراویی محمد المصطفی صلی الله علیه وسلم، وە سەڵەوات دان لە محمد صلی الله علیـه وسلم، وە سـەلام دانەوە لەپاش التـحـیـات و سـەڵەوات بە نیـیـەتی تەواو بوونی نوێژ. ئەمما بانگدان و قـامـەت کـردن و دەست بڵـند کـردنەوە لە وەخـتـی (الله اکبـر)دا و، ئامین وتن لەپاش (الحـمـد) و، سـوورەیێ لە قـورئان خوێندن و الله اکبـر لە هەڵسـان و دانیشـتندا، وە سمع الله بە بڵند وتن و، فـاتیـحە بڵـند خوێندن لە مەوقـیـعی جەهر و، هێواش خوێندن لە مەوقیـعی ئیخفات و، سەلام دانەوە بە بڵـندی، هەر یەکە لە جێگەی خۆی لازمە. مەلا وتی: ئافـەرین، ڕاسـتـە. مەلا وتی: لە چەند زەکات واجبە؟ ئەوەددود وتی: ئاڵتوون گەیشـتە بیسـت مسقاڵ نیو مسقاڵ زەکات واجبە. لەو میقدارە زیاد بوو بەو جۆرە حیسـاب ئەکریت، وە زەکـاتی حەیوان لە پێنج حوشتر مەڕێک زەکـاتە. لەبیـست و پێنج حوشـتر یەک حوشتر زەکاتە. مەڕ و بزن لەچل عـەدەد یەک عەدەد زەکـاتە. مەلا وتی: شـورووت و فـەرزی ڕۆژوو چۆنە؟ بەیانی بکە. ئەوەددود وتی: نیـیـەتە و خۆپاراستنە لە خـواردن و خـواردنەوە و، جـمـاع نەکـردنە و ڕشانەوەیە بە عـەمـدەن. ڕۆژوو واجب ئەبێت بەچاو پێکەوتنی مـانـگ لە مـانگی ڕەمەزاندا، وەیا بەشـەهادەتی دو کەس کە ڕاست بێ. فـەرزی ڕۆژوو ئەوەیە بەشـەو نیـیـەت بێنیت، وە سوننەتە زوو ئیفـتـار بکاتەوەو درەنگ پارشێو بکات، وە تەرک کردنی قسەی خراپە، وەقورئان خوێندن. ئەمما بە ڕۆن خۆ چەور کـردن و، چاو ڕشتن و، تۆز بە قـورگـا چوون و، ئاوی دەم قـووتدانەوە و جـاری بوونی

شەهووەت بە ئیحتیلام و، تەماشا کردنی ژنی بێگانە و، خوێن بەردان و حەجامەت گرتن زەرەر بە ڕۆژوو نەگەیەنێت. مەلا وتی: لە نوێژی هەردوو جەژن ئەڵێیت چی؟ تەوەددود وتی: نوێژی جەژن دوو ڕکاتە. بانگ و قامەتی نییە. لە ڕکاتی ئەووەڵ حەوت جار (الله اکبر) وتنە بە غەیری (الله اکبر)ی نییەت. لە ڕکاتی دووەمدا پێنج جار (الله اکبر) وتنە بە غەیری (الله اکبر)ی هەڵسانەوە، وە خوێندنی (التحیات)و شەهادەت بە مەزهەبی شافیعی. مەلا وتی: نوێژی وەتر چییە؟ تەوەددود وتی: کەمترینی نوێژی وەتر یەک ڕکاتە.. زۆرترینی یازدە ڕکاتە. مەلا وتی: ئیعتیکاف چییە؟ تەوەددود وتی: سوننەتە، شەرت و نییەتی ئەوە بێ لە مزگەوت نەچێتە دەرەوە مەگەر بۆ ئیحتیاجی کاری خۆی، وە نزیک نە بوونە بە ژنان، بە ڕۆژوو بێ قسەی لەهوو لەعب نەکات. مەلا وتی: خەبەرم بدەرێ حەج چۆن واجب ئەبێت؟ تەوەددود وتی: بەچوار جۆر: (١) بەبولووغی. (٢) بە عەقڵ تەواوی. (٣) بە ئیسلامی. (٤) بە ئیقتیدار بوون. وە لەموددەتی عومری یەک جار. مەلا وتی: فەرزی حەج چەندە؟ تەوەددود وتی: ئیحرام، وەستان لە عەرەفات، وەتەواف، وە سەعی کردن، وە سەرتاشین. فەرزی عەمرە تەواف و سەعی. مەلا وتی: سوننەتی حەج کامەیە؟ تەوەددود وتی: (لبیک) وتن، لە موزدەلیفە، مینا نووستن، وە شەیتان ڕەجم کردن. مەلا وتی: فەرزی ئیحرام کامەیە؟ تەوەددود وتی: ئیحرام دروومانناوی نەپۆشینە، عەتر بە خۆیا نەکردنە، سەرنەتاشینە، نینۆک نەکردنە، شمشێر دەرنەهێنانە، جیماع نەکردنە. مەلا وتی: ڕاستە. مەلا وتی: غەزا چۆنە؟ تەوەددود وتی: هاتنە دەرەوەی کوففارە بۆ سەر ئیسلام لە وەختی بوونی خەلیفەی ئیسلامدا و حازر کردنی ئەسلیحەیە و، ئیقتیدار بوونی وەستانە لە وەختی حەربدا. وە سوننەتی غەزا دڵخۆشی دانەوەی ئیسلامە و غیرەت نانە بەریانە بۆ سەر قەومی کوففار وەک خودای تەعالا فەرموویەتی: «یا أیها النبي حرض المؤمنین علی القتال». مەلا وتی: ئافەرین، ڕاستە. مەلا وتی: خەبەرم بدەرێ لە ئەشیایەک بە ئەشیا فرۆشتنی دروست نییە. تەوەددود وتی: لە حەدیثی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بۆم مەعلووم کراوە فرۆشتنی خورما بە ڕوتەب دروست نییە و، هەنجیری تەڕ بە وشک دروست نییە و، گۆشتی وشک بەگۆشتی تازە دروست نییە و، کەرە بە ڕۆن دروست نییە، نەهیی لێ کراوە.

وەختێ مەلا ئەو قسە فەسیحانەی لە تەوەددود بیست، بۆی مەعلووم کرا لە دەرەجەی عەقڵ و فامایە. فکری کرد: بەڵکی بە حیلە فایق بم. لەپاشا مەلا وتی: ئەی تەوەددود مەعنای دەستنوێژ چییە؟ تەوەددود وتی: نوێژ بە لوغەت ئەزافەتە لە چڵکنی. مەلا وتی:

مەعنای نوێژ چییە؟ تەوەددود وتی: نوێژ بە لوغەت دوعا کردنە. مەلا وتی: مەعنای غوسل لەلوغەتدا چییە؟ تەوەددود وتی: غوسل بە لوغەت خۆ پاک کردنەوەیە. مەلا وتی: مەعنای ڕۆژوو لە لوغەتدا چییە؟ تەوەددود وتی: ڕۆژوو بە لوغەت خۆ پاراستنە لە خواردن و خواردنەوە. مەلا وتی: مەعنای زەکات لە لوغەتدا چییە؟ تەوەددود وتی: زەکات بە لوغەت زیادیی ماڵە و پاک کردنەوەیە. مەلا وتی: مەعنای حەج لە لوغەتدا چییە؟ تەوەددود وتی: حەج بە لوغەت قەسد کردنە. مەلا وتی: جیهاد لە لوغەتدا چییە؟ تەوەددود وتی: جیهاد بەلوغەت وەفایە. وەختێ سوئالی مەلا تەواو بوو، مەلا هەڵسایە سەر پێی، وتی: ئەی خەلیفە بە شاهید بە ئەم جاریە لەمن و لە تۆ عالمترە. ئەنجا تەوەددود وتی: ئەی مەلا نۆبەی سوئالی منە وە جوابی تۆیە. مەلا وتی: فەرموو. تەوەددود وتی: سیهامی دین چەندە؟ مەلا وتی: سیهامی دین دەیە: (١) شەهادەت. (٢) نوێژ. (٣) زەکات. (٤) ڕۆژوو. (٥) حەج. (٦) غەزا. (٧) ئەمر بە چاکە. (٨) نەهی لە خراپە. (٩) ئولفەت و موعاشەرەت. (١٠) تەڵەبی عیلم. تەوەددود وتی: ئوسوولی ئیسلام چییە؟ مەلا وتی: ئوسوولی ئیسلام چوارە: (١) شەرت. (٢) ڕاستی. (٣) ئەمین بوون. (٤) وەفا و عەهد. تەوەددود وتی: یەک سوئالم ماوە، ئەگەر جوابی بەیان نەکەیت، لیباسەکانت داکەنە بە ڕووتی بڕۆرە دەرەوە. مەلا قوبوولی کرد. تەوەددود وتی: فورووعی ئیسلام کامەیە؟ مەلا سەری بە بەرۆکیا شۆڕ کردەوە، تا سەعاتێ جوابی نەبوو. تەوەددود وتی: لیباسەکانت داماڵە هەتا فورووعی ئیسلام بۆ تۆ بەیان بکەم. خەلیفە فەرمووی: ئەی تەوەددود، تۆ بەیانی بکە، من لیباسەکانی دائەماڵم. تەوەددود وتی: فورووعی ئیسلام بیست و دووە: (١) باوەڕ کردن بە قورئان. (٢) ئیقتیداکردن بە موحەممەدی (صلى الله عليه وسلم) ئاخر زەمان. (٣) ئازار لاپردن لەسەر موسڵمان. (٤) خۆ پاراستن لە حەرام. (٥) نەجاتدانی مەزڵووم لە دەست زاڵم. (٦) تۆبە کردن لە گوناه. (٧) مەسئەلەی دین فێر بوون. (٨) ڕەفیقی دۆست بە ڕەفیق گرتن. (٩) بە مووجیبی قورئان موعامەلە کردن. (١٠) بە پێغەمبەر باوەڕ کردن. (١١) بۆ غەزا حازر بوون. (١٢) دڵ سافی و عەفو کردنی خەتا لە وەختی دەست ڕۆیشتن. (١٣) سەبر کردن لەسەر مسیبەت. (١٤) شوکر کردن لەسەر نیعمەت. (١٥) ناسینی خودا بە تەنهایی. (١٦) ناسینی حوکمی پێغەمبەر. (١٧) شکاندنی ئارەزووی نەفس. (١٨) خۆ لادان لە ڕێگەی شەیتان. (١٩) بە ئیخلاس تەسلیم بوون بە ئەمر و ئیرادەی خودای تەعالا. وەختێ خەلیفە ئەو قسە فەسیحانەی لە تەوەددود بیست، ئەمری کرد بە ڕووت بوونەوەی مەلا و

بەخەجاڵەتی ڕۆیشتە دەرەوە.

ئەنجا دووەم مەلا چووە پێشەوە، ڕووی کردە تەوەددود وتی: سیحەحەت تەسلیم بوونی چییە؟ تەوەددود وتی: قەدەر مەعلوومە، جینس مەعلوومە، ئەجەل مەعلوومە. مەلا وتی: خواردن فەرز و سوننەتی چییە؟ تەوەددود وتی: فەرزی خواردن ئیعتیراف کردنە بەوەی خودای تەعالا ڕزق ئەداو شوکرانە کردن لەسەر نیعمەت. مەلا وتی: شوکرانە چۆنە؟ تەوەددود وتی: شوکرانە مەعنای ئەوەیە خودا هەر ڕزقێ ئەنێرێت بۆ لازمات سەرف کرێت. وە سوننەتی خواردن ئەوەیە ئەووەڵ بیسمیللا وتن و شتنی هەردوو دەستی، دانیشتن لەسەر ڕانی چەپ، بەسێ ئەمووست خواردن، خواردنی شتێک بە خواردن نزیک بێ. مەلا وتی: ئادابی خواردن چۆنە؟ تەوەددود وتی: تیکەی بچووک گرتن، تەماشا نەکردن بە ڕەفیقی هاونشین. مەلا وتی: لە عەقایدی دڵ و زیددی خەبەرم بدەرێ. تەوەددود وتی: عەقایدی دڵ سیانە و زیددی سیانە: (١) ئیعتیقادی ئیمان و زیددی ئەو دووری لە کوفر. (٢) ئیعتیقادی سوننەت و زیددی ئەو دووری لە بیدعەت. (٣) ئیعتیقادی تاعەت و زیددی ئەو دووری لە گوناە. مەلا وتی: خەبەرم بدەرێ لە سێ شت مانیعی سێ شتە. تەوەددود وتی: لە سەفیانی سەورییەوە ڕیوایەت کراوە: سێ شت مانیعی سێ شت ئەبێ: (١) بەسووک زانینی ساڵحان قیامەت لە دەست ئەچێ. (٢) بە سووک زانینی پادشاهان زیندویێتی لە دەست ئەچێ. (٣) بە سووک زانینی ماڵ و دەوڵەت حورمەت لە دەست ئەچێ. مەلا وتی: دەرگای ئاسمانەکان بۆ من بەیانی بکە. تەوەددود وتی: خودا فەرموویەتی: «وفتحت السماء فكانت أبوابا». پێغەمبەر صلى الله تعالى عليه وسلم فەرموویەتی: ژمارەی دەرگای ئاسمانەکان بۆ کەس مەعلووم نەکراوە ئیللا بۆ ئەوە نەبێ کە خەلقی کردووە. هەر بەنی ئادەمەی دوو دەرگای لە ئاسمان هەیە. یەکێکی ڕزقی بۆ دێتە خوارەوە، یەکیکی عەمەلی پیا بەرەو ژوور ئەکەنەوە. ڕزقی ئەو عەبدە قەتع ناکرێت هەتا ڕۆحی ئەبەن بۆ ئاسمان. مەلا وتی: بەیانی کە قەلب چییە؟ تەوەددود وتی: قەلب هەیە سەلامەت، قەلب هەیە شەقاوەت. قەلب هەیە (مونیب) یەعنی لە خراپە دوورە. قەلب هەیە (نەذیر) یەعنی ترساو. قەلبی سەلامەت دڵی ئیمانداره. قەلبی شەقاوەت دڵی کوففارە. قەلبی مونیب دڵی پیاوچاکانە. قەلبی نەذیر دڵی پێغەمبەرانە عليهم السلام. وەهەم ئەڵێن دڵ سێ جۆرە. دڵێک سابیت بێ ئەوە دڵی ئیسلامە. دڵێک نەخۆشە ئەوە دڵی منافقە. دڵێک موعەللەق ئەوە دڵی کوففارە. وە سێ جۆری کە دڵ هەیە. دڵێ پڕ لە نووری ئیمان و، دڵێ لە تاوی خەفەت بریندار و، دڵێ

ئەترسێ لە زەلیل و عاجزی. مەلا وتی: ئافەرین ڕاستە. تەوەددود وتی: ئەی خەلیفە مەلا سوئالی نەما. من دوو سوئال لە مەلا ئەکەم. ئەگەر جوابی نەدایەوە لیباسەکانی داکەنی بە ڕووتی بچێتە دەرەوە. مەلا وتی: هەرچی ئارەزوو ئەکەیت سوئال بکە جوابت بدەمەوە. تەوەددود وتی: ئیمان چییە؟ مەلا وتی: ئیقرار کردنە بە زوبان و باوەڕ کردن بە دڵ و عەمەل کردنە بە فەرموودەی پێغەمبەری ئاخر زەمان. ئینسانێ ئیمانی تەواو نابێ هەتا پێنج ڕەوشتی نەبێ: (١) تەوەککول بە خودا. (٢) سپاردنی هەموو کارێ بەخودا. (٣) تەسلیم بوون بە حوکمی خودا. (٤) پێ خۆش بوونی قەزا و قەدەری خودا. (٥) هەر ئیشێک بکەیت بۆ خودا بێ. ئەو وەختە ئیمانی تەواوە. تەوەددود وتی: لە واجبترینی فەرزەکان و، لە فەرزی پێش هەموو فەرزێکەو، لە فەرزێ هەموو فەرزەکان بەو فەرزە موحتاجن و، لە فەرزێ بە ئەترافی هەموو فەرزەکانا هاتووە- خەبەرم بدەرێ. مەلا بێ دەنگ بوو، جوابی بۆ نەدرایەوە. خەلیفە ڕووی کردە تەوەددود، فەرمووی جوابی سوئالەکەت بەیان بکە، مەلا بە ڕووتی ئەکەینە دەرەوە. تەوەددود وتی: واجبترینی هەموو فەرزێ ناسینی خودایە. وەفەرزێ پێش هەموو فەرزێکە (أشهد أن لا اله الا الله واشهد أن محمد رسول الله)یە. وەفەرزێک هەموو فەرزەکان بەو موحتاجن دەستنوێژە. وەفەرزێ بە ئەترافی فەرزەکانا هاتووە غوسلی جەنابەتە. وەختێ تەوەددود قسەی تەواو کرد، مەلا هەڵسایە سەر پێ ڕووی کردە خەلیفە، وتی: تۆ بەشاهید بە ئەم جاریە لە من عالمترە. لیباسەکانی داکەند تەسلیمی تەوەددودی کرد، بە شەرمەوە چووە دەرەوە.

ئەمجا سێهەم کەسیان بەرامبەر بە تەوەددود دانیشت، (قەڕڕاء)بوو، یەعنی قورئان خوێن، وتی: ئەی تەوەددود قورئانت خوێندووە؟ لە ناسیخ و مەنسوخ ورد بوویتەوە؟ وە لە مەککی و لە مەدەنی شارەزایت؟ تەوەددود وتی: بەڵێ، زۆر شارەزام. قەڕڕاء وتی: خەبەرم بدەرێ لە سوورەیی قورئان، وە لە ئایاتی، وە لەحورووفاتی، وە لەپێغەمبەرانی ناویان لە قورئانا بەیان کراوە، وە لە باڵندەیێ کە ناویان لە قورئانا هەیە، وە لە ناسیخ و مەنسوخی، وەلە ئایاتێ لە مەککە و لە مەدینە نازڵ بووە. تەوەددود وتی: قورئان سی جوزء و سەد و چواردە سوورەیە حەفتای لە مەککە و چل و چواری لە مەدینە نازڵ بووەو، شەش هەزار و شەش سەد و شەست و شەش ئایەتە. یەک هەزاری وەعدە، یەک هەزاری وەعیدە یەعنی هەڕەشە، یەک هەزاری ئەمرە، یەک هەزاری نەهیە. یەک هەزاری بۆ خوسووسی موحەممەدە (صلى الله عليه وسلم). یەک هەزاری قسەی پێشووە. پێنجسەدی بەحسی حەڵاڵ و حەرامە. سەدی ناوی تەسبیحی خودایە. شەست و شەشی مەنسوخە. وە

حورووفاتی سێ ملیۆن و بیست و سێ هەزار و شەش سەد و حەفتاو یەک حەرفە. قورئان خوێن بە هەر حەرفێکی دە خێری بۆ ئەنووسرێت، وە سەجدەی قورئان چواردەیە، ئەو پێغەمبەرانە کە ناویان لە قورئانا بەیان کراوە بیست و پێنج پێغەمبەرە: ئادەم، نووح، ئیبراهیم، ئیسماعیل، ئیسحاق، یەعقووب، یوسف، وەئیلیەسەع، یوونس، لووت، سالح، هوود، شوعەیب، داوود، زولکفیل، ئیدریس، ئیلیاس، یەحیا، زەکەریا، ئەییووب، مووسا، عوزەیر، هاروون، عیسا، موحەممەد (صلوات الله عليهم أجمعين). وە باڵندەیێ کەناویان بەیان کراوە نۆیە: مێشووله، هەنگ، مێش، مێرووله، پەپوو سلێمانکە، قەل، کولله، تەیرەن ئەبابیلە، شەمشەمە کوێرە. قەڕڕا وتی: ئافەرین ڕاستە. ئەی تەوەددود، لە قورئانا کام سوورە گەورەیە و، کام ئایەت گەورەیە؟ تەوەددود وتی: گەورەترینی سوورەی قورئان سوورەی (بەقەرە)یە، گەورەترینی ئایەتی قورئان (آیة الكرسي)یە. (آیة الكرسي) پەنجا کەلیمەیە، هەر کەلیمەی پەنجا جۆر بەرەکەتی هەیە. قەڕڕا وتی: کام ئایەت نۆ ئایەت بەیان ئەکات؟ تەوەددود وتی: «ان في خلق السماوات والأرض واختلاف الليل والنهار والفلك التي في البحر» هەتا ئاخری ئایەت. قەڕڕا وتی: کام ئایەت عەدلە؟ تەوەددود وتی: «ان الله يأمر بالعدل والاحسان وايتاء ذي القربى وينهي عن الفحشاء والمنكر والبغي». قەڕڕا وتی: کام ئایەت ئایەتی تەمەعە؟ تەوەددود وتی: «أيطمع كل أمريء منهم أن يدخل جنة نعيم». قەڕڕا وتی: کام ئایەت ئایەتی ئومێدە؟ تەوەددود وتی: «قل يا عبادي الذين أسرفوا على انفسهم لاتقنطوا من رحمة الله، ان الله يغفر الذنوب جميعاً. انه هو الغفور الرحيم». قەڕڕا وتی: بەچی قیرائەت قورئان ئەخوێنی؟ تەوەددود وتی: بە قیرائەتی ئەهلی بەهەشت. قەڕڕا وتی: کام ئایەتە کافران ڕاستیان وتووە؟ تەوەددود وتی: «وقالت اليهود ليست النصاري على شيء، وقالت النصاري ليست اليهود على شيء». هەردوولایان ڕاستیان وتووە. قەڕڕا وتی: کام ئایەت خودا بۆ خۆی بەیانی فەرمووە؟ تەوەددود وتی: « وما خلقت الجن والانس الا ليعبدون». قەڕڕا وتی: کام ئایەتە خودا لە قەولی مەلائیکە فەرموویەتی؟ تەوەددود وتی: «ونحن نسبح بحمدك ونقدس لك». قەڕڕا وتی: لە (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) خەبەرم بدەرێ. تەوەددود وتی: واجبە. خودای تەعالا ئەمری فەرمووە ئەووەڵی خوێندن بە (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم). دەلیلی ئایەتە: « فاستعذ بالله من الشيطان الرجيم». قەولی سەحیح ئەوەیە لە قورئان بەیان کراوە، لە حەدیسدا بەیان کراوە هەر وەخت موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) دەستی ئەکرد بە خوێندن، ئەووەڵ ئەیفەرموو:

«أعوذ بالله من الشيطان الرجيم. بسم الله الرحمن الرحيم». قەڕڕا وتی: (بسم الله) بە ئایەت دانراوە؟ تەوەددود وتی: بەڵێ بە ئایەت دانراوە، لە سوورەی نەملدا بە ئایەت ئەژمێردرێ، وە لەناو عولەمادا ئیختیلاف زۆرە بۆ خوسووسی (بسم الله). قەڕڕا وتی: مەعنای (بسم الله) چۆنە؟ تەوەددود وتی: گەورەیی و بەرەکەتی (بسم الله) تەواو نابێ. (بسم الله) لەهەر شتێک بخوێنرێت بەرەکەتی زۆر ئەبێ و، بەسەر هەر نەخۆشێکدا بخوێنرێ چاک ئەبێتەوە. وەختێ خودای تەعالا عەرشی ئافەریدە کرد لەرزانی گەورە بە عەرش کەوت، « بسم الله الرحمن الرحيم» لە عەرش نووسرا، لە لەرزە کەوت. وەختێ بۆ موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)(بسم الله الرحمن الرحيم) نازل بوو، فەرمووی: لە سێ شت ئەمین بووم. ئەووەڵ بە زەویدا چوونە خوارەوە. دووەم لە مەسخ بوون. سێهەم لە غەرق بوون. گەورەیی و مەعنای (بسم الله) درێژەی زۆرە تا قیامەت تەواو بوونی نییە. قەڕڕا وتی: ئایا خودای تەعالا قورئانی بەیەک جار نازل کرد، وەیا بە جیاجیا؟ تەوەددود وتی: جوبرائیلی ئەمین لە خزمەت ڕەببولعالەمین بە بیست و سێ ساڵ بە جیا جیا قورئانی نازل کردووە سەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم). قەڕڕا وتی: خەبەرم بدەرێ لە ئەووەڵ سوورەیێ بۆ موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) نازل بوو. تەوەددود وتی: بەقەولی ئیبنو عەبباس، ئەووەڵ سوورەیێ کە نازل بوو سوورەی عەلەق بوو، بەقەولی جابری کوڕی عەبدوڵلا سوورەی موددەسسیر (مدثر) بوو. قەڕڕا وتی: لە ئاخر سوورە خەبەرم بدەرێ. تەوەددود وتی:

ئایەتی ڕیبا بوو، وە ڕیوایەت کراوە «اذا جاء...» بوو. قەڕڕا وتی: لەو قوڕڕایانەی قورئان خوێنراوە خەبەرم بدەرێ. تەوەددود وتی: چوار کەس بوون: (١) ئوبەی بنی کەعب. (٢) مەعاز بنی جەبەل. (٣) سالم عەبدوڵلا. (٤) عەبدوڵلا بنی مەسعوود. قەڕڕا وتی: مەعنای «وما ذبح على النصب» چییە؟ تەوەددود وتی: ئەوانە بتێکە هەڵیانواسیوە کوففار عیبادەتی ئەکەن. قەڕڕا وتی: مەعنای چییە خودا فەرموویەتی: «يا أيها الذين آمنوا لاتحرموا طيبات ما أحل الله لكم»؟ تەوەددود وتی: شێخ ڕەحمەتی خودای لێ بێت فەرموویەتی: ڕیوایەت کراوە لە عەلی کوڕی ئەبوو تالیب وە عوسمانی کوڕی مەزعوون و لەگەڵ میقدارێ، وتیان: ئێمە تەرکی دونیا ئەکەین و لە ژنان دوور ئەکەوینەوە، تەنهایی ئیختیار ئەکەین. ئەو وەختە ئەو ئایەتە نازڵ بوو. قەڕڕا وتی:« واتخذ الله ابراهيم خليلاً» مەعنای چییە؟ تەوەددوو وتی: خەلیل یەعنی فەقیر و موحتاج وەیا مەعنای خۆشەویستی قەتعی. قەڕڕا بۆی مەعلووم بوو لە جوابدانەوە هیلاک نابێ،

هەڵسایە سەر پێیان، وتی: ئەی خەلیفە، تۆ بە شاهید بە تەوەددود لە خوێندن و لە تەفسیر لە من شارەزاترە. تەوەددود وتی: ئەی قەڕرا تۆبە سوئالی منە و جوابی تۆیە. ئەگەر جوابم نەدەیتەوە بەڕووتی بۆ دەرەوە خۆت دانێ. خەلیفە وتی: جوابت نەداتەوە ڕووت کردنەوەی لەسەر من. تەوەددود وتی: ئەی قەڕرا کام ئایەتە بیست و سێ کافی تیایە، وەکام ئایەتە شازدەمیمی تیایە، وەکام ئایەتە ئایەت سەد و چل عەینە (یەعنی چاو) وەکام حیزب ناوی (الله)ی تیا نووسراوە؟ قەڕرا جوابی بۆ نەدرایەوە. خەلیفە وتی: تەوەددود مەعنای بەیان بکە، ڕووت کردنەوەی قەڕرا ئاسانە. تەوەددود وتی: ئەی خەلیفە، ئەو ئایەتە بیست و سێ کافی تیایە لە سوورەی (بەقەرە) دایە، ئایەتی دینە. ئەو ئایەتە شازدەمیمی تیایە لە سوورەی هوودایە «قیل یا نوح اهبط» تا ئاخری. ئەو ئایەتە سەدو چل عەینە لە سوورەی (ئەعراف) دایە «واختار موسی قومه سبعین رجلا»، وە حیزبێ ناوی (الله)ی تیا نییە سوورەی (قەمەر) و(الرحمن) و(اذا وقعت الواقعة)یە. ئاخری قەڕرا بەڕووتی بە شەرمەوە ڕۆیشتە دەرەوە.

چوارەم کەسیان چووە پێشەوە حەکیم بوو، وتی: لە عیلمی دیانەت نەجاتت بوو، تۆبە عیلمی بەدەنە. حەکیم وتی: ئینسان چۆنە و چەند ئێسقانی لەبەدەندایە، وە چەند ڕەگ و دەماری هەیە و، سەری ڕەگەکان بە کوێوەیە؟ تەوەددود وتی: بەبەنی ئادەم بەوە ئەڵێن چونکە گەنم ڕەنگە. ئادەم یەعنی ڕووی ئەرز. حەزرەتی ئادەم لە ڕووی ئەرز خەلق بووە، سنگی لە خاکی کەعبە، سەری لە خاکی مەشریق، پای لە خاکی مەغریب. بۆ سەری بەنی ئادەم حەوت کون ئافەریدە بوو: دوو چاو، دوو گوێ، دوو کونە لووت، یەک دەم. چاو بۆ تەماشا کردن، گوێ بۆ بیستن، لووت بۆ هەناسە و بۆن کردن، دەم بۆ خواردن و ئەوەی لە دڵا بێ بە زوبان وتن. خودای تەعالا ئادەمی لە چوار عونسور خەڵق کردووە: لەئاو، لە ئاگر، لە خاک، لە با، سەفرا تەبیعەت، ئاگری، گەرم و وشکە. سەودا تەبیعەت، خاک، سەردو وشکە. بەڵغەم تەبیعەت، ئاو، سارد و تەڕە. خوێن تەبیعەت، باد، گەرم و تەڕە. بەنی ئادەم سێسەد و شەست ڕەگ و دوو سەد و چل ئێسقانی هەیە و سێ ڕۆحی هەیە. ڕۆحی حەیوانی، ڕۆحی نەفسانی، ڕۆحی تەبیعی. خودای تەعالا ئەوانەی هەریەکە بۆ حوکمێ تەرتیب کردووە. خودای تەعالا دڵ و سیوجگەر و سپڵ و ڕەگ و ڕیخۆڵە و گورچیلە و مێشک و ئێسقانی لەمانە بۆ خەلق کردووە. وە بیست و پێنج حەواس... بیستن و، چاو پێکەوتن و، بۆن کردن و، تام چێشتن و، لەمس کردن یەعنی سارد و گەرم زانین... لەم جۆرانە بەنی ئادەم دروست کراوە. دڵ لەتەرەفی چەپەوە کەوتووە. مەعیدە لە

بەردەمی دڵدا خەلق بووە. جگەر لای دڵەوە هەڵواسراوە. حەکیم وتی: سەری ئینسان چەند پارچەیە؟ تەوەددود وتی: سێ پارچەیە تێکەڵ بە پێنج حەواس: باتنی و، حوسنی موشتەرەک و، خەیاڵی موتەسەرریفە و، واهیمە و، حیفزکردن کراوە. حەکیم وتی: لە گەورەیی ئێسقانەکان خەبەرم بدەرێ. تەوەددود وتی: موڕەککەب لە دووسەد و چل ئێسقانە، وە بە سێ بەش بەش کراوە: سەرە، بەدەنە، تەنیشتە. وە سەر لەیازدە ئێسقانە، شەویلگەی خواروو نەبێت بە کەللە و، بە ڕوو. وە کەللە تەرتیب کراوە لە هەشت ئێسقان. چوار ئێسقانی گوێچکەی پێوە نەسب کراوە، وە دەم و چاو بەش کراوە بە شەویلگەی خواروو و سەروو، وە دووهەم یازدە ئێسقانە. شەویلگەی سەروو و خواروو دوو ئێسقانە سی و دوو دانی پێوە نەسب کراوە. بەدەنی بەنی ئادەم سێ بەشە: پشت، سنگ و تەنیشت. سنگ بیست و چوار ئێسقانە، هەر لای دوازدە ئێسقانە. پشت بیست و چوار ئێسقانە. تەنیشت دوو قیسمە. قیسمێکی سەروو دوو شان نووساوە بە قوڕگەوە، وە قیسمێکی عیبارەتە بە قۆڵ و، قیسمێکی عیبارەتە لە ئانیشک و قیسمێکی عیبارەتە لە پەنجە و، هەر پەنجەی عیبارەتە لە چوار ئێسقان و پەنجەکان پێنج پەنجەیەو، هەر پەنجەی سێ ئێسقانە. وەلای خواروو نەووەڵ ڕانە، یەک ئێسقانە. دووەم پووزە سێ ئێسقانە. سێهەم قاچە، ئەویش وەک پەنجەی دەستە کە بەیانمان کرد. حەکیم وتی: بەیانی ڕەگەکان چۆنە؟ تەوەددود وتی: عورووق و بەینە کە نەسلی ڕەگەکان لەو جیابوونەوە. ئەڵێن سێ سەد و شەست ڕەگ لە بەدەنا مەوجوودە. زوبان بۆ قسە، دوو چاو بۆ بینین، دوو کونە لووت بۆ بۆن کردن و نەفەس کێشان. دوو گوێ بۆ دەنگ بیستن. دوو دەست لە جێگەی باڵ بۆ نیش کردن خەلق کراوە. ڕەحم لەدڵا خەلق بووە. پێکەنین لە توحال (توحال: طحال، سپڵ) دروست کراوە. مەعیدە لە جێگەی خەزێنەیە و، قەلب کۆڵەکەی بەدەنە. ئەگەر قەلب خراپ بوو، هەموو بەدەن خراپ ئەبێ. حەکیم وتی: لە نیشان و دەلیلی بەدەن خەبەرم بدەرێ. تەوەددود وتی: ئەگەر حەکیم زانست بێ تەماشای ڕووی هەرکەس بکات نەخۆشییەکەی ئەزانێ. حەکیم نەزمی دەست نەخۆش بگرێ، لەگەرمی و ساردی، وشکی و تەڕیی نەخۆش گەیشت، دەرمانی بۆ ئەدۆزێتەوە. ئەگەر نەخۆش ئازاری ئاشکرای بوو وەک زەردیی چاو، مەعلوومە یەرەقانیەتی. وە نیشانەی نەخۆشیی باتنی شەشە (١) لە ئەفعاله. (٢) لە ئیستیفراغ. (٣) لەئازانەوە. (٤) لە جێگەوە. (٥) لە ئاوساوییەوە. (٦) لەئەعراز. حەکیم وتی: کام خواردن ئەزیەت ئەدات؟ تەوەددود وتی: زیادە خۆری و، بەیانیان زوو نان خواردن و ئێواران پێش بانگ نان خواردن و، زۆر جیماع

کـردن. لازمـه ئینسـان سکی بکات به سێ: بەشـێکی بۆ خـواردن و، بەشـێکی بۆ خواردنەوەو، بەشێکی بۆ هەناسەدان، چونکە ڕیخۆڵە هەژدە بستە. بە هێواش ڕۆیشتن سەلامەتە. فەرمووی خودایە: «ولاتمش في الأرض مرحاً». حەکیم وتی: نیشانەی سەفرا چۆنە؟ تەوەددود وتی: زەردیی کـوڵم، تاڵیی دەم، نەبز خـێـرا لێـدان. سـاحـیب سـەفـرا نەخۆشە، وەک لەرزوتا و، سـەرسـام و، بەرەقـان و قـورووحی ئەمعـا، زیادیی تینوێتی. حەکیم وتی: نیشانەی سەودا چۆنە؟ تەوەددود وتی: وەسوەسە نیشانەی سەودایە. حەکیم وتی: دەرمان خواردن چ وەخت باشە؟ تەوەددود وتی: دلر گەلا بکات، میوە دەنک بکات. وسـەلامـەتی ئەوەیە لە پاش نان خـواردن یەک سـەعـات درەنگ ئاو بخـورێتـەوە. وە هەرکەس ئارەزوو ئەکات تووشی نەخـۆشی نەبێ، هەتا زۆر برسی نەبێ نـان نەخـوات، وە مـیـقـداری برسـیـەتی مـابێ دەست هەڵگرێ. پێـغـەمـبـەر (صلی الله علیـه وسلم) فەرموویەتی: مەعیدە خانووی نەخۆشییە. ئەسڵی نەخۆشی خواردنێکە لەسەر تێر خواردن بخورێت. حەکیم وتی: لە مەسئەلەی حەمام ئەڵێیت چی؟ تەوەددود وتی: بۆ حەمام چوون لەسـەر تێری چاک نییـە. پێـغـەمـبـەر فـەرموویەتی: حـەمـام جێگەی چاکـە. بەدەن پاک ئەکاتەوە و جەهەننەم فکر ئەخاتەوە. وە چوونی حەمامێک چاکە ئاوی شیرین بێ و پاک بێ و بوخاری نەبێ. حەکیم وتی: تەعام کامیان چاکە؟ تەوەددود وتی: ئەو تەعامەی ژنان دروستی ئەکەن. لەهەموو تەعامێ چاکتر ئاو و گۆشتە. پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: زۆر چاکە (ثرید نسب ثرید) یەعنی ئاو و گۆشت بەنیسبەت ژنانەوە وەک عائیشە وایە. حەکیم وتی: خۆرش کامیان چاکە؟ تەوەددود وتی: چاکترینی خۆرش نان و گۆشتە. حەکیم وتی: چاکترینی گۆشت کامەیە؟ تەوەددود وتی: چاکترینی گۆشت گۆشتی شەکە. حەکیم وتی: چاکترینی میوە کامەیە؟ تەوەددود وتی: چاکترینی میوە ئەوەیە تازە پێگەیشتوو بێ. حەکیم وتی: ئاو خواردن چ وەخت باشە؟ تەوەددود وتی: بەسێ وچان ئاو خواردنەوە سـەلامەتەو، بەیەک جـار زەرەری زۆرە، لەپاش حـەمـام هاتنە دەرەوەو جـیـمـاع کردن، ئاو خـواردنەوە زۆر زەرەرەو، لەگەڵ نان خواردن ئاو خـواردنەوە چاک نییـە. حـەکـیم وتی: لە خـواردنی شەراب ئەڵێیت چی؟ تەوەددود وتی: ئەوی لە قورئان نازل بووە بۆ تۆ کافـیـیـە «انما الخمر والمیسر والانصاب والازلام رجس من عمل الشیطان فاجتنبوه». شەراب دایکی هەموو فەساد و خراپەیەکە، باعیـسی قەتڵ و زینا و شەڕ و شۆڕە. ئەوی شەراب خۆرە لە مردن نزیکە و عەقڵی شێرزەیە. ئەوانە شەراب ئەخۆن لەسەرخۆ خاسیەتی ئەوەیە قووەت بە مەعیدە پەیدا ئەکات و غەم دوور ئەخاتەوە، سەخاوەت ئەجووڵێنیت و

بەعزە عیللەتێ ئەپەڕێنێ. دەروون لە پیسی دوور ئەخاتەوە، مانیعی پیری ئەبێ، جوانی دێنێ. ئەگەر خودای تەعالا حەرامی نەکردایە لە هەموو دەرمانێ چاکتر بوو. حەکیم وتی: لە خوین گرتن ئەڵێیت چی؟ تەوەددود وتی: خوێن گرتن بۆ کەسێ چاکە خوێنی پیس بێ وە زیادیی خوینی زەرەری بێ. هەرکەس ئارەزووی خوێن گرتنی بوو، ڕۆژی حەڤدەی مانگ خوێن بگرێ، هەور و باران نەبێ. عەجامات گرتن عەقڵ و فام زیاد ئەکات. هەرکەس خوێن بگرێ لازمە تا یەک ڕۆژ ترشی و سوێری نەخوات. ڕۆژی سێ شەموان وەیا شیددەتی گەرما خوێن گرتن زۆر خراپە. چاکترین ڕۆژ کە خوێن بگیرێ ڕۆژی بەهارە. حەکیم وتی: لە جیماع کردن خەبەرم بدەرێ. تەوەددود سەری بەشەرمەوە داخست، وتی: ئەی خەلیفە لە جوابی عاجز نەبووم، ئەمما شەرم ئەکەم جوابی بدەمەوە. خەلیفە وتی: جواب دانەوەی لازمە. تەوەددود وتی: قانزاجی جیماع زۆرە، چونکە بەدەن پڕ لەسەودایە. جیماع ئاگری عیشق ئەکوژێنێتەوە و مەحەبیەت ڕائەکێشێ، شەوق بە دڵ پەیدا ئەکات، وەحشەت دوور ئەخاتەوە، غەم و خەفەت لائەدا. جیماع کردنی زۆر لە پایز و هاویندا زەرەری زۆرە، وە جیماع کردن لەگەڵ ژنی پیر وەیا نەخۆش لە زەهر کوشندە ترە. جیماع کردن لەگەڵ ژنی گەنج و سەوزە و جوان کە تازە مەمکی کردبێ وە خوسووس لەنەجیب زادەکان بێ، ئەو جۆرانە قووەت بە پیاو زیاد ئەکات. مێردی ژنی جوان پیر بوونی نییە. چاکترینی جیماع شەو پاش نان خواردن، پێش نووستن، بە ڕۆژ پاش قاوەڵتی. حەکیم وتی: مەنی لەکوێ دێتە دەرەوە؟ تەوەددود وتی: پیاو ڕەگێکی هەیە هەموو ڕەگەکان ئاوی لێ وەرئەگرن، ئاو لە سێ سەد و شەست ڕەگ کۆ ئەکاتەوە ئەیخاتە بەیزەی چەپەوە، ئەو وەختە ئەبێ بە خوێنێکی سوور. لەپاشا لەبەر گەرمیی میزاج ئەبێتە ئاوێکی خەست و سپی، بۆنی وەک بۆنی گوێکەی خورمایە. حەکیم وتی: خەبەرم بدەرێ کام باڵدارە مەنی و حەیزی هەیە؟ تەوەددود وتی: شەمشەمە کوێرەیە. تەوەددود وتی: ئەی خەلیفە، حەکیم لەسوئال ماندوو بوو، وەمن یەک سوئال ئەکەم جوابی بۆ نادرێتەوە. خەلیفە وتی: ئەتوانێ، بە ڕووتی ئەچێتە دەرەوە. تەوەددود وتی: ئەوە چییە شتێکە وەک زەوی گرد و مودەووەرە هاتۆتەوە، زۆر وەخت لەبەر چاو گومە، بێ قەدر و بێ ئەهمیەتە، دائیما حەپسە، ڕاکردنی نییە، زەنجیر کراوە، دەردی نییە، دائیم بریندارە بە تیغی شیر، شەڕی نەکردووە، حامیلەیە ئەولادی لەسک دا نییە، چەماوەتەوە، پاڵی بەهیچەوە نەداوە، بێ ئالەتی پیاوەتی جیماع ئەکات، بێ قووەت زۆران ئەگرێ، بەشەو لە جووتی خۆی جیا ئەبێتەوە، بە ڕۆژ باوەشی پیا ئەکات؟ حەکیم ڕەنگی زەرد بوو، تا سەعاتێ قسەی بۆ

نەکرا. تەوەددود وتی: لیباسەکانت داکەنە، جوابی وەرگرە. حەکیم وتی: ئەی خەلیفە تۆ بە شاهید بە تەوەددود لە من زۆرزان ترە. حەکیم رووت بۆوە، بە خەجالەتی ڕۆیشتە دەرەوە. خەلیفە وتی: مەعنای مەتەڵەکەت چییە؟ تەوەددود وتی: ئەوە کراسە.

ئەنجا پێنجەمم کەسیان ڕۆیشتە پێشەوە. تەوەددود وتی: هەرچی ئارەزوو ئەکەیت سوئالی بکە. مونەججیم وتی: لە تولوعووع و غورووب خەبەرم بدەری. تەوەددود وتی: ڕۆژ لەسەرچاوەیەک دێتە دەرەوەو ئەچێتە سەرچاوەیەکەوە. ئەو جێگەی لێی دێتە دەرەوە ناوی مەشریقە. ئەو جێگەی پیا ئەچێتە خوارەوە ناوی مەغریبە. هەردوو سەد و هەشتا جوزئە. خودا فەرموویەتی: «فلا اقسم برب المشارق والمغارب». مونەججیم وتی: شەو چۆن دێت، ڕۆژ چۆن ئەبێتەوە؟ تەوەددود وتی: فەرموودەی خودایە: «يولج الليل في النهار، ويولج النهار في الليل». مونەججیم وتی: لەمەنازیلی مانگ خەبەرم بدەری. تەوەددود وتی: بیست و هەشت مەنزڵە (شرطين، بطين، ثريا، ديران، هقعة، هنعة، ذراع، نثرة، طرفة، جهتة، زبرة، صرفة، عوا، سمك، عفر، زبانا، اكليل، قلب، شوكة، نعايم، بلدة، سعد، ملح، سعد ذابح، سعد السعود، ذو السعد الاجنبية، فرع موحز، رشاد)، وەنیشان زۆر هەیە غەیرەز خودا نەبێ بۆ کەس مەعلووم نەکراوە، وە تەقسیمی مەنزڵەکان دوازدەیە، لەهەر برجێ دوو مەنزڵ و سولس ئەمێنێت، هەروەک (شرطين) و(بطين) و(ثلث) و(ثريا) و(حمل). دوو سولس (ثريا)، ديران دوو سولس (هقعه) و(مقام)، (ثوره). بەو جۆرەیە هەموو مەنزڵەکان. مونەججیم وتی: لە ئەستێرەی سەییار وە لە میزاجیان خەبەرم بدەری، وە لە برجی سەعد و نەحس و خانەی شەرەف و هوبووت خەبەرم بدەری. تەوەددود وتی: ئەستێرەی سەییار حەوتە: قەمەرە، عەتاریدە، زوهرەیە، شەمسە، میرریخە، موشتەریبە، زوحەلە. ئەمما شەمس گەرم، وشک، نزیک بەنەحس، لەنەزەر سەعدایە. لەهەر برجێ سیی ڕۆژ ئەوەستێ. ئەمما قەمەر سەعد و ساردە، لەهەر برجێ بیست و پێنج ڕۆژ ئەوەستێ، وە میرریخ نەحسە، لەهەر برجێ دە مانگ ئەوەستێ، وە موشتەری سەعدە، لەهەر برجێ یەک ساڵ ئەوەستێ. زوحەل سەرد و وشک و نەحسە، لە هەر برجێ سێ مانگ ئەوەستێ. ڕۆژ ئەسەدە و شەرەفی ئەو لەحەمەل و هوبووتی ئەو لە دەلوایە، وەخانەی مانگ سەرەتان و شەرەفی ئەو لەسەور و هوبووتی ئەو لەعەقرەب، دوو باڵی ئەو لە جەدی، وە زوحەل خانەی جەدی و دەلو شەرەفی ئەو، وە میزان و هوبووتی ئەو لە حەمەل و باڵی ئەو لەسەرەتان و هوبووتی ئەو لەجەدی و باڵی ئەو لە جەوزا و ئەسەدە و، زوهرە خانەی سەور و شەرەفی ئەو لە حووت و هوبووتی ئەو لە میزان و باڵی لە

عەقرەب و زوحەلدایە و خانەی عەتارید و جەوزا و سونبولە و، شەرەفی ئەو و هوبووتی ئەو لە حووت و باڵی لە سەورایە، وەخانەی میرریخ حەمەل و عەقرەب و، شەرەفی ئەو لە جەدی و هوبووتی ئەو لەسەرەتان و باڵی لە میزانایە. وەختێ مونەجەجیم ناوی ئەستێرەکانی بۆ بەیان کرا زانیی تەوەددود هەموو جۆرە جوابێکی بۆ ئەدرێتەوە، ئارەزووی کرد لە ڕێگەی حیلەوە سوئاڵ لە تەوەددود بکات. مونەجەجیم وتی: ئەی تەوەددود، ئەم مانگە باران ئەبارێت. تەوەددود سەری داخست، بێ دەنگ بوو. خەلیفە وتی: وا دیارە تەوەددود جوابی بۆ نادرێتەوە. تەوەددو وتی: ئەی خەلیفە لە جوابی عاجز نەبووم. ئەمما بە ڕوخسەتی خەلیفە شمشێرێ داوا ئەکەم لە گەردنی ئەم فەرمەسۆنە بدەم. خەلیفە و حازران پێکەنین. تەوەددود وتی: ئەی مونەجەجیم پێنج ئەشیا هەیە لە خودا زیاتر بۆ کەس مەعلووم نەکراوە. ئەنجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: «ان الله عنده علم الساعة، وينزل الغيث، ويعلم ما في الارحام، وما تدري نفس ماذا تكسب غداً، وما تدري نفس بأي أرض تموت. ان الله عليم خبير». مونەجەجیم وتی: ئافەرین ئەی تەوەددود، لە ئیمتیحان زیاتر مەقسەدێکی کەم نەبوو. تەوەددود وتی: هەر ڕۆژێ ئەستێرەیەک هەیە، ئەو ئەستێرەیە ساحێبی ئەو ڕۆژەیە، ئەگەر ئەو ساڵە ئەووەڵ ڕۆژی شەنبە بوو، دەلالەت ئەکات لە قاتی، بەنی ئادەم زۆر ئەمرن، ئەهالیی میسر و شام لە زوڵمی پادشاه هەراسان ئەبن، هەردوو زۆر ئەبێ، بەرەکەتی زەراعەت کەم ئەبێت. ساحێبی ئەو ڕۆژە زوحەلی ناوە. سەری ساڵ یەکشەنبە بوو دەلالەت ئەکات لە زوڵمی پادشاه و حاکمان. پیاوان زۆر ئەمرێ و مەشەققەت زۆر ئەکێشن. کەم بارانی ئەبێت. بەری دانەوێڵە ئەبێ. نیسک و تەڕی ئەفەوتێت. شەڕ و شۆڕ لەناو پادشاهانا پەیدا کەم ئەبێت. ناوی ساحێبی ئەو ڕۆژە ئافتابە. سەری ساڵ دووشەنبە بوو دەلالەت ئەکات لە چاکەی بەختی حاکمان، لە زۆریی بەری میوە و دار زۆر بوون. نیسک و کەتان کەم ئەبێ، تاعوون پەیدا ئەبێ. چوارپێ ئەمرێ. تەڕی و هەنگوین و پیو هەرزان ئەبێ. ساحێبی ئەو ڕۆژە ناوی قەمەرە. سەری ساڵ سێ شەنبە بوو دەلالەت ئەکا لە مردنی گەورە زادان و خوێن ڕشتن، قاتی و گرانی و کەم بارانی، وە ماسی کەم ئەبێ. نیسک و هەنگوین و جۆ هەرزان ئەبێ. موحاربە لەناو حوکوومەتەکانا پەیدا ئەبێ. گوێدرێژ زۆر ئەمرێ. ساحێبی ئەو ڕۆژە ناوی میرریخە. سەری ساڵ چوارشەممە بوو دەلالەت ئەکات پیاوان بەزەحمەت نیدارە ئەکەن. لەناو میللەتدا دوشمنایەتی پەیدا ئەبێ، میقداری باران کەم ئەبارێ. میقداری زەراعەت ئەفەوتێ. منداڵ و چوارپێ زۆر ئەبێ. مردن لەناو بەحردا پەیدا ئەبێ. گەنم گران ئەبێ و

سائیرەی دەغڵ هەرزان ئەبێ. ڕەعد و بەرق زۆر ئەبێ. هەنگوین و خورما و کەتان و پەنبۆ زۆر ئەبێ. ساحێبی ئەو ڕۆژە ناوی عەتاریدە. سەری ساڵ پێنج شەنبەبێ دەلالەت ئەکات وەزیران عادل ئەبن، قازی و مەلایان و ئەهلی دین ئیدارەیان چاک ئەبێ. میوە، دەنکی بەردار، دار و گیا زۆر ئەبێ. هەنگوین و تەڕی و پەنبۆ و کتان هەرزان ئەبێ. ساحێبی ئەو ڕۆژە ناوی موشتەرییە. سەری ساڵ جومعە بوو دەلالەت ئەکات لە درۆ و بوهتان. لە پایزا چاک ئەبێ. هەرزانی ئەکەوێتە شارانەوە، فەساد لەبەحردا ئاشکرا ئەبێ و لەبەڕ دا زۆر ئەبێ. تۆوی کەتان و گەنم و هەنگوین گران ئەبێت. تەڕی و کاڵەک ئەفەوتێت. ساحێبی ئەو ڕۆژە ناوی زوهرەیە. هەموو ئەم مەسئەلەیە خودا ئەیزانێ، ڕاجیعە بە قودرەتی خودا .
ئەی مونەججیم یەک سوئال لە تۆ ئەکەم، جواب نەدەیتەوە حازر بە بە ڕووتی ئەچیتە دەرەوە. مونەججیم وتی: سوئالەکەت چییە؟ تەوەددود وتی: جێگەی زوحەل لە کوێیە؟ مونەججیم وتی: لە ئاسمانی حەوتەم. تەوەددود وتی: جێگەی موشتەری لە کوێیە؟ مونەججیم وتی: لە ئاسمانی شەشەم. تەوەددود وتی: جێگەی میرڕیخ لەکوێیە؟ مونەججیم وتی: لەئاسمانی پێنجەم. تەوەددود وتی: جگەی ڕۆژ لەکوێیە؟ مونەججیم وتی: لە ئاسمانی چوارەم. تەوەددود وتی: جێگەی عەتارید لەکوێیە؟ مونەججیم وتی: لە ئاسمانی دووەم. تەوەددود وتی: جێگەی مانگ لە کوییە؟ مونەججیم وتی: لە ئاسمانی یەکەم. تەوەددود وتی: ئەستێرەکان لەسەر چەند قیسمە؟ مونەججیم جوابی بۆ نەدرایەوە. خەلیفە ئەمری کرد بە ڕووت بوونەوەی مونەججیم. تەوەددود وتی: ئەی خەلیفە، ئەستێرەکان لەسەر سێ قیسمە، قیسمێکیان بە ئاسمانی یەکەمەوە دونیا ڕۆشن ئەکاتەوە، قیسمێکیان بۆ بەحر ڕوون کردنەوە بە هەواوە وەستاوەو قیسمێکیان بۆ شەیاتین دوورخستنەوە وەک دەلیلی ئایەتە «ولقد زينا السماء الدنيا بمصابيح وجعلناها رجوماً للشياطين». مونەججیم وتی: یەک دوو سوئال ماوە ئەگەر جواب بدەیتەوە بە زانستیی تۆ شەهادەت ئەدەم و ڕووت بوونەوە بەعار نازانم، لیباسەکانم تەسلیم ئەکەم. تەوەددود وتی: سوئالەکانت چییە؟ مونەججیم وتی: ئەوە چییە چوار ئەشیا بەیەکەوەن و بە یەک دوشمن؟ تەوەددود وتی: ئەو چوار ئەشیایە گەرما و تەڕی و ڕوتووبەت و وشکییە. خودا لە گەرمی ئاگری خەلق کردووە، تەبیعەتی ئەو گەرم و وشکە. لەتەڕی ئاوی خەلق کردووە، تەبیعەتی ئەو سارد و تەڕە. لەڕوتووبەت هەوای خەلق کردووە، تەبیعەتی ئەو گەرم و تەڕە. لە وشکی خاکی خەلق کردووە، تەبیعەتی ئەو سارد و وشکە. خودای تەعالا دوازدە برجی خەلق کردووە: حەمەل، ثەور، جەوزا، سەرەتان، ئەسەد،

سونبوله، میزان، عەقرەب، قەوس، جەدی، دەلو، حووت. ئەو برجانە لەسەر چوار تەبیعەتن، سێ برج لەوان نارییە، سێ برج خاکییە، سێ برج بادییە، سێ برج ئاوییە. حەمەل، قەوس، ئەسەد ئاگرییە. ثەور، سونبولە، جەدی خاکییە. جەوزا، میزان، دەلو بادییە. سەرەتان، عەقرەب، حووت ئاوییە. مونەججیم وتی: دەهر مەعنای چییە؟ تەوەددود وتی: دەهر ناوی ئەوقاتی شەو و ڕۆژە. موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: جنێو بە دەهر مەدەن، بە ڕاستی دەهر ناوی خودایە، وە جنێو بە ئەوقات نەدەن «فان الساعة آتیة لاریب فیها»، وە جنێو بە زەوی نەدەن «منها خلقناکم وفیها نعیدکم ومنها نخرجکم تارة اخری» مونەججیم وتی: لە پێنج ڕۆح لەبەر خەبەرم بدەرێ خواردن و خواردنەوەیان بوو، لە سک نەزاون. تەوەددود وتی: ئادەم ، شەمعوون، حوشتری ساڵح پێغەمبەر، فیدیەی ئیسماعیل، پەڕندەیێ لە غارا ئەبوویەکر چاوی پێ کەوت. مونەججیم وتی: لەو پێنجە ئەچنە بەهەشتەوە نە لە ئادەمن، نەجینن، نە مەلائیکەن خەبەرم بدەرێ. تەوەددود وتی: گورگی یەعقووب، سەگی ئەسحابی کەهف، کەری عوزەیر، حوشتری ساڵح پێغەمبەر، دولدولی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم). مونەججیم وتی: ئەوە کێ بوو نوێژی ئەکرد نە لە زەوی نە لە ئاسمان؟ تەوەددود وتی: سولەیمان پێغەمبەر بوو لەسەر تەخت نوێژی ئەکرد، تەختەکەی بەسەر پشتی باوە بوو. مونەججیم وتی: خەبەرم بدەرێ لەو کەسە نوێژی سوبحی کرد تەماشای کارەکەری کرد، بەو حەرام بوو. نیوەڕۆ بەو حەڵاڵ بوو. وەختی عەسر بەو حەرام بوو. وەختی مەغریب بەو حەڵاڵ بوو. وەختی عیشا بەو حەرام بوو. بۆ سوبحەینێ بەو حەڵاڵ بوو تەوەددود وتی: ئەوە پیاوێک نوێژی سوبحی کرد، چاوی بە جاریەیەک کەوت بەو حەرام بوو. نیوەڕۆ کڕیی، بەو حەڵاڵ بوو. عەسر ئازادی کرد، بەو حەرام بوو. وەختی مەغریب مارەی کردەوە، بەو حەڵاڵ بوو. وەختی عیشا تەڵاقی دا، بەو حەرام بوو. بۆ سبحەینێ مارەی کرد، بەو حەڵاڵ بوو. مونەججیم وتی: ئەوە کێ بوو شەو و ڕۆژ لە ساحێبی جیا نەبوەوە؟ تەوەددود وتی: یونس لەسکی ماسییا شەو و ڕۆژ جیا نەبووە. مونەججیم وتی: خەبەرم بدەرێ لە زەوییەک یەک جار خۆری لێ داوە، وە لە داوێنی ئەووەڵ جار بە زەوییا ڕاکێشراوە، وەلەشتێ نەفسی هەیە ڕۆحی نییە. تەوەددود وتی: ئەو زەوییە یەک جار خۆری لێ دا ئەو بەحرە بوو بە عەسای مووسا شەق بوو، لە دوای مووسا هاتەوە یەک. ئەو داوێنە ئەووەڵ جار بە زەوییا ڕاکیشرا، داوێنی هاجەرە خاتوون بوو لە شەرمی سارە خاتوون بە زەوییا ڕایکێشا. ئەو شتەی نەفسی هەیە ڕۆحی نییە «والصبح اذا تنفس». مونەججیم قسەی تەواو بوو.

لیباسەکانی داکەند، بەشەرمەوە ڕۆیشتە دەرەوە.

ئەنجا شەشەهەم کەسیان ڕۆیشتە پێشەوە، ناوی (نیزامی)بوو، ڕووبەڕووی تەوەددود دانیشت، وتی: من بەوانە مەزانە. تەوەددود وتی: بۆم ئاشکرا بوو لەوان کەمتری، چونکە خۆت هەڵنەکێشی. هەتا زووە بنێرە دەستێ لیباسی کەت بۆ بێنن. نیزامی وتی: کارێکت بەسەر دێنم بە عیبرەت لە دونیا بگێڕرێتەوە. تەوەددود وتی: ئومێد دەکەم دەرپێکەت لە قاچ دامالم، دەستێکت بە پێش و دەستێکت بە پاش بگریت، بچیتە دەرەوە. نیزامی وتی: خەبەرم بدەرێ لەو پێنجە لەپێش هەموو شتێکدا خەلق کراوە. تەوەددود وتی: (١) خاک. (٢) ئاو. (٣) با. (٤) ڕووناکی. (٥) تاریکی. نیزامی وتی: چییە خودا بە دەستی قودرەتی خۆی خەلقی کرد؟ تەوەددود وتی: عەرش، داری تووبا و بەهەشت. وسائیرەی ئەشیا و مەخلووقات خودا فەرمووی: ببە، بوون. نیزامی وتی: خەبەرم بدەرێ ئەوە چی بوو ئەووەڵ دار بوو، ئاخری ئەبوو بە ڕۆح لەبەر؟ تەوەددود وتی: عەسای مووسا بوو هەر وەخت ئارەزووی ئەکرد بە ئەمری خودا ئەبوو بە ئەژدەها و پاسەوان، وەیا مووسا عەساکەی بە زەویدا ئەچەقان، ئەڕواو میوەی ئەگرت مووسا ئەیخوارد و، لە ژێر سێبەری ئیسراحەتی ئەکرد. وە ئەگەر مووسا لە ڕۆیشتن ماندوو ئەبوو، سواری عەساکە ئەبوو وەک وڵاغ ئەڕۆیشت. وە ئەگەر مووسا ئەخەوت عەساکە وەک شوان ئاگاداری حەیوانەکان ئەبوو. نیزامی وتی: خەبەرم بدەرێ لەو ژنە لەپیاو خەلق بوو، وە لەو پیاوە لە ژن خەلق بوو. تەوەددود وتی: حەوا لە ئادەم و عیسا لە مریەم خەلق بوون. نیزامی وتی: لە بەستراو و لە کراوە خەبەرم بدەرێ. تەوەددود وتی: بەستراو فەرزە، کراوە سوننەتە. نیزامی وتی: مووسا لە حوزووری خودا چەند کەلیمە قسەی کرد؟ تەوەددود وتی: لە پێغەمبەرەوە ڕیوایەت کراوە خودای تەعالا لەگەڵ مووسا هەزار و پێنج سەد کەلیمەی تەکەللوم کرد. نیزامی وتی: خەبەرم بدەرێ ئەو چواردەیە چییە قسەیان لەگەڵ خودا کرد؟ تەوەددود وتی: حەوت ئاسمان، حەوت تەبەقەی زەوی «اتینا طائعین». نیزامی وتی: ئادەم چۆن خەلق بووە؟ تەوەددود وتی: ئادەم خەلق بوو لەگڵ و، گڵ لە کەف و، کەف لەبەحر و، بەحر لەتاریکی و، تاریکی لە نوور و، نوور لە ماهی و، ماهی لەبەردی سەخت و، بەرد لە یاقووت و، یاقووت لە ئاو و، ئاو لە قودرەتی ئەوەوە «انما أمره اذا أراد شیئاً أن یقول له کن فیکون». نیزامی وتی: خەبەرم بدەرێ سیرات چۆنە؟ تەوەددود وتی: سیرات سێ هەزار ساڵ ڕێگەیە، هەزار سەرو ژوور، هەزار ڕاست، هەزار سەروخوار. بۆ گوناهبار لە شمشێر تیژتر، لە موو باریکترە. نیزامی وتی: موحەممەد (صلی الله علیه

وسلم) چەند شەفاعەت ئەکا؟ تەوەددود وتی: سێ شەفاعەت ئەکات. نیزامی وتی: ئەو کەسە ئەووەڵ جار ئیمانی بە موحەمەد هێنا کێ بوو؟ تەوەددود وتی: ئەبووبەکری سیددیق بوو. نیزامی وتی: عەلی پێش ئەبووبەکر ئیمانی هێنا یان پاش ئەبووبەکر؟ تەوەددود وتی: عەلی لە منالییەوە خودا هیدایەتی دا، قەتعییەن بتی نەپەرستووە. نیزامی وتی: عەلی و عەبباس کامیان گەورەترن؟ تەوەددود ڕەنگێکی هێناو برد سوور هەڵگەڕا، وتی: تۆ قسە لە دوو گەورە بۆچ ئەکەیت هەردوکیان وەک یەک خۆشەویست و حورمەتدارن؟ خەلیفە ڕاست بووەوە، وتی: ئافەرین تەوەددود بۆ زیرەکیت؟ نیزامی وتی: لە هەنگوین شیرینتر لە شمشێر بڕندەتر، لە زەهر کوشندەتر چییە، وە لەزەتی وەخت و، خۆشیی سێ ڕۆژە و، خۆشترین وەخت و، خۆشییەک حەفتە و، حەقێ خودا بە تاڵی ئەکات و، زیندانی دڵ و، خۆشیی دڵ و، مەکری نەفس و، مردنی زیندوویەتی و، دەردی بێ دەرمان و، عەیبێ لابردنی نەبێ، چییە؟ وە ڕۆح لەبەرێ لە ئاوەدانییا نییە، لە وێرانە جێگە ئەکات، دوشمنی بەنی ئادەمە، لە حەوت ڕۆح لەبەر خەلق بووە، کامەیە؟ تەوەددود وتی: کراسەکەت داماڵە، مەعنای بەیان بکەم. خەلیفە وتی: تۆ بەیانی بکە داکەندنی کراسەکەی لەسەر من. تەوەددود وتی: لەهەنگوین شیرینتر ئەولادە. لە شمشێر بڕندەتر زوبانە. لەزەهر کوشندەتر نەفسی نەفەس پیسانە، وە لەزەتی وەخت جیماع کردنی ژنانە. وە خۆشیی سێ ڕۆژە داڕوو گرتنی ژنانە، وە خۆشترین وەخت ڕۆژی بەیع و شیرایە، وە خۆشیی یەک حەفتە زاوا و بووکییەتییە، وە حەقێ خودا بە تاڵی ئەکات مردنە، وە زیندانی دڵ کوڕی ناساڵحە، وە خۆشیی دڵ ژنێکە لە ئیتاعەی مێردایە. مەکری نەفس مەملوکیی نافرمانە. مردنی زیندوویەتی فەقیرییە. دەردی بێ دەرمان سەودای عیشقە. وە عەیبێ لابردنی نییە کچی بەد ئەتوارە. وە ڕۆح لەبەرێ لە ئاوەدانی نییە لە چۆڵ ئەنیشێت دوشمنی بەنی ئادەمە. لە حەوت ڕۆح لەبەر ئیجاد بووە کوللەیە، سەری وەک سەری ئەسپ، ملی وەک ملی گا، باڵی وەک باڵی کەرگەس، پێی وەک پێی حوشتر، کلکی وەک کلکی مار، سکی وەک سکی دووپشک وایە. شاخی وەک شاخی ئاسک ئەنوێنێ. خەلیفە جوابەکانی زۆر پێ خۆش بوو، ئەمری کرد بە داکەندنی کراسەکەی نیزامی نیزامی وتی: ئەی تەوەددود دەرپێکەم دامەکەنە، کیتابێ بە شیعر لە وەسفت دروست ئەکەم. تەوەددود وتی: لازمە بە ڕووتی بچیتە دەرەوە ئەگەرچی کیتابێ لەزەم دروست بکەیت، منیش حاشیەی بۆ دروست ئەکەم، بە تەخمیس لە عەیب و خۆ هەڵکێشانت. خەلیفە ناردی کراسێکیان بۆ ئیبراهیمی نیزامی هێناو کراسەکەی بۆ

ئەوەددود داکەند، وتی: مویارەکت نەبێ.

حەوتەم کەسیان وەستای شەترەنجێ بوو چووە پێشەوە، دەستیان کرد بە یاری کردن. هەر موهرەیێ وەستای شەترەنج فڕێی نەدا ئەوەددود بەتاڵی نەکرد، هەتا شەترەنجی مات بوو. وتی: بۆیە بە هێواش یاری ئەکەم تەماع ئەنێمە بەرت. ڕاوەستە، ئێستا یاریت پیشان ئەدەم. دووبارە دەستیان کرد بە یاری هەتا وەستا بێهۆش بوو. ئەوەددود پێکەنی، وتی: ئەی وەستا، من فەرزین و ڕوخ و مەیمەنە و ئەسپ یەک جار هەڵئەگرم، وە ئەگەر تۆ لە منت بردەوە کراسەکەم دائەکەنم، وە ئەگەر من بردمەوە کراسەکەت داکەنە. وەستا ڕازی بوو. ئەوەددود دەستی کرد بە موهرە هاوێشتن. فەرزینی کرد. بەیدەقی ڕەخی بە بەیدەقی ئەسپ گەیاند. وەلە پێنجەم و شەشەم بوو بە شاە. لە پاشا دەستیان کرد بە نەردێن. بەینی زۆر نەبوو وەستا دۆڕاندی. وەستا هەستایە سەرپێی، وتی: ئەی خەلیفە، بەنیعمەتی تۆ قەسەم جۆری ئەم بەلایە نییە، وە هەتا بە ڕۆح زیندوو بم لە بەغدادا یاری ناکەم.

ئەنجا خەلیفە ڕووی کردە ئەوەددود وتی: ئالەتی تەرەب ماوە. ئەوەددود وتی: ئەمر بفەرموو بە حازر کردنی. وەختێ عوودی گرت بە دەستەوەو، بە دەنگێکی خۆش دەستی کرد بە شیعر خوێندنەوەو عوود لێدان. ئاو لە ڕۆیشتن، تەیر لە فڕین ڕائەوەستا. بەدەنگێکی نەرم و حەزینەوە دەستی کرد بە شیعر خوێندنەوە هەتا حازران بێهۆش بوون. لەپاشا ئەوەددود هەستا دەستی خەلیفەی ماچ کرد و خەلیفە ئەمری کرد دە هەزار ئاڵتوونی سوور بدەن بە ئەبولحەسەن. تەسلیمیان کرد. وە ڕووی کردە ئەوەددود وتی: هەرچی ئارەزوو ئەکەیت بەیانی بکە پێت عەتا بکەم. ئەوەددود وتی: «وما الاحسان الا بالتمام». وە ئەگەر مەرحەمەت ئەفەرموویت بمبەخشەرەوە بە ئەبولحەسەن. خەلیفە قوبووڵی کرد و میقداری ئاڵتوونی نایابی لەگەڵ میقداری ئەلبیسە و لەوازیماتی ماڵی پێ بەخشی و دایەوە بە ئەبولحەسەن. شەفەقەت و مەرحەمەتی ئیبنو عەبباسی ئەوە بوو دە هەزار دینار و خەلاتێکی زۆر و جاریەکی بە ئارەزوو بەخشییەوە بە ئەبولحەسەن.

«ئەووەڵی نووسینەوە دەست پێ کرا ١٠ی تەشرینی ئەووەڵی سەنە ١٩٣٤»

«تەواو بوونی گەلاوێژ ٢٠ی تەشرینی ثانی سەنە ١٩٣٤»

## سەد ئامۆژگاریی لوقمانی حەکیم

١- ئەی رۆحی باوکت، خودای تەنها بناسە.
٢- هەر وەعز و ئامۆژگارییەک ئەلێیت، ئەووەڵ خۆت بیکە.
٣- قسە بە ئەندازەی خۆت وەرگرە.
٤- حورمەتی پیاوان بزانە.
٥- حورمەتی هەموو کەس بناسە.
٦- ئاگات لە سری خۆت بێ.
٧- رەفیقت لە وەختی سەغلەتی تاقی کەرەوە.
٨- دۆست بە قانزاج و زەرەر تەجرەبە بکە.
٩- لە کەم عەقڵ و ئەزلان دوور بە.
١٠- رەفیقی زیرەک و عاقڵ بگرە.
١١- لە کاری خێر عەجەلە بکە.
١٢- ئیعتیماد بە ژنان مەکە.
١٣- تەدبیر بە پیاوی سالح و عەقڵدار بکە.
١٤- قسە بە دەلیل بکە.
١٥- گەنجی بە تالان بزانە.
١٦- لە وەختی گەنجی کاری هەردوو دنیا بکە.
١٧- رەفیقی دۆستت بە خۆشەویست بزانە.
١٨- لەگەڵ دۆست و دوشمن رووخۆش بە.
١٩- خزمەتی دایک و باوکت بە تالان بزانە.
٢٠- وەستات لە باوکت بە چاکتر بزانە.
٢١- خەرجی بە ئەندازەی قانزاج بکە.
٢٢- لە هەموو کارێکا ئەوسەت بە.
٢٣- پیاوەتی و چاکە بە رەوشت بگرە.
٢٤- خزمەتی میوان بە واجب بزانە.
٢٥- ئەچیتە هەرماڵێ ئاگات لە چاو و زوبانت بێ.
٢٦- جل و بەدەن پاک بێ.
٢٧- لەگەڵ جەماعەت رەفیق بە.
٢٨- ئەولادت فێری عیلم و ئەدەب بکە.
٢٩- ئەگەر مومکینت بوو فێری تیر ئەندازی و سواریی بکە.
٣٠- کەوش و گۆرەوی ئەووەڵ پێی راست لەپێ کە، ئاخری پێی چەپ داکەنە.

٣١- لەگەڵ هەموو کەس کار بە قەدەر ئەو بکە.
٣٢- بە شەو قسە ئەکەیت بە هێواشی و نەرم بیکە. بە ڕۆژ قسە ئەکەیت بە هەموو لایەکا بڕوانە.
٣٣- کەم خواردن، کەم نووستن، کەم وتن بە عادەت بگرە.
٣٤- هەرچی بە خۆت لایق نەبێ بە خەڵقی لایق مەبینە.
٣٥- کار بە زانستی و بە تەدبیر بکە.
٣٦- لەگەڵ ژن و منداڵ قسەی سرِی ئاشکرا مەکە.
٣٧- چاوت لە ماڵی کەس نەبێ.
٣٨- چاوت لە وەفای نا ئەسڵان نەبێ.
٣٩- بێ خۆف مەچۆ بۆ کار.
٤٠- ناکردوو بە کردوو مەژمێرە.
٤١- کاری ئیمڕۆ مەخەرە سبحەینێ.
٤٢- لەگەڵ لە خۆت گەورەتر دەمبازی مەکە.
٤٣- لەگەڵ گەورە قسە درێژ مەکەرەوە.
٤٤- خەڵقی بەسەرخۆتا زۆردار مەکە.
٤٥- ئەوی موحتاجتە نائومێدی مەکە.
٤٦- فکری شەڕی ڕابوردوو مەکەرەوە.
٤٧- خێری خەڵقی تێکەڵ بە خێری خۆت مەکە.
٤٨- ماڵت بە دۆست و دوشمن مەنوێنە.
٤٩- خزمایەتی لە خزم مەبڕە.
٥٠- کەسێ کە چاک بوو غەیبەتی مەکە.
٥١- بە خۆت مەنازە.
٥٢- جەماعەتێ کە وەستا تۆش موافەقەتیان بکە.
٥٣- ئەمووست بە ئەمووستا مەماڵە.
٥٤- لەبەر چاوی خەڵق دان مەنازنە.
٥٥- چڵم و تف بە قایم و دەنگی بەرز فڕێ مەدە.
٥٦- لە باوێشکا دەست بە دەمەوە بگرە.
٥٧- لەبەر چاوی خەڵق خۆ هەڵکێشان و فیتنەیی مەکە.
٥٨- ئەمووست بە لوتتا مەکە.
٥٩- قسەی ڕاست و درۆ تێکەڵ مەکە.
٦٠- لەبەر چاوی خەڵق کەس تەریق مەکەرەوە.
٦١- ئیشارەت بە چاو و ئەبرۆ مەدە.

٦٢- قسەی بێژراو تەکرار مەکەرەوە.
٦٣- لەقسەیەک پێکەنین بێنێ خۆت بپارێزە.
٦٤- مەدح و سەنای خۆت و خزمەت لای کەس مەڵێ.
٦٥- وەک ژنان خۆت ئارایشت مەکە.
٦٦- هەرگیز بە ئومێدی ئەولاد مەبە.
٦٧- ئاگاهداری زوبانت بە.
٦٨- لە وەختی قسەکردنا دەست مەجوڵێنە.
٦٩- حورمەتی هەموو کەس بزانە.
٧٠- لەگەڵی ئەتوار خراپان رەفیق مەبە.
٧١- ناوی مردوو بە خراپ مەبە.
٧٢- هەتا ئەتوانی شەڕ و هەرا دامەگیرسێنە.
٧٣- قووەتی خۆت مەنوێنە.
٧٤- کەسێ تەجرەبە کرابێ بە چاک، تۆ بە خرابی مەزانە.
٧٥- نانی خۆت لەسەر سفرەی کەس مەخۆ.
٧٦- لەکار کردنا پەلە مەکە.
٧٧- بۆ دونیا خۆت عەزیەت مەدە.
٧٨- هەرکەس ناسیاوتە ئەوە بناسە.
٧٩- لە وەختی غەزەبدا قسەی فامیدە بکە.
٨٠- بە فەقیانە لووت مەسڕە.
٨١- لەوەختی هەڵهاتنی رۆژ مەنوو.
٨٢- لە رێگە پێش لە خۆ گەورەتر مەکەوە.
٨٣- مەچۆرە ناو قسەی خەڵکەوە.
٨٤- سەر مەخەرە سەر ئەژنۆ.
٨٥- تەماشای راست و چەپ مەکە، بۆ بەردەمی خۆت بڕوانە.
٨٦- ئەگەر ئەتوانی بە رووتی سواری ئولاغ مەبە.
٨٧- لەبەردەمی میوان لە کەس توورە مەبە.
٨٨- ئیش بە میوان مەسپێرە.
٨٩- لەگەڵ شێت و سەرخۆش قسە مەکە.
٩٠- لەگەڵ عاقڵان و پادشاهان لەسەری کووچە دامەنیشە.
٩١- بۆ قانزاج و زەرەر نابرووی خۆت مەبە.
٩٢- لووت بەرز و ساحێب کیبر مەبە.

٩٣- رقی خەڵکی مەخەرە دڵەوە.
٩٤- لە شەڕ و فیتنە پارێزگاری بکە.
٩٥- بێ کێرد و نەموستیلە، بێ پارە مەبە.
٩٦- ئاگات لە خۆت بێ سووک نەبی.
٩٧- خۆت قورس راگرە.
٩٨- بە راستی روو بکەرە خوا.
٩٩- بە ئارەزووی نەفس مەڕۆ.
١٠٠- لەگەڵ خەڵق بە ئینساف بە. خزمەتی گەوران بکە. شەفەقەت لەگەڵ وردان بکە. فەقیران بێ بەش مەکە. لەگەڵ دۆست و رەفیقان بە ئامۆژگاری بە و، حوکم بەسەر دوشمنانا بکە. لەگەڵ جاهیلان مەدوێ. لەگەڵ عالمان لە رێگەی دیانەت خەریک بە. تەمەع مەکەرە ماڵی کەس. ماڵ هاتە بەر دەستت، دەستی پێوە مەنێ. پێژراوە لێیان پرسی: بلووغ بوون مەعنای چییە؟ فەرمووی: مەعنای ئەوەیە شەهوەت لە پیاو بێتە دەرەوە و، پیاو لەمنەت نان بچێتە دەرەوە.

## تەواو بوو

## بەبلاێرین

چەند چیرۆکێکم لەم کتێبە خوێندنەوە. بە ڕاستی موتەرجیم، مەلا کەریم، شایانی سوپاس و ستایشە. بەلام، داخی بەجەرگم، ئەبێ ئەم کتێبە، بۆ چاپکردن، جارێکی تر بەشێوەی نووسینی زمانی کوردی ڕوونووس بکرێتەوە. هەندێ لە وشە و گوتاری بگۆڕرێن. مۆری وێنەکانی دروست بکرێت. ئەمەش کۆشش و پارەی زۆری ئەوێت. کۆستم کەوێ! لە بازرگان و پارە زۆرەکانی کوردا هاندەرێکی وەها نییە ئەم نیشە چاکە بکات، هەتا وەرگێڕ بتوانێ جارێکی تر ئەم تەقەلایە بدات. پەنا بەخوا.

۱۹۵۰/۱/۲۷ - بەغدا: محەممەد عەلی کوردی

***

حەقیقەت لە خوێندنەوەی ئەم وەرگێڕراوە لە زمانی فارسییەوە، ئازایەتی و کۆشش بە خەرج کراوە. وەبۆ ئەو کەسانەی موشتەری بن بە خوێندنەوەی ئیستیفادەیەکی فەوقەلعادە وەرئەگیرێت. زۆر سوپاسی خاوەنی وەرگێڕ ئەکەین ئەم خزمەتەی بۆ بەجێ هێنانەوە. بەلام نوقسانییەت ماوە بۆ جیهەتی ئەم کتێبە. ئەو کەسانەی ساحێب هیممەتن هەوڵ بدەن بۆ تەبع کردنی.

مەلا حەسن زادە عوبەیدوللا عەبدولعەزیزی مەلا عەلیی سەححاف

***

تەحسینی موتەرجیمی ئەم کتێبە ئەکەم بۆ حیسیپیاتی. لاکین ئەگەر هیممەت بکا بۆ تەبع کردنی، خزمەتێکی گەورەتر و بەقیمەتتر کوردێک ئەبێ، وە ئەو وەقتە هەموو کەس ئیستیفادەی لێ ئەکا.

۱۹۳۵/۱۰/۲۲: کوردێک

***

زۆر تەقدیری موتەرجیمی ئەم کتێبە ئەکەم، وە تەبع کردنی ئەبێتە سەبەبی خزمەتێکی زۆر گەورە، وەئەیزەن کتێبەکەش قیمەت و شەرەفێکی زۆر پەیدا ئەکا.

۲۲ی حوزەیرانی ۱۹۳۵: ئەلەبەیەک

***

لازمە لەسەر کوردەکانمان زۆر مەمنوونی خاوەن گەلاوێژ بن بۆ فکرێ کە کردوویەتی وە حورووفاتێ کە ڕێکی خستووە. لای من هەتا ئێستا کەس قیسسەی وای نەنووسیوە وای ڕێک نەخستووە.

۱۹۳٤/۱۲/۱۵ گولانی: شێخ سەلام

***

سەرتاپا تەماشای ئەم تەرجەمەکراوەی کە پڕە لە حیکمەت و عیلم و مەعریفەت و پڕە لە جەوهەر و زانستی و تەشبیه و کینایە و ئیستیعارەم کرد. تەقدیری موتەرجیمەکەی دەکەم. ئیرادەم کردبوو ئەم خزمەتە و ئەم هونەرە من بیکەم، (مع التأسف) من نائیل نەبووم. بەلام بەم کردەوە کە لەبرایێکی کوردی خۆ ولاتییەوە کرا، عادەتا وەکوو خۆم کردبێتم وای دەزانم. چونکە بە گەلێ زوبان تەرجەمە کراوە. زوبانی کوردیش کەوتە ڕیزی ئەوان. کەوابوو سەبەبی ئیفتیخارە، ئەی کاکە مەلا کەریم سەعید مەشکوورە. هەموو کەس بەم کردەوەیەت مەسرووورە. بۆ تەبعی تەمەنناى تەفیلت دەکەم. هەتا ماوم تەقدیر و تەحسین و بۆ تەبع و چاپی ئەم ئەسەرە پڕ گەوهەرە تەشجیعت دەکەم. لە ئێوەوە هیممەت، لەخوداوە تەوفیقتان نیاز دەکەم.

سەعید سیدقی کابان: ٥/٤/١٩٣٦

***

ئەووەڵ تا ئاخر سەحیفەی ئەم گەلاوێژە ڕووناکەم خوێندەوە. زۆر زۆر تەقدیری ساحیبی ئەم گەلاوێژە ئەکەم بۆ خۆی و فکر و تاقەتی کە ئەم کیتابەی تەرجەمە کردووەو، موحەققەق هەرچی ئیخلاسێکی جوان لەم کیتابە دا. بەخزیی لە زاتیا مەوجوودە. بۆیە ئەمەندە بە تاقەت و تەفسیر ئەم کەلیمانەی ڕەبت و تەرجەمە کردووەو، هەموو بەشەرێک لە ساحێبی گەلاوێژ، ئەوی ئەم نووسراوەی موتالەعە کردبێ. فەوقەلعادە مەمنوونە. ئومێدم وەهایە تەشویقات بکات چەند شەخسێک بۆ خزمەتی عالەم ئەم کیتابە تەبع بکرێ، وەخۆم حازرم بە موعاوەنەت لەگەڵ ساحێبی گەلاوێژ دا.

ع.ق: ١٩٣٨/١١/٢٠

***

ئەم کتێبەم خوێندەوە. بە ڕاستی پێویستە خاوەنی سوپاس بکرێ کە لە زوبانی فارسییەوە گۆڕیویەتی بە زوبانی کوردی. وە هیوام هەیە خوێندەوارەکانمان پەیڕەویی بکەن کە زۆر شتی وەها بخەنە ناوەوە. خوێندەوارەکانمان کە زوبانی بێگانە نازانن کەتێی بگەن. وە ئێمەیش هەموو ئامادەین بۆ یارمەدان، وە یەزدانیش یارمەی ئێمە ئەدات.

هەڵەبجە ن.م.عەللاف

***

بۆ خاوەنی تەرجەمەی ئەم کتێبە پێشکەشە.

برا شیرینەکەم، زۆر ڕجات لێ ئەکەم بۆ خاتری خزمەتەکەت بە هەوا نەڕوات، بۆ تەبعی هەوڵ بدە. ئەگەر لەسەر ئەفەقەی خۆیشت مومکین نابێت، بیدە بە خاوەن مەتبەعەیەک لەچاپی بدا با ئەم ناوە تەئریخییەت لە حەیاتدا بۆ بێنێتەوەو لەپاش مردنیش ناوت وەکوو سائیری پیاوە بە قیمەتەکانی کورد نەکوژێتەوە. ئیتر ڕجای چاپدانی ئەکەم.

کوردێک

خاوەنی گەلاوێژی کوردستان

نەڵێن بەهەشتە و جێی عەیش و نۆشە
ئەو شتە خۆشە کە دڵی پێ خۆشە

ئەوەندەی عەسکەرێک کە لە برینێکی کوشندە نەجاتی ببێ و، ئەوەندەی پیاوێکی تینوو لە دەشتێکی چۆڵ کارێزێ ئاو بدۆزێتەوە وەک چاوی قرژانگ ڕووناک بێ و، ئەوەندەی برسییەک کە سکی تێر بێ و، ئەوەندەی مەلایەک کە لەهەموو عیلمێک ئەبێتەوەو شەهادەی عالمیی ئەدەنێ و، ئەوەندەی موختەریعێک کە ئیختراعێ ئەکا بۆ ڕەحەتیی بەشەر و، ئەوەندەی قوتابییەک کە وەزیفەی خۆی بەجێ دێنێ و مامۆستای مەمنوون ئەکات، ئەوانە چەند مەسروور ئەبن دوو ئەوەندە مەسروور بووم کە چاوم بەم کتێبە کەوت و خوێندمەوە. گەلێ شوکرانەی خوام بژارد کەوا شوکر پیاوی وا هەڵکەوتووە لەقەومەکەماندا بۆ خزمەتی وڵاتی خۆی هەوڵ ئەدات و نەسیحەت نامەیەکی وا جوان دروست ئەکات بۆ لاوانمان کە عیبرەتی لێ وەربگرێ و بە گوێرەی ئەم پەندانە بجووڵێتەوە وە هەر کەسێ بە گوێرەی ئەم پەندانە بجووڵێتەوە سەر ئەکەوێ لە گشت ئیشیا، وە دائیما بێ لێکدانەوە هیچ ناکات چونکە ئەم عیبرەتانەی لە بەرچاوە و دووربینی ئەکات لە ئیشیا. وە ئەم کتێبە وەک گەوهەرێ وایە لەبن بەحردا بێ و خاوەنی ئەم کتێبە گەیشتووەتە بن بەحر و گەوهەرەکەی گرتووە بە دەستەوە. ئومێد ئەکەم گەوهەرەکە بگەیەنێتە سەر ئەرز، یەعنی ئەم کتێبە زۆر زوو تەبعی بفەرموێ، بەڵکو تەئسیر بکاتە هەموو کوردەکان و گەلێ کتێب تەئلیف و تەرجەمە بکەن تاکو لەبن بار دەرچین ببین بە سەردار. ناوی باشی میللەتەکەمان بکەوێتە ناو میللەتە باشەکان و پێشکەوتووەکانەوە. ئەنجا یەک ڕجام هەیە، ئەویش ئەوەیە کە زۆر هەوڵ بدەیت بۆ چاپ کردنی و بڵاوکردنی، بۆ ئەوەی ئەم پەندانە هەموو کەس بیزانێت و ئیستیفادەی عومومیی لێ بکرێت بۆ وریا بوونەوە.

ئیتر زۆرم نووسی و بۆ مەدح کردنی هێشتا دوو کەلیمەم نووسیوە. ئەنجا دەخیل، سەد دەخیل هەوڵ بدە بۆ تەبع کردنی. هەتا خێراکەی، درەنگە.

٥/١٠/١٩٣٥: ن.ا.س.

***

هەرێی یاخوا خاوەندی. ئەم کتێبە خۆشەویستەم بە تەواوی خوێندەوە. زۆر سوپاسی حیسسیاتی خاوەندەکەی ئەکەم و هیی ئەو کەسەیش کە لێم وەرگرتووە. من بە خەیاڵما نەئەهات کە ئەم کتێبە لە زەرفی چل ڕۆژ دا بکرێ بە کوردی لە فارسییەوە. یاخوا ساحێبەکەی خوا تەوفیقی بدا لەسەر خێر و بیهێڵێ بۆمان کە دائیما ئەم نەوعە خزمەتانە بکات بۆ دوا ڕۆژمان یادگارێکی گەورەیە پێی نازانین. هیوام وایە کە خوا مووەففەقی بکات بۆ تەبع کردنی. وە ڕجا ئەکەم لەو کەسانەی ئەم کتێبە ئەخوێننەوە

له برادەرە کوردەکان کە یاریدەی بدەن خۆیشم حازرم بۆ خزمەت بە هەموو نەوع.

خوا هیدایەتمان بدات لەسەر خێر لەگەڵ ساحێبەکەی.

۱۹٤٥/۹/۲۰ هەڵەبجە : م.ت.رەشید، لەخەستەخانە

***

خاوەنی سیپارەی (گەلاوێژی کوردستان)!

بێ گومان وەرگێڕاندنی ئەم سیپاوەیەت هونەرمەندی نیشان ئەدات، وە پێویستی سوپاس و شانازییە. بە ڕاستی بۆ ئەمڕۆی خوێندەواران و نوسەرانی کورد تەرجەمە لە تەئلیف کردن زۆر زۆر باشترە. ئومێد ئەکەین کە هەرچی ئەتوانێ پەیرەویت بکات لەم چەشنە کارانەدا. وەلە خودامان داوایە کە خوا ڕێگەی چاپ کردنیت بۆ سووک و ئاسان بکات.

۱۹٤٥/۹/۲۲ : ع.ا موعەللیمێکی عەبابەیلێ

***

ئەم کتێبەم خوێندەوە. تەشەککوری حیسسییاتی موتەرجیمی خاوەنی ئەم کتێبە ئەکەم.

کوردێک

***

برای هاوخوێنەکان!

بە ڕاستی خاوەنی ئەم کتێبە شایانی سوپاس و غیرەتە بۆ تەشجیعی بڕۆین. وە یەزدان یارمەتیمان بدات بیکەین بە دەرسی گشتی لە قوتابخانە کوردەکان بخوێنرێت، پڕە لە مەعنای جوان. هەر بژی خاوەنی ئەم کتێبە.

قوتابی: ت.ع - هەڵەبجە

ئەم کتێبەم بە دیققەت خوێندەوە. حەقیقەتەن شایستەی ستایشە. لەو وەقتەی کە موتەرجیم خەریکی ئەم نووسینە بووە حیسسییات و غەمخواریی ئەم نەوعە نیشانە کەم بووە. (جداً) تەقدیری جیددییەت و تێگەیشتنی موتەرجیم ئەکرێ.

۱۹٥۱/۸/۲٤: ئەحمەد تەقی

***

چەند چیرۆکێکی ئەم گەلاوێژەم خوێندەوەو، بە خوێندنەوەی سوودێکی فەوقەلعادەم لێ وەرگرت و زۆر مەسروور بووم. بە ڕاستی موتەرجیم زۆر شایانی سوپاسە، وە تەقدیر ئەکرێت بۆ تاقەتی کە ئەم کیتابەی تەرجەمە کردووە لە فارسییەوە بۆ کوردی. ئیتر هەربژی.

۱۹٥٦/٥/۱: بەرزنجی

بۆ خاوەنی تەرجەمەی ئەم کتێبە پێشکەشە!

زۆر بە ئیهتیمام موتالەعەی ئەم کتێبەم کرد. وە سوپاس بۆ موتەرجیم مامۆستا مەلا کەریم مەلا سەعید.

١١/١٢/١٩٦٣: برادەرێکت

***

له دەزگای ئاراسەوە

# ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی

داوا لە نووسەرانی بەڕێز دەکەین، ئەوانەی بەرهەمەکانیان لە ڕێگەی دەزگای ئاراس-ەوە بڵاو دەکەنەوە، پێڕەوی لەم ڕێنووسەی خوارەوە بکەن کە ڕێنووسی پەسندکراوی کۆڕی زانیاریی کوردستانە:

**یەکەم:** گیروگرفتی پیتی (و).

نیشانەی (و) لە زمانی کوردیدا بە شێوەی خوارەوە دەنووسرێ:

١- پیتی (و)ی کورت، واتە (و)ی بزوێنی کورت (و: u)

بۆ نموونە: **کورد. کورت. کوشت.**

٢- پیتی (وو)ی درێژ، واتە (وو)ی بزوێنی درێژ (وو: û)

بۆ نموونە: **سوور. چوو. دوو.**

٣- پیتی (و)ی کۆنسۆنانت (نەبزوێن). واتە (و: w)

بۆ نموونە: **ئاوایی. وەرە. هاولر.**

٤- پیتی (ۆ)ی کراوە. واتە (ۆ: o)

بۆ نموونە: **دۆڵ. گۆڕ. نۆ.**

**دووەم:** گیروگرفتی پیتی (و)ی سەرەتای وشە.

هەر وشەیەک بە پیتی (و) دەست پێ بکات بە یەک (و) دەنووسرێت.

بۆ نموونە: **وریا. وڵات. وشە. ورد.**

**سێیەم:** گیروگرفتی پیتی (ی):

نیشانەی (ی) لە زمانی کوردیدا بە شێوەی خوارەوەیە:

١- پیتی (ی)ی بزوێن. واتە (ی: î).

بۆ نموونە: **زەوی** - Zewî

٢- پیتی (ی)ی کۆنسۆنانت. واتە (ی: y)

بۆ نموونە: **یار** - yar

• **سەرنج ١:** پیتێکی (ی)ی بزو...ی فرە کورت هەیە کە لە نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی لاتینیدا نیشانەی (i)ی بۆ دانراوە وەک لە وشەکانی: من - Min ، کن - Kin ، ژن - Jin. ئەم نیشانەیە لە نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبیدا نییە.

• **سەرنج ٢:** نیشانەکانی (ی)ی بزوێن و (ی)ی کۆنسۆنانت واتە (î) و (y) لە پیتی عەرەبیدا هەردووکیان هەمان نیشانەی (ی)یان هەیە بەڵام لە ڕاستیدا لە یەکتر جیاوازن و لە کاتی بە دوای یەکتر هاتنیاندا دەبێ هەردووکیان بنووسرێن.

وەک: **نییە. چییە. دیارییەکە. زەوییەکە.**

• **سەرنج ٣:** لە کاتی هاتنی سێ پیتی (ی) بە دوای یەکتردا وەک لە وشەکانی **(ئاواییییەکەمان...)** **(کۆتاییییەکەی...)** **(وەستاییییەکی...)** **(کۆتاییی بە کارەکە هێنا)** دەبێ بەسەر یەکەوە بنووسرێن، واتە سێ (ی) بە شێوەی (ییی) بە دوای یەکتردا دێن.

**چوارەم:** گیروگرفتی پیتی (ڕ)ی گران، واتە (ڕ)ی نیشانەدار. ئەم پیتە لە هەر کوێیەکی وشەدا هات دەبێ بە نیشانەکەیەوە بنووسرێت. واتە لە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتای وشەدا هەر (ڕ)ی گرانی

نیشانەدارە.

وەک: **ڕۆژ. بەهار. کەر.**

**پێنجەم:** گیروگرفتی پیتی (و)ی بەیەکەوەبەستن (عطف):

پیتی (و)ی بەیەکەوەبەستن. بە شێوەیەکی جیاواز لە وشەی پێش خۆی و پاش خۆیەوە دەنووسرێت و مامەڵەیەکی سەربەخۆی لەگەڵدا دەکرێت.

بۆ نموونە: **من و تۆ. ئارەزوو و ویا.**

• **سەرنج:** لە هەندێک وشەی لێکدراودا پیتی (و)ی بەیەکەوە بەستن بووە بەشێک لە هەردوو وشە لێکدراوەکە و بە هەموویان وشەیەکی سەربەخۆیان دروست کردووە.

وەک: **کاروبار. دەنگوباس. ئەلقوبێ. هاتوچۆ.**

لەم بارانەدا مامەڵەی سەربەخۆ لەگەڵ پیتی (و)ی بەیەکەوە بەستندا ناکرێت و وشەکە هەمووی بەسەریەکەوە دەنووسرێت وەک لە نموونەکاندا پیشانمان دا.

**شەشەم:** وشەی ناسادە چ ناو بێ یان زاراوە دەبێ بەسەریەکەوە وەکو یەک وشە دەنووسرێن. وەک:

ناو: **چەمچەماڵ. بێکەس. دڵشاد. زووگەزراو. بێخاڵ. ئاڵهاریز. میواندۆلو. کانیکەوە. سپیکرە.**

زاراوە: **ڕێنووس. ڕێنیوان. دەسبەجێ. جێبەجێ. نیشتمانپەروەر. دەستنووس. دەسبازی. وڵاتپارێز. ئازادیخواز. دووشەمە. سێشەمە. پێنجشەمە. یەکسەر. ڕاستەوخۆ. یەکشەوە** (مانگی یەکشەوە).

**حەوتەم:** پیتی (ت) لە کۆتای کار (فرمان)دا دەشێ بنووسرێت و دەشێ نەشنووسرێت.

وەک: **دێت و دەڕوات** (یان) **دێ و دەڕوا.**

**هەشتەم:** نیسبەت لە زمانی کوردیدا زۆربەی جار بەهۆی پیتی (ی) لە کۆتای ناودا دەکرێت.

وەک: **پێنجوینی. هەولێری. دهۆکی. شێخانی.**

هەروەها ئەم نموونانەی خوارەوە:

ئەحمەدئاوا: **ئەحمەد ئاوایی**

پارمجە: **پارمجەیی.**

تووزخورماتوو: **تووزخورماتوویی.**

شنۆ: **شنۆیی.**

ئاکرێ: **ئاکرێیی** (یان) **ئاکرەیی.**

لادێ: **لادێیی.**

• **سەرنج:** ئەو ناوانەی خۆیان بە پیتی (ی) تەواو دەبن پێویست ناکات (ی)ی نیسبەتیان بخرێتە پاڵ.

وەک:

سلێمانی: **کامەران سلێمانی.**

کانیماسی: **حاجی حوسێن کانیماسی.**

ئامێدی: **ئازاد ئامێدی.**

**نۆیەم:** هەر وشەیەکی بیانی چ هاتبێتە ناو زمانی کوردییەوە، یان هەر ناو و وشەیەکی تر کە لە نووسینی کوردیدا دێتە پێشەوە، دەبێ بەڕێنووسی کوردی بنووسرێت.

وەک: **قەڵەم. ئەکبەر. قاهیرە. ئۆتۆمۆبێل. دۆستۆیفسکی.**

**دەیەم:** ئامرازی (تر، ترین) کە بۆ بەراورد بەکاردێن دەبێ بەوشەکانی پێش خۆیانەوە بلکێنرێن. وەک:

جوان: **جوانتر – جوانترین.**

خاو: **خاوتر – خاوترین.**

• سەرنج: ئەم ئامرازەی (تر) جیاوازە لە وشەی (تر) کە بەواتەی (دی، دیکە) دێت. ئەمەی دوایی دەبێ بە جیاواز لە وشەی پێش خۆی دەنووسرێت.
وەک: **ماڵێکی تر، چیی ترم ناوێ.**

**پازدەیەم:** جێناوی نیشانەی وەک: ئەم. ئەو. ئەڤ.
ئەم جێناوانە ئەگەر ئاوەڵکاری (کات - یان - شوێن)یان بەدوادا هات پێیانەوە دەلکێن و دەبن بە یەک وشەی سەربەخۆ.
وەک: **ئەمشەو. ئەمڕۆ. ئەڤسال. ئەمجارە. ئەمبەر و ئەوبەر. ئەڤرۆ.**

**شازدەیەم:** نیشانەکانی ئەناسراوی وەک ( ...یەک، ...ێک، ...ەک) بە شێوەی خوارەوە دەچنە سەر وشەکانی پێش خۆیان:
١- ئەگەر وشەکان بە پیتە بزوێنەکانی (ا، ی، ە، ێ) تەواو بووبن ئەوا نیشانەی (...یەک)یان دەخرێتە پاڵ. وەک:
**چیا: چیایەک.**
**زەوی: زەوییەک.**
**ڕێنە: ڕێنەیەک.**
**دێ: دێیەک.**
٢- ئەگەر وشەکان بە پیتە بزوێنی (وو) یان هەر پیتێکی دەنگدار (نەبزوێن: کۆنسۆنانت) تەواو بووبن ئەوا نیشانەی (ێک - لە کرمانجیی خواروو) و نیشانەی (ەک)یان لە کرمانجیی سەروودا دەچێتە سەر.
**خانوو: خانووێک، خانووەک**
**گوند: گوندێک** (کرمانجیی خواروو)، **گوندەک** (کرمانجیی سەروو).
**ژن: ژنێک** (کرمانجیی خواروو)، **ژنەک** (کرمانجیی سەروو).

**حەڤدەیەم:** گیروگرفتی پاشگرەکانی (دا. ڕا. وە. ەوە)
ئەم پاشگرانە بە وشەکانی پێش خۆیانەوە دەلکێنرێن. وەک:
دا: **لە دڵدا** (هەر برینێ کە لەدڵدا هەیە سارێژی کەن). (خەمێکم لەدڵدایە).
ڕا: **لە ئامێدیڕا** (لە وێرا بەپێ هاتووین). (لە خۆڕا دڵی گۆڕاوە).
وە: لە چوارچراوە (لە وێوە هاتووین).
ەوە: بە ماڵەوە (بە ماڵەوە ڕۆیشتین).
(جارێکی تر نووسیمەوە). (خانووەکەم کڕییەوە).
• سەرنج: پاشگری (دا) جیایە لە وشەی (دا) کە فرمانە و چاوگەکەی (دان)ە.
وەک: **تیرێکی لە دڵی دا. تیرێکی لە دڵی داوم.** ئەم (دا)یەی فرمان بە جیا دەنووسرێ.

**هەژدەیەم:** گیروگرفتی پێشگرەکانی (هەڵ. دا. ڕا. وەر. دەر)
١- ئەم پێشگرانە کاتێ دەچنە سەر چاوگ یان فرمان یان هەر حاڵەتێکی تر پێیانەوە دەلکێن بە مەرجێ جێناوی لکاو نەکەوتبێتە نێوان پێشگر و وشەکەی دوای خۆی. وەک:
* چاوگ:
**هەڵ: هەڵکردن. هەڵگرتن. هەڵکورمان. هەڵکێشان.**
**دا: دابڕان. داخستن. داڕمان. داکردن.**
**ڕا: ڕاگرتن. ڕاکێشان. ڕابەرین.**
**وەر: وەرگرتن. وەرسووڕان.**
**دەر: دەرکردن. دەرهێنان.**

* فرمان:

**هەڵ: هەڵگرە. هەڵمەدە. هەڵکشێ.**

**دا: دانێ. دامەبڕە.**

**ڕا: ڕاکێشە. ڕامەپەڕێنە.**

**وەر: وەرگرە. وەرسووڕێنە.**

**دەر: دەربێنە. دەرخە.**

* حاڵەتی تر. وەک:

**هەڵکشاو. هەڵنەکشا. داتراو. ڕاپەڕیو. ڕانەپەڕیو. وەرگرتوو. وەرگرتە. دەرخراو. دەرکراو.**

٢ – ئەگەر جێناوی لکاو کەوتە نێوان پێشگر و فرمانەکەی دوای خۆی ئەوا بەجیا دەنووسرێن و جێناوەکە بە پێشگرەوە دەلکێنرێ.

**هەڵ: هەڵم گرن. هەڵیان کەن. هەڵمان کێشن. هەڵمان مەواسن.**

**دا: دامان نەنایە. دایان خەن. دای برە.**

**ڕا: ڕایان دەگرین. ڕام کێشە. ڕام پەڕێنە. ڕاشیان پەڕێن.**

**وەر: وەرمان گرتایە. وەری نەگری. وەریان سووڕێنەوە.**

**دەر: دەریان پەڕاندین. دەری خە.**

پازدەیەم: گیروگرفتی وشەی لێکدراو.

ئەگەر وشەی دووەم لە دۆخی فرماندا بوو، بەجیا دەنووسرێن:

**ڕێک دەکەوین. پێکیان هێنایەوە. پێک نەهاتوون. یەکیان نەگرتووە. دەستمان نەکەوت.**

بەڵام ئەگەر وشەی دووەم لە دۆخی چاوگ یان حاڵەتی تردا بوو ئەوا هەردوو وشەکەوە بە یەکەوە دەلکێنرێن.

وەک: **ڕێککەوتن. پێکهاتن. یەکگرتن. دەستخستن. یەکگرتوو. دەسکەوتوو. پێکهاتە.**

شازدەیەم: ئامرازی (ش)ی تەئکید کەوتە هەر شوێنێکی وشەوە دەبێ بە بەشێک لە وشەکە و نابێ بە هۆی لەتبوونی وشەکە.

وەک: **بشتەوێ ناتدەمێ. نەشخۆی. گوتی دێم... نەشهات. نەشمانگرتن. بشمانبەن.**

●●●